PHILOSOPYH & SCIENCE

زنجیرەی فەلسەفە و زانست 1

# ڕەوشی فەلسەفی

# سەدەی 21

Century

## خودا - بوونەوەر - مرۆڤ

ALLAH CREATURE HUMAN


مسعود عبدالخالق




التفسير

نووسینی
مەسعود عبدالخالق
بڵاوکردنەوەی
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
نەخشەسازی ناوەوە
نەوزاد کۆیی
خـەت
نـەوزاد کۆیـی
بـەرگ
ئەمین مخلص
قەبارەی کتێب
١٧×٢٤ - ( ٤٣٨ ) لاپەڕە
نۆرە و ساڵی چاپ
دووەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز
تـیراژ
١٥٠٠ دانە

# ڕەوشی
# فەلسەفی سەدەی (٢١)
## خودا- بوونەوەر- مرۆڤ

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی ( ٢٨١٠ ) ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێدراوە



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

زنجیرەی فەلسەفە و زانست (١)

# ڕەوشی فەلسەفی سەدەی (٢١)

## خودا- بوونەوەر- مرۆڤ

نووسینی

مەسعود عبدالخالق

چاپی دووەم



| | |
|---|---|
| نـاوی کتێـب بـەکوردی: | **ڕەوشی فەلسەفی سەدەی -21-** |
| نوسینـــــــــــــــی: | مەسعود عبدالخالق |
| بڵاوکردنــــــــــەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسـازی نـــاوەوە: | جمعە صدیق کاکە |
| خـــــــــــــــە ت: | نەوزاد کۆیی |
| بـــــــــــــــەرگ : | أمین مخلص |
| نـــۆرە و ســاڵی چـــاپ: | یەکەم 1434ک – 2013ز |
| تـــــــــــــیراژ: | 1500 دانە |

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - ژمارەی سپاردن (2810) ساڵی (2012) پێدراوە**





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com



# پێشکەش بێ

* به دایك و باوكم، كه زۆر به منەوه ماندوو بووينه .
* هەموو ئەو هۆشمەندانەی بــەدوای ڕاستين لــه پێنــاو قەڵاچــۆی زوڵــم و هێنانــەدی دادگــەريی بــۆ گشــت مرۆڤايەتی .

# پێشەکی

لەو سەردەمەی عەولەمە و عقلانیەت (فەلسەفە) زیاتر ڕۆڵی گرنگ بوە بۆ مرۆڤی نویێ، ئەو مرۆڤە کە ڕۆڵەی نەتەوەو دەوڵەت و بنەماڵەکەی نەماوە، بەڵکو ئینتمایەکانی (عابرالقارات)ە ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەموو جیهان کارلێك دەکات، لە وەها دۆخێکیشدا لە چوارچێوەی (صراع البدائل) لەنێوان ئایین و مەدرەسەکاندا ئەوەیان سەرکەوتو دەبێت کەبەڵگەکانی بەهێزە، بەکارهێنانی هەیە، سەرتاسەری ومرۆڤایەتیە.

بۆ ئەوەی ئێمەش زیاتر لەکاروان دوا نەکەوین هەول دەدەین بەشێك لەو ئەرکەی سەرشانمان جێبەجێ بکەین، بابەتێکی وامان هەلبژاردوە بەو نیازەی خوێنەر لە لێواری هەرە پێشەوەی فەلسەفە نزیك بکەینەوە، لە هەمان کاتدا ئەو هەمو زەخیرەیەی ڕابووردووی فەلسەفەشمان فەرامۆش نەکردوە، بە ئەندازەیەکی زۆرگرنگیمان بە فەیلەسوفانی سەردەم نەداوە، چونکە ئەوان زیاتر لە ژێر کاریگەری زانستێکی ساغ نەبووەی وەك فیزیای کوانتەمن، هەر گۆڕانێك لەو زانستە هەمو بناغە فەلسەفیەکانیان هەلدەتەکێنێ و زۆریش لەگینە، تا بەرنامەو مەنهەجیکی لۆژیکانە بۆ ئەو پرسیارە قورسانە دابڕێژین، بۆ ئەوەی بەسادەیی ڕاستیەکانی دروستکەرو دروستکراومان بۆ دەرکەوێ، لەنێوان هەردوولاشیاندا لەفەلسەفەی ژیان بگەین بە داهێنان وپەیڕەوکردنیشەوە.

بەشی یەکەم بریتیە لە کورت کراوەی هەلۆیستی فەلسەفی کۆن بە سەرەنجامەکانیشیەوە.

بەشی دوەم بریتیە لە وەرچەرخانەگرنگەكانی ئایدیۆلۆژیای بەشەری بە بیرو زانست وفەلسەفەوە، لەبارەی پرسە هەرە بنچینەییەكانی فەلسەفە كەبریتین لە دروست كراوو دروست كەرو پەیوەندیان بە یەكتریەوە.

لەبەشەكانی تر —واتە لە دوای بەشی دوەم هاتووینەسەر پرسە فەلسفیەكانی سەردەم.

خوینەر وا تینەگا پرس و كێشە فەلسفیەكانی بەشی یەكەمان بەبێ وەڵام بە جێهێشتوە، نەخیر، بەشی یەكەم زیاتر گەلالەی پرسیارەكانە لە بەشەكانی دوای ئەو وەڵامەكانی تیدایە، ڕاستە بیری زاناو فەیلەسوفانی جیهان زۆر مەزنەو بەمەمانان بە ئاسانی هەلناسەنگینرێ، بەڵام تەقەلا باشترە لە دەستەوەستان، لەبەرامبەر ئەو زانیاریە زۆرەی ئەوان ئێمە زەخیرەی لە بن نەهاتووی كتێبە ئاسمانیەكان بەكاربهینین ئەو كاتی ئەو نابەرابەریەی فكرو فەلسەفە چارە دەكرێ، كە ئەوەش مادەی بابەتەكەمان.

هەولیكە وەك سەروەریە مێژووییەكانمان خۆشمان كوردستانیانە بۆچوونی تایبەتی خۆمان هەبێ، ئینجا بەشیكیش بیت بۆ داڕشتنەوەی كەسیتی كوردستانی بۆ ئەوەی لەكەسیكی سەلبی ببتە ئیجابی وسودمەند بۆ مرۆڤایەتی، تیایدا وولات و مرۆڤەكانت خۆش بوێ، گیانی بەرگریت بەرامبەر زولم نەمرێ، بۆ ئەوەش بەكاتیكی كەم ودەسكەوتیكی زۆرەوە بچیە نیو بابەتیكی ئالۆزودرێژی وا، كە ئێمە زۆر كورت وپوختمان كردۆتەوە، گوشیتمان، وا چاكە كەمێك بە سەرنج وووردبونەوە بیت لەگەلی، با لە هەمان كاتدا خویندنەوەكەت ڕەخنەگرانەش بیت، بەڕوونی دیارە كەلین وبۆشایی زۆرە، زۆر شوینمان بە جیهیشتوە بۆ تۆ گەشەی پێ بدەی، هەلەكانی ڕاست كەیەوە، بەڵام دوعات لە بیر نەچێ چونكە هیچ پرۆژەیەكی ئێمە بۆ دەستكەوتی مادی نیە بەڵكو (سەدەقەی جاریەیە)، بۆیەش هەردەم نرخی كتێبەكانی ئێمە هەرزانن.

# بەشی یەکەم

# پرسە فەلسەفیە کلاسیکیەکان

## فەلسەفە

مانا سادەکەی فەلسەفە بریتیە لە قوڵبوونەوە لە بابەتەکان یان گوتراوە (حب الحكمة)، یان وەك (پۆلیتزیر) ووتەنی(**معرفة العالم والإنسان**)، هەر سروشتی ئادەمیزادیش ئەوەیە حەزدەکات لە دنیای دەوروبەی تێبگات چۆن بەڕێوە دەچێت؟ لەکوێ هاتووە؟ بۆچی هاتووە؟ بەرەو کوێ دەچێت؟ چارەنوسی وبەختی خۆی چیە؟ کامیان زامنی ژیانێکی بەختەوەرو دادگەریەتی؟ لەدوای مردن چی بەسەردێت؟

ئەو پرسیارانە کورت کرانەوە لەچوار پرسیار (چۆن، لەکوێ، بۆ، بۆکێ) پرسیاری فەلسەفی کۆنن[1]، لە ئیگریکیەکانیش کۆن ترن.

مادام پرسیاری یەکەمی هەمو عاقلدارێك ئەوە بوە کێ ئەوی دروست کردوەو چی گەڕەکە، پرسیاری لە شیوەی شیعریش زۆر سەری هەلداوە وەك نمونەی خیام کەدەڵێ:

ئەی خودایە سەرم لەکارت گێژە
نوقل ئەخەیە دەمم ودەڵێی مەیچێژە
پیالەی ئاو وەرگێڕەومەیڕێژە

[1] لە ڕاستیدا بۆ ئەو سەردەم دەشێ هەمو ئەو پرسیارانە فلسفی بێت، بۆ ئیستا مەرج نیە فلسفی بن، هەندێکیان زانستین.

ئیخوان سەفا دەڵێن لەناو ناخی مرۆڤ ئارەزووی دۆزینەوەو توێژینەوەی خوای شین کراوە[1]، ڕەنگە پشتیان بەو ئایەتە بەستبێت ﴿بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ﴾[2]، لەدوای پەیام وپەیامبەران نۆرەی فەلسەفە دێت کەڕۆڵی هەرە گرنگی بینیە لە وەرچەرخانی کۆمەڵگەی ئەفسانەی (میتۆس) بۆ کۆمەڵگەی عەقلانی (لۆگۆس)، ئەوەش کاری هەرەسەرەکی پێغەمبەران بوە تا کۆمەڵگە بتوانێ پەیام وەرگرێ و شارستانی بەرپا بکاوەك لە ئینجیلی یۆحناش واهاتوە (في البدء كان الكلمة، وكان كلمة الله).

فەلسەفە جیایە لەگەڵ زانست هەروەك هەندێك تێکەڵی دەکەن وەك فەسلەفەی مارکسیزم دەڵێت فەلسەفەی ئێمە زانستیە[3]، ئەنتۆنی فلوو دەڵێ توێژینەوە لە نێوان دووتەنی فیزیایی ئەوە زانستە، کاتێ لە هۆکاریان دەپیچیەوە ئەوە چونە ناو فەلسەفەیە[4]. (براتراند راسل)یش دەڵێ کاری زانست گرنگی دانە بە پێویستی مادی و تەکنیکی هەرچی فەلسەفەیە کاری گرنگی دانە بە پرسی روح و ئەخلاقی مرۆڤە، لە شوێنێکی تر دەڵێ: زانست ئەوەیە دەیزانین هەرچی نەشمان زانی ئەوە فەلسەفەیە..، نەخێر ئاوا نیە، خاڵی هاوبەشیان هەیە هەردوکیان بەرهەمی فکری ئادەمیزادن، لەکاتێکدا کیانی زانست پێکدێت لەتاقیکردنەوەی بەکردەوە.

بەڵام فەلسەفە هەڵدەقوڵێت لەبەڵگە فکریەکان، دەتوانین بڵێین پرسیاری (بۆچی) بەرهەمی فەلسەفیت پێ دەدا، پرسیاری (چۆن)یش بەرهەمی زانستیت پێ دەدا، خەریکە بڵێین فەلسەفە لە (هۆکار) دەکۆڵێتەوە زانستیش لە (ئەنجام)، ئەگەر وابێ

---

[1] من رسالة اخوان الصفاء رقم:21ص99.

[2] العنكبوت اية 49

[3] بڕوانە:جورج بوليتزر–اصول فلسفة الماركسية – ت:شعبان بركات ج1ص13 ،هتروەها: عرض موجز للمادية الديالكتيكية ص6.

[4] There is agod how the worlds most notorious atheist changed his mining p - A. fluo

ئەوە فەلسەفە زیاتر بە دیوی دوەمی گەردوون سەرقالە دیوی یاسای سروشت وروح و پەیام، هەرچی زانستیشە زیاتر لە ئەنجام ومادەوبوون، بە زاراوەی ئاینی فەلسەفە لە (ئەمر) دەکۆڵێتەوەو زانستیش لە (خلق)، عەقڵ بە گشتیش لە پەیوەندی (ئەمرو خلق) دەکۆڵێتەوە، کەواتە فەلسەفەی ڕاست رۆحی عەقیدەیە.

دەتوانین بە ئایەتیکی قورئانی گوزارشی فەلسەفی وئاینی لیک جیاکەینەوە ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾[1]. بەشی یەکەم ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ﴾ بریتیە لە بزوتنەوەی زانستی و بەشی دوەمیش ﴿أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ بریتیە لە بزوتنەوەی فەلسەفی.

لەکۆنەوە فەلسەفە پێشڕەو بوە و زانستیش یەکێك بوە لە لقەکانی، فەلسەفە بزوێنەری زانستە، جار وایە زانست نازانێ دەردی خۆی چارەسەر بکا فەلسەفە بۆی دەکا هەروەك لە (فلسفة العلم في القرن العشرين) هاتوە: (إذا كان العلم لا يفكر في ذاته، فإن فلسفة العلم هي التي تتكفل بذلك العبء وتضطلع بالتفكير في ذات العلم)[2]. فەلسەفە باوەشی فراوانترە هەروەك پێشڕەوی تیۆری سیاسیشە هەروەها کۆمەڵایەتی و ئابوریش..،دایکی زانستەکانە(فیزیا-کیمیا-بیرکاری-کۆمەلناسی-سایکۆلۆجی —بایۆلۆجیا..)ئەوانە لەسەرەتا بەشیك بووینە لەفلسفە لەگەل گەشەکردنی بووینە بەشیکی سەربەخۆی زانست ، بۆیە فەلسەفە زۆر گرنگە بۆ زۆر ڕووکار، ئەوەی لە فەلسەفە نەزانێت لە (مەبەست ونهینیەکانی ئاین) ناگات ونازانێ بۆچی هاتۆتە دنیا و وئەرکی چیە؟ لەکوێ هاتووە؟ بەرەو کوێ دەڕوات؟ هەروەك گیاندارێك وەك ئەمیبیا وخشۆك یان فیلێك ژیانەکەی دەباتە سەرو دەمرێت.

---

[1] فصلت : 53.

[2] فلسفة العلم في القرن العشرين - د. يُمنى طريف الخولي ص10

بۆیــه پــه‌یامی ئــاینی فه‌لســه‌فه‌ی زۆر به‌هه‌نــد وه‌رگرتــووه بــه‌ده‌یان ئایــه‌ت و فه‌رموده‌ی له‌سه‌ره، پێچه‌وانه‌ی هه‌ندێك ڕاو بۆچوونی هه‌ندێ زانــای ئیســلامی كــه ده‌ڵێن قورئان و سونه‌ت بخوێنه‌وه به‌ڵام كتابی تــرو عه‌قلانیــه‌ت خۆشــێواندنه، لــه‌و باره‌یه‌وه ئیمامی شافعی به شیعر ده‌ڵی:

كل العلوم سوي القرآن مشغلـة إلا الحديث وعلم الفقه في الديـن

وعلم ما كان فيـه قـال حدثنـا وما سوي ذلك وسواس الشياطين

وا پیده‌چی ناونانی زانسته‌كانی ئــه‌كادیمی ســه‌رده‌م بــه (علمــی شــه‌یتان) لــه‌و ڕوانگه‌وه هاتبێت، له شیعریكی هاوشیوه له‌لایــه‌ن (اخبــار الــدول واثــار الــدول فــی التاریخ- احمدبن یوسف القارمانی ) هاتوه :

**جرى القلم القضاء بمايكون فسيان التحرك والسكون**

**جنون منك ان تسعى لرزق ويرزق فى غشاوته الجنين**

له‌كاتێكدا له كتێبه ئاسمانیه‌كان وله‌قورئان زیاتر له (300) جار باسی زانست ده‌كــات، باســی تێفكــرین له‌گــه‌ردون و بوونــه‌وه‌ر ده‌كــات بــاس لــه‌تێفكرین له‌دروستبوونی زه‌وی و ئاسمان ژیان.. هتد:

﴿اوَلَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْـأَرْضِ وَمَـا خَلَـقَ اللَّـهُ مِـنْ شَـيْءٍ..﴾[1]، ﴿افَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَـوْقَهُمْ كَيْـفَ بَنَيْنَاهَـا وَزَيَّنَّاهَـا وَمَـا لَهَـا مِـنْ فُـرُوجٍ﴾[2]، ﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ..﴾[3]، ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِـي السَّـمَاوَاتِ وَمَـا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[4]، ﴿قُلْ سِيرُوا فِـي الْـأَرْضِ

---

[1] اعراف 185.
[2] ق 50.
[3] ال عمران 191
[4] الجاثية 13

فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ...﴾[1].. زۆر بەدەگمەن لە فیقهـی ئیسـلامی گرنگـی بـەو ئایەتە زانستی و فەلسەفی وفکری وعەقلیەکان دراوە، بەو پاساوەی گوایە ئاین بـە سادەیی هاتووەو قولبونەوەی ناوی، وایان لێ دەخوێندرێتەوە ئەو بۆچوونە ترسـانیش بێت لە فەلسەفە[2]، کەچی قوول بوونەوە باوەڕت زیاد دەکا ﴿..وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا..﴾[3] ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِـنْ عِبَـادِهِ الْعُلَمَـاءُ..﴾[4]. بەو جۆرە لە ﴿نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾ دەگەین، ئینجا داوای حیکمەت دەکات ﴿يُؤتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾[5]، (خذ الحكمـة مـن اي وعاء خرجت)، واتا لەهەر کوێەك هەبێت، ئیمـامی عـەلی دەلی: (قـوت الأجسام الغذاء، وقوت العقول الحكمة)[6]، هەتا پێویستە فکری نائیسـلامیش بخوێندرێتـەوە وەك ئیمـامی عمـر دەڵـێ: لايعـرف الإسـلام مـن لم يعـرف الجاهليـة[7]. القـديس أوغسطينوس قال ذات مرة: "أشكر الهراطقة لأنهم لما أساءوا فهم الكتاب، جعلونـا نتعمق في الكتاب أكثر فأكثر لكي نفهم الوضع المضبوط".

فەلسەفە (یان ووردتر فەلسەفەی ئەرینی) ئەو مەیدانەیە کە مرۆڤە عاقلمەندە جیاجیاکانی جیهان لێی کۆدەبنەوە، دیالۆگێکی قوول دەکەن، ئەگەر مەنهـەجێکی لۆجیکانە بۆ توێژینەوە فەلسەفیەکان دابرێژرێ ئـەوا سـودی یـەکجار زۆری هەیـە، لەوانە:

---

[1] عنکبوت 20.

[2] لە بارەی ترسان لە فەلسەفە توێژینەوەیەکی فلسفی (ڕێبوار سیوەیلی – ترسان لە فەلسەفە ل73-107) بخوینەوە

[3] آل عمران : 7

[4] فاطر : 28

[5] البقرة : 269

[6] على ابن طالب-الف كلمة المختارة ص99

[7] محمد قطب-مذاهب الفكرية المعاصرة ص6

1- ئەرکێکی خوایی جێ بەجێ دەکەی کەداوای لێ کردی بیر لە زەوی وئاسمان بکەیتەوە، بیر لە نهێنیەکانی بونەوەر بکەیەوە.

2-دەبێتە هۆی پتەوی لە بیروڕا (عقیدە)، بە هۆی فەلسەفە دەتوانری دلە مردوەکان زیندوو بکریتەوە (ان الله لیحیی القلب المیت بنور الحکمة کما یحي الأرض المیتة بوابل المطر).

3- چاکتر لە (مقاصد)ی ئاین دەگەی.

4- دەبێتە پێشەنگێك بۆ بەرپاکردنی شارستانی وپێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی.

5-واتە زانینی فلسفە و پیادەکردنی کردنەوەی دەرگای خێرە بە هەمو ئارستەکانەوە ،بەمانای بەرپا کردنی شارستانی وتکنیك وخۆشگوزەرانی وخزمەت و..(ومن یؤت الحکمه فقد اوتی خیرا کپیرا )

6- فەلسەفەی دروست مەیدانی بیرکردنەوەو عەقیدەی خوایت لە پانتاییەکی تەسك دەگوازیتەوە بۆ زەوی وئاسمانەکان،لەکاتێکا بەشیکی زۆر لە ئیمام وفەقیهەکانی مەزهەبی دژی زانست بووینە ،لەهەموان راشکاوانە تر ئیمامی ئیبن تەیەمیە وزەهەبی وجۆزی ودیمەشقی دژی کیمیاو بیرکاری وفلسفە بوینە ،کەچی فەیلەسوف و شاعیری گەورە (مەلای کۆیە)دەلێت: علمی کیمیات نەخوێندوە بەخوا نازانی خوا چی کردووە!! عەقیدەی مرۆڤی نوێ بەو کتێبە سادانەی کۆن دروست نابێ،تەنانەت شارستانیش بەو جۆرە فقهەو عقیدەیە دروست نابێت،ئەو دابەشیەش کۆتایی پێدەهێنێ کە گوایە کیمیاو فیزیاو تەکنۆلۆجیا بەشی ئەکادیمیایەو پیویستی دونیایەو وانەی ئاینیش رۆحی بێت وبۆ قیامەت ،ئەوکاتە وانەی ئاینی عەبەسی وبێئامانج دەبێت .

عەقیدەی ڕاستەقینە بەخوا لەوێ پەیدا دەبێ هەروەك فرانسیس بیكون (فیلسوفی بریتانی-سەدەی16)دەڵێ: (ان كان قليل من الفلسفة يبعد عن الله.. فان الكثير منها يقربك الى الله) یەكێكێشە لە میساقەكانی نێوان خوداو مرۆڤ لەڕێی میساقی خواو پێغەمبەران، هەرچەندە ئیمام ابن تیمیە لەكتێبی (درء التعارض.. ) دەڵێ بۆ پێغەمبەران تەنها كتاب هاتوە فەلسەفەو حیكمە نەهاتوە، كەچی لە قورئان بە ڕوونی (حكمە) و (كتاب)ی لێك جیاكردووتەوە، بۆ پێغەمبەران كتاب وحكمە هاتوە ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ﴾[1]، بۆ (لوقمان) تەنها (حكمە) هاتوە، ئینجا حكمەی لەگەڵ كتاب وئینجیل وتەوراتیش ڕیزكردوە ﴿ويعلمه الكتاب والحكمة والتوراة والإنجيل﴾[2].

7- دەبێتە هۆی خێرایی گەشەی زانستی شەرعی وفقهی وفكری ئیسلامی بە پێچەوانەوە بێ فەلسەفەی دروست ئەو زانستە ئاینیانە توشی دوگماو بەجێمان دەبێ، تەنانەت بۆ زانستی سروشتی وكیمیاو فیزیاش فەلسەفە ئاوا پێویستە لەو بارەیەوە لویس دی برگلی دەڵێ: لەسەدەی 19 كەمێك دووركەوتنەوە لە نێوان زانست وفەلسەفە ڕوویدا زیانێكی زۆر بە هەردوولا كەوت[3]، بەهەمان شێوە دووركەوتنەوەی ئاین وفەلسەفە زیان بە هەردوولا دەگەیەنێ.

8- فەلسەفەی ئاینی دروست ڕۆڵی سوپا دەبینی لەسەر سنور پاریزگاری لە ئاسایشی ناوخۆ دەكا، ئەو فەلسەفەیەش ئەو ڕۆلە دەبینی لە (غزوالفكری) وباقی هیرشەكانی تر، ڕەنگە ململانێی وا بە مامۆستای ئاینی وفەقیهو

---

[1] ال عمران81
[2] ال عمران 48
[3] د محمدمطلب- الفلسفة والفيزياء ج1ص27

شێخ بەو جۆرە مەنهەجەی خوێندنیان نەکرێ بە فەلسەفە دەکرێ، بۆیە پیش هەموان بۆ مامۆستای ئاینی گرنگە فەلسەفە زان بێت.

9-مادام باس لە مەرجەعیەتی قورئان دەکرێ وقورئانیش هەلگری زانیارە فرەیە نەك (ئیختساسی) ،زانیاری گەردوونی وفلسفی وکۆمەلایەتی وسیاسیو سایکۆلۆجی و...،کەواتە ئەوەی پێی بووترێ زانای ئاینی دەبێ ئەو زانست وفکرانە هەمو بزانێ ،ئینجا واقعیش پیکهاتوە لە پیادەی ئەو زانستانە کەواتە زانای ئاینی دەبێ واقعناسیش بێت،کەواتە زانای ئاینی وەك زانای ئەکادیمی نیە ئیختساسی بێت بەلکو دەبێ فرە ئیختساسی بێت .

10- ڕەنگە تاکە مەیدان بێت بۆهاریکاری وتەبایی ئاینەکان لەگەڵ یەکتر ومەدرەسە فکریە جیاکانیش، با لەسەر ئەو خالە بوەستین: کتێبە ئاسمانیە ڕاستەقینەکانی ئاینی بە تێکڕا پالپشتن بۆ یەکتر بۆیە دەبینین هەر لەسەرەتای ئیسلام ترجمەی ئەو کتێبانە کراوە، عبداللە بن سلام یەکەم کەس بوە تەوراتی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئاینی ئیسلام[1]، ئەگەر چی هەندێك سەلبیاتی بوە گوایە لەوەوە هەندی فەرمودەی ئیسرائیلیات کەوتۆتە نێو ئەدەبیاتی ئیسلامی بەڵام سودی زۆریشی هەبوە لە زانیاری و کرانەوەی زمانی دیالۆگ لە نێوانیان وزیاتر ناسینی ئاینی ڕاستەقینە.

لەسەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا هەول دراوە (لەلایەن بیریارانی ئیسلامی) زەمینەیەکی مەسیحیانە بۆ بانگەوازی ئیسلام بدۆزنەوە تا بە خێرایی کارلێك بکات[2]، هەر ئەو مەیدانە بوە (واتە فەلسەفە) وای کردوە ئەو دیندارە مسیحیانەی لە فەلسەفەیان زانیوە نەچنە پاڵ پرۆپاگندەکانی دژ بە

[1] د عبدالمنعم الحفنی- الموسوعة النقدية للفلسفة اليهودية ص31
[2] د. أليسكي جورافسكي - الإسلام والمسيحية ص59

ئیسلام، جاروایە دەیان ڕەواندەوە، لەوانە قەشە توما ئەکوینی توێژینەوەیەکی لەبارەی ئیسلام دارشت تیایدا باسی لەوە کرد کە (محمد) ڕێساو یاسای ووردی بۆ بەشەریەت بەجێ هیشتوە کە ڕێك لەگەڵ ئەقلمان بگونجێ[1]، مارتن لۆتەر (1483-1546) توێژینەوەیەکی بەناوی (خرافات الأوروبی تجاه الإسلام) بلاوکردەوە، جۆرج شحاتەی قنواتی (1905-1994) مەسیحییەو خزمەتێکی زۆری فەلسەفەی ئیسلامی کردوە..، ئەوانە لە زۆر (داعی ئیسلامی بێحیکمەت )خزمەتی ئیسلامیان زیاترکردوە ،بەکورتی زمانێکە هەمو بەشەریەت لێی هاوبەشەو لەیەکتر دەگەن، دەروازەیەکی بە هێزیشە بۆ بلاوبوونەوەی ڕاستی ئاینی، بۆیە ئاین وزانست وفەلسەفە (لەباری ستاندەر بوونیان) یەکتر بە هێز دەکەن، ئەگەر ستاندەریش نەبن زیان بەیەکتری دەگەیەنن، یەکێ لە ڕەخنە جوانەکانی فەقیهەکان وخودی ئیمام غەزالیێ لە فەیلەسوفانی ئیسلام ئەوە بوو دەیان ووت زانیاریەکانیان لە عەقلیان گەورەترە، کەواتە فەلسەفە کەسی عاقلمەندی دەوێ، عاقلمەندیش بێ فەلسەفە لە باوەش ناگیرێ، لێرەیە مانای تەواوی قورئانی (علم) و (حکمە)ڕوون دەردەکەوێ کە چەندە جیاوازن ئەوەندەش بۆیەك پێویستن، (حکمە)ی دروست-فەلسەفەی دروست دەبێتە پیشڕەوی فکری ئاینی، لەو بارەیەوە ئاینشتاین دەڵێ: زانست بێ ئاین لەنگە، ئاینیش بێ زانست کوێرە[2]، ئاینپەروەری بێفکروفلسفەو زانست ،بێ قوولبوونەوە ..ئەو فەرمودەیەی لێبەرجەستە دەبێت (لم یبقی من الاسلام الا اسم..)،نە زیکر بێفکر دەبیت نە فکریش بیزیکر دەبیت.

ڕاستە هەندێ بابەت هەن دەمەتەقێ و لێ قوڵبوونەوە لێ ی بێ ئەنجامە

---

[1]الإسلام والمسيحية ص75وص83

[2] انسان ومعجزة الحياة ص5

هەروەك سەرهەلدانی سەفسەتیەکان لە یۆنان، لـەنیو ئیسـلامیش هەنـدیێ زانایـان فەلسەفەیان وەرچەرخاندوە بۆ (علـم الکلام)کـە زیـاتر شـەڕە (ووشـەو تەلـەفزە)، هەندێکی تر بە مەنهەجیکی توێژینەوەی لۆژیکی نـەبوە وەك دەمەتـەقیێ ی نێـوان (موعتەزیلەو ئەشعەری — کـە بـە فتنـەی خلـق وەسـف دەکـرێ). بەپێچـەوانەوە فەلسەفەی ئاینی وفەلسەفەی ڕاستی فەلسەفەیەکی وشـك و بـیێ مانـا و ڕەمـەکی نیە، تاکو بیێ (هۆ ومەبەست) یەخەی (ماددە) و (گیـان) بگـرێ، یەخـەی خـەلقی قورئان بگری، یەخەی (وجود و ماهیە).. بگرێ بیێ بەرنامـە. جـون لـویس دەڵـیێ: فەلسەفەی ئیجابی ئەوەیە کەلەواقع دەکۆڵێتەوە، فەلسەفەی سـلبی ئەوەیـە کەلـە (بەهابالاکان وئـەوەی کـە بـیری لی ناکرێتـەوە) بکۆڵیـەوە[1]، لەکاتێکـدا زۆربـەی قوتابخانە فەلسفیە مادیەکان وەك (مارکسی، وجـوودی، لیبرالـی، میکـانیکی.. ) هەریەك لەوانە یەخەی بابەتێك دەگرێ کۆتایی پیێ دێت بـە پێچـەوانەی بابـەتێکی تری خۆی یان قوتابخانەکەی، واتا لەهەڵوێستێك (جا ئەو هەڵوێسـتە سیاسـی یـان ئـابوری یـان کۆمەڵایەتیـە...) قـوڵ دەبێتـەوە دەگاتـە ئـەنجامێك پێچـەوانەی هەڵوێستێکی تری، ئەوە لەباشترین دۆخیاندا ئـەگینا فەیلەسـوفە بـیێ بەرنامـەکان (واتا سەر بەهیچ قوتابخانەیەك نین) بیێ هیچ ئامانج ومەنهـەجێکی فەلسـەفی یـان زانستی سیاسی یان تەشریعی.. لەبابەتێك قووڵ دەبنەوە، سـەریان لـەو گـەرداوەی بوونەوەر دەشێویێ و هەموو ژیانیان لەسەر دادەنێن ناگەنە هـیچ ئـەنجامێك، زانـای روسی ئۆپارین 28 ساڵ خەریك بوو ژیان لەبیێ ژیان دەربێنیێ دەست بەتاڵ دەرچوو، فەیلەسوفی ئینکلیزی سپینسەر (1820-1903) بیست و هەشت بەرگی تـەنیا لەسەر "گەشەکردن" نوسیوە.

نهرۆ (لەکتێبی- لمحات فی تاریخ العالم) بە جمـال عبدالناصـر دەڵـیێ: (وامزانـی

[1] د عبدالرحمن البدوی- المثالیة الالمانیة ص201

هەموو دونیا دەگۆڕم دوای واخۆم تەواو بووم هندییشم بەتەواوی پێ نەگۆڕا)، فەلسەفەی ڕاست ودروست فەلسەفەیەکی عەبەسی نیە، بەلای بابەتی وا ناچی کە لە ئاستی عەقڵی (سنورداری ئادەمیزاد) بەدەرە، واچاکە پرسیارو بابەتە فەلسەفیەکان بە مەنهەج بێت.. بە مەنهەجیکی دروست ومومکین لە ژیانی فکری و زانستی و سیاسی وکۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی و دەروونی... وا بکۆڵێتەوە زانست وسیستەمی ژیانی لەسەر بنیات بنرێ، چۆن سروشت بە یاسای ڕاستی ودادگەری بەڕێوە دەچێ ئاواش کۆمەڵگە بە یاسای دادگەری بەڕێوە بچێت.

کاری فەلسەفی ئەوەیە پەیوەندیەکانی نێوان یاساکانی سروشت و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە ستاندەرەکانی کۆمەڵگەو سروشتی ناخی ئادەمیزاد بدۆزیتەوە، کە دەردەکەوێ ئادەمیزا وتێکڕای بوونەوەر یەك خاوەنی هەیە، هەمووی هەر ئەو دایناوە بۆیە فەلسەفەی دروست پێمان دەڵێ تەنها لە مەودا نەبێ هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان یاساکانی سروشتی فیزیایی و کیمیایی و بایلۆجی و.. یاساکانی کۆمەڵ، هەر هەمووی لەسەر یەك (ڕاستی) بنیات نراوە، ئەوە مانای ئەوە نیە تەنها فەیلەسوف وزانای ئاینی دۆزەرەوەی (ڕاستیە) وتەنها ئەوهەقی هەیە بچێتە ناو فەلسەفەو زانیاری، نەخێر ئاینی راستەقینە ئازادی بەدژەکانیش دەدا، لەلایەکی تریش زۆربەی ڕاستیە زانست وفەلسەفیەکان لەلایەن ئەفەندیان دۆزرایتەوە، مادام (راستی) دۆزیتەوە خزمەتی ئاینی کردوە جا ئەوەفیساگۆرس و ئەرستۆیە یان مۆرگان وئەنجلسە.. گرنگ نیە، مادام ڕاستیە بەشێکە لە مەنهەج، ئەگەر هەر زاناو فەیلەسوفیك بەهەر ناسنامەیەکی باوەڕی مادام (راستی-کلمة الطیبة)ی دۆزیەوە ئەوا (حجە-بەلگەیە).

(ابن عقیل) دەڵێ: (السیاسة ماکان فعلا یکون مع الناس أقرب الی الصلاح

وأبعد عن الفساد، وان لم يضعه الرسول ولا نزل به وحي..)[1]، جاروایە فەیلەسوفیك راستی دەدۆزیتەوە ئەوە (كلمة الطيبة)یە ئەوەش وەك ڕاستیەکانی تر لەگەڵ پەیام یەکتر موکوم دەکەن، سینکا لەکۆنەوە ووتویەتی: (کەس ناتوانی بە زولم دریژە بە دەسەلاتی بدا، بەڵام دەسەلاتی میان ڕەو دەوام دەکا)[2] ئەوە نزیکە لە ڕاستی (يدوم الملك مع الكفر ولا يدوم مع الظلم) بریتیە لە (كلمة الطيبة).

لەسەر ئەو بنچینە ئیبن روشد هەولی دا شریعەت وفەلسەفە یەکبخاو دەلی (ان الحكمة صاحبة الشريعة والأخت الرضيعة)[3]، فلسفەی ئاینی کار لەسەر فەترەی نێوان دەق وفکری بەشەری دەکات،زەمینە سازی عەقل دەکات بۆ بەسانایی تەفاعول لەگەل دەق بکا،بەواتایەکی تر دەرگای عەقلی دەکاتەوە بۆ شەریعەت،

ئیبن حەزمی ئەندەلوسی دەڵێ (لا خلاف فيه بين أحد من العلماء بالفلسفة ولا بين أحد من العلماء بالشريعة)[4] ئیمام غزالی و رازی و هەتا ابن تیمیەش ووتویەتی عەقڵی دروست ودەقی راستەقینە تیك ناگیرێن[5]. لەلای ئەورووپاش ئەو تەقەلایەی دراوە، باسکال هەولی دا وەك ابن رشد ئاین و زانست وفەلسەفە ئاشت بکاتەوە[6].

لەوەوە بەشێك پێیان وایە ئاینی ڕاستەقینە تاکە ڕێبازێکی کۆمەڵایەتیە

---

[1] ابن قيم الجوزية -الطرق الحكمية ص17

[2] سسبينوزا-رسالة فى اللاهوت والسياسة ص211

[3] بڕوانە: ابن رشد- فصل المقال فيما بين الحكمة والشريعةمن الإتصال ص58- هەردووکی بە دەستە خوشك وەسف کردوە

[4] ابن حزم - الفصل في الملل والأهواء والنحل - فصل في الكلام على من أنكر الشرائع من المنتمين إلى الفلسفة بزعمهم وهم أبعد الناس عن العلم بها جملة.

[5] ان الحجة العقلية الصريحة لاتناقض الحجة الشرعية الصحيحة –ابن التيمية –مجموع الفتاوى، ط2\1998م، دارالوفاء-مملكة العربية السعودية ج5 ص149 لە ئەسلدا ئەو ڕیسایە لە رازی وەرگیراوە بڕوانە: الفخر الرازى - أساس التقديس ص220

[6] دجورج حنا - قصة الإنسان ص153

کەیاساکانی لەسەر (راستی) دانراوە تەبایە لەگەڵ یاساکانی سروشت و تەبیعاتە بنچینەییەکانی ئادەمیزاد، ئەگینا هەر ئادەمیزادێکی بەزەین کەمێك سەرنج بداتە فەلسەفە دانراو و دەستور و یاسا عەلمانی ورێبازە کۆمەڵایەتیەکانی تر دەبینێ نەك هەر نەگونجاوە لەگەڵ سروشت و ڕێساکانی ئادەمیزاد، بەڵکو لەگەڵ یاساکانی سروشتیش.

هەمو ئەوانە فەلسەفەزان بۆی لێك دەکرێتەوە، بۆ ئەوەی جیهان بەرەو شادومانی و میلەتەکەمان بەرەو پیشکەوتن ورزگاری ومرۆڤایەتی بەرین، بۆ ئەوەی تاکی کوردستانی وا بنیات بنێین بەرهەمدار بیت لەو بونەوەرەو بەشیك بیت لە پرۆسەی ئاوەدانی زەوی.. فەلسەفە بخوینەوەو پەیرەوی ڕاستیەکانی بکە.

## ڕاستكردنەوەی فەلسەفی

زۆرهەڵەی فەلسەفی هەیە بەڵام لەبەر پێویستیی، تەنها دوان ڕاست دەكەینەوە كە لەگەڵ ڕەوتی توێژینەوەكە گونجاوە:

1- لەو سەردەمەی ئیستا زیاتر وا دێتە بەرچاو كەهەرچی زانیاری وشارستانی هەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە كۆنەكانی ئەوروپی و دووره ئاین، بەتایبەتی كە دەبینرێ وا ئیستا ئەوان نمونەو سەرمەشقی پیشكەوتنن وئێمەش والەدواین، بۆمێژووش دەگوترێ: هیرۆدتس- باوكی مێژوو، ئەبیكرات- باوكی پزیشكی، سیۆكریتشس –باوكی هونەر، هیركلیتس- باوكی دیالكتیك، ئیكلیدو فیساگۆرس باوكی ئەندازەو ژمارە، ستراپۆ- باوكی جوگرافیا، تالیس وبیتلیمۆس –باوكی گەردووناسی، ئەفلاتوون وئەرستۆش –باوكی كۆمەڵێك لقی زانستی تریان پێ بەخشراوە.

كەچی بە سەرنجێكی ووردتر دەردەكەوێ زۆربەی زانیاریەكانی یۆنانی كۆن سەرچاوەكانی رۆژهەلاتین، زیاتر لەوەش ئایینین، بەنمونە هەندێكی وەردەگرین:

أ- ئەسلی دیموكراسی لە عەجەم وەرگیراوە بە پێی ئەو مشت ومڕەی نێوان زانایانی فارسی كەلەلایەن (هیرۆدۆتس)ەوە لە522پ ز لە كتێبە مێژووییەكەی نەقل كراوە لەدوای ئەوەی فارس ناوچەكانی ئەوانی داگیر كردوە 7 زانای فارسی سێ جۆر حوكم باس دەكەن و لەكۆتایی دا لەسەر پیشنیاری (ئۆتانۆس شێوەی ئیزۆنومیا)هەڵدەبژێرن بەمانای (یەكسانی لەبەردەم یاسا) كە هاوشێوەی دیموكراسیە[1]، واپێدەچێ هەر ئەسلی

[1] T. Asinclair-Ahistory of Greekpolitical thought p36

دیموكراسی ئاینی بێت چونكە ئەمبادیقلس بە باوكی دیموكراسی وەسف دەكرێ، ئەویش قوتابی (ح.داود) بوە، كەواتە لیبرال دیموكراسی زادەی بیری ڕۆژئاوایە بەڵام دیموكراسی مولكی هەمو مرۆڤایەتیە

ب- ئەسلی بیرۆكەی زانستی وفەلسەفی گەردونی بی سنور ووەستاو (كون الساكن-قدم العالم) ناگەریتەوە بۆ تالیس و ئەنكسامیندەر یان بۆ ئەرستۆ وەك ئەبو حامد الغزالی دەڵێت[1]، بەڵكو بۆبتلیمۆس (مەجەستی) كە لە ئەسكەندەریە بوە[2]، لەویش لە سومەریەكان هاتوە[3]، لەویش لە مەزمورەكانی داودپێغەمبەر هاتوە[4]، زیاتر لەوە ئەگەر بەووردی سەرنج بدەیە ئنجیلی برنابا وئەو ئایەتە: (انە مكتوب هناك كیف ان سماء السموات تسعە، لأن الهنا غیر محدود، 12 فقال الكاهن :" هكذا قال سلیمان النبي یا یسوع)[5] دەردەكەوێ لە بنەچەدا بیری (نامحدود)ی گەردوونیان لە ح.سلیمان وەرگرتبێ كە لەتەورات وكتێبە كۆنەكان هاتوە، سپینوزا دەڵێ سلیمان بە حكیم ترین مرۆڤی سەر زەوی

---

[1] بە پیی پەراویزی ص15تهافت الفلسفە ئەوا ئەرستۆ بۆ یەكەم جار لە كتیبی (السماء والعالم) ووتی جیهان ئەبەدی وئەزەلیە، بەلام واپیێدەچی زۆر پێش ئەو بۆچوونە هەبووبێ، لەزەبوورو تەورات ئاماژەی وای تیدایە. ؟؟؟؟ یحي بن نحوی دەلیت یەكەم فەیلەسوف ئەرستۆ بوو ووتی ئەو جیهانە هەرهەبوەو هەر واش دەمینی . شمس الدین شهرزوری هەمان زانیاری داوە

[2] ئەسلی بتلیمۆس میسری كۆنە، كتیبەكەی (مەجەستی) هەندی جار بە (الأطروحة الكبرى) ترجمە كراوە، بەڵام زیاتر بە (ترتیب)ترجمە كراوە، یۆنانیەكەی: ماثماتیكا سینتاكسیس، پێك هاتوە لە 13 بەش.

[3] لە كتیبی (المعتقدات الدینیة لدى الشعوب ص12) واهاتوە: ولقد اعتقد السومریون حوالي ١٩٠٠ ق م أن لكل موجود كوني أو ثقافي قواعده وقوانینه الخاصة التي تجعله یستمر في الوجود إلى الأبد.

[4] لەمەزموری ژ:78 دەڵێ: (كالأرض اسسها الى الأبد)

[5] ئینجیل برنابا- فصل 95 ئایەتەكانی 11-12

وەسف کراوە[1]، فیسـاگورس قوتـابی ح.سـلیمان بـوە، مـەرج نیـە بـەو شـێوەیەی کـە (ابـدی وازلی)و (کـون السـاکن)ی لیٚ هاتـە دی ڕەنگـە (ح.سلیمان) وەسفی بەگەورەیی کردوە وا سوڕدراوە.

ج- بیری فەلسەفی چوار توخمە بنچینەیەکە (ئـاوو وهـەواوا ئاگروگـڵ) کـە تـەواوی فەلسـەفەی یۆنـانی وجیهـانی تـەنیبۆوە، زیـاتر دەدریتـە پـاڵ ئەنپادیکلیس (495-435 ق م)[2] ئەسلەکەی رۆژهەلاٚتیـە، لـە ئـاینی زەردەشتی بە ڕوونی هاتوە، هەتا نیشانەی (+) نازیایەتی کە بە ئەڵمانی پێی دەوترا (سواستکا) ئەوە نیشانەی (خاچ) نەبوو، بـەڵکوو هیمایەکـە میللەتانی پێشووی زەردەشتی ودوای مەغۆل و جـەرمانی کـۆن و هـەتا هیندی سوورەکانیش هەڵیانگرتووە[3]، گوزارش لەو چوار توخمەکە دەکـا، (مەسحەفی رەشی) ئیزیدیانیش باسی ئەو چوار توخمـە وا کـردوە: (خـوا دابەزیە قودس فەرمانی بە جوبرائیلدا کەمێك خۆل وهەواو ئـاگرو ئـاوی تیکەل کردئادەمی لیٚ دروست کرد-عەرەبیەکـەی- أمـر جبرائیـل جلب تراب من أربع زوايا الدنيا فجاء بتراب وهواء ونار وماء فخلق مـن كـل هذا آدم الأول)[4]

ح-نـاوو ناوبـانگی هرقـل(200 پ ز)لـە یۆنـان وهیرکـل بـە لاتینـی لـە ئەدەبیاتـەکانیان ،دوورنیـە یـەك لـەناودارانی ئـاینی وەك (لوقمـانی حەکیم)نەبێت مـادام ڕەچـەلەکی هەرقـەل فینیقیەواتـە لای رۆهەلاتیـە زیاتر،چونکە دەشیٚ ئەوناوانە هاتون لە قورئان لە یۆنـان جـۆرە نـاویکی

[1] سبینوزا –رسالة فی اللاهوت والسیاسة، ترجمة:د حسن حنفی، دارالطباعة-بیروت، ط1 ص145
[2] الفلسفة والفیزیاء- ج1 ص44
[3] مەوسوعەی جودی - مادە : نازی
[4] ئەنستانس ماری کەرمەلی-کتیبی پیرۆزی ئیزیدیەکان ل79 ئایەتی 17 لە مەسحەفیٚ ڕەش.

تریان هەبووبیت ،وەك چۆن یونس لەویٚ بـە (یۆنان)ناودەریت،یوسـف بـە جۆزیف ..،دەشیٚ ناوی ئیبراهیم پیغمبەر بووبێت چونکە دەلیٚ لەکۆتایدا بڕیاڕیاندا بیسوتینن [1].

خ- گوایە هەریەکە لە گالیلۆ وکۆپەرنیك ونیوتن یەکەم دۆزەرەوەی هەندیٚ یاسان ،بالەوەی نیوتن بوەستین گوایە یەکەم جار ئەو یاسای کیشی دۆزیتەوە ،کەچیکتیبەکەی (شریف ادریسی)— (نزهە المشتاف فی اختراق الافاق) بخوینەوە دەبینی بە ئاشکرای باسی کیشی (جاژبیە)ی کردوە [2] ، ئەبوبکر رازی زانیویەتی زەوی خڕەو رۆژلە زەوی گەورەترەو مانگیش لەو بچوك ترە ئەلبیرۆنی و زۆری تر پیشی گالیلۆ ووتویانە زەوی خڕەو ئەو دەسوڕیٚ نەك ئاسمان ،لە هەموان روون تر هەریەکە لە(شریف جرجانی و عبدالرحمن ئیجی))باسی سوڕانی زەویان کردوە ووتویانە سوڕانەوەکەشی بەپیچەوانەیە لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەلاتە [3].

د- بـیری فەلسـەفی (دوودژ-زوج) هـەر رۆژهەلاٚتیـە ولـە فەلسـەفەی چـینی کۆنفیشیۆسی (یان وییـنگ) وئاینیەکانی تر هاتوە.. لەگەلٚ زۆرلای تر.

بە پێی هەندی سەرچاوە تەواوی فەلسەفە سەرچاوەکەی رۆژهەلاٚتیە، ویـل دیورانـت لە پیشەکی کتێبەگەورەکەی (قصة الحضارة)بەو دەقانە دەستی پیکردوە:

("تراثنا الحديث" وفيه تاريخ الاختراع والسياسة والعلم والفلسفة والدين والأخلاق والأدب والفن في أوربا منذ تولى نابليون الحكم إلى عصرنا الحاضر، إن قصتنا تبدأ

---

[1] بۆ ئرسي سوتاندنی هەرقەل بروانة : الموسوعة العربية ج11ص479

[2] شريف ادريسى — نزهة المشتاف فى اختراق الافاق ج1 ص8

[3] الشريف الجرجانى —شرح المواقف ص405

بالشرق، لا لأن آسيا كانت مسرحاً لأقدم مدنيّة معروفة لنا فحسب، بـل كـذلك لأن تلك المدنيات كونت البطانة والأساس للثقافة اليونانية والرومانية)[1].

براتراند راسل دەڵێ فەلسەفەو زانست لەلای دەریای سپیەوە بەرەو ئەوروپا هاتوە، هەروەك تالیس وئەفلاتون وهیرۆدۆت ووتویانە زانستەکانی بیرکاری وفەلەك وئاینی لە رۆژهەلآت بۆ رۆژ ئاوا هاتوە [2]، ڕەنگە ئەو داوایەی شای بریتانی لە خەلیفەی موسولمانان بۆ وەرگرتنی هەندێ خویندکار لە زانکۆکانیان پالپشتی زیاتری ئەو بۆچوونە بن ، **دەقی نامەکەی شا جۆرج:**

لە شای ئینگلتراوە (جۆرج) بۆ خەلیفەی مووسڵمانان لە شانشینی ئەندەلوس، خاوەن شکۆ (هشامی سێ یەم)ی پایە بەرز.. دوای سڵاو و ڕێز:

گوێبیستی باڵای پلەی خوێندن و زانست و پیشەسازی بووین لای ئێوە، ویستمان بەشێك لەو ڕووناکیە بەر نەوەکانی ئێمەش بکەوێ کە تەواو بێ بەشین لە زانست و زانیاری، ئەوا خوشکە زایەکم شازادە خانم (دوبانت)م نارد بە خۆ و بە دەستەیەك لە کچە ماقولانی ئینگلترا بە دیاریەکی سادەش بۆ جەنابتان[3]، داوامانە کە بە زانست و زانیاریەوە بگەڕێنەوە لامان تا نەوەکان فێرە زانست بکەن.

خزمەتکارتان (جۆرج)

خەلیفەش وەڵامی داوە و قایل بوو و فێرە زانست بکرێن لەسەر بودجەی (بیت المال)[4]، بە پێی تویژینەوەکانی (د مستەفازەلمی)بە ئاشکرا ڕەهەندی مەزهەبی حەنەفی لە یاسای باری کەسیتی وولاتانی ئەوروپا بەدی دەکرێ(بەتایبەتی فرنسی) .

بە پێی کتێبی( فکر الشرق القدیم)یەکەم جار ئەرستۆ دانی بەوە نا کـە فەلســفەی

[1] ويل ديورانت-قصة الحضارة- ج1ص9
[2] علم الإجتماع ص141
[3] دوایی لە کتێبی تر دەرکەوت دیاریەکان زێڕ بووینە.
[4] مەوسوعەی جودی ل256

سروشـــتی لـــە تـــالیس وەرگـــیراوە ئـــەویش لەســـەدەی 6ی پ ز لـــە ڕۆژهـــەڵاتی وەریگرتوە[1]. ئیستا کـەمێکی تـر دەردەکـەوێ لـەکێی ڕۆژهـەڵات هـاتوە، جـارێ بالـەبیرمان نەچـێ نـاوی یۆنانیشـی لـە (یـونس) پێغەمبـەر هـاتووە[2]، بەرەبـەرە توێژینەوەکان وادەری دەخەن کە سەرچاوەی مدرسـەی یۆنـانی ئاینیـە. (المقدسـی) دەڵێ باپیرانی ئەفلاتون لە پیغەمبـەرانن (وأمـا الحرانيـة فـإنهم يقولـون لـن تحصـى أسماء الرسل الذين دعوا إلى الله وان مشهورهم أراني واغثا وذيمون وهرمس وسولن جد أفلاطن لأمـه)[3]-(لە کتیبی الملل والنحل شهرستانی قسـم2 ص60 )دەلیـت حرنانیەکان(بەشیکن لەسابیئە)دەلین سۆلۆن باپیرەی ئەفلاتون پیغمبـەر بـوەو ) لـە (بن شهرزوری)ئەویش هەروا دەلیت , دامەزرینەری عقلانیەت وفلسفەی یۆنانی بـۆ تالیس(631-550پ ز) دەگەڕێتەوە ،ئەویش لـە ڕۆژهـەلات بـەرەو یۆنـان چـوە ،بـــاوەڕی ئـــاینی هـــەبوە ،باشـــترین پیناســـی خـــودا ئـــەو کردوویـــەتی دوور لـــە ئەفسانە،ووتویەتی خوا ئەوە نیە کە لەشیعر باس دەکرێ وەك ئەو ئایەتـەی (لـيس كمثله شيء) ،وەك ئاین پێی وابـوە ئەسـلی هـەمو شـتیك ئـاوە ،دامەزرینـەری فیزیاو فەلەك بوە ،پیشبینی ڕۆژگیرانی کردو دەرچوو ،هەریەکە لـە ئەنباکلیـدس و فیســاگورس (581- 497 پ ز) لـــە ســـەر دەســـتی پیغەمبـــەران (ح.داود و

[1] جون کولر- الفكر الشرقي القديم - ترجمة :كامل يوسف حسين مراجعة :د. إمام عبدالفتاح إمام ص7

[2] بڕوانە: 1- ئینجیل-مت 12: 40 : (لانه كما كان يونان في بطن الحوت ثلاثة ايام وثلاث ليال هكذا يكون ابن الانسان في قلب الارض ثلاثة ايام وثلاث ليال)
2- لە تەوراتیش: سفر یونان- اصحاح (1)ئایەتی17 (واما الرب فاعدّ حوتا عظيما ليبتلع يونان. فكان يونان في جوف الحوت ثلاثة ايام وثلاث ليال).

[3] البدء والتاريخ ص150

ح.سلیمان)دەرسیان خویندووە[1]، لەوەوە ئەرستۆ ووتویەتی فەلسەفەی سروشتی لە تالیس وەرگیراوە، ئەویش لەرۆژهەلاتی وەرگرتوە[2]، بوکرات قوتابی لوقمانی حەکیم بوە[3]. ابن خلدون وای رێز کردوە: ئەرستۆ قوتابی ئەفلاتونە، ئەویش قوتابی سوکرات، ئەویش قوتابی فیساگۆرس، فیساگۆرسیش قوتابی تالیس بوە، تالیسیش لەسەروو باسمان کرد وزیاتر لەوەش ابن خلدوون دەلێ فەلسەفەی لە لوقمان وەرگرتوە[4]، کتیبی(تاریخ الحكماء —علي بن يوسف القفطي ص15)دەلیت قوتابی لوقمان بوە , لە قورئانیش ئاماژە بە لوقمان دەدا کە حیکمەت وفەلسەفەی بە پەیام بۆ هاتوە، لوقمان کتابی بۆ نەهاتوە تەنها حیکمەی بۆ هاتوە ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ..﴾ [5]. هەر لەسەر ئەو بنچینە کاتێ کێشەی وولات بەرەو دیکتاتۆری چوو لەسەر دەستی (پۆلیکراتیس) ئەوا فیساگۆرس هەلاتە ئیتالیا لەوێ کۆمەلێکی

---

[32] بروانە : شهرستانی -الملل والنحل..ق2 ص 72 لە رۆژئاوا ناوی داود بە (دیڤید) دیت وتا ئیستاش ئەوناوانە باون. لە (طبقات الأمم- الصاعدى الأندلسى) زیاتر باسی لە پەیوەندی ح.سلیمان و فیساگۆرس کردوە.

[2] جون كولر- الفكر الشرقي القديم ص7

[3] ابن خلدون-مقدمه ص480 دەقەکەی وا هاتوە: واتصل فيها سند تعليمهم على ما يزعمون من لدن لقمان الحكيم في تلميذه بقراط الدن ثم إلى تلميذه أفلاطون ثم إلى تلميذه أرسطو ثم إلى تلميذه الإسكندر الأفردوسي وتامسيطون وغيرهم).

[4] تاريخ ابن خلدون ج2 ص222دەقەکەی ئاوا هاتوە (.. ومعلمه أرسطو هذا من اليونانيين، وكان مسكنه أثينا، وكان كبير حكماء الخليقة غير منازع. أخذ الحكمة عن أفلاطون اليوناني. كان يعلم الحكمة وهو ماش تحت الرواق المظلل له من حر الشمس، فسمى تلاميذه بالمشائين، وأخذ أفلاطون عن سقراط، ويعرف بسقراط الدن بسكناه في دن من الخزف اتخذه لرهبانيته وقتله قومه أهل يونان مسموماً لما نهاهم عن عبادة الأوثان. وكان هو أخذ الحكمة عن فيثاغورس منهم. ويقال: أنّ فيثاغورس أخذ عن تاليس حكيم ملطية، وأخذ تاليس عن لقمان-.. )

[5] لقمان : 12

ئاینی پێك هێناوە[1].

زاراوەی (ئەسترۆنۆمیا)لاتینی کە تایبەتە بە گەردوون ناسی ئەسلەکەی ڕۆژهەڵاتیە ئەگەر زیاتربیپشکنین کوردیە لە (ئە ستێرە –نامە) هاتوە، (موسوعة الحضارة العالمیة) تەنجیم وئەسترۆنۆمی پێکبەستوەونزیکیشی کردوە لەکوردو وەڵی: تنجیم Astrology هو علم التنبؤ الغيبي . وقد نشأ في بلاد مابين النهرين بشمال العراق. وكان أحد فروع علم الفلك(مادة). وكان يعني بالطالع للتعرف عل أمور مستقبلية ، هەر خودی (نۆمی وەك ئۆتۆنۆمی) گوایە لە مانای لاتینی بە ئەسلی یاسا دێت هەر لەو (نامە)یە هاتوە،تەنانەت (ناموس)یش هەر ئەو ئەسلەیە کەلەقاموسی یەهودی بەمانای یاساو شریعەت هاتوە جار وایە بەتەورات دەووترێ ناموس، مانگا پەرستی لە یۆنان وئەلمانیاو تەواوی ئەسکەندیناڤیای لەهندەوە بۆیان چوە، زیاتر لەوەش زۆربەی شارستانی ویاسا کۆنەکانیش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە شۆڕشی پێغەمبەرێك هاتوە.

لە سەر ئەو بنچینەیە دەبینین شارستانی ڕۆم ویۆنان ومیسرو چین ومیزۆپۆتامیا.. بەرهەمی پێغەمبەرانن بەوشێوەیەی خوارەوە : بناغەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم هەروا لە باپیرە گەورەیان کە ناوی (روم بن عيسو بن اسحاق النبي)ە[2]، شەریعەتی حەمورابی درێژ کراوەی شریعەتی ح.ئیبراهیمە. بە پێی (پەیمانگای ئیسلامی بریتانی –زانستەکانی بەراوردی ئاینی) ئەوا حەمورابی 300 سال دوای ح.ئیبراهیم هاتوە لە 1870 پ ز، بۆیەش بەشی زۆری مادەکانی شریعەتی

---

[1] الموسوعة الفلسفية ص 353.

[2] بڕوانە : لسان العرب –ابن المنظور ج1ص1260 مادة: روم.

حەمورابی لەتەورات و ئینجیل وشریعەتی ح.ئیبراهیم وهەندێکیشی لە ئاڤیستای زەردەشتی دەچێ، هەندێکی لەگەڵ قورئانیش لێك نزیکە[1].

ڕۆژهەڵات وعەجەم وفارس لەو کاتی زانیاری وئاینیان ناردوە بۆ ڕۆژئاوا، کە دەڵێن فارس ئاگر پەرست بووینە نەك خوا پەرست واپێدەچێ وانەبێ.

(ابن مسکویه) دەڵێت: (وأفریذون أوّل من تسمّی ب « كي ». فكان يقال له: كي أفريذون، وهي كلمة تعنى التنزيه، أي: روحاني، أي: هو منزّه متصل بالروحانية. وكان جسيما وسيما حسن البهاء، مجربا عظيم القوة)[2].

زۆربەی زانیاریەکانی ئەو سەردەمەش ڕەگێکی کۆنی هەیە کە لەویشەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاینە کۆنەکان، دەقەکۆنەکانی (نصوص القديمه) ی سۆمەری وبابلی ومیسری کە لەویش بۆ ئاینی (ح.ابراهیم) وئاینەکانی ئەو سەردەم دەگەڕێتەوە، تەنانەت ئەسلی تەکنۆلۆجیاش زیاتر ڕۆژهەڵاتیە وچین یەکەم وولاتی پیشەسازی بوەو زۆرترین سەرمایەداری لیبوە، وەك ئیبن بەتووتە لە گەڕانەکانی بە دونیا بۆی دەرکەوتوە [3]..، دەگۆترێ کۆپەرنیك وگالیلۆ یەکەم جاردۆزیانەوە کە زەوی بەدەوری خۆر دەسوڕێتەوە، کەچی ئەوەش زانیاری کۆن وئاینی لە پشتە. یاقوت حموی دەلی:

---

[1] لای لە یەکچوو لە نێوان تەورات و یاساکانی حمورابی وشریعەتی ح.ئیبراهیم هەیە، هەندێکی بە نمونە لێرە تۆمار دەکەین کە لە (مەوسوعەی بریتانی)مان وەرگرتوە : یاساکانی ژ:8، 129، 195، 196... وەکو ئایەتەکانی (21- 37- خروج)، (22- 22- تپنیە)، (15- خروج)، (20- 24- لاوین)... لەگەل زۆری تر، هەر ئەو دەقەی هەردوولاش بە نمونە تۆماردەکەین : قانون حمورابی رقم129- إذا قبض على امرأة مضطجعة، مع سيد فيجب عليهم أن يوثقوهما ويلقوهما في الماء. ويمكن لزوج المرأة أن يبقي زوجته على قيد الحياة إذا رغب، كما يمكن للملك أن يخلّي حياة أمته. التوراة: وإن أخذ رجل يضاجع امرأة متزوجة فليمُت كلاهما. (تثنية 22:22)، لە ئاڤیستای زەردەشتیش سزای ژنی مێردار لە زینا هەر ئەوەیە، هەمو ئەوانە بەلگەن کە هەموی لە ڕەچەلەکدا لە پەیام هاتوون دوای بەرەبەرە دەستکاری کراون.

[2] ابن مسكوية- تجارب الامم ج1 ص18

[3] ابن بطوطة –تحفةالنظار فى غرائب الأمصار وعجائب الأسفار ج1ص283

(وقال قوم الأرض تهوي إلى ما لا نهاية لـه والسـماء ترتفـع إلى مـا لا نهايـة لـه. وقال قوم إن الذي يـرى مـن دورانـا لكواكـب إنما هـو دور الأرض لا دور الفلـك)[1]. مەقدیسی هەمان ڕاستی دەڵێ بەشێك لە زانایـان پێیـان وابـوە وادەردەکـەوێ کـە ڕۆژومانگ وئەستێرەکان بەدەوری زەوی بسـوڕێنەوە کەچـی زەویـە بـەدەوری خـۆی دەسـوڕێتەوە [2]، لەکۆنـەوە ئـەو زانیاریـە هـەبوە و واش پیدەچـی ئـاینی بیـت. (لارستارخۆس)لە270 پ.ز. تیـۆرێکی وەك کۆپـەرنیکی گەڵاڵـە کـرد[3]، تـالیس سالی بـە 365 رۆژ دانـاوەو لـە 585ی (پ ز)پیشـبینی رۆژ گیرانـی کـردوە[4]، ئاریستاگۆریس لە سەدەی (3)ی بەر لە زاین زانیویەتی کە زەوی چـەقی گـەردوون نیـەو خـۆر زۆر لـەزەوی گـەورەترە، فیسـاگۆرس ووتـی زەوی بـەدەوری ئاگریـك دەسوڕێتەوە[5]، شیشرۆن لە لارستاخۆرسـی (310-230 پ ز) وەرگرتـوە دەڵـێ ئەو پێی وابوو رۆژ ناجولێ بەڵکو زەوی بەدەوری دەسـوڕێ، ئـەلبیرۆنی لـە973 ز زانیویەتی زەوی خڕەو نیوەتیرەشی دۆزیتەوە.

هەمو ئەو ڕاو بۆچوونانە لەلایەن (یاقوت حەمەوی)نەقل کراوەو دەردەکەوێ لـەلای زاناو فەیلەسوفانی ئیسلامەوە پیش کۆپەرنیك ئەو زانیاریە گەردوونیانـە هـەبوە[6]، ابن حزم (کە لـە 456ھ مـردوە) دەڵـێ ئـەوەی پێـی ووترابـێ زانـای ئیسـلامی زانیویەتی زەوی خڕە[7]، بەپێی هەنـدێ سەرچـاوە (قـەزوینی) پـیش کۆپـەرنیکۆس

[1] یاقوت حموی –معجم البلدان ج1 ص2.
[2] المطهری بن طاهر المقدسی- البدء والتأریخ ص 78
[3] مادلر- تاریخ علم الفلك ص44
[4] فریدریك انجلس- دیالکتیك الطبیعة ص217، ص213
[5] دیالکتیك الطبیعة ص214
[6] معجم البلدان ج1ص2
[7] ابن حزم- الفصل في الملل والأهواء والنحل ج2ص78

باسی سوڕانی زەوی کردوە[1]، تەنانەت لە کتێبی پیرۆزی ئیزیدیەکان بە ڕوونی باس لە خڕی زەوی دەکا (.. ئەوودەمانە هیشتا زەوی خڕ وبێ درزبوو)[2]، لە رسالەکانی ئیخوان سەفاش دەردەکەوێ زانیویانە زەوی خڕە، هەر لەجولەو مادەو کاتدا دەبینین لە مەزموری ح.داود زۆر بە ڕوونی باسی (نسبیەتی زەمەنی)کردوە وهاتوە (.. لأن الف سنة فی عینك مثل یوم امس..)[3]... هەمو مافە مرۆییەکانی ئیستا هەرگیز لەو سنورەی ئاینی کۆنی هندوچین ومیزۆپۆتامیا وعەجەم ڕەت نادا، تەنانەت سیستەمی ژمارەی (دەیی) کە لەهەمو جیهان کاری پێدەکرێ ئەسلەکەی هندیە، با نمونە لەدەرەوەی کتێبە ئاسمانیەکان بهێنینەوە. تاغوور لەکتێبی (البیت والعالم- بە هندیەکەی: غوری بایر) کۆمەڵێك بنەمای مرۆڤایەتی دارشتوەلە دادگەری ویەکسانی لە نێوان نەژادو نەتەوەو ئاینی جیاجیاوبەندیشی کردوەبەخواپەرستی.

لە سەر ئەو بنچینە قووڵانە (ڕۆسۆ) دەڵێت یەکەم دەسەڵات وشارستانی ئاینی بوە[4]، ئاینیەکانیش زیاتر رۆژهەڵاتین چونکە دانیشتوان وشارستانی لە رۆژهەڵات بوە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە کە رۆژهەڵات عاقل تر بن لە رۆژئاوا، بەڵکو زیاتر مانای ئەوە دەدا کە یەکەم جارئادەمیزاد بەعەقڵ وشارستانیەوە لە رۆژهەڵاتەوە لە جودیەوە بەرەو رۆژئاوا ڕۆیشتون[5].

2- **فەلەسەفەی ئیسلام میسالی نیە** : مادام بابەتە فەلسفیەکەمان لە دەوروبەری ئاین دەسوڕێتەوە دەبێ ناوە ناوە هەندێ چەمکی (خوارکراو) ڕاست کەینەوە، هەندێ لە فەیلەسوفەکان بەتایبەتی مەدرەسەی مارکسیزم دنیای فکری بە ڕوانگەی خۆی بۆ دوو مەدرەسە دابەشکردوە (مادی و میسالی)، ئیسلامیشی بە

---

[1] بروانة: صورة الأرض- احمدعلامة، دارالفتی العربی للنشر ص36

[2] مەسحەفێ ڕەش – ئایەتی ژ:11.

[3] مزمور داود رقم:90 ایة (4-5).

[4] جان جاك روسو- العقد الإجتماعی- ص201.

[5] بروانە: رۆلی عەلمانی لە دروست بوونی مەینەتی کورد ل21-

میسالی داناوە (گوایە ئەوەی بڵێت روح پێش ماددەیە ئەوە میسالیە و پێچەوانەش بەپێچەوانەوە)[1]. بەڵام هەر عاقڵمەندێك تۆزێك زانیاری هەبێت دەزانێ ئەو پۆلین ووەسفەی مارکسیەت (1817- 1883) داینـاوە بۆ ماددیەت و میسالیەت تێکەڵە و لەهەردوو لاهەیە،فەیلەسوف هەیە مولحدەو بە میسالیش هەژمار دەکریت وەك کرۆتچە ، هەیە مادیە (وەك ئەوەی پێیان دەووترا مادی میکانیکی)، مارکس و ئەنجلس خۆیان دەڵێن ئەو جۆرە فەلسەفەیە مادیە بەڵام سەبارەت بە خودا میسالیە،... هەشە میسالیە وەك وجودیەکان (لەسەر قسەی ئەو) کەچی نەباوەڕیان هەیەو نەپێشیان وایە روح لەپیش مادەیە، ئینجا کەم ڕای وا هەیە بڵێت عەقڵ پێش مادەیە، تەنها ئەو فەیلەسوفانەی پێیان دەووترێ (میسالی زاتی) تاڕادەیەك ئاینی تاوی، هەروەها هەریەکە لە فیختە وجۆرج بارکلی (سەدەی 18) و بەشیك لە (عدمیەکان) دەڵێن هەرچی هەیە تەنها لە مێشکمان هەیە ئەگینا لەواقع نیە[2]،ئەوانە بە میسالی زاتی ناودەبرین، هەرچەندە شوبنهاوەر زۆر مادیە بەڵام لە (الإرادة الطبيعية) بازی داوەو دەڵێ: (الطبيعة اذن من نتاج العقل)[3]، ئەگینا هەموو کەس دەزانێ سەردەمێك زەوی و ئاسمانەکان هەبووینە، مادە هەبوە، کەچی ژیریێکی تێدا نەبووە. لە قورئانیش بە ڕوونی هاتوە: ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً﴾[4].. بە ڕوونی ئەوزنجیرە دروست بوونە لە زەبوور وتەورات وئینجیل وقورئان هاتوە.

کەواتە ئەو دابەشیەی فەلسەفی لەسەر بنچینەی (رۆح پێش مادەیە یان پێچەوانە) هیچ بەڵگە نیە بۆ دابەشی فەلسەفی.

---

[1] بۆدوستنیك وياخوت- عرض موجز للمادية اليالكتيكية ص8
[2] الفكر الشرقي القديم ص9
[3] المثالية الألمانية ص216
[4] سورة( الإنسان -اية 1).

لە ئەسلدا ئەو دابەشیە لە دوو هۆ هات:

**یەکەمیان** تاڕادەیەکی زۆر وادەخویندریتەوە کـە فەلسـەفەی ئیسـلامی بیگانەیـەو ڕەسەنایەتی لە ئەدەبیاتی ئیسلام نیەو فەیلەسـوفانی ئیسـلام لـە ژێـر کاریگـەری بووینە: ابن سینا وکندی بە ئەفلاتون، وابـن روشـد بـە ئەرسـتۆ، ئیخـوان الصـفا بەفیساگۆرس و.. بەوانە کاریگەر بووینە نەك بە ڕەهەندی فەلسەفی قورئان.

**دوەم** بەشیکی گەورە لە فقهی ئیسـلامی دانیـان بـە فەلسـەفەی ئـاینی نـەهینا و بۆشاییەکی گەورە پەیدا بوو، فەلسەفەی ئیسلامی نوینەری نەما لەبەر بـێ کەسـی کەوتە سـەر فەلسـەفەی میسـالی زیـانێکی زۆری بەرکـەوت لـەوەی کـە راسـتیە فکریەکانی ئیسلام وەك خۆی دەرنەکەوێت، بەڵام ئیستا خاوەنی فەلسەفەی خۆیەتی کۆتایی بەوداگیرکاریەی میسالی هینا بەسەر فەلسـەفەی ئـاینی، ئیسـتا دەتـوانین بلـێین فەلسـەفەی ئیسـلام فەلسـەفەیەکی سـەربەخۆیە و تیـڕوانینی خـۆی جیایـە لەهـەموو پرسـەکان وبـە قۆنـاغی تەتبیقیشـدا تـێ پـەڕیوە بۆیـە بـە میسـالی ناژمێررێت، هەرچەندە نمونەی زۆر ناشرین لە مێژووی موسوڵمان هەیە بەڵام بەهۆی ئەو مەنهەجە کۆمەڵگایەکی نمونەیی لەسەر ئەو زەویە دروست کردوە.

هەرچی مارکسیەتە بەخۆی هێشتا بەشوعیەتدا تێنەپەڕیوە، کەواتە خۆی میسـالی حیسابە، ئەوەی کێشە بوەهەندێ فەقیهی ئاینی تەواو پسپۆر نـەبوە لـە فەلسـەفە بۆیەهەم بڕیاڕی سەلبی لەسەر فەلسەفە بەکافرو زەندیق وسەر لێشێواو.. داوە، هەم بەمیسالیانەش بەناوی فەلسەفەی ئاین قسەی لێکردوە، بوویتە فاولی فەلسەفی تـا بگۆترێ فەلسەفەی ئیسلام ووشك ومیسالی وناواقعیە.

فەلسەفەی ئیسلام ئەرك وئامانجی لە هەمو مەدرەسە فەلسفیەکانی تـر ڕوون تـرە، عەبەسی نیە، بریتیـە لەدۆزینـەوەی بنچـینە گەردونیـەکانی شـەریعەتی ئیسـلام، ئەرکی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان یاسای سروشتی و پەیامی ئاینیـە، لەسـەر ئـەو بنچینەیە تـا فەلسـەفە و فیکـری ئـادەمیزاد بـەرەو پـێش بچـێت ئیسـلام زیـاتر

دەبوژێتەوە و فراوانتر دەبێت. ڕەنگە پرسیاری ئەوە بوروژێ ئەی بۆ سەردەمێك ئەو هەنگاوە لە قازانجی ئیسلام نەبوو؟ وەڵامی ئـەو پرسـیارە بـۆ بەشـەکانی داهـاتوو هەڵدەگرین، کورتە وەڵامەکەی لێرە ئەوەیـە ئەگـەرئاین پـەروەران لەسـەر سـکەی دروستی خۆی بێت، ئەوا بەرهەمە عەقلیەکانی ئادەمیزاد وەك فەلسەفە و زانسـت و تیۆرەکـانی سیاسـی و ئـابوری و کۆمەڵناسـی لەخزمـەت بڵاوبونـەوەی ئـاینی راستەقینە دەبێت، فەلسەفەی ئیسـلام (وەك فقـه ئاسـا) دەقـی پـیرۆز نیـە زادەی فکری ئادەمیزادە هەمو هەق لای ئـەو نیـە، دەشـێ هەلـەی تێکـەوێ قابیلـە بـۆ ڕەخنەو هەلسەنگاندن، جاروایە فەیلەسوفێکی مولحیـد بۆچـوونە فەلسـفیەکەی لـە بۆچوونێکی ئاینی ڕاست ترە، گرنگ ئەوەیە تـەرازووی هـەمو لایـەك (فەلسـەفەی ڕاستی) بێت، بۆیە لەسەر هەموو ئاین پـەروەر ومـرۆڤ دۆسـتێك لـە سەرتاسـەری جیهان بە هەمو ڕەنگە جیاجیاکان ومەدرەسەو ئاینە جیاجیاکـان ئەرکـە فەلسـەفە بزانێت و بڵاوی بکاتەوە.

## فرە خواوەندی وپرسە فەلسەفیە بنچینەییەکان

لەکۆنەوە ئادەمیزاد بە هەموو پۆلەکانیەوە کە سەیری ئەو هەموو شت و مـەك و زەوی و ئەسـتێرە و مـانگ و ڕۆژی کـردووە، راسـتەوخۆ پرسـیار بـە خـەیاڵی داهاتووە ئاخۆ چۆن دروست بووینە؟ کەی ؟ بۆچی؟لەبەرچی؟

ئینجا پێ دەنێتە پرسیارێکی فەلسەفی گرنگ و ترسناکتر: ئاخۆ ئـەو بونـەوەرە هەر لەخۆیەوە دروست بووە یاخود خاوەنی هەیە؟

ئەوە پرسیاری زۆرانـە بـەلام وەلام لای کەمانـە، ئەوانـە نـاونراون فەیلەسـوف، وەڵامەکانیش فەلسەفەیە.

دیارە لەکۆنەوە قوتابخانەی فەلسەفی جیاجیـا پەیـدابووە بـەپێ ی وەڵامـی ئـەو

پرسیارانە، لەمێژوودا پێغەمبەرەکان وەك چرا کاروانی فکری فەلسەفی ڕێگای کۆمەڵیان ڕووناك کردۆتەوە و هەرهەمووی یەك وەڵامیان داوەتەوە، وەڵامی ڕێك لە پێش دروست بوون تا کۆتایی و ئەولاتریش، بەپێچەوانەی هەندێك رۆژهەڵاتناس و زانایانی ئەنترۆبۆلۆجی و هەندێك مەدرەسەی فەلسەفی بە تایبەتی (مدرسەی تطوریەکان) لەوانەش :مارکسیەکان بەگشتی، دورکایم، تایلۆر، دانتی، فیۆرباغ، فریزەر.. وای بۆچووبوون گوایە ئاینی سەرەتایی (فرەخوایی) بووە، یان ئاینی بەندەو بیّ دەسەلاتان بوە، دوای بوە ئاینی دەرەبەگ، هەروەك بارون دولباخ لەکتێبی (المسيحية من غير ستار) دەڵێت: (ئاین لە دروستکراوی تاغوتەکانە)[1]، ئینجا وەرچەرخاوە بو یەك ئاینی.

لەوەش زیاتر (د جورج حنا) دەڵێ یەهودی یەکەمین ئاینە کە تاك خوایی پەیڕەو کرد[2]، لە تاك خواییەوە ئاین بوە ئاینی بەردەست بورجوازی.

د.محمد ئەرگۆنیش پێچەوانەی ڕای جورج حەنایەو دەڵێ : لە پیش ئاینی یەهودی یەکەم جار لە میزۆپۆتۆمیاوگلپەی یەکەمی شارستانیەوە بیرۆکەی یەك خوایی هاتە کایەوە[3]. بەڵام (وليام شميد) پێچەوانەی هەمویانی سەلماند و ووتی یەکەم جار یەك خوایی بووە ئینجا زۆرداری وچەوسانەوە فرە خوایی هێنا کایەوە[4]، زیاتر لەوەش واپێدەچێ پاریزگاری لە حوکمی سیۆکراسی بچوك وگەورە وای خواستبیّ فرە ئاینی دروست بووبیّ.

---

[1] روجي غارودي- ماركسية قرن عشرين ص143

[2] جورج حنا- قصة الإنسان ص75

[3] د محمد اركون- قضايافى نقد العقل الدينى ص280

[4] بروانە : أ-الاسلام والعلمانية.... ص18 ب-علم الأجتماع ص418

تیۆری فره خوای پرسه فەلسفیەکان یەکجار زۆر ئالۆزدەکا لە قازانجی فەلسەفەی مادی، ئەوانەی پێیان وایە ئایین لەسەرەتادا چەند خوایەکی زەویانەی هەبوە دوای بوە ئاسمانی ڕەنگە پالپشتیان کردبێتە سەر هەندێ بەلگەنامەی کۆن، سۆمەریەکان پێیان وابوە خوای زەوی ناوی (ئەنکی) بوە و خوای ئاسمانیش (ئانۆ) بوە[1]، هەروەك لە ئاینی کۆنی عەجەم شێوەیەك لەوە هاتوە:

(بعد النزاع والصلح بین الیزدان (الإله)والأهرمن إتفقا علی أن یکون العالم السفلی خالصاً لأهرمن لمدة 7000ألاف السنة)[2]، ئالێرە بیرۆکەی (خوا لەئاسمانە لە زەوی نیە )دێت کەلەدوای باسی دەکەین ، لە کتێبی ئیزیدیەکان (مەسحەفی ڕەش وجلێوە) ئاوا باسی سەرهەلدانی فره خوایی دەکا:

ثم خلق ستة آلهة من ذاته ومن نوره وخلقتهم صارت كما إذا أوقد انسان سراجا من سراج آخر :فقال الإله الأول للثاني أنا خلقت السماء فقط اصعد أنت إلأی السماء واخلق شيئا فصعد وصار شمسا وقال للآخر فصعد وصار قمرا والرابع خلق الفلك والخامس صار نجم الصبح والسادس خلق الفراغ يعني الجو تم الكتاب

کوردیەکەی-.. دواتر 6 خواوەندی لە زاتی خۆی دروست کرد یەکەم ئاسمان دوەم رۆژ سێیەم مانگ.. چوارەم خولگەی دروستکرد، پینجەم ئەستیرەی بەیانیان، شەشەم ئەتمۆسفیر[3]، زیاتر بیرۆکەی فره خوایی لەو بیره چەوتەش دێت کە گوایە هەمو ئیشەکانی بوونەوەرو سروشت خوابەخۆی وبەدەستی خۆی دەیکا وەك سەرۆکیك هەردەم لە ڕێنمایی وسەرقاله بە ئەستیرەو مانگ وگرکان وباران وشەرو ئاسمانەکان وزەوی ..بیمەجال و ماندوو بێت ،بۆیە یارمەتیدەرو خوای تری بۆخۆی دروست کردوە ....

---

[1] بڕوانە: قاموس الخرافات والأساطیر ص44-45

[2] الملل والنحل.. ص197.

[3] کەرمەلی- ه س ل83، ئایەتەکانی32-33)مەسحەفێ ڕەش.

بــه پێــی نوســینه‌كانی (ئه‌ســتافاخیس)كه ابــن خلــدوون لێــی وه‌رگرتــوه ئــه‌وا سه‌رده‌مێك هه‌مو جیهان به 7 هه‌رێم دابه‌ش كرابوو هه‌ر هه‌رێمه‌ی هه‌ساره‌یه‌كی به خوای خۆی دانابوو وده‌یپه‌رست[1]. به پێی بڕوای (تایفه‌ی ئیســماعیلیه) ئاسمانــه‌كان ژماره‌یان (10)یه، ئاسمانی هه‌ره سه‌روو پێغه‌مبه‌ر (محمد) به‌رپرسه لێــی، ئاسمــانی نۆیه‌م (ئیمامی علی) ودوای حسن وحسین وعلی زین العابدین، محمد الباقر، جعفــر الصادق، اسماعیل بن جعفر الصادق، ئاسمانی هه‌ره نزیكی زه‌ویش (ح.فاطمــة) لێــی به‌رپرسه.

فارابی وئیبن سیناوماموٚستای یه‌كه‌م ئه‌رستۆ وزۆری تر هاوشێوه‌ی ئه‌و ده‌قانــه‌ی (مه‌سحه‌فیٚ ڕه‌ش) باسی دروست بوونی گه‌ردوون ده‌كه‌ن نه‌ك خوای جیاجیا، ده‌ڵێن: عه‌قڵی یه‌كه‌م (هۆكاری یه‌كه‌م)خوایه وعه‌قڵی دوه‌م هۆكاری دوه‌مــی لیٚ ده‌رده‌چــیٚ وفه‌له‌كی یه‌كه‌م له بوونه‌وه‌ر دروست بــوو.. به‌وشــێوه‌یه تاده‌گاتــه عــه‌قڵی یــازده‌م وهه‌مو خولگه‌وفه‌له‌كه‌كانی مانگ وڕۆژو زوحه‌ل موشته‌ری.. لیٚ ده‌رده‌چیٚ به‌وشێوه ئه‌ستێره‌كانیش، له‌هه‌ره خوارووش (له خوارووی مانگ) جیهان له 4 ماده‌كه (ئــاو گل ئاگر هه‌وا) دروست ده‌بیت[2]، ده‌بیٚ كامیان یه‌كه‌م سه‌رچــاوه‌بووبێت چــونكه لــه كتێبــی ئیزیــدیان باســی چــوار توخمه‌كــه‌ش ده‌كــاو لــه‌پیش ئــه‌وانیش له‌لایــه‌ن زه‌رده‌شتیه‌كان، پێده‌چی ئه‌وانه كاریان له‌فه‌لسه‌فه‌ی یۆنان كردبیت كه پێیــان وابــوو پێكهاته‌ی ئاسمان وزه‌وی لیك جیایه.

ئه‌و جۆره لیك جیاكردنه‌وه‌یه بوه هۆی په‌یدا بــوونی فــره خــوایی وكه‌وتــه نێــو زۆربه‌ی ئاینه‌كان له‌دوای پێغه‌مبه‌ره‌كان، خوای مرۆڤ (ئه‌و خوایه‌ی مرۆڤی لــه قــوڕ دروست كرد له چــین نــاوی تــۆنگ وانــگ كــۆنگ)ه، خــوای زه‌وی وخــوای ئاسمــان

[1] تاريخ ابن خلدون ج2ص223 مه‌رج نیه ئه‌و زانیاریه‌ی ئه‌رستافاخیس به موتله‌قی ڕاست بووبیٚ.

[2] فارابی –كتاب اراءاهل المدينة الفاضلة ص61. هه‌روه‌ها بڕوانه: موسوعة الفلسفة ج2 ص104-106 هه‌روه‌ها:اريخ الفكر الفلسفي في الاسلام ص149-152

(سەفارۆگ خوای ئاسمان بوو لەناو سلاڤیەکان)، خوای خۆر (بالدر خـوای خـۆرە لـە ئاینی ئەسکندیناڤیەکان) و مانگو (سەن خوای مـانگ بـوە لەسـۆمەری)[1] وخـوای ئـاوو خـوای شـەو وخـوای رۆژ وخـوای بروسـك و (زیـۆس خـوای بروسـکە لەمیسریەکان)باوبارانن خوای نەخۆشی وکارەسات (رەشاڤ خوای نەخۆشـی بـوو لـە کریت)، ئەو فرە خواییانەو لیك جیاکردنەوەی ئەرکیان بوە هۆی لیك جیاکردنـەوەی چەمکە پێکوەنوساوەکانی تری وەك: دین ودنیا، لاهوت وناسوت[2]،، عەقلٚ ونەقل، زاناو دەسەلاتدار، شریعەت ودەسـتور، پیـاوی ئـاینی ورەشـۆکی، تادەگاتـە ئـاین وئاینپـەروەران و یاسـا، سـیکولاریزم لـەولیك جیاکردنەوانـە هـات، لـە مێـژووی ئەوروپاو هەتا لە ناو جیهانی ئیسلامیش کـاری خـۆی کـردوە، لەسـالی 1737ز بەرجەستە بوو لە رێکەوتنێکی دەگمەن لە ناوجەرگەی ئاین لە نێوان زانـای ئـاینی (محمد بن عبدالوهاب) لەگەلٚ (محمد بن سعود)کە ئاین بـۆ یەکـەم ودەسـەلاتیش بـۆ دوەم[3]، ویچووی رێکەوتنی مۆسۆلینی (سەرۆکی بزوتنەوەی فاشی ئیتالیا) وپاپـای سالٚی 1929 بۆ دابەشی دەسەلاٚتی ئاینی ودونیایی بەو شیوەیە: مرۆڤ لەبوونیـەوە تامردن بۆ مۆسۆلینی بیت لە دوای مردنیش بۆ پاپا بیت هەتا قیامەت[4]!!

ئێستاش هەیە دەلٚێت (قیم السماویە) یان (ادیـان السـماویە) لەبەرامبەریشـدا دەلٚێن (قوانین الأرض).

هەندێ ئایەتی ئینجیل زیاتر ئەو لیك حیاکردنەوانە پتـەو دەکـا: (أيحـل لنـا أن ندفع الجزية الى قيصر أم لا ؟... قالوا: للقيصر ! فقال لهم: ادفعوا إذن، الى القيصر

[1] قاموس الخرافيات والأساطير ص140، ص134،

[2] - معجم الفلسفی الشامل... مادة: ناسوت ص 867، اللاهوت: عالم الغيب، آخرة، والناسوت عالم الشهادة أي الدنيا .

[3] د. صالح العابد –حركة الأستقلال العربى، رسالة الماجستر –جامعة المستنصرية، بغداد1988 ص12-13

[4] بڕوانە :مەوسوعەی جودی-دانەر مادە:عەلمانی

ما للقيصر والى الله ما لله[1]، (مملكتي ليست في هذه الدنيا)[2]، ((سمعتم انه قيل: عين بعين وسن بسن، أما أنا فأقول لكم: لا تقاوموا من يسيئ إليكم. من لطمك عن خدك الأيمن فحول له الآخر، ومن أراد أن يخاصمك ليأخذ ثوبك، فاترك له رداءك أيضاً))[3]، (فلا تهتموا للغد. لأن الغد يهتم بما لنفسه. يكفي اليوم شره..)[4]. لەوەشەوە ئایین درایە پاڵ چینی چەوسێنەر، لەفقهی ئیسلامیش ئەو دۆخە بەدی دەکرێ **اذا كان الحاكم عادلافله الأجر وعليك الشكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر**)[5]، ( ونقل عبد الكريم الخطيب قول الحسن البصري: **]ألا لا تسبوا الولاة فإنهم ان أحسنوا فلهم الأجر وعليكم الشكر، و ان أساؤوا فعليهم الوزر وعليكم الصبر، وإنما هم نقمة ينتقم الله بهم ممن يشاء فلا تستقبلوا نقمة)** ، لە هەموان ڕوون تر قدیس ئۆکستین لە کتێبی (ملكوت الله) دەڵێ (بۆیە خوا عەبدایەتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[6]. قەشە لاس کاسیس (1474-1566) فتوای دا کە دەکرێ ئەمریکیەکان لە جیاتی هندیە سورەکان کۆیلە لە ئەفریقا ببەن بۆ ئەمریکاو لەوەوە ڤۆلتیر زۆر بە توندی ڕەدی دایەوە[7]،

---

[1] - إنجيل متى22 ط4 1992، اتحاد جمعيات كتاب المقدس.

[2] -جان جاك روسو-فى العقد الأجتماعى –ترجمة:زوقان قرقوط، دار القلم –بيروت ص208 (ونقله لكتاب المذكوربصيغة: وطن المسيحى ليس في هذا الدنيا).

[3] - متى 5 (39 – 41) الكتاب المقدس العهد الجديد-

[4] كتاب المقدس-العهد الجديد مت (34:6)

[5] د محمد شحرور–الكتاب والقران ص101ص620

[6] ماركسية قرن عشرين ص146

[7] دعبدالسلام الترمانينى – (الرق، حاضره ومستقبله) ص207-208

لەوەوە (ئاین تلیاکی گەلان- الدين افيون الشعوب) لەلای مارکس هات[1]، لە پیش ئەویش بارون دولباخ ووتبوی ئاین هونەری سڕ کردنی میلەتانە تا هەست بە چەوسانەوە نەکەن[2].

ئەو لیك جیاکردناوانە هەڵەیە، لەیەکەم تا دوا پێغەمبەر یەك وەڵامی هەبوە وباسی یەك خواشی کردوە،.. هەرچی مەدرەسەی تری مێژووین ئەوان هەر لەناوەخۆش ڕای جیایان هەبووە، لەمەدەرەسی یۆنانی ئەفلاتون پێ ی وابوو (ئەو بونەوەرە خاوەنداره) کەچی (هیرکلیت)نکولی لەوە دەکرد،.. لە ناو یەك مدرەسەی وەك وجودی هەریەکە لە: **جان بول سارتر** (1905 – 1980) و مارتن هیدجر (1889 – 1976) و سیمون دی بوفوار (1908 – 1986) **بێ باوەڕ کەچی** کیرکیجورد (1813 – 1855) کارل یاسبرز (1883 – 1969) و جبریل مارسیل (1889 – 1973) باوەڕداری مسیحین...، ئینجا زانایانی زانستیش.

هەروەها هەموو ئەو مەدرەسانە دەتوانین بەکورتی و پوختەی ڕاکانیان بەو سێ وەڵامە سەرەکیە دابەشی بکەین:

خودا دروست کەرەو هەمو ئیشێك لەو بوونەوەرە لەدەست خواو بە قودرەت و ئیرادەی ئەو دیتە دی.

---

[1]. دەقی ووتەکەی مارکس لە کتیبی (نحو نقد لفلسفة الحق الهيجلية- 1844م) وانوسراوة: إن الهم الديني هو في الوقت نفسه تعبير عن هم واقعي واحتجاج علي هم واقعي. إن الدين هو آهة الخليقة المضطهدة، هو قلب عالم لا قلب له، مثلما هو روح وضع بلا روح. إنه أفيون الشعب- ئینکلیزیەکەی :

: (Religion is the sigh of the oppressed creature, the heart of a heartless world, and the soul of soulless conditions. It is the opium of the people) Marx, K. 1976. Introduction to A Contribution to the Critique of Hegel's Philosophy of Right. Collected Works, v. 3. New York.

[2] روجيه غارودی –ماركسية قرن عشرين ت:نزيه الحكيم ص143

بەشی دوەم دەڵێن دروست کەرە بەڵام پەیوەندی پیوە نەماوە.

بەشی سییەم دەڵێن ئەو بونەوەرە خاوەنی نیە ئەوەی هەیە ماددەیە.

ئەنجلس دەڵێت دەتوانین لە بونەوەر تیَ بگەین بەبیَ پەنا بردن بۆ غەیب دوا تەقەلای ستیڤن هوکینگ لە (Grand Design) دوبارەی کردۆتەوە، بەو شێوەیە هەر مەدرەسەیەك بەجۆریَ، هەیە دەڵێت ئەو بوونەوەرە و ژیانی سەر زەوی بە (رِێکەوت) هاتووە، هەیە دەڵێت هەر بوە و هەر دەمینێت، ئەو جەدەلە مێژووییە ئێستا خەریکە لە سایەی زانستی نویَ یەکلادەبێتەوە، ئێستا مەدرەسەی مارکسیزم کە نوێنەرایەتی بەرەی مادی دەکات کە باوەریان وایە (مادە فراوانترین مەفهومە)[1] هەروەك دەڵێن هەرهەبوەو هەر دەشمێنیَ، وەسفی مادە بە (نەمر)دەکەن.[2].

راوبۆچوونەکانی روو بە رووی زانستی نویَ بۆوە، دەرکەوت (اللامادی) یش شان بەشانی مادە دەور دەگێریَ لەو بوونەوەرە، لینین (1870- 1924) خۆشی گومانی هەبوو لەوەی عەقڵی ئادەمیزاد پرۆسەیەکی مادی رووت بێت، وتی ئەوەی بڵێت تەنها مادەیە دیارە هۆشی نیە[3]. ئینجا فیزیای نویَ کە پێشرەو بوو لە بۆچوونی مادی ئێستاش هەر پێشرەوایەتی (اللامادی) دەکات وەك لە کتێبی (جذور المصادفة) هاتوە ئەو دونیایە (مادی و لامادی) وەك یەك لێی بەشدارن، ئیستا زانستی نویَ سەلماندی کە ئەو گەردونە تەمەنی هەیە و کۆتایی وسنوریشی هەیە، ئینجا دۆزرایەوە هەموو بونەوەر لەژێر یەك فەرمانی ناوەندی بەرێوەدەچێت و هەر هەمووی بەرێکوپێکی بەپێچەوانەی راو بۆچوونەکانی فەلسەفەی مادی (مارکسیزم بە تایبەتی)کە پیَ ی وابوو ناکۆکن. تۆماس ئەکوینی وولیام بالی وسیر

---

[1] عرض موجز للمادیةدیالکتیکیة ص32

[2] ف انجلس- دیالکتیك الطبیعة ص87

[3] عرض موجز للمادیة الیالکتیکیة ص63

جیمس (1877-1946) جهانیان بە مەکینەیەکی گەورە وەسف کرد.. (نیوتن) پێش هەموان لەو سەردەمەدا وتی هەموو پارچەکانی بوونەوەر وەك سەعاتێکی قورمێشکراو بەڕێوە دەچێت، بەڵام لەوە بەهەڵەداچوو کە وتی گەردون سنوری نیە، ئێستاش دەسکەوتەکانی زانستی بەپێچەوانەی مارکسیزم کە وای داناوە لەقازانجی فەلسەفەی ئەوان بێت، بەڵکو هەر یاسایەك دۆزرابێتەوە زیاتر پاڵپشت بۆ ئەو باوەڕە دروست دەکات کە ئەو بونەوەرە بێ خاوەن و بەرێکەوت بەڕێوە ناچێت، زۆرتر نزیك بۆتەوە لەو دەنگ و باس و وەسفانەی کەلە پەیامی ئاینی بەتایبەتی لەقورئان هاتووە..ئادەمیزادی ئێستا جیاوازی زۆرە لەگەڵ پێش 50 ساڵ، زانایان دەتوانین بڵێین بەشی هەرە زۆری بڕواداره ئەگەر چی وەك پێویستیش ڕێبازەکەیان هەموو نەدۆزیتەوە، بەڵام ئەوەی مسۆگەرە پرسیارە فەلسفیەکان گۆڕاون، پرسیاری بنچینەیی ئیستای فەلسەفی لەبارەی میسالی ومادی نیە، هەروەك پیشوو تر مادیەکان بانگیشەیان بۆ دەکرد، ئەنجلس تیکرای کێشە فەلسفیەکانی کۆن ونوێی کۆکردۆتەوەو دەڵێت پرسی پەیوەندی نێوان فکر و بوون، رووح و سروشت،.. گەورەترین پرسی تەواوی فەلسەفەیە[1]، ئاینی ومادی لێرەوە ڕووبەڕووی یەك دەبنەوە، تاڕادەیەکیش فیزیاویەکان پالپشتیان دەکردن ودەیان ووت: (هەمو کێشە فەلسفیەکان لە نێوان مادی ومیسالیە بە جۆریکی وا هیچ لایەکیان نێوبژی قەبول ناکەن)[2]. دوای ئەوەی ئاین بەخۆی هاتە مەیدانی فەلسەفی ململانیی ئیستا لە نێوان مادی ومیسالی نیە کەوتۆتە نێوان مادی وئاین، پرسیارەکانیش وەرچەرخاوە بۆ ئەو پرسیارانە:

ئایا ئەو بوونەوەرە بە (ترتیب) وەك ژمارە وا ڕێك خراوە یان پرۆسەی گەشە ئەو ئەنجامە جۆر بەجۆرەی داوە؟ واتە (سلم الترتیبە) یان (سلم التطور) ؟

---

[1] مارکس-انجلس -مختارات ط انکلیزی ص430-431).

[2] الفلسفة والفیزیاءج1ص61

ئەوبوونەوەرە لە خۆوە پەیدا بوە یان خاوەنی هەیە وا بەووردی بەڕێوە دەچێ؟
لە هەموشیان گرنگ تر پرسی کێ بونەوەری دروست کردوە؟
کە لەبڕگەی داهاتوو باسی دەکەین.

## بونەوەر[1] چۆن وکێ دروستی کردوە؟

لە بڕگەی سەروو کەمێك ئەوپرسیارەی (بوونـەوەر دروسـتکەری هەیـە یـان لـە خۆوە دروست بوە) ساغ بۆوە، ئیسـتا پـێ دەنێینـە قۆنـاغێکی تـر لـە پرسـیاری فەلسەفی گرنگ، بەشێك لەفەلسەفەی کۆن وایان زانی کە بوونەوەر بەرجەستەیەکی خواییە وشانۆی کارەکانی بوە لە پیش بوون ولەدوارۆژ، بۆیە پێیان وابـوو بوونـەوەر هەر هەبوەو هەردەمینی، سۆمەریەکان پێیان وابوە ئـەو بوونـەوەرە گـەورە بەیـەك خوا دروست نەکراوە، ئانکی زەوی دروست کردوەو ئانۆش ئاسمانی دروست کردوە[2].

بە پێی باوەڕی کۆنی ژاپۆنی ئەوالەوجیهانە تاریکایی بـوو، هـیچ نـەبوو تـەنها هیلکەیەکی زۆر چڕی سپی بچوك هەبوو، دوای مادە ڕەق وقوڕسەکانی ئەو هیلکـە زەوی لێ دروست بوو هەرچی شلەومادەسوکەکانە بەرزبوونەوەو ئاسمانی لێ دروست بوو، *لەئاینی کۆنی عەجەم جیهانی باڵا وجیهانی دونیا لیك جیـا کرایتـەوە کـاری هەریەکە بە خوایەك سپێردرایە، دونیا بۆ ئەهریمەن وئاسمانیش بۆ خودا[3].*

بابلی ومیسری کۆنیش ووردتر پییان وابو لەزەویش ئاودروست کەری گەردوونە، لەشەپۆلی ئاو وشکایی ولەهەلمی ئاسمان دروست بوە، لە یۆنانیش تـالیس (سـەدەی

---

[1] مەبەست لە بونەوەر چەمکێکی فراوان ترە لە گەردوون هەموو دروستکراوێك دەگرێتەوە کە بەر هەستی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەکەوێ، بەلام لە چەمکی (شت) فراوان تر نیە.
[2] بڕوانە: قاموس الخرافات والأساطير ص44-45
[3] الملل والنحل.. ص197.

6ی پ ز) پێی وابوو یەکەم جار ئاو ئاسمانی دروست کردوە[1]، لەوەشەوە ڕەنگی داوەتەوە سەر کتێبەکانی ئینجیل وتەورات وهەندی مەزهەبی ئیسلامیش، بەشە ئاینیەکەش (بە سوڕدراوی) ڕای باوی وابوو کە یەکەم جار زەوی هەبوە ئینجا ئاسمان دروست بوە، پێیان وابوە یەکەم جار دەریا دروست بوە لە دەریاوە ئاسمان ورۆژو مانگ وئەستیرە دروست بووینە.

**لە** (تاریخ الطبري)یش وا هاتوە: قال إن الله عز وجل كان عرشه على الماء ولم يخلق شيئا مما خلق قبل الماء فلما أراد أن يخلق الخلق أخرج من الماء دخانا فارتفع فوق الماء فسما عليه فسماه السماء ثم أيبس الماء فجعلة أرضا[2].

له (تەورات)یش کە دەڵێ (في البدء خلق الله السموات والأرض، وكانت الأرض خربة وخالية.. )[3].

له ئەسلدا ئەو ڕایەی کە دەڵێ هەمو شتیك لەئاوە بۆ (تالیس)دەگەڕێتەوە میسریەکان وزۆربەی ئاینیەکانیش ئەو باوەڕەیان هەبوە،، شیشرۆن رەدی تالیس دەداتەوە کەووتویەتی ئاو سەرچاوەی هەمو بوونیکە خواش ئەو ئەقلەبێ کە لە ئاو هەمو شتیکی دروست کردبێ، واپێدەچێ ئەوبیرۆکەی ئاو ئەسل بووبێ سەردەمیك هەمو جیهانی گرتبیتەوە چونکە لە تەواوی ئەفریقاش باوەڕ وابوو کە ئاوو تاریکی وخوا هەبوو پیش بوونەوەر.

هەرچی ئەناکسیمینسە ووتی هەموو شتیك لە هەوا هاتوە، هرکلیت (510-480 پ. ز) ووتی نەخیر هەمو شتیك لە ئاگرە، فیساگۆرس ووتی ژمارە ڕەچەلەکی هەمو شتیکە، بلۆتارك ووتی روح وهەواش هەر یەك شتن.

---

[1] المعتقدات الدينية لدى الشعوب ص12

[2] تاريخ الطبرى ج1ص20

[3] الكتاب المقدس-عهدالقديم –سفرالتكوين ئايەتەكانى (1 و2).

ئەنیکسیماندریس ووتی ئەسلی مرۆڤیش لە ماسی هاتوە دوای کەوتۆتە ووشکاییی[1]، لەدوای هەموو شتیکیان گەڕاندەوە بۆ 4 توخم (ئاوو هەوا ئاگر گل)ئەوە زۆر حوکمی کرد[2].

لە کتێبی پیرۆزی ئیزیدیەکان دەڵێ یەکەم ئادەمیزاد لەو چوار توخمە دروست بوە، هەر لەسەریەکەم دروست کراو ئەو کتێبە پێی وایە یەکەم جار (ملکە تاوس بەناوی عیزرائیل) دروست کراوە ئەو کاتی تەنها زەریا هەبوو خواش لەسەر ئەو زەریایە بوە، دوای دروست کردنی 6 خوا بۆ یارمەتی کارەکانی ئینجا زەوی وئاسمانی دروست کرد[3]. هەرلە کتێبی ئیزیدیەکان (مەسحەفی ڕەش وجلێوە) ئەو بوونەوەرە بە 6 خوا دروست کرا[4].

فارابی وئیبن سیناوماموستای یەکەم ئەرستۆ وزۆری تر هاوشێوەی ئەو دەقانەی (مەسحەفێ ڕەش) باسی دروست بوونی گەردوون دەکەن (نەك خوای جیاجیا)، دەڵێن: عەقڵی یەکەم (هۆکاری یەکەم)خوایە وعەقڵی دوەم هۆکاری دوەمی لێ دەردەچێ وفەلەکی یەکەم لە بوونەوەر دروست بوو.. بەوشێوەیە تادەگاتە عەقڵی یازدەم وهەمو خولگەوفەلەکەکانی مانگ ورۆژو زوحەل موشتەری.. لێ دەردەچێ، لەهەرە خوارووش (لە خوارووی مانگ) جیهان لە 4 مادەکە (ئاو گل ئاگر هەوا) دروست دەبیت[5].

---

[1] ف انجلس- ديالكتيك الطبيعة ص212-213

[2] ابو الحسن الجرجانى (1340-1413م)-التعريفات ص90 مادة:العنصر (الأرض، الماء، النار، الهواء)الأصل الذى تتألف منه الأجسام المختلفةالطباع. لافوازيا يةكةم كيميازان بوو كة سةلماندى هةوا توخم نية ،بةلكو تيكةليكة لة توخم .

[3] بروانە (جلیوە- کتیبی یەکەم بڕگەی یەکەم) بۆ زانیاریەکانی تر : مەسحەفی رەش - ئایەتەکانی (28-30).

[4] کەرمەلی- ە س ل83، ئایەتەکانی32-33)مەسحەفێ ڕەش.

[5] فارابی –کتاب اراءاهل المدينة الفاضلة ص61. هەروەها بڕوانە: موسوعة الفلسفة ج2 ص104-106 هەروەها:اريخ الفكر الفلسفي في الاسلام ص149-152

ئەرستۆ دەڵێ ڕەچەلەکی هەمو بوونەوەر بۆ مادە دەگەڕێتەوە، گاسندی ووتی مادە نابێ و لەناویش ناچێ بەڵام دەگۆڕێ، سپینوزا وزۆری تر بەدوای داهاتن[1].

لە فەلسەفەی چاخی ناوەڕاست یەکەم جار ئەمانویل کانت لە بنەچەی گەردوونی کۆلیەوە ئینجا لاپلاس ودوای شۆڕشە گەردوونیەکە (کۆپەرنیك، کیپلەر، گالیلۆ، جۆردانو) دەست پێ دەکا، تایلەر لەکتێبی (عندما دقت الساعە صفراً) دەڵێ بوونەوەر بە بێ خودا لەهیچەوە دروست بوو، فرید هویل دەلی پەیدابوون لە نەبوونەوە لە مەجەرەکان بەردەوامە بی خودا.

ڕای پێچەوانەش زۆرە نیوتن جارێکی تر لە ڕای (ئەتۆمیەکانی کۆن) نزیك دەبێتەوە ولەسالی 1704دەنوسێ: واپێدەچێ خوا یەکەم جار مادەی لە شیوەی خوردەی زۆر ڕەق دروست کردبێ کە بشێ بۆ گەشەو جولە وئامانجەکانی بهێنیتە دی[2]، بە کۆی گشتی کتێبی (الله بین الفلسفة والمسیحیة) بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی ئاخۆ بونەوەر چۆن وکێ دروستی کردوە؟ عەقڵی بەشەری کردۆتە 5 بەشی سەرەکی

1-مادیەکان دەڵێن بوونەوەر بە ڕێکەوت بە بێ خودا دروست بوە.

2-عەقلانیەکان دەڵێن دروست کەرە بەڵام نازانین چیە.

3-یەك بوون، دەڵێن بوونەوەر وخودا یەك گەوهەرن.

4- خوا دروستی کردوەو جیاشە لەگەڵ ئەو جیهانەو ئەو رۆلی دینامیك بۆ بوونەوەر دەبینی.

5-ئەوانەن کە باوەڕدارن، دەڵێن خوا دروستی کردوە...

بۆ ئەوەی وەڵامی ئاڵۆزترین پرسیار بدەینەوە کە هەم فەلسەفە و هەم زانستی و هەم مێژوو پێویستی بە لێ کۆڵینەوە لە چەند پرسێکی تر هەیە کە کلیلی ئەو بابەتەن، چونکە لە پێش ئەو پرسیارە گەوەرەیە پرسیاری تر هەیە، ئاخۆ ئەو

[1] الفیزیاء والفلسفة ج1ص47
[2] الفلسفة والفیزیاء ص42

گەردونە هەر لەخۆیە دروست بوە، وەك بەرەی فەلسـەفەی (تەتەوریـەکان) وای بـۆ دەچن دەڵێن هەموو ئەو شت و مەکە جیاجیایانەی لەو گەردونە دەبینی وەك دار و بەرد و شاخ و ئاو و هـەوا و ڕۆژ و ئەسـتێرە، ئـەوە بەرهـەمی جوڵانـەوەی دوور و درێژی بێ پایانی ماددەن، هەر چەندە ئەو بۆچوونە شکستی هێنا لە ڕووی زانسـتی لەگەڵ سەرهەلدانی (bing bang theory) دۆزرایـەوە ئـەو گەردونـە ئەبـەدی و ئەزەلی نیە تاجێی تیۆری گەشەی تێـدا ببێتـەوە. بـەڵام پێویسـتە ئێمـە لـەڕووی فەلسەفیشەوە هەلی سەنگێنین، بۆیە پێویسـتیمان بـەو بابەتانـە دەبێـت تـاڕوونی کەینـەوە ئـەو مـاددە (بـێ ئیرادەیـە) گەشـەناکات لەخۆیـەوە بـۆ دروسـتکردنی جۆرەکـانی تـری مـاددە ئەگـەر ڕێنمـایی پـێ نـەدرێ یـان خـۆی بەرنامەکـەی هەلنەگرتبێ. بۆ ئـەو مەبەسـتەش بـزانین مـاددە لـەخۆوە دەجولێـت بـەبێ هـیچ عاملێکی دەرەکی، لێـرەدا پێویسـتیمان بەدیراسـەتی (دەوری عـاملی دەرەکـی و ناوەکی ویاساکانی دەبیت). ئینجا پێویسـتیمان بـەوە دەبێـت ئـاخۆ ئـەو مادەیـە گەشەدەکات و پەرەدەسێنێ لەجۆرێك بۆ جۆرێکی تر، لەبەرد بۆ ئاسـن ئینجـا بـۆ یۆرانیۆم ئینجا بـۆ سـێو و پرتـەقال و باڵنـدە و ئـادەمیزاد یـاخود جوڵانەوەکـەی سوڕانەوەیە ناپەڕێتەوە لەجۆرێك بۆ جۆرێکی تر.

لێرەشەوە پێویستیمان بە دیراسەت کردنی بابەتێکی فەلسەفی تر دەبێت بـەناوی (جوڵانەوەی مادە یان گەشەسەندن)، ئینجا لەپاش ئەوانە دێینە سەر ڕێـك وپێکـی ئەو گەردونە کە نیشانی ڕێبەرێکی مەزنە و دێینە سەر فەلسـەفەی ئـاین لـەبارەی (هاوسەنگی لەو بونەوەرەدا) ئینجا دێینە سەر دروست بوونی بونەوەر ومەبەست لە ئادەمیزاد....

بەڵام لەپێش هەموو ئەوانە بزانین ئاخۆ سەرچاوەی جوڵانەوەی مادە لەکوێ دێت دیارە هەر هەمووی زۆر بە کورتی لەسەری دەدوێین.

# جولانی مادەو تەرتیب:

جولان ئەوکاتە ڕوودەدا کەکاریگەریەکانی دەرەکی بە هێز تر بێت لەئارامی تەنەکە، کاریگەریەکان پێی دەووترێ (هۆکار) وئەوگۆڕانکاریانەی بەسەریشی دێت پێی دەوترێ (ئەنجام)، مەبەست لەجولانی مادە هەموو ئە و جولانە دەگرێتەوە کەبەسەر شت و مەك دادێت لە ناوەکی ودەرەکیدا، ئەوەشە دەبێتە هۆی کارلێك کردنەکانی لەگەڵ دەوروبەریدا، لە فەلسەفەپۆلین کردنی جۆرەکانی جولان لەگەڵ زانست تا رادەیەك لیك جیایە، ئەنجلس لە (دیالکتیك الطبیعةص282)بە سەردیری (اشکال الحرکە المادە)دەستی پێ کردوە گوزارشی لە ڕای سەرجەم مادیەکان کردوە - زیاتر لقەکانی زانستی پێ پۆلین کردوە دوای کردویە بە (5) جۆرە جولانەوە:

1-میکانیکی ئەویش سی بەشە : کیش، سوڕان، فشار.

2- فیزیایە ئەویش دوو بەشە.

3-کیمیایی وسەرووی کیمیایی.

4- جولانی ئۆرگانیکی.

5-جولانی مێژوویی بەهەردوو دیوی سروشتی وژیاری[1].

بە هەمان سەردێر لە (مادیە الدیالکتیکیە)[2] بۆ 7 بەشی دابەش کردوە، لە (فلسفة الطبیعة) ی شلنگ هەمو سیستەمی جولانەوەی بۆ سێ پۆل دابەش کردوە:

1-جولانەوەی چەندایەتی

2-جولانەوەی چۆنایەتی

---

[1] ف انجلز- دیالکتیك الطبیعة ص290

[2]دوو کتیبی بە ناوی (مادیە الدیالکتیك) هەیە یەکیان بەناوی (عرض موجز للمادیة الدیالکتیکیة —بۆدوستنیك یاخوت) ئەوەی تر تەنها (المادیە الدیالکتیکیە)کۆمەڵێك زانای سۆڤیەتین.

3-جولاّنەوەی نسبی کەبە هۆکاری دەرەکی کاردەکا[1].

هەرچی جرجانیە (1340-1413م)کە گوزارشی لە ڕای فەیلەسوفانی ئیسلامی (توسی، شیرازی، ابن رشد، ابن سینا،... )کردوەوبۆ8 پۆلی دابەشی کردوە، کەبریتین لە: (کم وکیف والوضع والعرضیة والذاتیة والقسریة والإرادیة والطبیعیة)[2].

لەلایەن ئیخوان سەفاش جۆرەکانی جولاّنەوە بریتین لە (کون-فساد-زیادة-نقصان-تغیر-نقلة)[3]، صدرالدین شیرازی وابن روشد وەك یەك باسیان کردوە.

ئەوەی لە ڕووی زانستی وفەلسەفی نیمچە ڕێکەوتنیکیان لەسەر هەیە هەتا ئێستا ئەو (6) جۆرە جولاّنەوە لەناو مادە هەیە:

1-جولاّنی سادە-میکانیکی یان (جیٚ گواستنەوە).

2- جولاّنی چەندایەتی (وەك زیادبوون و کەمبوون).

3- جولاّنی سروشتی (کە زیاترفیزیایی و کیمیایی) دەگرێتەوە.

4- جولاّنی ژیانداری کە ئەویش سەرەڕای ئەو جولاّنانەی پێشوو جولاّنی بایلۆجی و فسیۆلۆجی دەگرێتەوە.

5- جولاّنی کۆمەلاّیەتی دێت.

6- جولاّنی فکری کە بەرزترین پلەی جولاّنە لە بونەوەری مادیدا.

ئەگەر زۆر بە ووردی و کورتی لە هەر سیستەمە جولاّنەوەکە وورد بینەوە دەبینین:

1-ئەو فاکتەرانەی دەبنە هۆکاری گۆڕان خۆشیان دەگۆڕێن.

---

[1] المثالي الألمانية ص230

[2] ابو الحسن الجرجانی- التعریفات ص51

[3] رسائل اخوان الصفاء –الحدودوالرسوم-ص178

2-ئارستەی گۆڕانەکەیان لە دەرەوە بۆ ناوەوەیە، بە جۆرێك لە سەرەتای جولانیان زۆر پێویستیان بە فاکتەری دەرەکیە، بەرەبەرە فاکتەری ناوەکی گرنگیەکە لە فاکتەری دەرەکی دەسێنێتەوە.

3- تا فاکتەری ناوەوە رۆلی زیاد بکا خیرایی گەشەی زیاد دەکا، لەوەوە سیفەتی (اطرادی) بۆ سیستەمی گەشەکردن دروست دەبێ.

4- لەهەمو بارەکانی جولانەوە وەرچەرخانی گرنگی (لە خالی 2)فاکتەری دەرەکی وناوەکی پایەی (پێویست) لەدەست نادەن.

لەو چوار رێسایەی سەروو دەتوانین (سلم الترتیب)یك بۆ مادە سروشتیەکان دیاری بکەین لەشیوەی خشتەکەکەی مەندەلیف: لە 6 جۆرە جولانەوەکە فاکتەری دەرەکی لەسەر یەکەم جۆر گەلێ زۆرەو ناوەکی کەمە، جۆری دوەم لەجولانی ناوەکیەکە کەمێك زیاد دەبێت ودەرەکیەکە کەم دەبێ، بەو شێوەیە تا دەگاتەشەشەم جۆر. بەهەمان شێوە ئەو جارە لەهەریەکە لە ناو خودی جۆرەکانیش ئەوە بەدی دەکرێ، بەپێی (سلم الترتیب) وپایەی لەجولانەوەی دوەم تا شەشەم (فکری) یەکەیەکە بەو قۆناغانە تێدەپەڕن، واتە هەریەکە لەسەرەتای جولانیان پێویستیان بە فاکتەری دەرەکی زیاترە لەگەلّ کاتدا ڕاستەوانە پێویستی بە فاکتەری ناوەکی زیاد دەکا، نزیکە لەبڕگەی یەکەمی (یاسای دوەمی نیوتن)کەواهاتوە: (إذا أثرت قوة أو مجموعة قوى على جسم ما فإنها تكسبه تسارعاً، يتناسب مع محصلة القوى المؤثرة)[1]، لەگەلّ ئەو بڕگەیە ناگونجێ کە دەلّێ (يتناسب مع محصلة القوى المؤثرة) چونکە ئەوە تایبەتە بە جۆری یەکەمی جولانەوەی (میکانیکی) و فاکتەری دەرەکی.

---

[1] ئەو یاسایانە لە کتیبی(الفلسفة الطبيعية ومبادىء رياظيات )هەیە .

ئەو ڕێسایانە وادەکا ئەو (سلم الترتیب)ە بنکەو هەرەمێکیش دروست بکا، خانەی هەر شتیك بە چەندین ئاڕستە دیاری بکرێ، ئاڕستەی: سەروو وخواروو، خیراو هیواش، کاریگەری فاکتەری دەرەکی وناوەکی،... ئینجا وادەکاپۆلینێك بۆ جۆرەکانی جولانەوەو هەرتوخمیك کەسەر بەو سیستەمە جولانەوە بیت هەندێ سیفەتی گشتی بۆ دیاری بکەین، وەك: تەمەنیان، خۆ ڕاگریان، ڕادەی بلاوبونەوەیان، گرنگیان لە (سلم الترتیب)ی سروشت، ئینجا پیوانی خیرایی گەشەکردنی...، ئەوە هەرەمیکی سروشتیمان بۆ دروست دەکا مەرج نیە هەرەمە کۆمەلایەتیەك دروست بکا رەنگدانەوەی هەرەمی سروشتی بێت ،یان وەك هەرەمی ماسلۆ بێت بۆ پیویستیەکان ، لەماسلۆ بنکەکەی لە پیویستە چڕەکان هاتوە،لەبنکەکە مرۆڤ پیویستی بە ئۆکسجن وخواردن وخواردنەوەو ئینجا سەرووتر ژیانی جنسی کۆمەلایەتی و..لەهەرە سەروو (خود)، ئاوانیە ،جاروایە عەقیدە دەکەوێتە سەرووی خودیش کەلە کارە خۆتەقاندنەوەکان بەدی دەکرێ لەو سەردەمە، ماسلۆ پەیوەندیەکی تری سازانی لەبەرچاو نەگرتوە کە تامرۆڤ پیویستی بەمادەیەك زیاتر بێت لەسروشت زیاتر هەیە ،ئۆکسجنی لە خولەك پیویستە لە هەوا هەیە بیئەزیەت ،ئاوی لە کاتژمێر پیویستە بوونی زۆرە بەلام تەقەلایەکی دەویت،تا دەگاتە کەمالیەکان زیاتر تەقەلای دەوێ وکەمترە ، سیەکان بۆ ئۆکسجن وئاو بۆ کلیە وخواردن بۆ گەدەو جنس بۆ (دەزگای خۆی) زمان بۆ ئال وگۆڕ و عەقل بۆ گشتی ..ئەوانەش ڕەنگدانەوەی تەرتیب و هەرەمێکن ،یان ئەو تەرتیبە هەرەمی پیویستی وکەمالی دروست دەکا بەشیکی ترە لە ئالۆزی ئەو باسە ،بەجێی دێلین بۆ زیاتر تویژینەوە.

کەواتە پەیوەندیەکی ڕاستەوانە لە نێوان خیرایی گەشەو ئینتمای ئەو توخمە لەسیستەمی جولانەوەکە هەیە، بەپێچەوانەکردنی زۆر بە ئاسانی تەمەنی ئەو بوونەوەرەو یەکەیەکە ناوەرۆکی ئەو بونەوەرەمان بۆ دەردەکەوێ بە حیسابێکی

سادە، ئەویش تەنها بە دیاری کردنی ئینتمای بۆ سیستەم (پۆل)ی جولآنەوەکەو خێرایی گەشەی یان دیاری کردنی خانەکەی لە (سلم الترتیب)، بۆدۆزینەوەی وقەبلآندنی تەمەن نمونەی کۆمەڵگە وەرگرین:دەبینین لە سەرەتای کۆمەڵگە کاریگەری فاکتەری دەرەکی وسروشتی یەکجار زۆربووە، بەرە بەرە لەگەڵ گەشەی کۆمەڵگە ئەم ڕۆلە کەم دەبێتەوە ڕۆلی ناوەکی زیادی کردوە.

دەتوانین بلێین لەسەرەتا مرۆڤ لە ژێر ئینتدابی سروشت بوە بەلآم ئیستا تاڕادەیەکی چاك كۆنترۆلی سروشت کراوە، ڕادەی ئەو کۆنترۆلە بریتیە لە تەمەنی کۆمەڵگە، لەوەشەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەوانەی تەنها وەبەر جولەی میکانیکی دەکەون تەمەنیان لە هەموان زیاترە وەلەهەموشیان بەبەرگە ترو فراوانتریشە، ئەو تەن وشتومەکانەی کەمتر هۆکاری ناوەکی لێ بەکارە ئەوە بەرگەوتەمەنی دریژترەو (ترتیب)دروست دەکا بۆتەمەن بۆ گەشە بۆ پێویستی وکەمالی بۆزۆر لای تری.

لەوەوە کەمێك ڕایە فەلسفیەکانی یۆنانی وفارابی وئیبن سینا کە دەیان ووت گەشەو تیك چوون بۆ ئاسمان نیە تەنها بۆ دنیایە، تاڕادەیەك وایە بەلآم بە شێوەی زەمین وئاسمان نا، بەڵكو لەچوارچیوەی (سلم الترتیب)ی جولآنەوەکان، هەروەك چۆن زۆربەی پیکهاتەی بوونەوەر لە سادە ترین توخم پیك هاتوە کە هایدرۆجینە ئاواش زۆربەی پانتایی جولآنەوە لە سادەترین جولآنەوە پیك هاتوە کەبریتیە لە جولآنەوەی میکانیکی، سەرەڕای ئەوەش هەرجۆرە جولآنەوەیەکی سەرووتر جولآنەوەی خوارووتری تیدایە، واتە جولآنەوەی کۆمەلآیەتی رەهەندەکانی جولآنەوەی میکانیکی وکیمیایی وبایۆلۆجی تیدایە، واتە هەر جولآنەوەیەکی سەروو دەتوانی شیتەلی کەیتەوە بۆ جولآنەوەی هەرە خوار کە میکانیکیە.

بەلآم ئەو ڕێسایەی پیشوو پێچەوانەی ڕاست نیە وەك لەوەوە (مادیەی میکانیکی)بە هەلەدا چوو کە ووتی ئەو بوونەوەرە هەموی جولەی میکانیکیە،

لەوسەردەمەش ستیفن هۆکینـك لێـی بەهەڵەداچـوو کـەدەڵێ دەتـوانین یاسـاکانی بایۆلۆجیا دابەزێنینە خواروو تر بۆسیستەمی کیمیاوفیزیاو.. [1].

واتە جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی یان فکری بەتەنها لەمیکانیکی پیك نایەت، بەڵام ئەوە راستە کە یەکەم جوڵانـەوە کـە میکانیکیـە بڵاوترینیانـەوە خـۆ ڕاگـر تـرە، تەنانەت ئەوانەی تەنها لە ژێر ئەو جوڵانەوەن (تیك چوون) وتەمەنیان زۆر دریژ ترە لەو جۆرە تەنانەی دەکەونە ژێر کاریگەری جوڵانـەوەی دوەم کـە فیزیـایی وئـاواش زیاتر بۆ سییەم و.. تا دەگاتە دوا جوڵانەوە (شەشەم جوڵانـەوە –فکری)لەهـەموان ناسك ترە (بۆیە خراوەتە ناو کەلە سەر) وتەمـەنی کـەم تـرە.. دیسـان لایـەنیکی (ترتیب)بۆ بونەوەر دروست دەکا. ئینجا زۆربەی جولـە خولگەییـەکان ئاسمـانین لـە کتێبی (اهل المدینة الفاضلة) باس لە تەواوی خولگەی ئاسمانی دەکا دەڵێ بازنەییـە کـە تـەواوترین خولگەیـە[2] بۆیـە وایزانیـوە ئاسمـان تیـك ناچـێ، کەچـی ئیسـتا هەمولایەك دەزانن بەلای کەم لە ئاسمانیش شان بەشانی جولەی میکانیکی جولـەی فیزیایی وکیمیایی وناوکی هەیە، ئینجا دەرکەوت خولگەکان بازنەیی نیـە وەك لـە یاسای دوەمی کیپلەرهاتوە:

(تدور الكواكب حول الشمس بحركـة ليسـت دائريـة ولكـن في قطـع نـاقص تحتـل الشمس إحدى بؤرتيـه)[3]. بۆیە تیـك چـوونی ئاسمـان (ئەسـتیرەو هەسـارەو مـانگ ونیـازك و.. )بەرێوەیـە، ئەسـتیرەکانیش تووشـی مـردن و (سـۆپەر نۆفـا)دەبن (ئەستیرەی رەش وسپی دروست دەکا. هەر لەو رێساو (سـلم الترتیـب)ەی لەسـەری دروستمان کرد، کۆمەڵێك دەمەتەقێی فەلسەفی کۆتایی پێ دەهینـی، دەردەکـەوێ هەردوولای مادی ومیسالی بەهەڵەداچووینە کـە یەکـەمیان ووتویـەتی بـۆ جـوڵان

---

[1] فیزیاء العقل البشری والعالم من منظورین ص191

[2] فارابی – اراء اهل المدینة الفاضلة ص20 وص63

[3] هەر3 یاسا لە کتیبەکەی (کیپلەر-التوافق الکونی ) هەیە .

فاکتەری ناوەکی گرنگە، فەلسەفەی میسالی ومادیەی میکانیکیش بەهەلەداچـوو و ووتی هەمو جولانیك هەر میکانیکیە، ووتیشیان تەنها فاکتــەری دەرەکـی رۆلی هەیە نەك ناوەکی، لەوەوە شـوبنهاوەریش لای گـرتن کەچـی نەفاکتــەری دەرەکـی بەتەنها نە ناوەکیش بەتەنها ئەو ڕۆلەی هەیە.

با نیۆبژیەك بکەین لەسەرەتا ڕای میســالیەکان ڕاســتە کــە فاکتــەری دەرەکـی گرنگە، بەلام دوای فاکتەری ناوەکی گرنگ دەبێ بـۆ جولەوگەشـە ئـەو کـاتی ڕای مادیــەکان ڕاســت دەردەچــێ، بــەلام ڕای هــیچ لایــەکیان تــا ســەری ڕاســت نیــە، راستیەکەی ئەوەیە فاکتەری دەرەکی وناوەکی تا ســەری لەیــەك ئاســتی کاریگــەر نامیننەوە وەك لەسەروو باسمان کرد.

لێرەدا پرســیارەکەی تــوینبی (کــە دەڵــێ: چــەندە گەشــەی کۆمەڵگــە لــە ژێــر کاریگەری یاسای سروشتیە؟)[1] هەلوەستەی دەوێ، ڕاســتیەکەی ئــەو وەلامــە نیــە کەخودی توینبی دایتیەوە، بەڵکو وەلامی ڕاست ئەوەیــە لەســەرەتای ســەرهەلدانی کۆمەڵگە زۆر لە ژێر کاریگەری یاسای سروشت بــوو تــا ڕادەی مســەیەری، بــەلام دوای بەرە بەرە واسەربەخۆیی خۆی وەردەگرێ ئەویش کار لە سروشت دەکــاو ســود لەو یاسایانە دەبینی کە پیشتر هەنــدێ لای ئــەو یاســایانە وەك (بــڕەڕ) وابــوو بــۆ کۆمەڵگە، واتە بەرەبەرە کۆمەڵگە لەژێر یاســای سروشــتی وەردەچــەرخێ بــۆ ژێــر یاسای کۆمەلایەتی، هەر لێرەوەش هەڵەی هەرەگەورەی فەیلەسوفانی ســەدەی 18 و فەرەنسیەکان دەردەکەوێ کــە ووتیــان مــرۆڤ بریتیــە لــە زادەی ژینگەگــەی وەك بلیخانۆف لێی کۆکردنەوەو ووتی (الإنسـان بكـل ارائـە هـو نتـاج لبیئتـە)[2]، واتــە جولەی کۆمەڵگە بەهۆی ژینگەو فاکتــەری دەرەکــی دەجــولێ، چــەوتیەکە لێرەیــە

[1] توینبی منهج التاریخ وفلسفة التاریخ ص83
[2] جورج بلیخانوف- تطور النظرة الواحدية الى التاریخ –ت: محمدمصطفى ص14.

جولەی کۆمەڵگەیان (کە لە پۆلی پێنجەمە) بەهەمان جولەی میکانیکی چواندوە (کە لە پۆلی یەکەمە).

لە چوارچێوەی هەمان هەڵە با لەو دەرفەتە تەسکە فۆرماتی رێسایەکی تری گرنگی راڤەی جوڵانەوە بکەین کە لە ئەرستۆوە دیاری کراوە تا فەیلەسوفانی ئیسلامی و وەك جرجانی کۆی کردوویتەوە ودەڵێ جوڵانەوە (الحركە) بریتیە لە: الخروج من القوه الى الفعل[1] فەیلەسوفە ئیسلامیەکانی ئیستاش پێی کاریگەرن، ماناکەشی ئەوەیە دەرچوون لە هیزەوە بۆ کار، لە ئیمکانیەتەوە بۆ واقیع.

روون تر بڵێین مەبەستیان لەوەیە دەکرێ بلیین هیلکە ئیستا هیلکەیە بەلاّم بە ئیمکانیەت بە (هێز) جوجکەیە، کەواتە جولەی هێلکە بریتیە لە وەدی هینانی هیز بۆ واقیع (جوجکە).

ئەو ریسایە هەلەی تیدایە لە (تەعمیم)، هەمو جوڵانەوەیەکی ناگریتەوە، واتە پیناسی هەمو جوڵانەوەیەك نیە، ئەوە تەنها پیناس وریسای ئەو جۆرە جوڵانەوانەیە کە ڤاکتەری ناوەکی بگۆرێت، واتە جولە کیمیایی وبایۆلۆجی وکۆمەلاّیەتی وفکری دەگریتەوە بەلاّم جوڵانەوەی میکانیکی ناگریتەوە، واتە پۆلە جوڵانەوەکانی سەرەتایی ناگریتەوە، کاتێ هیزیکی دەرەکی کاردەکاتە سەر تەنیکی رەق ودەیجولینی ودەیگوازیتەوە لە شوینیکەوە بۆ شوینیکی تر ئەوا مانای (الخروج من القوه الى الفعل) ناگەیەنێ.. لەهەمو ئەو هەلاّنە رەچاوی (سلم الترتيب)ەکەی نەکراوە.

لەو تەرتیبە بونەوەریە پەیوەندیەکی گرنگی نێوان مادی ونامادیمان بۆ دەردەکەوی، ئەویش بریتیە لەوەی کە بوونەوەر بە پیی ئەو (سلم الترتيب)ەپیك هاتوە لە مادی ونامادی بە جۆریك لە هەرە خوارەوە لای مادی زیاتر لێ زالە تا

[1] ابو الحسن الجرجانی - التعريفات ص51

بەرەو سەروو بچیت لای مادی کەم دەبیت ولای نامادی زیاتر دەبێ، بەو شیوەیە زنجیرەی (جماد ونبات و حیوان وانسان) ڕیز دەبن و هەم هاوسەنگ وهەم دیزاینی بوونەوەر پێك دەهینن، لە هەموشیان دەردەکەوێ کە ئەو (سلم الترتیب)ە یاسا پیك دەهێنی هەم یاساش بوە ئەو (ترتیب)ەی پیك هیناوە، یاسا پەیوەندیەکانی مادە ڕێك دەخا بەجۆرێك تا لە سەرەتا نزیك بینەوە لە جولەی میکانیکی و سروشتی ئەوە یاساکان هاوکێشەی بیرکاری ڕوون وسانا وەردەگرن —مادام مسەیەرن، بەڵام تا لە جولەی کۆمەڵایەتی وعەقڵی نزیك بینەوە توانای گوزارشی یاساکان بەشیوەی بیرکاریانە زەحمەت تر دەبێ — مادام ئیختیار لەبەردەمی زیاد دەبێ، واتە تا ڕێژەی بەشداری مادی زیاتر بێت ئەوا یاساکان ئاسان تر دەکەونە نیو هاوکێشەی بیرکاری تا زیاتر بەرەو ڕوحی بچیت ئەوا دۆزینەوەی هاوکێشەی بیرکاری بۆ یاساکان زەحمەت تر دەبێ[1]، ئەودابەشیە لە ئەنجامی ئەو (سلم الترتیب)ەی لە نێوان دابەشی مادی وروحی دروست دەبێ، کەواتە مادەی جولاو یەك رەهەندی مادی نیە، مانای (مادەو یاسا)دەگریتەوە کە مانای مادی ونامادی دەبەخشێ وەك لە دوای باسی دەکەین.

## سەرچاوەی جوڵە:

هەر لێرەشەوە دەتوانین گەورەترین پرسیاری فەلسەفی جولان کە بریتیە لە (سەرچاوەی جولان) چارەسەر بکەین، جولانی مادە ئەوەندەمشتومڕی فەلسەفی

---

[1] وەك تیبینی وا دەردەکەوێ یاساکانی سروشتی بەهاوکێشەبیرکاری ڕەگ ولۆگاریتم وکەرت و ژمارەی زەحمەت گوزارش دەکرێن کەم تر بە ژمارەی سروشتی دەردەبڕێ.. ئەوەیان پەیوەستە بەسیستەمی ژمارەی ئیمە کە (دەییە-عشریە)، ڕەنگە لە سیستەمیکی تری (چلی بە نمونە)ئاوا نەبێ.

لەسەر نیە تەنیا ئەوەیە لە فەلسەفەی مارکسی دان بە جولانەوەی فکری (عەقڵی)ناهینن دەڵێن : عەقڵ ڕەنگدانەوەی واقیعەکە لەدوای باسی دەکەین.

ڕەهەندی ئاینی لەوکێشە لەسەر وەڵامی ئەو پرسیارە بنەڕەتیە هەیە ئاخۆ سەرچاوەی ئەو جولانە لەکوێوە دێت، بەبەرنامەو ئامادەکراو وهەماهەنگە لەلایەن دروستکەر؟ یان ئەوە مادەوسروشتە و دوور لە هەماهەنگی بە خۆی ڕێبازێکی بۆ خۆی دروست کردوە؟

جا هەر مەدرەسەیەك بەبۆچونی خۆی وەڵام دەداتەوە.. هەیە دان بەجولان هەر نانێت (فەلسەفەی ستاتیکی پێی وایە بوونەوەر مەییوە)، هەیە دەڵێت جولان لە تێکچوونی هاوسەنگی دێت، هەیە دەڵێ بە هۆی فاکتەری دەرەکی و هەیە دەڵێ بە ناوەکی ویان هەردووکیان، هەیە دەڵێ هەر مادە خۆی جولەی چڕکراوە یان دەڵێن بارستەی مادە بریتیە لەجولەی قورمێشکراو. لەهەموان بەهێزتر کە جێی سەرنجەوپێچەوانەی (بنەمای هەماهەنگ) لەبەرەی مادیدا مەدرەسەی مارکسی-هیگلی کە دەڵێت ناکۆکیەکانی ناوەوەی مادە جولان بەرهەم دەهێنێ، دەڵێن لەهەموو شتێك لەناوەوەی دوو لایەنی ناکۆکی تێدایە و ناکۆکی نێوان ئەو دوو لایەنە دەبێتە سەرکەوتنی لایەکیان و ئینجا ناکۆکێکی تری لێ پەیدا دەبێت وياسای دوەمی دیالکتیکی لێ بەرجەستە بوە[1].

پەیوەندی نێوان ئەو دوو لایەنە پەیوەندییێکی دیالیکتیکیە، کە بەهۆی دوو پەیوەندی دەبەسترێنەوە یەکیان ئەو دوو لایەنە مەرجن بۆمانی یەکتر، دووەمیان

[1] بۆ ئەومەبەستە بڕوانە:
1-جورج بۆليتزر -اصول فلسفة الماركسية-درس الخامس ج1ص83-
2-انجلس-ديالكتيك الطبيعة ص244-
3-مادية الدیالكتيكية —قانون رقم 3 (قانون وحدة وصراع الإضداد)..

کارلێك دەكەن[1]، بەو شێوەیە (مادە) و (دیالیكتیك) لەیەك جیانابنـەوە و جـوڵانی لێ بەردەوام دەبێـت،، سێ یاسای دیالكتیكیش لەسەر بنیاتكرا:

1ـ قانون وحدة وصراع المتناقضات

2ـ قانون نفي النفي.

3ـ قانون التحول من تغيرات الكمية الي تغيرات الكيفية[2].

لەسەر ئەو بنچینەیە لەهەمو بوارەكان ناكۆكی دۆزراینەوە بۆ سروشت —ژیان — فكر —مێژوو، بۆ هەمو لقەكانی زانستیش : لـە سروشـت : (بڵنـد نـزم)، (گـەورە بچـووك)ن، (خێـرا هێـواش)... لـە بیركـاری : (+، -)، (تـەواوكاری داتاشـراو)، (لۆگاریتم و ئیكسپۆنینشال)... لە فیزیا : كارو كاردانەوە... لە كیمیـا : مـادە و مادەی دژ، یەكگرتن وهەلوەشانەوە.. لە بایۆلۆجیا:مردن وژین، نوێبونەوەو فـەنا.. لە ئابوری: ململانێی هێزی بەرهەم وپەیوەندی بەهەم هێنان لە كۆمەڵگەو مێـژوو: مل ملانێ ی چینایەتی [3]. لەگیاندار:ململانێ بۆ مانەوە[4].

بەڵام هەموو ئەو بۆچونە ناتوانێ ئەسلی جیاواز لەنێوان شتەكان لێـك بداتـەوە، باشە لەسەرەتا كە مادە یەك شت بووە (متجـانس) بـوو لایـەن لایـەن نـەبوە وەك زانست وئاین (لێك نزیكن) كەدەڵێن سەرەتای گەردوون هەمووی هایـدرۆجین بـووە چۆن جوڵان پەیدا بوە، ئینجا نمونەیەك لەو گەردوونە پان و بەرینـە لـە (شـانەیەكی ژیان) هەتا مەجەرەیەكی ملیۆن ئەستێرەیی نیە ئەو دوو مەرجەی تێدا بسازێت.

---

[1] لەهەموان ڕوون تر (ماوتسی تۆنگ) لە كتیبە بچووكەكەی بەناوی (فی التناقض) لە ڕەوتی ڕاڤەكەی بەخال باسی ئەو دوو مەرجەی كردوە.

[2] بروانە: أ- انجلس — ديالكتيك الطبيعة ص78 ب- بودوستنيك وياخوت- عرض موجز للمادية الديالكتيكية ص89-112

[3] بڕوانە : ماركس- انجلس بيان الحزب الشيوعي، دار التقدم- موسكوص65 لەوێ كۆمەڵگەی سەرەتایی لێ پەڕێنراوە چونكە گوایە چینایەتی نەبوە.

[4] تشارلس داروین- اصل الأنواع- مكتبة النهضة بغداد ص190-

با نمونەكەی ماوتسی تۆنگ وەرگرین كەدەڵێ : (بلا حیاة لا موت، وبلا موت لا حیاة، بلا بورجوازیة لا برولیتاریا، وبدون برولیتاریا لا بورجوازیة)[1] كەچی ژیان بەبێ مردن هەیە بورجوازیش بێ پرۆلیتاریا هەیەئەگەر بەو مەرجە دیالكتیكیە بوایە ئەوامردن وژین وەك یەك دەبوو ئەو هەمو كۆمەڵگەیە دروست نەدەبوو، ئەگەر مردنی شانە وژینی بەو پەیوەندیە دیالكتیكیە بوایە ئەوا گەشەی جەستەیی هیچ گیانداریك دروست نەدەبوو.. بەهەمان شێوە، كاردانەوە مەرج نیە بۆ كار، بلندمەرج نیە بۆ نزم، كۆمەڵگە مەرج نیە بۆ مانی سروشت، داتاشراو بێ تەواوكاری هەیە، (+) بێ (-) دەبیت...، ئەوەی زۆر جێی سەرنجەلە (ئوسولی فەلسەفەی ماركسی)دەڵێ (+، -) جولینەری بیركارین كەچی ئەنجلس ئەو ئەسلەی لەوەلامی (دوهرینگ) لەبیردەچێ ودەڵێ: بیركاری لە پێویستی بەشەری هاتە كایەوە[2].

لەدوای هەمو ئەوانە پرسیارێكی تریش هەیە مادیەی دیالیكتیك هیچ وەلامی بوی نیە، با بلێین ئەو دوو لایەنە هەن و ناكۆكن لەناو یەك شتدا. ئەگەر ناكۆكن دەبێت بوونیان جۆرە سەربەخۆییەكی هەبێت و ئەو دوو لایەنە هەریەكە جووڵەیەكی هەبێت ئاخۆ جولەی ئەوانە لەكوێ هاتووە؟

واتە وەلامی پرسیاری یەكەمی پێنەدرایەوە ئاخۆ ئەو شتە ئەسلی جولەكەی لە كوێ وەیە. كەواتە لەدوای ئەو هەلسەنگاندن وتێڕوانینە جیاجیایانە سەبارەت بە ماكینەو سەرچاوەی جووڵە چیە؟

ئاین بە گشتی وئاینی ئیسلام بە تایبەتی باوەڕیان بەوە هەیە كە مادە دەجولێت، فەلسەفەی ماركسی وهەندێ تەیاری تر ئەو تومەتە بە ئاین دەكەن دەڵێن ئاین بە ستاتیكیانە (وەستاو) تەماشای بوونەوەر دەكەن، نصرالدین توسی و

---

[1] ماوتسی تونك-مؤلفات مختارة-حول التناقظ-ج1ص398
[2] ف انجلس- انتی دوهرینك ص50

ابن روشد لەکتێبی (فی جوهر الأجرام السماویة) ی هەموی باسی جولەی زەوی وئاسمانەکانە، کەسی ئاینی نەیوتوە دنیا وەستاوەو بێ جولەیە، هەتا ئەوەی کە لەبەر هەست و لەپێش چاوان مەییو و وەستاو دیارە دەجولێ (وترى الجبال تحسبها جامدة وهي تمر مر السحاب صنع الله الذي اتقن كل شيء انه خبير بما تفعلون) [1]

بەڵام جوڵان وەك لە سەرەتا باس کرا یەك سەرچاوەی نیە زۆر شێوەی هەیە و وەك هەریەکە لە تۆماس ئەکوینی ونیوتن وولیام بالی.. ووتیان ئەو گەردوونە دەڵێی سەعاتێکی قورمێشکراوە، ئەوە وەڵامێکی فەلسەفی ئاینی بەهێزە.

راستە ئەو گەردوونە پڕ وزە کراوە، هەموو شتێك ئیمکانیەتی تێدایە وەك فیزیا بە (طاقة كامنة- یان كمونة)ی ناوزەد کردوە، سەیری هێلکە بکە (جولەوزەی) تێدایە هەر کە هەلومەرجی خۆی هات دەجولێت و دەبێتە جوجکە، ئەلیکترۆن بە پێی وزەکانی بەدەوری ناوك دەسورێت وبازدەدات بۆ خولگەی تر، واتە بەکورتی وەك جرجانی (1340-1413م)لە فەلسەفەی یۆنانی وفەیلەسوفانی ئیسلامیش کۆی کردۆتەوەو دەڵێ (الحركە) بریتیە لە : (كمونە) الخروج من القوه الى الفعل[2]، واتە بەرجەستە کردنی ئەو ووزەو ئیمکانیەتەی پێی دراوە، واتە هەر لە ئەسلدا هەمو شتێك جووڵەی شاراوەی هەلگرتوە، خەریکە بتوانین بڵێین مادەو بارستە بریتیە لە جولەی چڕکراوی شاراوە.

لەدوای زیاتر باسی جووڵەو کات دەکەین، تێکچوونی هاوسەنگیش بەشێك لەجوڵان پێکدێنێت، ناکۆکیش لەبەشێك لەمادە جوڵان دروست دەکات،.. بەو شێوەیە دەگەینە ئامانج کە جوڵانی مادە یەك سەرچاوەی نیە، فاکتەری دەرەکی وناوەکی لە قۆناغە جیاجیاکان وبە ڕێژەی جیا بەشداری دەکەن، کەواتە مادە

---

[1] سورة النمل اية88

[2] ابو الحسن الجرجانی - التعریفات ص51 هەروەها بڕوانە: ابو النصر الفارابی الثمرة المرضیة فی بعض الرسالات الفارابیة-تحقیق:د عادلنبیل ص304

پەیامی جوولەی لەگەڵ خۆی هەلگرتوە، هەریەك دەبێتە یارمەتیدەر بۆ شتێکی تر و ئەو بۆ ئەو تێکڕای جوڵانەوەی مادە پێك دەهێنن لە چوارچێوەی (هۆو ئامانج) کە شێوەیەك لە ئۆتۆماتیکی ویەکتر تەواو کردنی پێوە دەبینرێ وسیستەمێکی یاسایی جووڵە دروست دەکا، کە مادی ونامادی لێی بەشدارە.

## مادی و نامادی (رۆح)

بەشێکی زۆری فەلسەفە کە باسی مادی ونامادی (ئامون وئامونیت) کردبێ یەکسەر (روح) ی هیناوەتە بەرامبەر مادە یان بە جۆری جودا جودا وەسفی روحیان کردوە، ئەرستۆ پێی وابوە یەکەم بەری گەشەی سروشت روحە، جەستە لە سروشت، روحیش لە جەستە، بیریش لە روح پەیدا بوە[1].

لە ئەسلدا یەکەم جار فەیلەسوفیکی چینی لە سەدەی (5) ووتبووی (جەستە لانەی مادی روحە، روحیش جەستەیە)، هیگل (روح) و (نفس) یەکسان کردوەودەڵێ روح دیالکتیکیانەگەشە دەکا[2]، لە (الموسوعە السوفیتیە) هەمان یەکسانی بۆ روح ونەفس هاتوە، بەڵام ئەفلاتون کەمێك باشتری بۆچوە دەڵێت: (.. القوتان المتضادتان فی النفس، هما قوةالعقل وقوةالشهوانیة.. )[3] ، بەمان شێوە (رۆسۆ)ش لە کتیبەکەی(دین الفطرة)یەکسانی کردوە ،هەرچەندە ئەو ڕایەی ئەفلاتونیش کەمێك هەمووارکردنی دەوێ، (نەفس) یەکێکە لە دوودژەکەی ناخی مرۆڤ، کاریگەری مادی زۆر لەسەرە جیایە لەگەڵ (روح) کە دژی نیە، لە زەوجی پێك نەهاتوە وەك لەدوای باسی دەکەین،تا ڕادەیەك لە (قاموس المسیحی )جوانتر

[1] ج لویس- مدخل الی الفلسفة ص54
[2] المثالیة الألمانیة ص61
[3] جمهوریة افلاتون ص137

ڕاڤەی (نفس)ی کردوە بەلام کەوتۆتە هەلەی وەسفی روح بە (خلق)و یەکسان کردنی بە عقل : (**يتكون الإنسان من ثلاثة عناصر: روح ونفس وجسد. وهذا ما يؤيده قول الرسول بولس "ولتحفظ روحكم ونفسكم وجسدكم كاملة بلا لوم" (1 تس 5: 23). فالجسد هو الجزء المادي في تكوين الإنسان أما النفس فهي عنصر الحياة الحيوانية، وفيها يشترك الإنسان مع الحيوان عليها يتوقف الفهم والحركة والحساسية، وهي تتوقف عند الموت. والروح هي العقل، العنصر الخالد، مصدر الإرادة والضمير. خلق الله الإنسان بإعطاء حياة للجسد الذي صوره ثم بخلق روح عاقلة وهبها للإنسان (تك 2: 7)**[1]، بەشیکی زوریش هەر نکولیان لە روح وتەواوی پانتایی نامادی کردوە،، شوبنهاور لە (وحدة الطبيعة والعقل)دەڵێ ر وح وعەقڵ یەکەو لەگەڵ سروشتیش یەکن[2].

زۆربەی فەیلەسوف وتەیارە مادیەکان ووتویانە ژیان بریتیە لە سێ ڕەهەند (خوین وئیسك وگۆشت) ورووحیش هەر بەشیکە لەو سێ رەهەندە، تەنانەت فەلسەفەی ئاینیش لەو بارەیەوە وورد نەبوە، بە جۆرێکی تر بۆ مادی ونامادی چووینە، ڕای زۆربەیان وابوو کە ئاسمان نامادیەو زەوی مادیە، ئیبن روشد زۆر هەولی ئەوەی داوە کە ئاسمان نامادی وئەبەدی بیت[3]. ابن سیناوفارابیش ڕای وایە (نفس)ئەبەدیە پێی وایە روح بەرامبەر مادیە[4].... لەگەڵ زۆر ڕای تری جۆراو جۆر هەیە.

لە پیشدا دەبێ ئەوە ڕوون بکەینەوە کە مادی ونامادی تەنها روح ومادە

---

1 قاموس الكتاب المقدس – دائرة المعارف الكتابية المسيحية –المادة :رُوح

2 المثالية الألمانية ص233

3 بروانە: ابن رشد –فی جوهر الأجرام السماوية ص198، ص199 ص243-

4 اراء اهل المدينة الفاضلة ص21 وص87

نابەخشێ، بەڵكو نامادی روح ویاساكانی سروشت وعەقڵ وپەیام ودوورنیە زەمەنیش بگریتەوە، بۆیە بۆ هەردیوێكی مادی دیوی نامادی دەماودەست لەگەڵە، جایان دەبێ چەمكی روح فراوان بكەین هەمو ئەو بەشانەش بگریتەوەوئەو كاتی وەك لەزۆرێك لەزاناو فەیلەسوفان وەسفی گەردوونیان بە (روح لەبەر)كردوە، بەتایبەتی كیپلەر (1571-1630م)ی فیزیازان، فیزیازانی كوانتەمی ئیستاش زۆربۆ ئەوە دەچن كە بۆ هەر هاوكێشەیەكی مادی هاوكێشەیەكی تەریبی نامادی لەگەڵە،.. لەدوای زیاتر باسی دەكەین جاریٚ هەروا كلاسیكیانەی پیادە دەكەین مادام مشت ومرەكانیان بەو زاراوەی (روح ومادە) بوە.

گرفتی فەلسەفی مادەو روح زۆر كۆنە ئێستاش هەر گەرمە و رەنگە ماوەیەكی تریش دەوام بكات، ئەوپرسیارە لەوە دەست پێدەكات ئاخۆ كە ژیاندارێك دەمرێت جگە لە گۆرانكاریە مادیەكانی چ گۆڕانكاری نامادی تر روودەدات؟ یاخود بەسادەیی دەتوانین بڵێین ئاخۆ چ جیاوازیەك هەیە لەنێوان مردوو وزیندوو ؟ ئەو پرسیارە هەموو فەیلەسوفێكی سەرسام كردووە و نەیان توانیوە وەڵامێكییان دەسگیربێت، وەك لێكۆڵینەوە لە رۆح هەزاران كتێب وتوێژینەوەی لەسەر كراوە تەنها زەرەیەكیشی لیٚ هەڵنەكەنراوە، فەلسەفەی مادی هیچ سەركەوتنێكی مێژووی بەدەست نەهێناوە لەو بارەیەوە، تەنها ئەوەی بۆ ماوەتەوە كە بیكاتە لاملی و نەیسەلمێنێ. (بۆخنەر) دەڵێ روح هەر مادەیەو هۆشی مرۆڤیش لە ووزەی مێشك دەردەچیٚ وبەس، زیاتر لەوەش (بودوستنیك) گوزارشی لە مەنهەجی فەلسەفی دیالكتیك كردوە لە هەولێكی بۆ ئەوەی (مادی ونامادی و ژین وروح)لە مادە نزیك بكاتەوە دەڵێت (الحیاة —وعی-خاصیة ماددة عالیة التنظیم)[1]. ئەو

[1] عرض موجزللمادیة الدیالكتیكیة ص55

وەسفە نزیکە لە وەسفی فارابی بۆ عەقڵ کە ووتویەتی (العقل هو اسمی ملکة)[1] بەڵام فارابی لە چوارچیوەی هەرەمی مرۆڤ ئاوای ووتوە، بەلای هیچ زاناو خەڵکێکی ئاسایی مەعقول نیە ئادەمیزاد و بەردێك جیاوازیەکانیان تەنها مادی یان (عالیة التنظیم) بێت، هەر نمونەیەکی سادە بۆ خەڵکی خۆمان ئایا (25) دیناری هەر هەمان مادە و پێکهاتن و ڕەنگ نەبوو وا بەنرخ بوو کەچی دوایی (ئیلغا) بوو بوە وەرەقەیەکی ئاسایی.

لێرەوە دەتوانی تەسەورێك دورست بکەی بۆ تێگەیشتنی (رۆح) جولانی رووحدار لەگەڵ جوولانی مادەی تر لەوەیەئامانجی هەیەدەتوانی بەرژەوەندی خۆی دیاری بکا، مادە ناتوانیٚ مادەیەکی تر بەرهەم بینی لە خۆی بالاتر با هەرچەندە ڕێکخستنی بالاش بیت، ئینجا وادیارە مادە بە زانیاری و نەخشەو پلانیکی پیشوو تر (وعی) ناسیوە بۆیە تەقەلای بەرهەم هینانی داوە!.

فەلسەفەی ئاینی کۆتایی بەو لێکۆڵینەوە هێناوە هەروەك (هایزنبیرگ) کۆتاییی بەمشت ورێکی فیزیایی هێنا لەبارەی (خێرایی)و (شوێنی ئەلیکترۆن) لەیەك کاتدا کەپێی دەڵێن (مبدأاللادقە)، لەقورئانیش وا هاتوە: (ویسألونك عن الروح قل الروح من امر ربی وما اوتیتم من العلم إلا قلیلا)، دیارە مەودا و توانای فیکری ئێمە لەئاست ئەو کێشەیە نیە.. خەڵکیشی بیٚ منەت کردووە بەڵام ئاگاداری کردوینەوە کە هەرچی زانست وفەلسەفە هەیە کۆیکەیەوە نەیتوانیوە و ناتوانیٚ دێرێك لە زانیاری دروست لە بارەی روح پەیدا بکا، بەڵام قوفڵی نەداوەو نەیبردۆتە (غیب)، یان بەلای کەمی بەو جۆرە مەنهەجە ناتوانیٚ، ئەوە وەك ئەوە وایە کۆمەڵە خەڵکێکت بینی وابیر هەڵدەکەنن بۆ ئاو دەرهێنان تۆش زانیت ئاوی لیٚ نیە و وشکە چەند زانیاریەکی مرۆڤایەتیە پێیان بڵیٚ خۆتان ماندوو مەکەن،

[1] اراء اهل الدینة الفاضلة ص25

بڕۆن لە شوێنێکی تر بیر هەلکەنن.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەفەلسەفەی مارکسیزم و فەیلەسوفانی تر (خودی گەلالەی پرسیارەکەیان یەکلاکەرەوە نیە)کەدەڵێن رۆح لەپێش مادەیە یان بەپێچەوانەوە؟ ئەوەمەنهەجی پرسیار نیە بۆ دۆزینەوەی پرسە بنچینەییەکە؟! یان وەك لە (مادیەی دیالیکتیك)هاتوە دەڵێت ئەگەر (لەش)ی ئادەمیزاد هەنجن هەنجن بکەیت ئەوا دەمرێت کەواتا لایەنە مادیەکەی بنچینەیە!![1]، کێشە فەلسەفیەکە بەو شێوەیە نیە.

زۆر پرس هەیە کۆمەڵێك هۆی هەیە و یەك ئەنجامیان هەیە، گیاندارێك چ دڵی بوەستێ چ پیر بێت چ بە گوللە بپێکرێ چ بە میکرۆبێك چ هەناسەی بوەستێ چ بکەوێتە ژێر ئاو... هەر هەمووی هۆی جیاجیان بۆیەك ئەنجام، ئەویش مردنە، پرسیارەکە لە دوای ئەو پرۆسەیە: لەومردنە (روح) چی بەسەردێت ئەوە بابەتێکی ئاڵۆزە و بەدەرە لە مەودای فکری ئادەمیزاد. هەر گیاندار نامریت بەڵکو مادەش لەناودەچێت، هیچ شتەك نیە بمێنێ، تەنها جیاوازیەکەی کاتە هەندێك تەمەن درێژ هەندێك تەمەن کورت، وەك لەقورئانیش وا هاتوە: (کل شيء هالك الا وجه)، ئیستا زانستی نوێش هاتە ئەو باوەڕە (هەرچەندەئاینی راستەقینە خۆی نابەستێتەوە بە زانست ئاخۆ چ بڕیارِ دەدا)، فەلسەفەی دروست بینینی تایبەتی خۆی هەیە، جگە لەناوچوونی شتەکانی سەر زەوی ئەوانەی لە ئاسمانیشن نامێنن و خۆری خۆشمان کۆتایی پێ دێت سوتەمەنی نامێنێت، کە ئێستا بەهۆی گۆڕانی هیلیۆم بۆ هایدرۆجین ئیش دەکات ئەو هیلیۆمەی خۆر نامێنێت واتا پیردەبێت و دەمرێت، زانایانی گەردونی ناویان لەمردنی ئەستێرەکان ناوە (سۆپەرنوڤا)[2]،

---

[1] مجموعة اساتذة (علماء) سوفيت- المادية الديالكتيكية ص57

[2] بە پێی یاسای (شاندرا) ئەو ئەستیرانەی هەندو نیوی خۆر گەورەترن ئەوا لەکاتی مردنی دەبیتە ئەستیرە ڕەشەکان، ئەگینا دەبیتە سپیەکان.

ئەوەیە فەلسەفەی سەردەم وتێڕوانینی نوێ ی ئادەمیزاد بۆ (مـادە و گیـان) بـەڵام تێڕوانینی فەلسەفی خوایی هەروابووە لەیەکەم چرکەی بووندا، مادده (سـید العـالم) نیە، هونەرمەندیش نیە، ئەو سـەروەریە گەورەیـەی بـەمادە دراوە بـۆ سـەردەمی ئەبیکرات دەگەڕێتەوە کە بوونەوەری بۆ (ئەتۆم)ی مادی گێڕایەوەو بە (نەمر)یشـی وەسف کردو ووتیشی ئەوە دوا یەکەیەو پارچە نابێ بۆیە بە بناغەی گەردون ومـادە هەژمار کرا، کەچی ئیسـتا لـە نـاو ئـەتۆم ئـەلکترۆن وپرۆتـۆن ونیـوترۆن ولـەناو ئەوانەش کوارك دۆزراوەتەوە هیچیش لەوانە کۆتایی نیە، کـوارکیش وەك تـەنیکی ئاسایی لە هەزاران پیکهاتەی بچوك تر پیکهاتوە، وەك بیرێکی بێ بنە.

پیش هەمو ئەوانە لە قورئان ئەو ڕاستیە هاتبوو (.. وما یعـزب عـن ربـك مـن مثقال ذرة في الارض ولا في السماء ولا اصغر مـن ذلـك ولا اکـبر..)[1] لەسـەر ئـەو بنچـینەیە زانایـانی ئیسـلامیش پێیـان وابـوە دوا یەکـە نیـە وەك لەسـەر زاری (مقدسی) وا هاتوە:ولما جاز لقائل أن یقول أن الله قادر علی أن یرفع من الجسم کـل اجتماع خلقه فیه فأقل الاجتماع بین جزئین قال ابن بشار النظام وهشام بن الحکم أنه یتجزأ تجزءًا بلا نهایة.[2]

لەکۆنەوەش ئەرستۆ ووتبووی (هیچ پارچەیەکی بچوك نیـە پارچـەنەکریتەوە تـا بێ کۆتایی)، کەواتە ئەوە بناغەودروست کەر نیە... بەڵکو خـۆی دروسـت کـراوە، مسەیەرەو هیچ جۆرە ئازادی وسەربەخۆییەکی نیە،، هونەرە، ئـامرازە، بەرنامـەی بۆ دانراوە ئەگینا مادەی بێ ئیرادە چۆن دەزانێ لەخۆی بالاتر دروست بکا، ژیـان و بێ ژیانیش لە مادە و چـالاکیەکانی ئـەو پێـك نـەهاتووە وەك فەلسـەفەی مـادی دەڵێت، ئەویش بەشێکە لە دروستکراو (خلق) بۆ ئـەوەی هـەروەك چـۆن لەکۆنـەوە

[1] سورة یونس ایة61
[2] المطهر بن طاهر المقدسی-البدء والتاریخ ص9

هەیە رۆژ پەرستە هەیە ئاگر و هەیە بت و... ئەورۆش (مادە) و سبەیش (یاسـا) و دوو سبەش (ووزە)بە دروست کەر هەژماردەکا.

زۆربەی فەیلەسوفان پێیان وایە هەموئەوانە بە مەبەست ونەخشە دروسـتکراون، ئـادەمیزادیش تـەنها قووتبوونەوەیـەکی مـادی نیـە لـەو سروشـتە، ئـادەمیزاد لەپێکهاتنی لەش و بیر و هۆشی بـە هاوسـەنگیەکی بـەرادە لـەنێوان مـادە و رۆح دانراوە (کە لەدوایی زیاتر باسـی دەکـەین)، ئینجـا پرسـیاری دووەم یـان کێشـەی دووەم فەیلەسوف و زاناکان کەتەقەلای بەدەستهێنانی زانیاری لـەبارەی (روح) یـان هـەر پرسـێك لـەو شـێوەیە دەدەن، بوونـە بـە دوو بەشـی سـەرەکی، فەلسـەفەی باوەرداری و بـێ بـاوەری کـە زۆربـەی پانتـایی مێـژووی کلاسـیکی داگرتـوە لـە بەشەکانی داهاتوو باسیان دەکەین.

# بەشی دوەم

# فەلسەفەی بێ ئاینی

فەلسەفەی بێ ئاینی (ئیلحاد) لە (لسان العرب) بەمانای نکوڵیەکی وەك (لحد) گۆڕهەڵکەندن هاتوە، ئیلحاد هاوتای وشەی ئەگریکی (athos) ە، بەمانای (باوەر نەبوون بە خوا)، مەرج نیە هەموو ئایینێك باوەڕدار بێت و هەموو بێ ئاینێکیش مولحید بێت، هەروەك لەمانای ئەسیزم هاتووە، زۆر تاقمی کۆمەڵایەتی هەیە بە ڕوونی ئایینیان نیە، کەچی مولحیدیش نین، چەند جۆرە مولحید هەیە، سەرەکیەکەیان نەفامی و مولحیدی فەلسەفی وزانستی هەیە، لەوەی نەفامی هەروەك ئاژەڵ بیرناکاتەوە، مولحیدی فەلسەفی بیر بە قوڵی دەکاتەوە بەلاّم مەنهەجی بیرکردنەوەی لەنگە.

## مێژوویێکی کورتی فەلسەفی بێ ئاینی:

هەندێ ئینسکلۆپیدیا و توێژینەوەی تایبەت بە فەلسەفەی مێژووی یەکەم فەیلەسوفی دژ بە (ئایین و باوەڕ) دەگێرنەوە بۆ مەدرەسەی هندی و دەڵێن یەکەم مولحید (سوخیا) لە (450 پ ز) بوە، بەشێکی تر بۆ مەدرەسەی یۆنانی لەوێش بۆ حەکیمی گەورە (پیلاس 550پ-ز) یان دیاگراس 500 پ-ز، ناوی هەریەکە لە (ئەناکسیۆگوراس500پ-ز، ئەناخسیماندەر، تیۆدۆرس، گریتۆس، ئەبیکۆر(341-270 پ ز)، (شیشرۆن 106- 42 پ.ز، (سینکا 5-65ز).. هاتووە، هەر لەوانەش مەدرەسەی (نازانم- گومان) ی مولحیدی سەری هەلداوە.

ئــەنجلس(1820- 1890) دەڵێــت: ئــەبیکۆر مــەزن تــرین مــادی مولحیــدی فەلسەفەی یۆنانیە[1]، هەر (سینکا)ش بەیەکــەم جیاکــەرەوەی ئــایین لــە سیاســەت هەژمار دەکرێت، کۆنترین ئاینیش لەلایەن ئەو سەرچاوانەوە کە بێ باوەڕ بن بــریتین لە ئایینی بوزی[2] و تاوی 800 پ-ز، ئــاینی مهــاریش هەربەشــێکە لەهندۆســی ولەسەردەمی نزیك بوزا سەری هەلداوەو باوەڕی بەمهاریش هەیە وەك خاوەنی ئــەو جیهانە نەك خودا[3]، هەرچی ئــاینی ئیزیدیــە(کتێبی جلیــوە-بەشــی یەکــەم ودوەم) نزیکە لەو ئاینــەوباوەڕی وایــە خــوا بــە ئــیرادەی خــۆی ئــەو جیهانــەی بە(ملکــە تاوس)سپاردوە[4].

ئــەوە دوایــین توێژینــەوەی ئەکادیمیــە لــەبارەی مێــژووی ئیلحــاد، بــەڵام بــە وردبوونەوەیەکی فراوانتر وادەردەکەوێ مێژووی ئیلحاد کــۆن تــرە، هــەر بــەگوێرەی قورئانی پیرۆز و هەندێ کتێبی تری ئاسمانی هەر لــە دوای (ح.ئــادەم) بــێ بــاوەڕی شان بەشانی باوەڕی پەیدابووە، بەلای کەمەوە لەسەردەمی (ح.نوح) بێ باوەڕی زۆر فراوان بووە، باوەڕدار کەمایەتی بووینە.

لەبارەی ئایینی بوزی و تاوی هەندی ئاینی تریش پێناچێ ئەوانە لــە بنچــینەدا بێ باوەڕ بووبن، ڕاستە لە ئێستادا لە بنەماکانی ئایینی بــوزی (خــوا)ی تێدانیــە، بەڵام یەکێ لە خەسلەتە بنچینەکانی بێ باوەڕان ئەوەبووە توخمی ویژدان و ئــەخلاق و بەزەیی زۆر لاواز بووە، بەڵکوزیاتر زادە و ئارەزووی دەسەڵاتدارانی زاڵم سەربردەو ئەفسانەیەکی وادروست دەکرد کە لە خزمەتی دەســەلاتەکەی (سیۆکراســی) بیــت،

[1] دیالکتیك الطبیعة –فهرس الاعلام ص378

[2] سیدهارتا غوتاما، أمیر یتحدّر من شمال الهند قرب نیبال الحدیثة، عاش من حوالي ٥٦٣إلی ٤٨٣ ق.م. (یدوّن الاسم أحیاناً علی الشکل التالي: سیدهاتا غوتاما الکتب المقدسة: متعدّدة ولکن أقدمها وأکثرها موثوقیة، جُمعت في قانون بالي-(موسوعة ادیان العالم).

[3] موسوعة الأدیان مادة:مهاریشی

[4] ئەنستاس ماری کەرمەلی –کتیبی پیرۆزی ئیزیدیەکان ل63

ئەوانەی سەر بە مەدرەسەی مولحیدین دژ بە مرۆڤایەتیش بووینە هەر لـە هرکلیـت وشیشرۆن تا دەگاتە هۆبزو نیتچە باوەڕیان بە دیموکراسی وئـازادیو ئـەخلاق نیـە، کەچی لە ئایینی بوزی خۆویستی بـە حـەرام دانـراوە، پـڕە لەبنـەمای ئـەخلاقی و ئاشتی وتەبایی و لێبوردەیی و زیـاتر پێدەچـێ ئـایینێکی ئاسمـانی بێـت و دواتـر دەسـتکاری کرابـێ، یـان پـرۆژەی فەیلەسـوفێکی دانـابووبێ بـۆ پـەیڕەوکردنی ئیمراتۆریەتێك کە لە ئەسڵدا ئەو پرۆژەیە لەنەریتی کۆمەڵێك ئایین وەرگیراوە، بۆیە بویتە بڕوای کۆمەڵگە، هـەروەك زۆربـەی ئایینـە کۆنـەکان وایـان بەسـەرهاتووە، چونکە لەکۆمەڵگەی کۆنی ستونی مەحاڵ بـووە کۆمەڵگەیـەکی ئاسـۆیی دروسـت بووبێت بێ پـەیامێکی ئاسمـانی، ئـەوەی لـەو ئایینانـە بـەدی دەکـرێ توانیویانـە کۆمەڵگەی ئاسۆیی لێ دروست بکەن و بناغە و کاریگـەری بـۆ ئـەو سـەردەمەش مابێت، ئەوە هەر دەبێ ئایینی ئاسمانی بووبی.

زۆربەی توێژینەوە ئەنسرۆپۆلۆژیەکان لە پلۆتارخی ئەگریکی تا هنری برگسـۆنی ئەو سەردەمە ڕایان وایە کۆمەڵگە بێ ئاین نەبوەو دەڵێن: لەمێژوودا میلـەتان بـێ کۆشك وتەلار بوە، بێ فەلسەفەوهونەر بـوە بـەڵام هـەرگیز بـێ ئـاین و پەرسـتگا نەبوە، لە (معجم لاروس)یش هاتوە کە لە تاکی دڕنـدە تـرین میلـەتانیش مـەیلی ئاینی تیدا بوە، لە قورئانیش ئاماژە بەوە کراوە بۆ هەموو نەتەوەیەك پێغەمبەرێك بەزمانی خۆیان ڕەوانەکراوە (وما ارسلنا من رسول الا بلسان قومه ليبين لهم فيضـل الله من يشاء ويهدي من يشاء وهو العزيز الحكيم)[1] هـەروەك دەبیـنین فەیلەسـوفە مولحیدەکانی بەهێزتر لە بوزا وەك: هرکلیت، سوخیا، پیلاس، دیاگراس، ملیـۆس، ئەناکسیۆگوراس، شیشرۆن، تیۆدۆرس، گریتۆس، سینکا،... لایـەنگری وایـان بـۆ دروست نەبووە لەسەر ئاستی میللی، تەنها لەسەر ئاستی توێژی فەیلەسوف و زانا

---

[1] سورة إبراهيم - آية 4

و عاقڵمەندان بووە، یان گەیشتۆتە ئاستی مەدرەسە و باڵی فەلسەفی، هەروەك لە مەدرەسەكانی (یۆنانی و هەرسێ مەردەسەی سەرەكی ئاییینی و نائاییینی و مام ناوەندی لێ خەملّی)، مەدرەسەی ئاییینی (یان نزیك لەئاییینی ) بریتی بوو لە فەیلەسوف و زانایانی وەك (فیساگۆرس وئەمبادیكلس و ئەنكسیمونراس تا دەگاتە سوكرات).

ئەوەی ڕوونە هەریەكە لە فیساگۆرس و ئەمبادیكلس قوتابی (ح.سولیمان و (ح.داود) بووینە، بۆیە ئەوانە خاوەنی دەعوەش بوونە، لەگەڵ هاتنی ئەسكەندەر بۆ رۆژهەلاّت دوو قوتابی فیساگۆرس بەناوی (مەرزنۆس وڤلانۆس) فەلسەفەو باوەڕی فیساگۆری وهیلنیستیان لە فارس وهند بلاودەكردەوە[1]، كەواتاهیلنستی (یۆنانیزم)دەعوەی ئاییینیش بوەبۆجیهان.

لە دوای یۆنانیەكان فەلسەفە و زانستی بێ باوەڕی بەردەوام بووە تا سەدەكانی 17 بەدواوە تەكانی بە خۆدا، گەورەترینیان سپنوزا و هۆبز شوبنهاوەر، دیفید هیوم، جون دیوی، برتراند راسل،.. پێیان وابوو ئایین و شەریعەت لە یاسا وەردەگیرێ نەك لە (راستی گەردوونی)، یاساش فەرمانی دەسەلاّتەوەك هۆبز(1588- 1679 ز) دەڵێت، واتا ئایین لە خودا وەردەگیرێتەوە بۆ نێو دەوڵەت[2]. بەشێكیش بە كتێب و توێژینەوەی زانستی و فەلسەفی ئایدۆلۆژیا هاتنە مەیدان دژ بە ئایین، لەوانە : (النسق المسیحیە)ی شوبنهاور، (جوهر المسیحیە)ی فیورباخ1841، (الوجود والعدم) ی سارتر، (مستقبل الوهم) ی فروید.. ئەوانە

---

[1] - ابي الفتح الشهرستاني- الملل والنحل – تحققت محمد عبدالقادر الفضل، بيروت، طبعة الأولى ج3 ص79 – لة(قصة الحضارة – ج13 ) له 529ز باس له رۆیشتنی زۆریك له فەیلەسوفان كراوە بۆ ئەو شوینانە.

[2](هۆبز- مبادئ القانون – ئةوةش بة دوو بةش ضاثكرا لة 1640 ز (الطبيعة الانسانية)، (الهيئة السياسة).

کتێبی هەرە مولحیدودژ بە خواو ئاینن[1]، ئینجا مەکیاڤیلی بە (میر)، ئیڤان باڤلۆڤ(1849-1936) لەبارەی (محاضرات فی عمل نصفی الکرة الموخیة)، سپیۆنزا (1632- 1677) (الرساله فی اللاهوت و السیاسه)....، لەدوای شۆڕشی فرنسا 1789م بۆ یەکەم جار بڕیارِ بەناوی گەل درا لە جیاتی بە ناوی خودا، لەدوای ئەوانەش: فریدرێك نیتچە (1844- 1900) خاوەنی دروشمی(مەرگ بەر خودا)، داروین (اصل الانواع)، مارکس ئەنجلس لینین لەبارەی شوعیەت، تادەگاتە سارتەرو براتراند راسل و هواتیهد (1861- 1947)، تازەترین کتێبی بایۆلۆجی (رتشارد دوکینغز-وهم الإله) وفیزیایی (ستیڤن هۆکینگ-the grand design ) (دیزاینی مەزن).

مەدرەسە و تەوژمە مولحیدیەکان بە وجودی (باڵی سارتەری)[2] وشیوعی و مەزهەبی تری فەلسەفی وەك : وةزعي، واقيعي، المنفعة، اللذة، عقلانية الخالصة، الطبيعي، الظواهر، الشك، البرجماتي.. هەموو ئەو تەوژمە فەلسەفی و ئایدۆلۆژیایانە لە کۆتایدا لە سێ مەدرەسەی سەرەکی خەملین کەبریتین لە: (لیبرال دیموکراسی، سۆشیال دیموکراسی، شیوعیەت)، بە پێی (پۆشنکی)فەلسەفەی کلاسیکی ئۆروپی لە 1600تا 1900ز پۆلین دەکا، دیکارتیش (١٥٩٦ — ١٦٥٠) یەکەم گلپەی ئەو شۆڕشە فکری وفەلسەفی بوە، لەو فەترەی بوونی خودا لە توێژینەوە فەلسەفیەکانیان ناوەندی بوە[3]، لەوی بەو لاوەبە فەلسەفەی هاوچەرخ

---

[1] - المعجم الفلسفی الشامل.. ص 89

[2] چونکە لە وجودی "کیرکیجاردی" 1813-1855 ئاییینیش هەبووە.

[3] بە گشتی ئەو پۆلینە زۆر بە سودە بەلام تەواو وورد نیە چونکە زۆرێك لە فەیلەسوفان دژ بە بوونی خودا بووینە لەوانەهۆبز(١٥٨٨ - ١٦٧٩ م)، هۆلباخ(١٧٢٣ — ١٧٨٩)، سپینوزا،..هەروەك خۆشی لە ص26 باسی ئەوانەوهەریەکەلە: لامتری(١٧٠٩ — ١٧٥١)، دیدرو (١٧١٣- ١٧٨٤ م)، هلفتیوس (١٧١٥ - ١٧٧١ م) کردوە.

حیسابە[1]، هەرچی روجیی غارودیە دەڵێت: فەلسەفەی مولحیدی هاوچەرخ بە قۆناغی جیا تێپەڕیوە، فەلسەفەی سەدەی 18 سیستەمی سیاسیشی گرتەوە، سەدەی 19سیستەمی زانستیشی گرتەوە، سەدەی بیست مرۆڤایەتیشی گرتەوە [2].

بەوشێوەیە زەمینەی ئیلحادی لەسەدەکانی 18 و 19 لە ئاستەکانی فیکری و فەلسەفی و یاسایی و سیاسی و دەولی تەکانەکی گەورەی پێدرا، (کارین ئەرمسترۆنگ) لەکتێبی (تاریخ الخالق الأعظم) دەڵێت: لە سەدەی 17 و18 لەگەڵ گەشەی زانست ئەوا چەندین تەیاری فەلسەفی بە ڕوونی دژ بە خوا پەیدا بوون، لەوانە (فولتیر، توماس هوبز، توماس باین، جون لوك، بنجامین فرانكلین، كارل ماركس و تشارلز داروین و فریدریك نیتشه وسیغموند فروید..)، دیسان بە پێی (پۆشینکی) لەوسەردەمی فەلسەفەو زانست بە ڕوانگەیەکی ستاتیکی (وەستاو) دەیڕوانیە بوونەوەر، مادیەتەکشیان(مادی میکانیکی)بوە وایان زانیە ئەو دونیایە بەیەك جار ئاوا هاتوەو گۆڕانی بەسەر نایەت[3]، هەرچەندە ئەوە لە بنەچەدا بەشێك بوە لە بیرەباوەڕی ئاینی سۆمەریەکان، پێیان وابوە ئەو ڕێسایانەی گەردوونی لەسەر دامەزراوە بۆ هەتاهەتایە[4]، بەڵام بۆ ئەوروپا بوەهۆی ئەوەی (کون الساکن) و(قانون حفظ المادة) و..حوکمێکی وا بکەن زۆربەی زانستەکانی تری فیزیایی وکیمیایی وبایۆلجی وکۆمەڵایەتی لەسەر بنیات بنرێ.

لەو سەردەمەی ئیستاش ناوی کۆمەڵێك زانای وەك(یۆلیۆس ئیکسفۆردزانای کیمیایی ئەمریکی، پتریك پلاكیت1897-1973فیزیایی بەریتانی،

---

[1] إ .م .بوشنسكي - الفلسفة المعاصرة في أوروبا - ترجمة : د .عزّت قرني ص23-24

[2] ماركسية قرن عشرين ص143-144

[3] الفلسفة المعاصرة في أوروبا ص28

[4] جفري بارندر - المعتقدات الدينية لدى الشعوب، ترجمة :د .إمام عبدالفتاح إمام مراجعة :د . عبدالغفار مكاوي ص12

چارلاندساخارفیزیایی هندی1910-1995، فرنسیس کریك بریتانی1916-2004، ریتچارددوکنیز بایۆلۆجی1941..بەزانای مولحید وەسف دەکرین،میشیل ئۆنفرێی فرنسی لە کتیبی(نفی اللاهوت)ڕای وەك فیرباخە کەدەلێ میشکی دواکەوتەی مرۆڤە خودای دروست کردوە(**الإنسان الشقي الذي يبحث عن السعادة، وإذا لم يجدها في ذاته، ولا على الأرض يتوَّهم أنه وجدها في شخص غريب عن الدنيا اختلقته مخيلته ويسميه الله**)[1]، ،ئۆنفرێ لە ڕەدی (نیتچە کە دەلێ خوامرد)دەلێ مادام مرۆڤیك مابیت خوانامرێ خوالەگەل مردنی دوا مرۆڤ دەمرێ ، لە مەدرەسەو گروپە هەرە نوێیەکان ئەوا لەکاتیکا مەدرەسەی فرانکفۆرت کەپیك هاتوە لە : ماکس هۆرکهایمەر(1895-1973) تیۆدور ئەدرنۆ(1903-1969)، هربرت مارکۆز(1898-1978)ئەریك فرۆم(1900-1980) زیاتر بەلای مادی بووینە وەك مدرەسەی براتراند راسلیش لە بریتانیا، تازەترین گروپی بێ ئاینی زانستی (new aithism) سام هارینزی فیزیایی، دانیال دینیکی بایۆلۆجی زان، ریتچارد دۆکنیزی بایۆلۆجی زان، هەرچی (گرۆپی ڤینا)یە کەپیك هاتوون لە کۆمەلێك زاناو فەیلەسوفی پسپۆر جیای وەك(رودۆڤ کارناب 1891-1970)، کارل پۆپر(1902-1991) هانزهان ومینجەر وکورت جودل پسپۆری بیرکاری وئۆتۆ نیورات کۆمەل ناسی ڤیکتۆر گراڤت مێژووزان، کۆفمان یاسا ناس فیلیپ فرانك فیزیازان...فەلسەفەی ئەوانەزیاتر بەلای زانستدا لار بوویتەوە، هیشتا ساغ نەبووینەوە، بەگشتی بەرەبەرە ئەو ڕەوشە زۆر هێورتر بوویەوە بەگەیشتنمان بە سەرەتای سەدەی (21) ،

---

[1] أنجيلوس جرجس(القس)– وجود الله وصوُّر الإلحاد ص22

خالێکی تریش هەیە شایەنی گۆتنە هەرچەندە لە زۆر سەرچاوەی تر ئەوانە بە مولحد ناویان هاتوە بەلام کە بۆچوونەکانیان بە ووردی دەخوێنیەوە وایان لێبەدی ناکرێ ،هەندیکیان باوەڕێکیان هەیە لەگەل ئەو سەردەم ناگونجێ ،سوکرات و جۆردانۆ وتەنانەت زینفۆن(430 پ ز)یش بە مولحد ناوزەد کراوە کەچی ئەو بەرجەستە کردن وبەمرۆڤ چواندنی خوای رەتکردەوە ،ووتی ئەوروپا وادەزانن چاوی خودا شینە ،ئەفریقی بە رەش ،ئاسیای سەروو چاوی خودا بچوك .ز،ئەوانەی رەت کردەوە ناویان نا مولحیدە ،ئەوانی تریش زیاتر (دوودلن نەك مولحد) هەتا (دیگۆراس)کەبەیەکەم مولحدی ئەوروپی هەژمار دەکریت دەردەکەوێ مولحد نەبوە دوودلی وگومانی هەبوە ،بۆیەش ئەو ئامارە زیاتر نزیکە لەڕاستی کەدەلێت ئیستا رێژەی مولحید تەنها لە2٪ی جیهانە ،واتە مولحیدی تەواو نەك متردد[1].

## هۆکاری ئیلحادی مەعقول و نامەعقول

لەبڕگەی پێشــوو بۆمــان دەردەکــەوێ کــە بــێ بــاوەڕی هــەر کــەمێك لــەدوای بزوتنەوەی مێژوو دەستی پێکردووە، لە پانتایی مێژوو زۆرایەتی بوونە، زەخیرەکــی زۆری زانیاری و پاساویان لایە، توانیویانە هۆکاری مــەعقولیش بهۆننــەوە، نــاکرێ ئەوهەموو زانیاری و ڕێبازە دوور و درێژە بە سادەیی و نەزانی و (ئارەزوو بــە زولم) پۆلین بکەین، پێویستی بە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی ئــەکادیمی وفەلســەفی هەیــە، بەتایبەتی لەوکاتەدا دەتوانین بلێین بەلای کەمی ئەوواقیعــەی ئیســتای جیهــان لــە پیشــکەوتن وخۆشــگوزەرانی وپەیوەندیــە نیودەولــەتی ومافــەکان ومەدەنیــەت

[1] بۆ ئەو ريَذةية بروانة:دعدنانابراهيم– مدخل الى معرفة الالحادوبرهانالنظم (مطرقةالبرهانوزجاجالالحاد) ص23

ودیموکراسی وسەروەری یاسا وبنەمای هاوولاتی بوون..لەلای فەلسەفەی نائاینی هاتوە، بابزانین گرنگترین ئەو هۆکارانە چین کە یارمەتی ڕێبازی فەلسەفی بێ باوەڕی دەدا، زۆر بە کورتی ئەوانەن:

1- لەسەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤایەتیەوە تا ئەو ساتە لە کاتی پێویست و کارەساتی سروشتی و کۆمەڵایەتیدا، لەکاتی زوڵمی بەشەری لەزۆرکاتی تر هەست بەبونی ڕاستەوخۆی دەستی خوایی ناکرێ بۆ کۆتایی هێنان بە مەینەتیەکان.

2- هەر لەپەیوەست بە خالی (1) وکارەساتەکان زۆر لە خوا دەپاڕێنەوە کەچی هەر زۆردارە بەسەر هەژار سەردەکەوێ، یەکێ لە مولحیدە عەرەبەکانی ئەو سەردەمە دەڵێ: لەسالی 1948 ەوە عەرەب ویەك ملیار موسوڵمان دوعا دژ بە ئیسرائیل دەکەن کەچی سەرکەوتن هەر بۆ ئیسرائیلەو شکستیش بۆ عەرەب، لە ئەنفالەکان زولمی ئەوەندەگەورە لە ژن ومندالی کورد بە شیوەیەکی وا کرابە زیندوویی لە ژێر خاك بنرێن..کەچی هەردوعا دەکراو وەڵام نەبوو، وەك لائیکێکی کورد دەڵێ هەمو ئەو دوعایانە ناکاتە بەرگریەك کە بەدەستی خۆت دەیکەی، لە زۆربەی هەرە زۆری خانەوادە کۆنەکان (ئیستاش) هەر دوعای (کوڕ) بوون کراوە کەچی ڕێژەی کچ وەك کوڕە ئەگەر زیاتر نەبێ[1]، کەچی کوڕ بوون وکچ بوون یاسای مەندل دیاری دەکا..کاری ڕۆژانەمان وژیان بریتیە لە پەیڕەوی یاسای سروشتی و(هۆوئەنجام)نەك دوعاو تەوەکول، بۆیە (هینزپاچلیز)لەکتێبی(دستور الکون) ئەو یاسایا سروشتیانەی ناونا

[1] لە کتیبی(ئافرەت لە نیوان عەلمانی وئاینیدا)-نوسەر بەدرێژی باسی هۆکارە سروشتیەکانی ڕێژەی زیادی ئافرەت بەرامبەر پیاو کراوە.

دەستوری گەردون[1]..

3- لە دوای دورکەوتنەوەی (زەمانی ومەکانی) پەیامی ئایینەکان لەسەرچاوەکانی (واتە دوای نەمانی پێغەمبەرەکان) ئەوا کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەسەردێت بەهۆکاری جیاجیای نەریت و ئاستی زانیاری خەڵکی و هەندێکیش بە ئەنقەست لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، ئاین پەروەریەکە کاڵ و سادە دەبێتەوە، گەڵی جار لە ناوەڕۆك و قورساییە زانستیەکەی دەپچڕێ، دەبێتە نەریت و کاری سۆفیگەرایی و پاککردنەوەی دەرون، ئەوکاتیش هەموو ڕوداوێك دەدرێتە پاڵ خودا، ئەوەیان لەسێ ئایینە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکەش بەدی دەکرێ، لەتەورات و ئینجیل بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، لە ئایینی ئیسلام ئەو خەلەلە لەخودی قورئان و فەرمودەی دروست بەدی ناکرێ بەڵام لە فیقهی ئیسلامی و عەقیدە بەدی دەکرێ، دەڵێن هەرچی ڕوودەدا لەباران بارینەوە لە بروسك و گڕکان و مانگ و رۆژگیران تا ڕووداوە کۆمەڵایەتیەکان و مردن،.. هەمووی دەڵێن بە ئەمری خودایە(تیۆری المشیئە) پشت بەو ئایەتەی (والی الله ترجع الامور)[2] دەبەستریێ،، لە نێو مەسیحیەکانیش نەك قەشەکان بەڵکو فەیلەسوفەکانیشیان لە رەدی سپینۆزا دەیان ووت هەرچی ڕوودەدا بە ئیرادەی خوا ڕوودەدا[3].

4- لەلایەن ئاینیەکانەوە تارادەیەك ئاسمان وزەوی لیك جیادەکریتەوە، جۆریك لە میسالی پەیرەو دەکرێ، هەندێ جاربەگوزارشی (دنیاوقیامەت) بە دژی یەك وەسف کراون، کە مرۆڤ سارد دەکاتەوە لە پەیڕەوێکی ڕاستەقینەی

---

[1] بڕوانە: بۆل دیفیز- الإقتراب من اللة- ص98 ئەو کتیبە لە بنچینەدا ناوی(Mind of God) وای بە شیاو زانیوە ئاوای وەرگێڕی.

[2] سورة الحدید اية5

[3] سپینوزا لە کتیبی (الاخلاق)وەلامی ئەوانەی دایتەوە –دیالکتیك الطبیعة ص231

دادگەری و قەلاچۆی زۆرداری، فەلسەفەی کۆن وبە ئاینیەکانی وەك ئیبن روشد وئیبن سیناو فارابی و.. وایان دەزانی کەمادەی ئاسمان جیایە لەگەڵ مادەی زەوی، ئەوەی ئاسمان لە ناوناچیٚ، یاساو ڕێساوپیکهاتنی ئاسمان لەگەڵ زەوی لیك جیایە،لە بنەچەدا بیرۆکەی جیای ئاسمان لەزەوی لە بیرۆکەیەکی تری هەلە دێت کەوادەزانن خوا لە ئاسمانە ،لە (**قاموس الكتاب المقدس** ) دووجۆرة ئاسمانيكى مادى وئةوى تر روحى ،طواية ئاسمانة ماديةكة لةناودةضيَ بةلام روحيةكة دةميَنىَ ،دةقةكةى واهاتوة:

**(..وهناك السماء الهيولية والسماء الروحية, أما الهيولية فهي التي تظهر فوق رؤوسنا وتسمى القبة الزرقاء, وكان العبرانيون يقولون أنها الجلد (تكوين 1: 14) ويقولون مجازًا أن بها كوى ومصاريع ينزل منها المطر والصقيع والثلج (تك 7: 11 ومزمور 78: 23 ويعقوب 5: 18 وأيوب 38: 29). وقد سميت النجوم نجوم السماء وجند السماء وأنوار الجلد (ناحوم 3: 16 وتثنية 4: 19** وتكوين 1: 14) وسوف يأتي اليوم الذي فيه تضمحل هذه السماء مع الأرض وتظهر بدلًا منهما أرض جديدة (2 بطرس 3: 10 ورؤيا 21: 1). أما السماء الروحية فهي مسكن الله الخاص, ولذلك يقال أن الله في السماء وأنه إله السماء, ومشيئته نافذة هناك ولذلك نصلي قائلين: "لتكن مشيئتك كما في السماء كذلك على الأرض" ويقال عن المسيح أنه الرب من السماء (متى 5: 45 و1 كورنثوس 15: 47) وقد نزل المسيح من السماء وصعد إليها وهو فيها (يوحنا 3: 13) هناك تسكن الملائكة, ويسود الفرح والسلام. وقد هيأ المسيح فيها منازل كثيرة للمؤمنين به (لوقا 19: 38 ويوحنا 14: 2) وقد صعد إيليا

في عاصفة إليها (2 ملوك 2: 1) كما أن لكل مؤمن ميراثًا فيها وهو يكنز فيها كنوزه (1 بطرس 1: 4 ومتى 6: 20) والكلمتان الفردوس وحضن إبراهيم تشيران إلى نفس الشيء (لوقا 23: 43 و16: 22)[1].

هەرچەندە لە قورئان دەڵێ ئاسمان وزەوی یەکن و هەردوولایان لە ئەتۆم پیکهاتون :(..لا يعزب عنه مثقال ذرة في السماوات ولا في الارض..) لەشوێنیکی تریش لەبارەی یاسای ئاسمان وزەوی هاتوە: (ومن اياته ان تقوم السماء والأرض بإمره.. )[2]، لەشوینیکی تر لەبارەی کارنامەی ئاسمان وزەوی بە (هۆو ئەنجام) هاتوە: (من كان يظن ان لن ينصره الله في الدنيا والاخرة فليمدد بسبب الى السماء ثم ليقطع فلينظر هل يذهبن كيده ما يغيظ)[3] لەو هەلەیەی فەیلەسوفانی ئاینی سەبارەت بە مادەی ئاسمانی (واینبرگ) لە کتێبی(DREAMS OF FINAL THEORY) دەڵێت ئاینیەکان وایان دەزانی رۆژو ئەستیرە مادەی نەمرن ولە خوا نزیکن، ئیستا دەرمان خست بریتین لە تۆپەلە گازو کیش ویاسا چی لە بەردێکی سەر ئەو زەویە زیاتر نیەوئەستیرەکانیش نەبوونە گەورەیی خوا[4]، ئیترنهینی سروشت ئاشکرا دەبێ و باوەڕداران لاواز دەبن.

---

[1] قاموس الكتاب المقدس –دائرة المعارف الكتابية المسيحية–مادة:سماء

[2] القران الكريم- سورة سبأ اية3، سورة الروم اية25

[3] سورة الحج - - آية 15

[4] الفيزياء ووجود الخالق ص31 لە ڕاستیدا ئەوە ئاین نەبوو ئاوای دەوت بەلکو فەلسەفەی یۆنانی نزیك لە پەیڕەوانی ئەرستۆ ئاوایان دەووت.

لە کۆنەوە تەقەلای ئەوە دراوە کە لە جیاتی خودا بنچینەی مادی بۆ ڕووداودیاردە سروشتی و زیندەکیەکان بدۆزرێتەوە، لەوانە تەقەلای (دیموقریتس460-370 پ ز لویکیب(450 پ ز) وأبیقور(342-270پ.ز) زیاتر بە ناوی دیموکریت ولوکریشیس ووتراوە بناغەی هەموبوونەوەر ئەتۆمە نەك خودا[1]، ئەو تەقەلایانە بەردەوام بوەو بەشێك بوە لە پیشکەوتنی کۆمەڵگە بەپێچەوانەی ڕای ئاینی(سوڕدراو) کەڕێ لەو توێژینەوانە دەگرێ وڕۆلی عەقڵ پەك دەخا کە خوا ئەو عەقلەی پیداوەو داواشی لیکردوە بەکاری بهینی، لەلای ئاینی کەمتر بەکارهات ولەلای نائاینی زیاتر بەکارهات، بەو شێوەیە زانست وزانیاری کەوتە دەست فەلسەفەی بێ باوەڕی.

لەگەڵ دۆزینەوە و پێشکەوتنەکانی زانست بەرە بەرە ئاشکرا دەبوو کە ئەو ڕووداوانە بەپێ ی یاسای سروشتی و ئیرادە و قودرەتی سروشتە نەك غەیبیەتێك، جاران وا مەزەندە دەکرا کە کاری زەوی مرۆڤ بەڕێوەی دەبا، بەڵام کاری ئاسمان خودا ڕاستەوخۆ بەڕێوەی دەبا. لێڵی لە وەڵامی پەیوەندی خواو بوونەوەر پرسی (یاسای سروشتی) وای کردوە(لاپلاس) لە وەڵامی پرسیارێکی ناپلیۆن(کە ووتبووی کوا رۆلی خودا لە فەلسەفەی تۆ) بڵێت: پێویستمان بە خوا نەما یاسامان دۆزیتەوە[2]، یان وەك هولباخ لە(نظام الطبیعة) بلی ئەوەتە یاساکانی سروشت و(هۆوئەنجام)م دۆزیەوە لە سروشت

[1] لە کتیبی (دیالکتیك الطبیعة ص216 دەلێ یەکەم زانا کە ووتی جیهان لە ئەتۆم پیك هاتوە لۆکیبۆس بوو نەك دیموکریتیس، لە ص57 یش دەلێ ئەوەی کیشی ئەتۆمیشی دۆزیەوە دالتون نەبوە بەلکودیوجین لایرسی بوە.

[2] دیالکتیك الطبیعة ص229 کاتی لاپلاس توێژینەوە گرنگەکەی لەبارەی ((میکانیکاالسماء) تەواو کردو کۆپیەکی پێشکەش بە ناپلیۆن کرد، ناپلیۆن لیی پرسی ئەدی رۆلی خوالە ئاسمان چیە ؟لاپلاس ووتی: یاساکانمان دۆزیتەوە پیویست بە خوا نەما.

چـیتر پێویسـت ناکـا بلـین بـە تـەمای خـوا، بۆیە(دافیـد بیرمـان )دەڵـێ ڕاشکاوەترین کتێب دژ بە ئاین(نظام الطبیعة- Système de la nature)ی هۆلباخ بوە کە لە 1770 دەرچوە، تۆماس هۆبزیش پیش ئەو یەکـەم جـار بەبێ پەردە لە سالانی 1651 ووتی کتێبی موقەدەس وعیساو موسا هـیچ پەیوەندیان بەیەکەوە نیە، ئیکۆرن لە1779 زۆر بەتونـد تـر دابەزیـە سـەر کتێبی موقەدەس وبە خرافیاتی وەسف کرد، سپینوزا لە کتێبـی(رسـالة فـی اللاهوت والفلسفة) بەیەکجاری کتاب المقدسی تەرت و ویران کرد، هەریەکـە لە جورج ئەلیوت، جیمس فرود، جون ستوارت مل.. بەو مەنهەجە توندە دژ بە مسیحی و بیری ئاینی بووینە، هەمو ئەوانـە وای کـرد سـەردەمی ئـاین بەگشتی بە(سەردەمی تاریکی) وەسف بکەن.

دوای ئەو هەنگاوانە بەرەبـەرە زانسـت و ئـایین، عـەقڵ و نـەقل، ئاسمـان و زەوی، دنیا و قیامەت،.. لێك جیابوونەوە، زەمینەیەکی سانا بۆ عەلمانیەتی عەقلی دەسازێ، هەر لێرەشەوە ئەنجلس دەلێت "ئێمە دەتوانین ڕووداوەکـان لێکبدەینـەوە بـەبێ پەنابردنـە بـەر غەیبیـەتێك"، لەهـەموویان زەقـتر لەپێشوودا بڕوا وابوو بروسك لە ئەنجامی ئەوەی فریشتە بەقامچی لە هـەور دەدا دروست دەبێ (أَنَّ الْبَرْق مَلَك لَهُ أَرْبَعَـة وُجُـوه : وَجْـه إِنْسَـان وَوَجْـه ثَـوْر وَوَجْه نَسْر وَوَجْه أَسَد فَإِذَا مَصَعَ بِذَنَبِهِ فَذَاكَ الْبَرْق)[1]،ئەوە ڕێك ئەفسانەیەکی ئەگریکی وئەسکەندنافی هاتوە کە گوایە بروسك لە توڕەیی مانگایەکی زۆر گەورە دێت لە ئاسمان تـووڕە دەبێـت وقامچـی ڕادەوەشـێنێتە دوژمنـەکانی وبەهەور دەکەوێ ودەبتـە بروسـك ، کەچـی لەدواییـدا (مانعـە الصـواعق) لەلایەن زاناو سەرۆکی ئـەمریکی فـرانکلین(1706-1790)دروسـتکرا،

---

[1] ابن کثیر-البدایة والنهایة ج1 ص53

ئایا مرۆڤ کونترۆلی قامچی فریشتەی خودای کرد..، لە بارەی فەلەك و گەردوون وئاسمان فەرمودەی باویان هیناوە باس لەوە دەکا هەر 7 ئاسمان یەك لەسەر یەکەو عەرشیش لەسەرووی هەموانەو خواش لەسەر عەرشە، لەوەوە اخوان الصفا نەخشەیەکی گەردوونی کردبوو بریتی بوو لەناوەندەکەی زەوی دوەم فەلەك مانگ سییەم عەتارد، تا دەگەیشتە فەلەکی 7زوحەل بوو، فەلەکی رۆژ لە ئاسمانی چوارەم بووفەلەکی هەشت کرسی بوو فەلەکی 9 عەرش بوو لەسەر ئەویش خوایە[1]، **(أما الهاوية فهي ضد السماء, وقد هبط الشيطان من السماء إلى الهاوية (لوقا 10: 18 و2 بطرس 2: 4). وقد قال الربيون أن هناك سبع سموات، ولكن بولس الرسول يقول أنه صعد إلى السماء الثالثة في رؤياه (2 كورنثوس 12: 2) وهي ما يعبر بها عن سماء السموات، فالسماء الأولى سماء السحب والطيور، والسماء الثانية سماء الكواكب والنجوم، أما السماء الثالثة فهي مظهر المجد الإلهي ومسكن المسيح بالجسد والملائكة والقديسين. وحالتها فوق فهمنا وإدراكنا (افسس 1: 3 ويوحنا 14: 2 و3 عبرانيين 4: 11)[2].**

ئینجیلی برناباش لەو سۆنگەوە باس لە 9 ئاسمان دەکا، تایفەی ئیسماعیلیە باس لە 11 فەلەك دەکەن، ابن مسکویەش وای نەقل کردوە کە پێیان وابوە 7ئاسمانەکە بریتیە لەو 7هەسارە (..ويقال أن الله خلق الشمس يوم الأحد والقمر يوم الاثنين والمريخ يوم الثلاثاء وعطارد يوم

[1] من رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء رسالة رقم 28 ص32 ئیخوان سەفا لە پرسی بروسك جوانتری بۆچووبوو بەلام لەو پرسە وای بۆچووبوون.

[2] قاموس الكتاب المقدس – دائرة المعارف الكتابية المسيحية– مادة:سماء

الأربعاء والمشتري يوم الخميس والزهرة يوم الجمعة وزحل يوم السبت)[1].
کەچی دوای دەرکەوت ئەوانە ئاسمان نین، کرسی و عەرش وخواشی لینەبوو، لیرەوە وا دەرکەوت ئایین بەرەو دواکەوتوویی و زانست و زانایان و ڕۆشنبیری وتکنۆلۆژیا بەرەو پیشەوە وبە پەیڕەوکردنیشەوە، ئەو تەکنۆلۆژیایەش نەوەستا لەسەر قسەی قەشە و پاپا و شیخ الاسلام و کتیبی فیقهی..کە گەلی جار خۆیان بە بەرپرسی پەیوەندی نیوان خوداو مرۆڤ ناسیوە[2]، ئەوانەی راستەوخۆ دەگەڕانەوە سەر سەرچاوە و دەقەکان ئەوا بی باوەڕ نەدەبوو.
لیرەشدا دووکیشەی تر سەری هەلدەدا، یەکەمیان ئەو جۆرە رەوشەنبیرو فەقیهو فەیلەسوفانەی کە دروست تر لە ئاین گەیشتبوون کەمایەتی بووینەو لەلایەن خودی هاوتاو هاوپیشەکانی تانەوتەشەنەی توندی تاڕادەی کافربوونیان لینراوە[3]، ئەویش دەکەینە خالیکی سەربە خۆ.

5- ناکۆکی نیوان فەلسەفەو ئاین: لەدوای بانگی پیغەمبەرەکان عادەتەن وا هاتوە ئەوانەی خۆیان بە میراتگری ئاینی زانیوە لەگەل عاقلمەندان ڕووبەڕوودەبیتەوە، ئەوەیان لە میژووی ئیسلامەتیدا زیاتر شیوەی ناکۆکی نیوان فقهو فەلسەفەی وەرگرتوە، بە پیی (ئیمام غەزالی)یەکەم کیشە لەوە هات کە (موعتەزیلەکان) وەك یەکەم گرۆپی ئیسلامی کەوتنە ژیر

---

[1] ابن مسكوية – تجارب الأمم ص92

[2] رئيس الكهنة هو الوسيط بين الله والناس. (جدول وشروح فی كتاب المقدس ص716).

[3] لە نمونەیەکی ئەو دیاردەیە: هەندی فەقیهی ئیسلامی داوایان کرد مدرسە لەبەردەستی سیف الدين ئامەدی(گەورە فەیلەسوفی کورد) رزگار بکریت وەك چۆن واجبە عەکا لەبەر دەست سەلیبیەکان بسینریتەوە، هەندی لەو فەیلەسوفانە تۆماردەکەین بۆ زانیاری:ئیبن روشد:رسالة النفس ابو حامد الغزالی: تهافت الفلاسفة، معيارالعلم فی الفن المنطق، نصرالدين الطوسی:تجريد، ئيبن سينا عيون الحكمة، فارابی: السياسة المدنية، اراء اهل مدينة الفاضلة، اخوان الصفء: الرسائل..ابن باجة: الرسائل فلسفية كندی:الفلسفة الأولی، الرازی: المنطق...

کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی[1]، لەسەردەمی مەئمون(813-833) هاندەری فەلسەفە بوە، لە سەردەمی متەوەکیل(846-861) جارێکی تر دەسەلاتی فقهی هاتەوە تەنیشت خەلیفەوفەلسەفەو عاقلمەندان دوور خرانەوە، نازناوی (زانا) دراوە ئەوانەی لە تەلاق ومارەیی دەزانن، بەو شێوەیە ئەو ناکۆکیە توندە لە نێو ئیسلام بە توومەتی توندی کافرو مولحید دەستی پێکردو لە ناو مسیحیش بە سوتان وئیعدام دەستی پێکرد، هەردوولای موعتەزیلەو ئەشعەری یەکتریان تەسفیە کردوە، تەنانەت ئەشعەریەکان لە کتێبی(الأنانة) موعتەزیلەکان بە(مجوس هذه الأمة) وەسف دەکەن[2]، ئیمام غزالیٚ هۆکاری تەکفیرەکە باس دەکاو دەڵیٚ:(تكفيرهم لا بد منه في ثلث مسائل إحديها مسألة قدم العالم والثانية قولهم إن الله لا يحيط علماً بالجزئيات الحادثة من الأشخاص والثالثة في إنكارهم بعث الأجساد وحشرها)[3].

لە کتێبە فقهیەکان هەریەکە لە ئیبن سینا وفارابی وتوسی وجاحیزو سیف الدین ئامیدی وزۆری تر بە کافرو مولحید وەسف کراون، هەندێکی بە نمونە وەردەگرین(بڕوانە پەڕاوێز)[4] ابن تیمیە لە(ج1 درء التعارض) لیستیکی دوورو درێژی لەفەیلەسوف ومدرسەکان ڕیٚز کردوە (جگە لەوانەی سەروو هەریەکە لە: ابن عربی ومبشر بن فاتك، سروردی، سۆفیەکان، ئیخوان سەفا، موعتەزیلە، کلابیە، شیعە، سالمیە، تراقیە..) بەو دەقەش بەشداری لەو هەلمەتە دەکات:(كان ابن سينا وأمثاله وهؤلاء وأمثالهم من رءوس

[1] تهافت الفلاسفة ص7 مقدمة د ماجد فخری.
[2] تهافت الفلاسفة ص26
[3] تهافت الفلاسفة ص89
[4] إغاثة اللهفان ج2 ص267، شفاء العليل ص14، درء التعارض ج1ص289 الجواب الصحيح ج4 ص463 ...

الملاحدة الباطنية إلحادا أعظم من إلحاد اليهود والنصارى)[1] لە هەندێکیانیش فەقیهەکان یەك دەنگ نەبووینە، بەشێك بە کافرو دۆزەخیان داناوە وبەشێکیش بە پیاو چاك وبەهەشتی وەسف کراوە، لە بارەی فەیلەسوفی کورد(سیف الدين امدى551-631ھ)[2] ئەو وەسفە پێچەوانانەی خوارەوەی بۆ کراوە: الشيخ العفيفي: "ما أقبح هؤلاء الطلبة لو كان شيخهم لا يصلي لنصحوه فإن أبى لهجروه، إذ كيف يتلقون العلم من فاسق أوكافر"، الحافظ الذهبي : تارك للصلاة، شاكٌّ في دينه. نفوه من دمشق من أجل اعتقاده[3].

ئەوانەی بە پێچەوانەی ئەوانەش پێیان وابوە زۆر خوایی بوە : ابن تيمية : "لم يكن أحد في وقته أثر تبحرا في العلوم الكلامية والفلسفية من(الأمدى)وكان من أحسنهم إسلاما وأمثلهماعتقادا". إمام العز ابن عبد السلام) : لو ورد على الإسلام متزندق أو مشكك لعين الإمام سيف الدين لمناظرته لاجتماع أهلية ذلك فيه). ابن خلكان: امدى "حسن الاعتقاد"... لەگەڵ زانایانی (علم الكلام)یش (ابو الحسن الأشعري. أبو منصور الماتريدي. الحارث المحاسيي. أبو المعالي الجويني. أبو حامد الغزالي. فخر الدين الرازي. أبو بكر الباقلاني. سعد الدين التفتازانى. أبو عبد الله

[1] درء التعارض العقل والنقل ج1 ص289

[2] خاوەنی ئەوبەرهەمەگەورانەیە: لإحكام في أصول الأحكام. منتهى السول في علم الأصول.ـ ـ المآخذ على المحصول. ـ منتهى السالك في رتب الممالك. ـ دقائق الحقائق.ـ غاية المرام في علم الكلام.ـ كشف التمويهات على الإشارات والتنبيهات.ـ رموز الكنوز.ـ الغرائب وكشف العجائب.ـ النور الباهر في الحكم الزواهر.ـ المبين في شرح ألفاظ لحكماءوالمتكلمين.ـ فرائد القلائد.ـ منائح القرائح مختصر أبكار الأفكار.ـ المآخذ على المطالب العالية.
ـ أبكار الأفكار في أصول الدين...الجدل فى الفلسفة، دقلئق الحقائق فى المنطق...بروانة: موسوعة الفلسفة والفلاسفة ج1ص15

[3] المغني في الضعفاء" ج1 ص293، الميزان ج3 ص358

السنوسي .أحمد الدردير .إبراهيم اللقاني .إبراهيم الباجوري...) کێشە هەبوە، جارجاریش زانایانی ئیسلام لە سیدارە دراون(مەعبدەدی ئەلجەهەنی) لەلایەن عبدالملك بن مروان لەسیدارەدرا(گەیلانی دیمەشقی) لەلایەن هشام بن عبدالملك لەسیدارە درا بەهۆی ئەوەی بە پێچەوانەی جەبریەکان بەسەرۆکایەتی (جهم بن صفوان) کە دەیان ووت هەمو خراپەکانی خەلیفەکانی ئەمەوی خواییەو خوا بۆی نوسیون و ئیجبارن، ئەوانەدەیان ووت نەخێر ئەو زولم وزۆرەی ئەمەوی دەیکا خوا نەینوسیە خراپە بکەن بەو هۆیەوە لەسیدارەدران بەحوکمی دژ بەخوا.

هەرچی لە جیهانی مەسیحیشە زۆر توند تربوە، بەشێك سزادانی مولحیدان لە جیهانی مسیحی بە هەلەیی دەگێڕنەوە بۆ یاساو فتواکانی ئەفلاتوون، دیسان بە هەلەیی باس لەو سزا کۆنانە دەکرێ کە سیدارەکەی (سوکرات) لەسەدەی5ی پ ز بە هۆی یاخی بوون وبێ باوەڕی بوە.

لە دوای ئەوانیش لە سەدەی 12ەوە یان وورد تر لە 1184ز ئەنجومەنێك لەلایەن کنیسە دژ بە (هەرتەقە وبێباوەڕانی زاناو فەیلەسوفان) دامەزرا، دوای بە پێی ڕێنمایی پاپاقەیسەر هیستریاخ زۆربەی بێ باوەڕان لەسەر دونیا دەسوتینران، یان سەریان دەبڕین، بۆ یەکەم جاریش ئەو حوکمە گەیشتە نێو ئیمپراتۆرەکان بەتایبەتی لە سەدەی 16 بەدواوە، بەفەرمی دادگایی دەکران، لەو ناوانەی کە ماون و بەدەستمان گەیشتون بریتین لە: لوکیلی ڤانینی لە 1619، کازیمیرزلە1689، هەریەکە لە (لیژینسکین وجان فرانسوا دی لا بری) لە 1766 لە سیدارە دراون لەگەڵ زۆری تر، ئەوە بەردەوام بوو تاگەیشتە (محاکم تفتيش).

پرۆتستان زۆر توند تر بوو لەکاتۆلیك زیاتر دژی توێژینەوەی سروشت بوو، کالڤن وپرۆستان(سیرفیتیۆس)ی سوتاند لەو کاتە بوو کە خەریك بووسووڕی

خوێن بدۆزیتەوە وەك ئەنجلس دەڵێت[1]، کاتۆلیکیش جۆردانۆیان سوتاند.
لەلای مسیحی کوشتن وسوتاندن لەلای فقهی ئیسلام تەکفیرکردن بوو، لەلای یەهودیش (موسی بن میمون)لەلایەن حاخامەکان بەکافر هەژمارکراون، هەرچەندە ئەسلی ئاین بە هۆی بیرو ڕاو ئاینی وبێ ئاینی سزای تیدانیە (خودائەو ئازادیەی پێداوە)، لە پاش هەمو ئەو سزایانەی مسیحی وتەکفیری ونەفی کردنی زاناو فەیلەسوفە ئیسلامیەکان دەردەکەوێ کەبەشێکی زۆری ئەوانە مولحید نەبووینە، تەنانەت کە برۆنۆ لە17فبرایەری 1600سوتینرا باوەڕێکی بە هێزی بە خوا هەبوەو شوبنهاوەر دەلی من لەوی فیرە ئەوەبووین کە سروشت هونەرە نەك هونەرمەند وکەمێك ئاینم وەرگرت[2]، ئەو بۆچوونەی برۆنۆ لە ڕۆژهەلاتەوە دەبێتە ئەدریسی کتێبیکی شیخ نەورەسی بەناوی(سروشت هونەرە یان هونەرمەند)، سوکرات لەسەر بێ ئاینی سوتینرا کەچی ئیستا سوکرات لەسەر کەلتوری فەلسەفەی ئاینی هەژمار دەکرێ. دەریش کەوت فەیلەسوفانی ئیسلامی ویستویانە ئاین لە(فقهی ئەحوال شخصی) قەتیس ودابڕێنراو نەمینیتەوە، بەڵکو بچێتە پێشڕەوایەتی زانست وفەلسەفەو تەواوی بەرهەمی عەقڵی ئادەمیزاد، وادەردەکەوێ ئیمام غەزالیش بەتەواوی زانیاری لە بارەی ڕای فەیلەسوفانی ئیسلامی نەبووبێ کە لە کتێبی(تهافت الفلاسفە)وەسفی کردوون وبوویتە سەرچاوەی مێژووی ئیسلامی دژبەوانە، ابن رشد بە ووردی هەمو ئەو تیگەیشتنانەی ئیمام غەزالی بەهەلەیی نەقلی کردوە بۆی ڕاست دەکاتەوە، لەکۆتایدا دەڵێ غزالی بە هەلە ئەوانەی تکفیر کردوە، بەڵکو باش لە

---

[1] ديالكتيك الطبيعة ص32
[2] المثالية الألمانية ص331

فەلسەفەکەیان نەگەیشتوە[1].

ئەگەر بە ووردی ئەو کتێبانەی سپینوزا (رسالە فی الاهوت والسیاسە) بخوینیەوە، شیعری ئەبوعەلاو خیام وزۆری تر لەوانەی بە ملحد هەژمار کراون دەبێ پێداچوونەوەیەکی گشتی بەو حوکمانە بکەین، دەبێ زۆر ئاگاداری گواستنەوەی بۆچونەکانی ئەو سەردەم بکەین کەم تر وەك دەق وەرگیراوە بەڵکو زیاتر پشت بە (گۆتە)بەستراوە، تەنانەت هەڵەی وا گەورە کراوە لە (نەقل وگواستنەوە) وەك نمونە کتێبی (اثولوجیا ارسطو) لە ئەسل ئەفلاتونیە بە هەلە وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبی بوە بە ناوی ئەرستۆ، فارابی لەسەر ئەو هەڵە مەزنە بینای کتێبێکی کرد بەناوی(الجمع بین الرأی الحکیمین)، لەو کتێبە رای وێك چووی لەنێوان ئەفلاتون وئەرستۆی(گوایە) دۆزیەوە کەچی یەك خاوەنی هەبوە، لەکۆتای کتێبەکەی فارابی دەڵێ: رای یۆنانیەکان نزیکە لێك ئەوەندە لێك جیانیە وەك باوە[2].

تێکنەگەیشتنێکی ترسناك لە نێوان فەقیهو فەیلەسوف ڕوویداوە، ڕەنگە هەردوولا بەرپرسیار بن، هەریەکە ویستویەتی بوونی بەرامبەر لاواز بکا تا ڕادەی ئێرەیی(حەسودی)[3]، ئیمام غزالیّ دەڵیّ ئەگەر حەسودی 10 بەش بیت نۆی زانایان بردوویانە،، ئەو کێشەیە هەر لەنێوان فەلسەفەو فقە نەبوە لە نێوان فقە خۆبەخۆشی بوە، ئەحمەدی هاتونە شافیعیان فەلاقەکردوە، سونە شیعەی فەلاقەکردوە، شیعە سونەی فەلاقە کردوە..زۆربەی ئەوانە لەشاری بەغدا ڕووی داوە.

ئینجا بەشێك لە فەیلەسوفانی ئیسلامیش جار وایە لە هاوسەنگی

---

[1] ابن رشد- فصل المقال.. ص38

[2] مقدمة : اراء اهل المدینة الفاضلة ص17.

[3] ابن رشد- فصل المقال.. ص12

(عەقلانی) و (نقلانی)یان نەپاراستوە، تا ئەو ڕادە دروشمی (اخوان الصفاو) ئەوەبوو:(متی انتظمت الفلسفة الیونانیة والشریعة العربیة فقد حصل الکمال) دەیان ووت شەریعەت پڕ بوە لە خلت وخار ونەفامی تەنها بە فەلسەفەی یۆنانی پاك دەکریتەوە[1].

لە نمونەی نویدا(محمد ئەرگۆن)وەك بیریارێکی گەورە زۆر بەووردی وزانستیانە دەست نیشانی دەردەکانی ئاینی ئیسلامی لەو سەردەمە کردوە، ویستویەتی چاکسازی بکا لە فکری ئیسلامی، بەلاّم عەقلانیەتەکەی ئەوەندە ڕەت بوە باوەڕی وایە وەك مادیەکان سەرەتای کۆمەڵگە بریتی بوە لە فرە خوایی ئینجا بوە تاك خوایی[2].

سوکارنوی سەرۆکی ئەندونیسیا بەهەمان شیوە باوەڕی بە ئاین وخوا هەبوە بەلاّم بەوجۆرەی(وەك ئەرگۆن ئاسا)دەڵێ : لەسەردەمی ڕاوژگاری ئەوا وایان دەزانی خوا لە ئەشکەوتەکانە، لەسەردەمی بەخێو کردن وایان زانی خوا لە نێو مەڕومانگاکان دەژین، لەسەردەمی کشتوکاڵیش خوا بەجۆرێکی تر هاتە پێش چاو...[3].

لایەنگیری عەقلێ بەو ڕادەو فەرامۆش کردنی لەلایەکی ترەوە لاسەنگیەکی ترسناك دەدات، وا دەکا فقیهو پیاوانی ئاینی زیاتر لە فەلسەفە دوور کەونەوەو بە پێچەوانەش، کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیە هەریەکە لە فقهو فەلسەفە بۆ ژیانی ئاینی گرنگن، فەلسەفە بینای تەعمیرو تکنۆلۆژیا بۆ کۆمەڵگە فەراهەم بکا فقهیش ڕێکخستنی بە ئەستۆ وە بگرێ، دەسەلاتی

---

[1] - موسوعة الأدیان في العالم- ج: الفرق الإسلامیة.. ا ص78

[2] محمد ارکون- نحونقدالعقل الإسلامی ص289 لەکتیبەکەی تری(قضایافی نقد العقل الدینی ص280 باس لەوە دەکا چۆن لە پیش ئاینی یەهودی یەکەم جار لە میزۆپۆتمیا بیرۆکەی یەك خوایی هاتە کایەوە.

[3] د محمد ناصر-الدین واللادینیة ص44-45(محمد ناسر سەرۆك وەزیرانی ئیشوی ئەندۆنیسیا بوو).

ئەو سەردەم نەهاتوە مەیدانەکانیان بۆ لێك جیا بکاتەوەو بیکاتە پسپۆری جیا، ئەوکاتی لە جیاتی(ناکۆکی) دەبوونە پالپشت بۆ یەکتر،هاوسەنگی (زیکروفیکر)ستاندەر نەبێت لادانە ،سمرقندی لە زاری(ابابکر الوراق)دةلیَت:**وقال من اکتفی بالکلام من العلم دون الزهدالفقه تزندق،ومن اکتفی بالزهد دون الفقه الکلام تبدع،ومن اکتفی بالفقه دون الزهدوالکلام تعسف)** ، لەو سەردەمە مسیحی ئەو کێشەیەی چارەسەرکردوە، تەنانەت لەگەڵ یەهودیش کەوتنە شێوە بەرەیەکی زۆر جوان، هەڵساون هەردوو کتێبی تەورات وئینجیلیان لە یەك کتێبی پیرۆز کۆکردۆتەوە، ناویان لە(تەورات) ناوە(عهد القدیم) ناویشیان لە (ئینجیل) ناوە (عهد الجدید)، کەچی لە ناو فقهی ئیسلامی هەروا کۆك نین، لە نێوان فەلسەفەو فقە، لە نێوان شیعەو سونە، لە نێوان سۆفی وسەلەفی، لە نێوان عەقلّ ونەقل..، کەچی ئەو ناکۆکیە دروست کراوە ئەسلی نیە.

کێشەیەکی تر لەلای رۆشنبیر و توێژەرانی جیهانی ئەوەیە کەمتر قورئانیان بەرچاو کەوتووە، وەرگێڕانیش تا ئەم دواییە بۆ زمانەکانی تر حەرام بووە، یەکەم وەرگێڕان بۆ زمانی ئینگلیزی دەگەرێتەوە بۆ سالی 1649[1]، بۆیە کە گەڕاونەتەوە سەر مەرجەع گەڕاینەوە سەر تەورات و ئینجیل و مەزمور و ڤیدا...یان لە باشترین دۆخیاندا هەندێ ڕای فقهیان بەدەست گەیشتوە، کتێبە فەلسەفی وعەقلانیەکانی نەمابوو نەلە جیهانی ئیسلامی نەلە جیهانی مسیحی، بۆ نمونە تا سالی1859 ئنجا لە میونیخی ئەلمانیا جارێکی ترکتێبی ابن رشد چاپ کرایەوە ئەگینا بزر کرابوو[2]. هەروەك چۆن لە

[1] بڕوانە : عزالدین حایك-ترجمة القران الکریم –اوراق الندوةالدولیة..18ایار1998 ص29 هتروةها : Ilyas, Asim.1990."Old and Contemporary Translations of the Holy Quran". In Op. Cit. p.1

[2]ابن رشد- کتاب فصل المقال وتقریر مابین الشریعة والحکمة من الإتصال –ص1 تمهید.

ئەوروپا کتێبە فەلسەفیەکانی ئیسلام دەسوتینران ئاواش لەنێو خەلافەتی ئیسلامی، بەتایبەتی سەردەمی (منصور- لە ئەندەلوس سەدەی 12)، بە هاندانی فقیهەکان کار لەسەر حرامی فەلسەفە کراو و کتێبە فەلسەفیەکان سوتینران وقەدەغەش کران[1]، زیاتر رەواج بە کتێبە کلاسیکی وخرافیەکان درا، ئەو جۆرە کتێبانەش وەڵامی مەنتیقی ئەو توێژەر و زانایانە پێ نەدەدرایەوە، لەسەر ئەو بنچینەیە سپیونوزا توێژینەوەیەکی لەبارەی ئەو کتێبە پیرۆزانە کرد لە (رسالە اللاهوت و السیاسە) بەسەدان هەڵەی زانستی لێ تۆمارکردوون و دەرگای رەخنە لەسەر ئەو کتێبانە کرایەوە، بەو شێوەیە زانا و رۆشنبیران گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە ئاین بەڵگەی بوونی خوای زۆر لاوازە.

6- هەر لەدوای دورکەوتنەوەی ئاین لەسەرچاوەکەی لە رووی سیاسی بوویتە ئامرازی چەوسانەوە و هەڵخەڵەتاندنی خەڵك، بینراوە بەناوی ئایینی پیرۆزی و شەرعیەت بەدەسەڵاتێکی دیکتاتۆری و زۆردار دراوە، عادەتەن بۆهەر دەسەڵاتێکی ئاواش هەندێ پیاوانی ئایینی (وعاظ السلاطین) لەتەنیشتیان بووینە.

لەسەردەمی خەلیفەی موسوڵمانان (ولید بن یزید88-126ھ) کە ئیبن قوتەیبەوزۆربەی شارەزایان بە بێ باوەڕی وەسفی دەکەن[2] شیعری هەیە گاڵتەجاڕی بە خواو قورئان دەکا کاتێ لە قورئان بینیویەتی باسی (سزاو پاداش)دەکا دەڵێ:

تذکرنی الحساب ولست ادری　　　احقاماتقول من الحساب

---

[1] ابن رشد- فصل المقال..ص12

[2] ابن قتیبة الدینوری- المعارف –تحقیق: ثروة عکاشة ص366، د محمد عمارة لة(المعتزلة والثورة ص72) بة زةندیقی وةسف دةکا.

فقل لله يمنعني طعامي          وقل لله يمنعني شرابي[1]

کەچی فەقیهی خۆی هەبوو بەپێ ی خواستی سیاسەتی ئەوکات ملی ئایینیان بۆ خوارکردونەتەوە تا ڕادەی دەستکاری فەرمودە و ئەسلی ئایینی (نمونە: فەزلی عەرەب بەسەر میلەتانی تر)، یان بەلای کەم لێی بێ دەنگ بووینە تا ئەو ساتەش، لەسەر ئەو بنچینەیە بەشێکی زۆر ئایین بە ئامرازی چەوسانەوە وەسف کراوە، لەوەوە (ئاین تلیاکی گەلان- الدين افيون الشعوب) لەلای مارکس هات[2]، لە پیش ئەویش بارون دولباخ لەکتێبی(المسيحيه من غير ستار) ووتبوی ئاین بۆچەوساندنەوە دروست کراوە[3]، دیمەنی ئایین زۆر ناشرین کرا.

7- لەبەرامبەر خالّی (5) کۆمەڵێك ڕێکەوتن سیستەمی نوێ هاتەکایەوە، لەهەموویان سەرکەوتووتر (سیستەمی دیموکراسی) بوو کە بوە مۆدێڵی سەردەم، لەهەمان کات بووە هۆی پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی و بەرجەستەی مرۆڤایەتیش، لەوەوە سیستەمی عەلمانی جێ ی سیستەمی ئایینی گرتەوە، وا دەرکەوت کە ئایینی خوایی نادادگەربێت، لەبەرامبەردا ڕێکەوتن و دیکۆمێنت و جاڕنامە بەشەریەکان مرۆڤانەتر بن، ئەوەش کاریگەری زۆر خەستی کردە سەر چین و توێژانی فکر ڕۆشەن. بۆ نمونە بۆ میلەتانی داگیرکراوو(بەکوردستانیشەوە) دەبینین کۆمەڵێك مادەو بڕیار

---

[1] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72.

[2]. دەقی ووتەکەی مارکس لە کتیبی(نحو نقد لفلسفة الحق الهيجلية- 1844م) وانوسراوە: إن الهم الديني هو في الوقت نفسه تعبير عن هم واقعي واحتجاج علي هم واقعي. إن الدين هو آهة الخليقة المضطهدة، هو قلب عالم لا قلب له، مثلما هو روح وضع بلا روح. إنه أفيون الشعب.

[3] روجيه غارودی –ماركسية قرن عشرين ت:نزيه الحكيم ص143، وا پێدەچی لە بنەچەدا ئەو ڕایەلەلایەن (کریتیاس )هاتبێت کە دەلێ: ئاین لەلایەن دەسەلاتدارەوە داهینراوە بۆ زیاتر ملکەچی هاوولاتیان.

هەیە لە نیودەولەتی بۆ مافی چارەنوسی گەلان وەك: مـادەی(1) و مـادەی (55) ی میسـاقی نەتـەوە یـەکگرتوەکان، مـادەی60ی(النظـام الـداخلي المؤقت لمجلس الأمـن)، هـەروەها بریارەکـانی: ژمـارە 1514 خـولی(15) لـە14/دیسـمبر/1960، بڕیـارِی ژ:2105 خـولی (20) لـە1965ز، بریاری ژ:2625 خولی 25 لە24/ئۆکتۆبـەر/1970، بریـاری ژ:3070 خولی28لە 1975، هـەروەهابریاری 3314سـالی 1974... لەهـەمان ئەنجوومەن دەرچووە، ئینجا پیشوو لە 14 خالەکەی ویلسونی ئەمریکی لـە سـاڵی 1918 ولێدوانـە هاوبەشـەکەی بریتـانی - فرنسـی لـە 1918، بنەماکانی شۆڕشی ئۆکتۆبـەری 1917ی رووسـی و شۆڕشـەکانی پیشـوی ئەمریکی 1776 و فرنسا 1789 هاتووە، زیاتر لـەوەش هـەر 3 مـادەی 62 و63 و64ی سیڤەر و مادەی 16ی ئینتـداب بەسـەر عـیراق و..زۆری تریان هەیە بیکەنە بەلگەو منەت بەسەر میلەتانی ژێر دەسـتەو بزوتنـەوەی کوردایەتی ودەڵێن ئێمەی(مولحید یـان عـەلمانی) بـە پالپشـت بەوانـەو بـۆ میلـەت ئـیش دەکـەین ئیـوەی ئـاینی چـیتان هەیـە، ئایـا لـە ئـاین وەك وەسیقەی(رزگاری) بۆ کورد چ هەیە؟!!

8- گەشەی عەقلْ وزانستی وشکستی ئاینی : سەر هەلدانی کۆمەڵێك تیـۆری زانستی دژ بە ئاین بوون و هەمولایەکیش باوەڕیـان پـێ هینـابوو، لەوانـە: دەرکەوتن و زاڵبوونی تیۆری (گەردونی الساکن –یان- قدم العالم) سەردەمی بەتلیمۆس بەناوی (مەجەستی) وا دەرکەوت ئـەو گـەردوون و جیهانـە هـەر بووە و هەردەشمینێ، بواری بـۆ ڕای ئـایین نەهێشـتەوە کـە ئـەو بوونـەوەرە دروسـتکراون و تەمەنیشـیان هەیـە، ئـەوە لـە بنەچـەدا بەشـێك بـوە لـە بیرەباوەڕی ئاینی سۆمەریەکان، پێیان وابوە ئەو ڕێسایانەی گەردوونی لەسەر

دامەزراوە بۆ هەتاهەتایە[1]، لە تەوراتیش وا هاتوە (3 والفاهمون یضیئون کضیاء الجلد والذین ردوا کثیرین الی البر کالکواکب الی ابد الدهور)[2]، لەویش وا پیدەچی لە مەزمورەکانی ح.داود وەرگیرابێ بە جۆرێك لە جۆرەکان کەلەمەزموری ژ:78 دەڵێ: (کالأرض اسسها الی الأبد )، لێرەدا بوارێکی زۆری بۆ بێ باوەڕی دروستکرد، چونکە وادەرکەوت کە چۆن سروشت ڕوداو دروست دەکات نەك خوا ئەوا (خەلق)یش لە(خوا) سەنرایەوە. لەوەشەوە گومان لە دوارۆژ و باقی غەیبیەتەکانی تر زۆر خەست بوویەوە، تا وای لیهات عەقڵ ونەقل، زانست و ئایین، تەکنەلۆژیا ودوعا، موختەبەروفیقە، مۆدێرن و فکری کۆن،... کەوتنە ڕوو بە ڕووبوونەوە، وەك (ابو علی المعری) و (هوایتهد-لە سەدەی بیست دووبارەی کردەوە) ووتیان: سەرکەوتن بۆ زانست و مۆدێرنەو شکستیش بۆ ئاین[3].

هەرلەوەشەوە (همنکوای) دەڵێ بەسروشتی خۆی هەمو عاقلێك مولحید دەبێ، بی عەقلیش ئاینی دەبێ، مارکس پێی وایە بۆ ئەوەی ئایندار بیت پێویستی بە ئەقلێکی لەنگ هەیە ئەقلی دروست ئاینی قەبوول نیە[4]، لە شوینیکی تر لە(ڕەشنوسێکی سالی 1854) دەڵێت بۆ ئەوەی مرۆڤ پێی بووترێ مرۆڤ دەبێ مولحید بێت [5]، واتە بۆ جیبوونەوەی ئاینی لەکۆمەڵگە

---

1جفري بارندر- المعتقدات الدينية لدى الشعوب - ترجمة :د .إمام عبدالفتاح إمام مراجعة :د . عبدالغفار مكاوي ص12

2عهد القديم -سفر دانيال اصحاح 12

3شبلی عیسمی لە(العلمانیه والدوله الدینیه ص105) دەلیت شیخ محمد عبدەش ئەو بۆچوونەی هەبوە: ((اذا تعرض العقل والنقل أخذ بما دل علیه العقل)تا ڕادەیەك (رازی)یش ئەو بۆضونەی هەبوو.

111 کارل مارکس-بؤس الفلسفة ص256نامەکەی مارکس بۆ ئینینکۆف.

5 مارکسیة قرن عشرین ص145

پێویست بە عەقڵی لەنگ هەیە، مەرگی ئاین لەگەڵ پێشکەوتنی عەقلە. زۆربەی موفەکیرانی عەلمانی عەرەبیش ئەو ڕایەیان هەبوە لە نوێیەکەیان عبدالمنعم الحفنی دەڵێت: سەرم سوڕماوە لە هەندی عاقڵمەند چۆن یەکسەر تەسلیمی فەلسەفەی مادی نابن کە تاکە چارەنوسیانە[1].

ئەگەر بەورد تر سەرنج بدەین دەبینین ئیمانداران لەسەرەتادا دژی دەزگای چاپ بوونە یەکەم جار لە سالی 1610دەزگای چاپ هاتە لبنان زانا فقهیەکان یەکەم جار حرامیان کرد گوتیان ئەوە دروستکراوی کافرە، بەرەبەرە شلیان کردو ووتیان تەنها قورئان نابێ چاپ بکرێ دوای ئەویش نەما، دیسان بۆ رادیۆ، دوایی چونە سەرمانگ، بەکورتی دژی خوێندنیش بوونە و بە عیلمی شەیتان وەسفیان کردووە، دوایی تەسلیمی هەموویان بوون، هەرە دواییەکەی کە زۆر دژی حیزب بوون، ئێستا وا حیزبی ئایینی دروست دەکەن..

ئەوانە هەموو ئەوە پیشان دەدا کە عەقڵ و کاری مرۆڤ ئەسلە و ئایینیش لاواز و شوێنکەوتەیە وجێی لەسەردەمی مودێرنەو شارستانی نوێ نابێتەوە.

9- بینرا ئەو میللەتانەی کە زیاتر پەیوەستن بە ئایین ئەوا زیاتر دواکەوتون، ئەو پرۆسەیەش لەسەرەتای عەولەمە و سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن و سیستەمی جیهانی زیاتر ڕوون تر دەرکەوت، لە ئەوروپا تا لە ئایین ڕزگار نەبوون گەشەیان بەخۆ نەبینی و تابوونە پێشڕەو، ئەوانەی زیاتر پەیوەست بوون بە ئایین بوونە قوتابی و گوێگری ئەوانەی پەیوەست نەبوون بە ئایین، لەوەوە تەنزیری ئیستیعمار ئەوروپای مامۆستا و بنەمای(ملتون)

---

[1] المثالية والمادية وازمة العصر ص95

سەری هەلدا[1]، تا ئەو رادەیە ولاتانی عەرەبی و ئیسلامی قایل بوون بچنە ژێر سیستەمی ئینتیدابی کە لەبەشی (1)ی مادەی (22) ی کۆمەڵەی گەلان دەرچوو، ئەوان ببنە قوتابی وئەوروپیش ماموستاو فێرکەر، لەسەر ئەو بنچینەش وولاتانی عەرەبی ئیستا دروست بووینە، لەوەش زیاتر مامۆستایان بۆ ئەو میللەتانەی مسولمان نارد کە فێری دەوڵەتداری و پێشکەوتنیان بکەن، لۆرانسی بۆ ولاتانی جەزیرەی عەرەب، بۆ عێراق هەریەکە لە (مس بیل) و (برس کۆکس)بۆ عیراق...، تا ئەو ساتەش وا بەدی دەکرێ لەهەر شوێنێك کە کۆمەڵێك میللەت تێکەڵ دەبن دواکەوتوەکانیان ئەو میللەتەیە کە زیاتر بە ئایین پابەندە.

** ** ** **

لە راستیدا هۆکاری بێ باوەڕی گەلێك زۆرە بەئەندازەی ئەوەی (ان الله علی کا شئ شهید) ئەوا بەدیویێکی تریش لەهەموو شتێك بێ باوەڕی لێ دەخوێندرێتەوە، بۆیە لەگەڵ زەمان و زەمین دەگۆڕێن، ئەوەی ئێمە دەست نیشانمان کردووە هەوڵمان داوە کۆکراوەی کۆن و نوێ بێت لەتەوەری سەرەکی، پوختەی ئەوەیە لای مولحید وادەرکەوت:

1- باوەڕداران بەڵگەی بوونی خوایان لاوازە، زیاتر ئاین لە نەزانی وترس وبزری هۆکاری ڕووداوەکان هاتوە.

2- ئەو خوایەی باوەڕداران باسی دەکەن حوکمی بزرە، هەرچی حوکمی دەوڵەت و ئیمپراتۆر و سروشتە ڕوونە.

[1] د علی وردی –لمحات من تاریخ العراق... ج5 ص56 بنەمای ملتۆن وادەلێ: ((لا تدع بریطانیا تنسی رسالتها في تعلیم الأمم کیف تعیش))،

3- ئەو کتێبە پیرۆزانەی دەڵێن ئاسمانیە، ڕەنگدانەوەی زەمەن و زەمینی و قۆناغی مێژووی پێوە دیارە بۆیە بەشەریە نەك غەیبی.

4- ئایین بەشێکە لەچەوساندنەوە و دواکەوتووی و ناتەبایی، یان وەك مارکس لەو بارەیەوە دەڵێ: نەزانینی لیکدانەوەیەکی وورد بۆ کێشە ئابووریەکان لەلایەن هەندی فەیلەسووف بە ووشەی بریقەدارو لێلی وەك:خودا وبەهەشت ودۆزەخ پڕی دەکەنەوە[1].

5- ئەو جیهانە دروست نەکراوە و هەر هەبووە و هەر دەمێنێ (دهریە).

6- ڕووداو و سیستەمی سروشتی و زیندەکی بەیاسای سروشتی کاردەکەن نەك بەئەمری خودا.

هەموو ئەوانە زەمینەیەکی هەمیشەی بۆ بەرهەم هێنانی فەلسەفەی مولحیدی (نەك مولحیدی نەفامی بەڵکو مولحیدی عاقلیش) پەیدا دەکا.

## ئاین بە نەزانی هاندەری فەلسەفەی مولحیدیە

_زۆر باسمان لە لیك جیاکردنەوەی (زەوی وئاسمان، دین وژین، ئیرادەی سروشتی وئیرادەی خوایی،..)کرد، پرسیارەکە ئەوەیە کێ ئەوانەی لیك جیاکردۆتەوە؟ لە دەقی ئەسل وپەیامی ڕەسەن لێك جیا نەکرایتەوە، ئەوە مرۆڤە(ڕەنگە ئاین پەروەربیت) گەلی جار ویستویەتی بەدلسۆزی خزمەت بکا نەیزانیوە، فەقیە وئیمامی گەورەحەزیان نەکردوە ئەوڕووداوە گەورانەی گەردوونی وزەمینی وباران ورزق وهۆی مردن..بدەنە پال سروشت، نەیان توانیوە مەزنی خودا بە مەزنی دروستکراوەکانی خودا ببەستنەوە، سروشت ویاساکانی سروشت دروست کراوی خوایە، بۆیە ئەو ڕووداوانەیان داوەتە ئەمری خودا کە لە قورئان باسی (امر)ی

[1] کارل مارکس-بؤس الفلسفة ص257

کردوه، بەو هۆیەشەوه خەڵکی ڕەشۆکی وای زانیه هەردەم له پەیوەندیدایـه لەگـەڵ خوای خۆی وزیاتر لێـی ترسـاوه، ئەگـەر خـوا لـەو ڕووداوانـه دوور خەیـەوه ئـەوا وادەردەکەوێ که خوا دووره. بۆیه ئەو جۆره فقهه لەلایەك خزمەتی کردوه بەڵام لـه سەردەمی پێش کەوتنی زانست دەبێته بەڵا، لـه پێشـودا باسمـان لـەوه کـرد چـۆن سەربردەی بروسك وهەوره تریشقه هۆی ئاینی وهۆی زانستی چەنده لێك جیـا بـوو ودوایش زانست بردیەوەو تەفسیره ئاینیەکه(یان ووردتر ئەوەی بەناوی ئـاین ووتـرا) وەهم دەرچوو.

ئیستا دێینه سەر هەندێ نمونەی بالآی تر، لـەبارەی پرسـی فەلـەك بـه ڕوونـی ئەوەی لێ دەخوێندرێتەوه که نەیان زانیه ئەستیرەو خۆر بـه ملیـۆن ملیـۆن جارلـه زەوی گەورەترن، بەڵکو بەچاو بینیویانه ئەوانه بچوکن، چـەند نمونەیـەك لـه فقهـی ئیسلامی وتەورات وئینجیل وەردەگرین که چۆن توشی هەڵەی زۆر کوشنده بووینه، لەوەش کوشنده تر بەناوی (پەیام) قسەیان کردوه:

# 1-لەبارەی ئاسمان:

گوایه خۆر لەسەر پێچکه دەڕواو جارجار دەکەویته ناو دەریـا..(روی أبـو جعفـر عن ابن عباس عن النبي في خلق الشمس والقمر وسيرهما فإنهما على عجلتين لكل عجلة ثلاثمائة وستون عروة يجرها بعددها من الملائكة وأنهما يسقطان عن العجلتين فيغوصان في بحر بين السماء والأرض فذلك كسوفهما ثم إن الملائكة يخرجونهما فذلك تجليلهما...)[1]، ئەوه لەکاتێکا ئەو زانیاریانەی لەو سەردەمی هـەبوه (..کـل فـی فلك یسبحون..)، هەتا لـەلابی (ئیمـام غـزالیش)وەك لـه رەدی فەلسـەفه دەڵێـت (کقولهم: إن کسوف القمر، عبارة عن انمحاء ضوء القمر بتوسط الأرض بينـه وبـين الشمس، والأرض کرة والسماء محيطة بها من الجوانب، وإن کسوف الشـمس، وقـوف

[1] تاريخ الطبری ج1ص21

جرم القمر بين الناظر وبين الشمس عند اجتماعهما في العقيدتين على دقيقة واحدة)[1]. له تەوراتیش باس لەکەوتنی ئەستێرە دەکا بۆ سەر زەوی! (.. وظهرت آية اخرى في السماء.هوذا تنين عظيم احمر له سبعة رؤوس وعشرة قرون وعلى رؤوسه سبعة تيجان 4 .وذنبه يجر ثلث نجوم السماء فطرحها الى الارض...) هەر لەو کۆمەلە ئایەتەهاتوە (وظهرت آية عظيمة في السماء امرأة متسربلة بالشمس والقمر تحت رجليها وعلى راسها اكليل من اثني عشر كوكبا 2 وهي حبلى تصرخ متمخضة ومتوجعة لتلد) [2] لە ئینجیلیش بە هەمان عەقلیەتی (ڕووکەشیانەی سەر زەمین ) وەسفی ئاسمانیان کردوە زۆر خراپ تێکەوتون و وا هاتوە:(ونجوم السماء سقطت الى الارض كما تطرح شجرة التين سقاطها اذا هزتها ريح عظيمة)[3]، نمونەیەکی تر لە فقهی ئیسلامی لەبارەی ئەستێرەو بۆنەی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (والسماء والطارق... النجم الثاقب)وەرگرین دەڵێ ئەستێرەیەك لە ئاسمان کەوتە خوارەوە کەوتە ناو قاپە ماستەك و بوە ئاگر [4]. ئینجا نەشیان زانیوە لە نێوان خۆرومانگ وئەستێرە کامیان ڕووناکی دەرەو کامیان ڕەنگدانەوەی ڕووناکیەکەیە لەو ئایەتەی ئینجیل بە پێچەوانەی هیناوە (فان نجوم السموات وجبابرتها لا تبرز نورها.تظلم الشمس عند طلوعها والقمر لا يلمع بضوءها)[5] لەو سۆنگەوە چینیەکان دەڵێن لەسەردەمی پاشاهاسیا (نزیکەی 20سەدە پ ز) لەناکاو 10خۆر پێکەوە پەیدا بوون بەڵام پاشا فەرمانی کرد خۆرە زیادەکان بە تیر بخەنە خوارەوەو خستیانە خوارەوە[6].

---

[1] تهافت الفلاسفة-المقدمة الثانية ص5

[2] كتاب المقدس، عهد القديم -رؤيايوحنا(12-3)

[3] رؤ 6: 13 عهدجديد.

[4] ابى الحسن على الواحدى النيسابورى —اسباب النزول- ص250

[5] ا كتاب المقدس، عهد الجديد(اش 13: 10)

[6] ديزاینی مەزن ل221

ئەوانە بە پێی زانستی سەردەم وعەقڵی مرۆڤی ئیستا بە خرافیات هەژمار دەکرێت، دەبێ ئەوە بزانین ئەوەی کەمێکی لە فەلسەفەو زانست زانیبێ زانیویەتی ئەو زانیاریانە بێ بنەمان، تەنانەت ئیمام غزالی کە (لەدژی فەلسەفە) کەمێکی فەلسەفە خویندیتەوە زانیویەتی خۆر وا بچوك دەردەکەوێ بە دەیان جار لە زەمین گەورە ترە وەك لە رەدی فەیلەسوفان دەڵێ:(والشمس التي يقال إنها كالأرض مائة وسبعين مرة أو ما يقرب منه )[1] یاقوت حەمەویش باس لە دیزاینی گەردوون دەکا ونەخشەیەکی زانستانە تر لەو خرافیاتانە باس دەکا ودەڵێ:(وقال قوم الأرض تهوي إلى ما لا نهاية له والسماء ترتفع إلى ما لا نهاية له. وقال قوم إن الذي يرى من دورانا لكواكب إنما هو دور الأرض لا دور الفلك)[2] ابن کەسیریش ئەوەی گواستۆتەوەو دەڵێ بەشێك دەڵێن خۆر لەکاتی ئاوابوونی ناچیتە دەریاو سوجدە نابا بۆ خوا بەڵکو لە پیش چاوی ئێمە بزر دەبێ ئەگینا هەر دەڕوا[3]، لەو بارەیەوە زانیاریەك خراوەتە پاڵ ئیمامی علی لەوەڵامی دوری نێوان ڕۆژئاواو رۆژهەڵات ووتویەتی: (مسافة بين المشرق والمغرب، فقال: مسيرة يوم للشمس)[4]، هەرچی خاوەنی ئەو وەڵامە بیت نەیزانیوە زەوی بەدەوری خۆی دەسورێ رۆژهەڵات ورۆژئاوا پیك دەهینی نەك سوڕانی رۆژ وئەو وەڵامە.

لە باسی (مەجەڕە)ی ئاسمان زۆر خراپ تر تێکەوتون وەڵامی پرسیاری هەرقەلی ڕۆم وادراوەتەوەکە(مەجەڕە) بریتیە لە دەرگای ئاسمان لە شوێنێکی تربە:(هی لعاب حية تحت العرش) [5]،تەنانەت باس لە دۆخیکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەکرێ گوایە بەهەشتیەکانی فردوس گوێیان لە چیرچیڕی عرش دەبێ کاتێ خودا خۆی دەجولێنی

[1] تهافت الفلاسفة-مقدمة الرابعة ص23
[2]ياقوت حموی –معجم البلدان ج1 ص2.
[3]ابن كثير –البداية والنهايةج1 ص45
[4] على ابن طالب-الف كلمة المختارة-دار الأندلس، ط21980 ص52
[5]البداية والنهاية ج1ص52

لەسەر عرش !!کەچی لە قورئان باسی شوینی بەهەشت واناکا لەژێر عرش بێت وگوایە لەنێوان جیهانی ئێمەو عرش بێت ،دەڵێ (وجنة عرضها كعرض السماء والارض )ئەو (ك) هیە مانای وایە بەشیك نیە لەو جیهانە بەلكو پانتاییەكەی وەك ئەو پانتاییەیە .

## 2- لەبارەی زەمین:

زۆربەی مێژوونوسی (نزيك فقهى) سەربردەی دروست بوونی زەوی وچینەكانیان باس كردوە، وای تێگەیشتون كە زەوی وئاسمان هاوتەریبن وەك لە پێش چاو وادەردەكەوێ، جوگرافی ناسەكانی ئیسلامی (كەنزیك بووینە لە فەلسەفە) ئەو بۆچوونەیان نەبوە، یاقوت حەمەوی ئەو بۆچوونانەی لە بارەی زەوی وژێر زەوی وهەلكشان وداكشانی دەریاو بوومەلەرزە بە گالتەجاڕی باس كردوە، بەو شێوەیە:

(وفي أخبار قصاص المسلمين أشياء عجيبة تضيق بها صدور العقلاء أنا أحكي بعضها غير معتقد لصحتها. رووا أن الله تعالى خلق الأرض تكفأ كما تكفأ السفينة فبعث الله ملكا حتى دخل تحت الأرض فوضع الصخرة على عاتقه ثم أخرج يديه إحداهما بالمشرق والأخرى بالمغرب ثم قبض على الأرضين السبع فضبطها فاستقرت ولم يكن لقدمه قرار فأهبط الله ثورا من الجنة له أربعون ألف قرن وأربعون ألف قائمة فجعل قرار قدمي الملك على سنامه فلم تصل قدماه إليه بعث الله ياقوتة خضراء من الجنة مسيرها كذا ألف عام فوضعها على سنام الثور فاستقرت عليها قدماه وقرون الثور خارجة من أقطار الأرض مشبكة تحت العرش ومنخر الثور في ثقبين من تلك الصخرة تحت البحر فهو يتنفس كل يوم نفسين فإذا تنفس مد البحر وإذا رده جزر ولم يكن لقوائم الثور قرار فخلق الله تعالى كمكما

كغلظ سبع سموات وسبع أرضين فاستقرت عليها قوائم الثور ثم لم يكن للكمكم مستقر فخلق الله تعالى حوتا يقال له بلهوت فوضع الكمكم على وبر ذلك الحوت والوبر الجناح الذي يكون في وسط ظهر السمكة وذلك الحوت على ظهر الريح العقيم وهو مزموم بسلسلة كغلظ السموات والأرضين معقودة بالعرش. قالوا: إن إبليس انتهى إلى ذلك الحوت فقال له إن الله لم يخلق خلقا أعظم منك فلم لا تزلزل الدنيا فهم بشيء من ذلك فسلط الله عليه بقة في عينيه فشغلته. وزعم بعضهم أن الله سلط عليه سمكة كالشطبة فهو مشغول بالنظر إليها ويهابها. قالوا وأنبت الله تعالى من تلك الياقوتة التي على سنام الثور جبل قاف فأحاط بالدنيا فهو من ياقوتة خضراء فيقاد والله أعلم أن خضرة السماء منه ويقال إن بينه وبين السماء قامة رجل وله رأس ووجه ولسان وأنبت الله تعالى من قاف الجبال وجعلها أوتادا للأرض كالعروق للشجر فإذا أراد الله عز وجل أن يزلزل بلدا أوحى الله إلى ذلك الملك أن زلزل ببلد كذا فيحرك عرقا مما تحت ذلك البلد فيتزلزل وإذا أراد أن يخسف ببلد أوحى الله إليه أن أقلب العرق الذي تحته فيقلبه فيخسف البلد. وزعم وهب بن منبه أن الثور والحوت يبتلعان ما ينصب من مياه الأرض فإذا امتلأت أجوافهما قامت القيامة. وقال آخرون: إن الأرض على الماء والماء على الصخرة والصخرة على سنام الثور والثور على كمكم من الرمل متلبد والكمكم على ظهر الحوت والحوت على الريح العقيم والريح على حجاب من الظلمة والظلمة على الثرى وإلى الثرى ينتهي علم الخلائق ولا يعلم ما وراء ذلك إلا الله قال الله تعالى: (له ما في السموات والأرض وما بينهما وما تحت الثرى طه: 6.)[1] ، ،تا ئەوساتەش

---

[1] ياقوت حموی- معجم البلدان ج1 ص10 هەروەها ابن كثير-البداية والنهاية ج1 ص32 باسی ئاوای زەوی بە بڕواوە كردوە لەگەل زۆر سەرچاوەی تر.

هەندێ زانای ئاینی باوەڕیان بەوە نیە زەمین خڕە لەوانە (بن باز) ،بابوەستین لەسەر دەقی فتوای ئیبن باز لەبارەی دۆخی زەوی و ئاسمان و بەکافر کردنی هەرچی بلێت خڕەو بەدەوری خۆر دەسوڕێتەوە :

السؤال الثالث من الفتوى رقم (18647) – والجواب لأبن باز

س 3: في درس للعلوم أدرسه: أن الأرض تدور حول الشمس، وحيث إنني سمعت من الشيخ أبي بكر الجزائري: أن الشمس هي التي تدور حول الأرض، وأن من يدرس هذه المادة يجب أن يخاف الله، وأن هذا خطر على عقيدته، حيث إن هذا الأمر يكفر صاحبه، فقد قمت بعد أداء الدرس بتوضيح ذلك للطلبة، فهل هذا الأمر صحيح أم أنني مخطئ في ذلك، أفيدوني أثابكم الله وجزاكم عنا كل خير.

ج 3: ما قاله الشيخ أبو بكر صحيح، فإن الأرض ثابتة قارة، والشمس هي التي تدور حولها، كما قال الله عز وجل: {اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا} وقال سبحانه: {وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا} وقال في الشمس والقمر: {كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى} ومن قال: إن الأرض هي التي تدور، وأن الشمس واقفة فهو مكذب للقرآن، وتكذيب القرآن كفر أكبر،

نسأل الله العافية والسلامة.
وبالله التوفيق، وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم[1].

ئەوە لەكاتێكا بوە كە ياقوت حەمەوی خۆشی وئەبوريحان ئـەلبيرۆنی وزۆربـەيان زانيويانە زەوی خڕە وەك تێگەيشتنی ئيستا بەڵام بە جۆرێكی تری گوزارشت كردوە ووتويەتی ئەگەر لە ئەندەلوس زەوی كون بكەی لەو سەری زەوی لـە وولاتـی چـين كون بەدەر دەبێ: (لو حفر في الـوهم وجـه الأرض لأدى إلى الوجـه الآخـر ولـو ثقـب منها بفوشنج لنفذ بأرض الصين)[2].

لەبارەی وەسفی (لوحة المحفوظ):لـەزۆر شـوين بـاس كـراوە ئـەوەی ابـن كەسـير هەلدەبژێرين لەبارەی گەورەيی واهاتوە:(طوله مابين السماء والأرض وعرضـه مـابين المشرق والمغرب)[3] ئەوەيان لە هـەمويان بـە ڕوون تـر دەری دەخـا كـە ئـەو بيرەلـە عەقليك دەرچوە كەوای زانيوە نێوان ئاسمان وزەوی نزيكە لە دووری نێـوان (مشـرق ومغرب)، نێوانی زەوی وئاسمانی يەكەم بە500 سال دووری دەقەبلێيندرا:

كنا جلوسا مع رسول الله صلى الله عليـه وسـلم بالبطحـاء فمـرت سـحابة فقـال رسول الله صلى الله عليه وسلم (أتدرون ما هذا قال قلنا السـحاب قـال والمـزن قـال قلنا والمزن قال والعنان قال فسكتنا فقال هـل تـدرون كم بـين السـماء والارض قـال قلنا الله ورسوله أعلم. قال بينهما مسيرة خمسمائة سـنة ومـن كـل سمـاء إلى سمـاء مسـيرة خمسـمائة سـنة، وكشـف كـل سمـاء، مسـيرة خمسـمائة سـنة وفـوق السـماء

[1] لە كتيبی(مجموع الفتاوی ج9ص228 ،لە فتوی ژ:15255 زانايانی تر(عبدالعزيز ال شيخ- صالح فوزان-عبدالله بن غديان-ابن باز) هەمو فتوای ئەوەيان دا ئەوەی بلی زەوی دەسوری كافرە ،دوای لەوەی پشيمان بۆوە ووتی نابتە كافر بەلام دژ بە ئيسلامە.
[2] معجم البلدان ج1 ص3
[3] ابن كثير –البداية والنهاية ج1ص28

السابعة)[1]. ئەوە لە بنەچەدا لە ئینجیلی برنابا هاتوە(الحق أقول لك ان السموات تسع موضوعة بينها السيارات التي تبعد أحداها عن الأخرى مسيرة رجل خمس مئة سنة، وكذلك الأرض علي مسيرة خمس مئة سنة من السماء الأولي)[2]

لەکاتیکا دوری ئاسمان وزەوی نەك بە ڕێڕەوی بەڵکو بە کیلومەتریش ناپیورێ ئەوەندە دوورە، نزیك ترین ئەستیرە لیمان ناوی(ئەلفا کونتوراسە)زیاتر لە 2سال ڕووناکی لیمان دوورە (25تریلیۆن میل دوورە، بە 100000سالی پیادەی مرۆڤ پێی ناگا)، نزیك ترین مەجەرەش لە ئێمە بریتیە لە (مەجەرەی ئەندرۆمیدیا) زیاترلە 2 ملیۆن سال ڕووناکی لێمان دوورە، ئەو دووریە لەچاو دووری (مشرق ومغرب) نێوان چین وپورتگال(بەنمونە) هیندە پانیەکەی (لوحة الحفوظ) بچوك دەبێ وەك هێلیکی ڕاستی لیدیت، بەهەمان شێوە ئیمام حسنی بەسری کەوتۆتە هەلەیەکی زانستی گەورە دەلێ رۆژ لە ئاوێکی کولاو ئاوا دەبێت (**الشمس تغرب فی ماء یغلی غلیان القدور** ..) نەیزانیە رۆژ بەهەزاران ملیۆن جارلەزەوی گەورەترە چ جای لە ئاوی گەرمی زەوی ئاوابێت[3] ، بەشیکی تر بۆ سەلماندنی ئەو بۆچونە زانیاری تریان هۆنیتەوە و ووتویان خەلکی نزیك ئەو ئاوەو ئەو شوینەی رۆژی لیهەلدێ (کە لای زەمینی چینیان دیاری کردوە) دەلێن خەلکی ئەوێ کە رۆژهەلدێ ماسی لەبەر سوور دەکەنەوە ،کەچی ئیستا دەبینین ئەو ناوچەیە چەندەساردە ، ئەوەش لەکاتێکا بوە زانایانی جوگرافی ناسی ئیسلامی زانیاری ووردیان لابوە وەك ئەلبیرۆنی ومسعودی وئیدریسی و.. یاقوت حموی دەڵێ: زەوی

[1] البداية والنهاية ج1 ص10
[2] انجيل برنابا- فصل78-اية6-7
[3] اخبار الدول واثار الدول فی التاریخ- احمدبن یوسف القارمانی ص26

خڕەو هەر چواردەوری هەوایەو ئاسمان دەوری داوە وەك چۆن زەردینەی هیلکە بە سپیلکە دەورەدراوە، زەویش بەهۆی کیش هەموی ڕاگرتوە[1]، (قال ابو الحسن بن المنادی :لاخلاف بین العلماو فی ان السماو علی الارچ مپل القبه وان العالم مپل الکره وانهاتدور بمافیها من الکواکب علی قگبین پابتین غیر متحرکین ،احدهما فی ناحیه الشمالوالاخر فی ناحیه الجنوب،وان کره الارچ مپبته وسگ کره السماو کالنقگه من الدائره)[2].

زۆر نمونەی ترئاوا بەهەلەداچوونی تیدایەو مۆرکی بەشەری پیوە دیارە لە کتاب المقدس باس لەسزای (مار)دەکا لەلایەن خوداو دەڵێ:خواردنت تەنها گڵە کەچی دەبینین خواردنی مار نیچیرە نەك گل: (فقال الرب الاله للحیه:لانك فعلت هذا ملعونه انت من جمیع البهائم ومن جمیع وحوش البریه علی بطنك تسعین وترابا تاکلین کل ایام حیاتك)[3].

لەو جۆرە کتێبانە باسی سەرچاوەی ڕووبارەکان واکراوە گوایە لە بەهەشتەوە دێت (وزعم أهل الکتاب أن أربعة أنهار تخرج من الجنة الفرات وسیحان وجیحان ودجلة)[4] ئةوة رِيَك لة تةورات هاتوة (**وَكَانَ نَهْرٌ يَخْرُجُ مِنْ عَدْنٍ لِيَسْقِيَ الْجَنَّةَ، وَمِنْ هُنَاكَ يَنْقَسِمُ فَيَصِيرُ أَرْبَعَةَ رُؤُوسٍ: اسْمُ الْوَاحِدِ فِيشُونُ، وَهُوَ الْمُحِيطُ بِجَمِيعِ أَرْضِ الْحَوِيلَةِ حَيْثُ الذَّهَبُ. وَذَهَبُ تِلْكَ الأَرْضِ جَيِّدٌ. هُنَاكَ الْمُقْلُ وَحَجَرُ الْجَزْعِ.**

---

[1] أ-شریف ادریسی – نزهة المشتاف فی اختراق الافاق ج1 ص8 ب-معجم البلدان ج1 ص2.

[2] اخبار الدول واثار الدول فی التاریخ ص25

[3] سفر التکوین-اصحاح 3 اية(14-15)

[4] المقدسی –البدء والتاریخ ص88

وَاسْمُ النَّهْرِ الثَّانِى جِيحُونُ، وَهُوَ الْمُحِيطُ بِجَمِيعِ أَرْضِ كُوشٍ. وَاسْمُ النَّهْرِ الثَّالِثِ حِدَّاقِلُ وَهُوَ الْجَارِي شَرْقِيَّ أَشُّورَ. وَالنَّهْرُ الرَّابِعُ الْفُرَاتُ)[1].

خواردنی خۆل بە دەرمان لەناو مەزهەبەکانی ئیسلامیش هەیە (كُلُّ طِينٍ حَرَامٌ مِثْلُ الْمَيْتَةِ وَالدَّمِ وَلَحْمِ الْخِنْزِيرِ إلا طِينَ قَبْرِ الْحُسَيْنِ فَإِنَّ فِيهِ شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ وَلَكِنْ لا يُكْثَرُ مِنْهُ وَفِيهِ أَمَانٌ مِنْ كُلِّ خَوْفٍ)[2]. دەڵێن قسە کردن لەکاتی سێکسی دەبتە هۆی لالی منداڵەکە..![3]

## 3- لەبارەی دروست بوونی زەوی وئاسمان:

وایان زانیوە کە یەکەم جار ئاو هەبوە لە هەلمی ئاو ئاسمان دروست بوە! لە دەریاوە ئاسمان ورۆژو مانگ وئەستێرە دروست بووینە، بابلی ومیسری کۆنیش ووردتر پێیان وابو لەزەویش ئاودروست کەری گەردوونە، لەشەپۆلی ووشکایی ولەهەلمی ئاوئاسمان دروست بوە، بە پێی باوەڕی کۆنی ژاپۆنی ئەوالەوجیهانە تاریکایی بوو، هیچ نەبوو تەنهاهیلکەیەکی زۆر چڕی سپی بچوك هەبوو، دوای مادە ڕەق وقورسەکانی ئەو هیلکە زەوی لێ دروست بوو هەرچی شلەو مادەسوکەکانە بەرزبوونەوەو ئاسمانی لێ دروست بوو، لە یۆنانیش تالیس(سەدەی 6ی پ ز) پێی وابوو یەکەم جار ئاو ئاسمانی دروست کردوە [4]، ئەوە لە بنەچەدا (بەپێی کتێبی المعتقدات الدينيه)ڕای سۆمەریەکانەکە دەڵێن رۆژو مانگ وئەستێرە لە هەلمی ئاوو دەریادروست بوە [5]، زەوی بە(کی) و ئاسمان بە(ئان) هێما دەکرا.

---

[1] كتاب المقدس –عهدالقديم–سفر التكوين 2: 10–14. حداقل مەبەستی دجلةية

[2] اصول كافي ج3 ص378

[3] اصول كافى ج5ص498

[4] جفري بارندر- المعتقدات الدينية لدى الشعوب- ترجمة :د .إمام عبدالفتاح إمام ص12

[5] المعتقدات الدينية لدى الشعوب ص12

لەهەمو ئەوانەشەوە ڕەنگی داوەتەوە سەر کتێبەکانی ئینجیل وتەورات وهەندی مەزهەبی ئیسلامیش، لە (البدایە والنهایە) و(تاریخ الطبري)یش وا هاتوە: (قال إن الله عز وجل كان عرشه على الماء ولم يخلق شيئا مما خلق قبل الماء فلما أراد أن يخلق الخلق أخرج من الماء دخانا فارتفع فوق الماء فسما عليه فسماه السماء ثم أيبس الماء فجعلة أرضا)[1] لە ئینجیل (فى البدء خلق الله السموات والأرض، وكانت الأرض خربة وخالية..)[2].

لە کتێبی پیرۆزی ئیزیدیەکانیش (إنه قبل كون السماء والأرض كان الله موجودا على البحار وكان قد صنع له مركبا وكان يسير به في بينونات الأبخار متنزها في ذاته.. فيا للعجيب إذا صارت من ضجيجها الجبال ومن عجيجها التلال ومن دخانها السماوات -کوردیەکەی-پیش دروست بوونی زەوی وئاسمان خوا لەسەر زەریاکاندا بە پاپۆریك پیاسەی بەسەر دەکرد،...وای لەو سەیرو سەمەرەیەلە هەراوزەنای(زەریا-نوسەر)چیایەکان و لەتۆزەکەی گردۆلکەکان ولەدووکەلەکەی ئاسمانی لیوە دروست بوو[3].

بە پێی بڕوای (تایفەی ئیسماعیلیە) ئاسمانەکان ژمارەیان(10)یە، هەر ئاسمانەکیش ئیمامیکی لێیە. لە بارەی ڕۆژی دروست بوونیان دیسان هەردوو کتێبی پیرۆزو بەشی هەرە زۆری فقهی ئیسلامی زۆر خراپ لێی بەهەلەداچووینە، ابن مسکویە لێی وەرگرتون بەو شیوەیە: (..ويقال أن الله خلق الشمس يوم الأحد والقمر يوم الاثنين والمريخ يوم الثلاثاء وعطارد يوم الأربعاء والمشتري يوم الخميس والزهرة يوم الجمعة وزحل يوم السبت)[4] نیسابوریش فەرمودەیەکی هیناوەو

---

[1] ابن كثير —البداية والنهاية ج1ص32 هەروەها: تاريخ الطبرى ج1ص20

[2] الكتاب المقدس-عهدالقديم —سفرالتكوين ئایەتەکانی(1 و2).

[3] کرملی- جلیوەو مەسحەفی رەش ل83 ئایەتەکانی(28-30) مەسحەفی رەش.

[4] ابن مسكوية — تجارب الأمم ص92

دەڵێ:(خلق الله الأرض يوم الأحدوالأثنين، وخلق الجبال يوم الأثنين، وخلق السموات يوم الأربعاء والخميس، وخلق يوم الجمعة النجوم والشمس والقمر)[1] سادە ترین هەڵە ئەوەیە ئەگەر ڕۆژو مانگ وخودی زەوی دروست نەبووبن یەك شەمە لە کێ هەبوە؟.

زۆر ڕوونە ئیستا ئەو دەقانە بە ئەفسانەش حیساب ناکرین، چۆن لە هەڵمی دەریا ئاسمانەکان دروست بووینە، ئەو عەقلە زۆر لوکالی بوە، ئاسمان وگەردوون لە کێ گەورەییەکەی لە کێ وهەڵمی ئاو لە کێ، زۆربەی کتێبە فقهیەکان پڕیەتی لەو جۆرە زانیاریە سادانە، ئیمامی قورتبی لەو وولاتە بوە کەچی (تفسیرەکەو جامع الاحکام..) پڕیەتی لەو جۆرە زانیاریە سادانە، لەو کاتیش بەو ڕایانە قایل نەبووینە،، شیشرۆن رەدی تالیس دەداتەوە کەووتویەتی ئاو سەرچاوەی هەمو بوونیکە خواش ئەو ئەقلەبێ کە لە ئاو هەمو شتیکی دروست بێ،، هەرچی ئەناکسیمینسە ووتی هەموو شتیك لە هەوا هاتوە، بلۆتارك ووتی روح وهەواش هەر یەك شتن، ئەنیکسیماندریس ووتی ئەسلی مرۆڤیش لە ماسی هاتوە دوای کەوتۆتە ووشکاییی[2].

لە قورئان وفەرمودەی (دروست)، لە کتێبە ئاسمانیە ڕاستەقینەکانی تریش بەو شێوەیە نەهاتوەو سەربردەی دروست بوونی زەوی وئاسمان زۆر جیایەودوای باسی دەکەین کەلەو سەردەمی هیچ زانستێك باسی ئەو نهینیانەیان نەکردبوو، بەڵام لەکۆتایدا لە نێوجیهانی ئیسلامی زیاتر برەو بەو زانیاریە لەنگانە دراوە کەچی کتێبەکانی زانیاری بە نرخ سوتینراون، لەکۆتایدا ئەوجۆرە زانیاریانەی ئاین بەوەهم وئەفسانەوهەڵەتینەرپۆلین بکری لەلایەن زانستەوە. لەوەوە کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی ئیمام غزالیش(کە کەمێك بەلای فەلسەفە داچوە) هاوار بکاو بڵێ

---

[1] ابی الحسن الواحدی النیسابوری- اسباب النزول – ص221
[2] دیالکتیك الطبیعة ص212-213

بلاوبوونەوەی بێ بڕوایی نیوەی لە ئەستۆی ئاینپەروەران خۆیانــە کــەنازانن وەســفی خواو ئاینەکەیان بکــەن: (إن انتشــار الكفــر في العــالم يحمــل نصــف أوزاره متــدينون بغضوا الله إلى خلقه بسوء صنيعهم وسوء كلامهم).

ئەوە وەسفی دۆستە وەسفی دژانی ئاین زۆر توند تــرە، ئــەنجلس بــە تەوســەوە دەڵێ: خوا چەندە بە دەست نەزانی لایەنگرانی خۆی مانــدووبوە، هــەروەها دەڵێــت وەك (فریدریك ولیامی سێیەم)ی لیهاتوە چۆن ئەویش بەدەست جەنەراڵ و سەرکردە عسکریەکان قەلا بەقەلا دەیان دۆڕاندو چەکیان دادەنا، لایەنگرانی خواش بەرامبەر زانست ئاوا وا دەدۆڕێنن.[1]

دیفید میلز لە کتێبی ( atheise univers ) لــە بەشــی یەکــەمی دەڵــێ ئەگــەر کتێبی پیرۆز زۆر بەووردی وزانستیانە بخوێنیەوە یەکسەر بێ باوەڕ دەبی ، یەکی تــر دەڵێ کنیسە ببوە ناوەندی بەرپاکردنی مولحیدی[2].. ریتچــارد فاینمان(فیزیــا زانــی ئەمریکی) دەڵێت ئێمە ئامرازی وامان دروست کردوە هەمو نهینیەکمان بۆ ئاشکرا دەکا چی تر پێویستمان بــەوە نــەما بلــێین ئــەوە خــوا دەزانــی، جــاران نەخۆشــیە دەروونیەکانیان دەدرا پاڵ شەیتان و جن یان (غەزەبی خوا) لە نیو مەسیحی وایــان دەزانی کــە شــەیتان سەرچــاوەی نەخۆشــیە بەتایبــەتی دەروونیــەکان[3]، بۆیــە کــە پزیشکێکی یۆنانی کۆن ووتی ئەو نەخۆشیە پیرۆز نیەو پەیوەنــدی بــەخواو شــەیتان نیە بوە کێشەیەکی گەورە[4]. تا ئەو دواییەش لەکوردستان شــەوانە پاســەوانیان بــە دیار مندالی لەدایك بوو دەگرت گوایە (شەوە) دەیبات وچەندین چیرۆك وســەربردە دەگیڕدراوە گوایە بە چاوی خۆیان بینیویانە چەندین پشــیلەی بەســتەزمان دەکــوژرا

[1] دیالکتیك الطبیعة ص230

[2] الفیزیاء والوجودالخالق ص25

[3] کتاب المقدس-العهد الجدید4 اتحادجمعیات الکتاب المقدس-جدول الشروح ص719

[4] المعتقدات الدینیة لدی الشعوب ص59.

گوایە شەوە بــە شـێوازی پشـیلە دیتـە ژوورەوە، دوای دەرزی گـزاز(tetanus) دۆزرایەوە پرسی(شەوە) هەر نەما، هەمو ئەوانەش ئەسلی دەقی نیە، زیادەیـە لـە ئاین، بەرژەوەندی هەندێ شیخ و نوشتەچی وپیاوی ئاینی چەوسینەرە.

لەوەوە فەلسەفەی ئاینی بەتایبەتی ئیسلامی ناچار پەنای بۆ فەلسەفەی یۆنـانی ببا بۆ ئەوەی ئەو نەفامیەی تووشی کۆمەڵگەی ئیسلامی بوە پـاکی بکاتـەوە، تـا ئەو ڕادەیەدروشمی(ئیخوان ئەلسفا) بوە(متى انتظمت الفلسـفة اليونانيـة والشـريعة العربية فقد حصل الكمـال)[2] واتە دەڵێ فقهی ئیسـلامی پـڕ بـوە لـە نـەفامی بـە فەلسەفەی یۆنانی پاك دەکریتەوە، چونکە کار گەیشتە ئەو ڕادەیـەی بەسـەر هاتـە دنیاییەکان دراونە پاڵ پێغەمبەران و بووینە کێشە لـە چوارچـێوەی پـەیام، لەوانـە بەسەرهاتی ئەو کەسەی لە بیستانەکە لە ترسـی دوژمنەکـەی هەلاتـە ناوبیرەکـەو دوژمنیش لەسەرووی وخوارووش چوار مـار بـۆی دەهـات ودەستیشـی بـە داریـك گرتبوو مشك دەیان قرتاند...تاد، ئەوەلـە فقهـی ئیسـلامی دەڵـێن (ح.موسـایە) کەچی لە (کلیلەو دمنە) وسەرچاوەی تر دەڵێن ئەوەگەورە پزیشکی فارسـی ئـەوەی بەسەر هاتوە.[1]

گەلێ جاری تر ڕێك بە پێچەوانەی ئاینی ئەسل (هـەر بـەناوی ئاینـەوە) کـاری خراپ کراوە، ئاین بۆ دژی زوڵم هاتوە کەچی بەکاریان هیناوە بۆ مل کەچی مـەزلوم لە قازانجی زاڵم قەشە ئۆگستین دەیوت هەژاروبەندەقەدەری خودایە نـابی خـۆ رزگـار بکەن وئەو قەدەرە تیك بدەن، هەندێ زانای ئاینی ئیسـلامیش بـەجۆریك کەوتونـە ئەو هەلەیە ،ابن عبد ربە دەلێت: ( **اذا كان الحاكم عادلافله الأجر وعليك الشـكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر**)[3]، ( **ونقل عبد الكـريم الخطيـب قـول**

---

[1] - موسوعة الأديان في العالم- ج: الفرق الإسلامية.. المصدرالسابق ص78

[2] المثالية والمادية وازمة العصر – عبدالمنعم الحفنى ص7

[3] د محمد شحرور–الكتاب والقران ص101ص620

الحسن البصري: ]ألا لا تسبوا الولاة فإنهم ان أحسنوا فلهم الأجر وعليكم الشكر، و ان أساؤوا فعليهم الوزر وعليكم الصبر، وإنما هم نقمة ينتقم الله بهم ممن يشاء فلا تستقبلوا نقمة) .. ،کاتێ زاناو فەیلەسوف دژ بەو هەنگاوە دەوەستان ناوناتۆرەی کافرو مولحیدیان لینراوە، بۆیە دەبێ ئاگاداربین لەو توومەتانە گەلێ جار پێچەوانەیە.

لەوەوە ڤۆلتیر شانۆگەریەکی لە پاریس کرد بە ناوی دۆزەخ وبەهەشت لەکۆتایی شانۆگەریەکە هەرچی قەشەو پاپا وپیاوی ئاینی بوو خوا ڕەوانەی دۆزەخی کردن مولحیدەکانیشی بردە بەهەشت، هەر لەسەر ئەو بنچینەیە (بلوخ) کە بە مولحیدێکی ئاینی ناوزەد کراوە دەڵێ:(مولحید مەسیحی ڕاستەقینەیە، مەسیحی ڕاستەقینەش مولحیدە)[1]... واتە ئاین نەك بوە چارەسەر بەڵکو بوە بەلایەکی وا کە خانەنیشینی بکەی قازانج بوەو وەك بەشێك لە لیبوردە، جۆن لۆك کتێبیکی بە ناوی(رساله فی التسامح ـA Letter Concerning Toleration) یەکیك لەوانە بوو کەلێبوردەیی بەستبۆوە بە دوور خستنەوەی ئاین لە ژیاندا، ولیم بلاك(1827 - 1757) لە شیعرێکی هاتوە کە ئاین وا دەکا مرۆڤ متمانەی بە خۆی نەبێ وئامادە بێ بۆ خۆ بەدەستەوە دان وملـ چەماندنەوە بۆ زوڵم، دەڵێ ئاین لەگەڵ سروشتی مرۆڤ ناگونجێ ومولحیدی زیاتر گونجاوە،زانایەکی تر دەلێت گەورەترین کارەسات بەسەر بەشەر هاتبیت خودی ئاینە ، لەو سۆنگە قوولەوە وەسفی زۆر خراپی ئاین کراوە، وا هەندێکی تۆماردەکەین:

- تایلر: ئاین لە گیانە عفریتیەکان هاتووە.
- سپنز: لە چیرۆکی مردووەکان هاتووە.
- کوندریت مولر: لە ترسی کارەساتە سروشتی یەکان هاتووە.

---

[1] الماركسية والدين ص7.

- بزر: لە مەزنی سروشت هاتووە کۆتایش دێت بە کۆنترۆڵ کردنی سروشت.
- فرۆید: لە پشیمان بوونەوەی باپیرە کوژراوەکەیان هاتووە.
- ج سنتیانا(1863-1952)ئاین لە شیعرو پەخشان وئەفسانە هاتوە بەگەشەی زانستی سروشتی هەمو ئەو ئاینانە لەناو دەچێ.
- جیسف انتورا: الدین هو عکاز لذوي العقول الضعیفة.

بارون دولباخ لەکتێبی(المسیحیه من غیر ستار): ئاین دژ بە سیاسەتی راست ودروست وئاسودەی میلەتانە (ئاین لە دروستکراوی تاغوتەکانە)

غارودی: ئامۆژگاری مسیحی دەکاو دەڵێ ئاینداری کات بە فیڕۆ دانە

-لینین ئاین گولیکی جوانە بەڵام بێ بەرە

لەگەڵ زۆر ڕای تری وا هەر مارکس نەیوتوە (الدین افیون الشعوب)زۆر لەفەیلەسوفانی چاك وخراپ بەهۆی هەلەیی تیروانینی ئاین پەروەران وایان ووتوە، لەوانە: کانگ وهیردر وفیورباخ وبرونو باور وهاینریش..هەمان گەوهەریان دووبارە کردۆتەوە، زۆربەشیان کاردانەوەی بە هەلە وەسفی ئاین وبەکارهینانی ئەو هەڵوێستانەی بۆ دروست کردوونە.

## هۆی تایبەتی فەلسەفەی ئیلحادی لە کوردستان

ئەو هۆکارانەی لەپێشوو باسمان کرد گشتی بوو، بۆ هەر میللەتێکیش هەندێ هۆی تایبەتی هەیە، لەنێو تورك لەلایەن ئیتیحاد تەرەقی و کەمالی وتۆرانیەکان دەگۆترا سیستەمی ئیسلامی و عوسمانی زیانی بەیەکرێزی جیهانی تورك هێنا و شکستیشی لەجەنگی جیهانی یەکەم (1914-1918) زیاتر توندی کردوون، بەتایبەتی دوای سەردانەکەی شای ئەڵمانیا (ڤلهالم دوەم) لە پیش جەنگ کە ئامۆژگاری کردبوون تورك گرنگی بە ئاسیای ناوەڕاست بدا کە هەمووی تورکن باشترە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

لە نێوعەرەبیش دەڵێن عـەرەب بـوە قوربـانی ئیسـلام، سـاتیع حصـری دەڵـێ عەرەبایەتی ڕەسەن ترە لە ئایین، لەکاتێکدا سـێ ئـایین گـۆڕا بـەڵام عـەرەب هـەر عەرەبە، مەلیك فەیسەڵیش لە وتارێکی وتبووی (ئێمە عەرەبین پێش محمد و عیسا و موسا)[1]، (ئیبراهیم احمد)ی شاعیر و بیریـاری کـوردیش بـەهۆنراوە دەڵـێ: ئێمـە کوردین و هەرکورد دەبین،..پیشی ئەدیان هەر کورد بووینە...

هەردوو لای مولحیدانی تورك و عەرەب پێیان وایە ئیسلام هۆکاری دواکـەوتن و پارچەپارپەبونیانە[2]، هەرچی ئیلحادە لە کوردسـتان لەمێـژوودا لـە دوای ئیسـلام سەریهەڵنەداوە، ئەو تومەتەی ئیلحاد کەدراوەتە هەندێ زانای گەورەی کوردی وەك سیف الدین ئامدی ئەوا لەچوارچێوەی ململانێی نێوان فقهو فلسەفە بوە، شـۆڕش و شەڕ لەگەڵ سوڵتانی ئایینی کراوە، بەڵام ئیلحادی لێ دروست نەبووە، دیاردەیـەکی تازەیە لەقۆناغی نوێ ی شۆڕشی کورد لـەدوای 1975 سـەری هەڵـدا، پێشـووتر تاك و تەرا هەبووە.

ڕەنگە یەکەم نـەوەی ئیلحـاد لەگـەڵ یەکـەم نـەوەی عەلمانیـەتی کوردسـەریان هەڵدابێ کە بریتین لە: د.عەبدوللا جەودەت، ئیسـحاق سـکوتلی، فکـری لـوتفی، زیاکۆك ئەلب...[3]، بەڵام بەردەوامی بزوتنـەوەی ڕزگـاری خـوازی کـوردی لـەژێر سایەی زانا و مەلا و شێخە ئایینیەکان وای کرد مولحیدی نەبێتـە دیـاردە و زیـاتر قەتیس بمێنێت لەنێو شیوعیەکان و هەندێ ئینتیمای تری وجودی و دەهری کـە زۆر کەم بوون.

لەدوای 1975 تاڕادەیەك فەلسەفەی ئیلحادی زیادی کرد و مارکسـیەت بـوە

[1] العلمانیە والدولە الدینیە ص39.

[2] شبلی شمیل لە کتیبی(فلسفة النشوء والإرتقاء) باس لەوە دەکا کە ئاین فاکتەری هەرە چالاکی پەرتەوازەی میلەتانە بەتایبەتی میلەتی عرب.

[3] مولحید و عەلمانی لێك جیان، مەرج نیە عەلمانی مولحید بێ، عەلمانیەت باوەڕی بەشەریعەت نیە مەرج نیە باوەڕی بە خوا نەبێت.

چرای پێشەنگی کوردایەتی[1]، بەکورتی هۆکارەکانی ئیلحاد لە کوردستان(سـەرەڕای ئەوانەی سەروو) ئەمانەی خوارەوەیە:

1- بەشێکی کاریگەرن بەو خاڵانەی ئیلحادی گشتی (لەپێشوو باسمان کرد).

2- بەشێکی زۆر کاردانەوەی چەوسانەوەی نەتەوەیی بووە، بەرامبەر ئەو زوڵـم و زۆرەی دەکرێ، دەبینین داگیرکەران بەڕووکەش موسڵمانن، واهەسـت دەکـەن هـەر دەوڵەتـەکان داگیرکـەر و زۆردار نـین بـەڵکو میللـەتی مسـوڵمانی دەوڵەتەکەش یارمەتی دەرن، کەمتر بینیویانە زانایـانی ئـایینی لـە وڵاتـانی عێراق و ئێران و تورکیاوسوریا سۆزی ئایینی بیگرێ لەسەر کورد فەتوایـەکی ئیجابی بدا، (جگە لەهەندێ زانای شـیعە) نـەبێ بەدەگمـەن نـەبووە، بـەڵکو بەپێچەوانەوە هەندێك لەزانا و موفتی و بزوتنەوە ئیسلامیەکانیش ناوی کورد بە پیلانگێر و سەر بە ئیمپریالیزم و ئیسرائیل وەسف دەکەن.

لەلایەکی تر دەبینین لـەکاتی مەینـەتی و لێقـەومانی کـورد کـەمتر وڵاتـانی جیهانی ئیسلامی لەسەر کورد بەوەڵام دێن، زیاتر وڵاتـانی ڕۆژئـاوا و غـەیرە ئیسـلامیە، ئـەوە کاریگەریـەکی قـوڵ لەسـەر نـاخ و سـایکۆلۆژیەتی تـاکی کوردکردووە، باوەڕی بە مسوڵمانان ئیسلامیش لەق بێت.

3- بەشێکی تری شارەزای مێژووی کـورد هۆکـارێکی سـەرباری تـری خـاڵی (2)یان بۆ دروست دەبێت، کاتێ دەبینین هەندێ مەزهەبی فیقهی ئیسلامی و زانای موعتەبەر بەچـاوی (مـەوالی) و (علـوج) و (ڕەچـەلەك سـوك) بـەلای

---

[1] تەنانەت پ.د.ك لەسەر رێبازی بارزانی - ئایینی بووە، کەچی لە کۆنگرەی - 9- المنهاج والنظام الداخلی للحزب الدیمقراطی الکردستانی (منهاج)وایان تۆمارکرد :
المادة الخامسة\ یسیر الحزب فی نضاله السیاسی والاجتماعی والاقتصادی علی ضوءِ النظریة المارکسیة اللینینیة ویقوم بتثقیف النظریة المارکسیة وتسلیح کوادره ومنتسبیه مرکزیاًبها، کما ویستفید من التجارب الشعب الکردی وتراث البارزانی الفکری، ومن التجارب حرکات التحرر الوطنی فی العالم.

مێژووی کورد داچووە، لەوانە مەزهەبی ئیمامی شافیعی ئیمام سەعالیی و شێخ ئیسلام ئیبین تەیمیە و زۆری تر پێیان وابووە عەرەب پلە یەکەو کورد پلە دووە[1].

بەشێك ڕەچەڵەکی کوردیان کردۆتە عەرەب یان جن یان (ئەعرابی فارس)...، بۆچوونی ئەو زانایانە لەگەڵ تەیاری عروبی ئێستا و بۆچوونیان لەبارەی کورد دیمەنێکی زۆر ناشرینی ئاین دێنێتە پێش چاو، ئەگەر زۆر بەوردی ئەو زانیاریانە لێك نەکەیتەوە و ڕەفتاری مسوڵمان و ئەسلی ئایین لێك جیانەکەیتەوە(کە ئەو تەقەلایەش زۆر کەمە) ئەوا ئەو ڕەوشە دەبێتە زەمینەیەکی زۆر چالاکی ئیلحادی لە کوردستان.

ئەوەی زیاتر ئەو قەیرانە قوول تر دەکاتەوە تا ئەو ساتە لایەنە ئیسلامیەکانیش نەهاتوون لەگەڵ ڕابوونی خۆیان پیشەنگ بن بۆ چاکردنەوەی ئەو دەردە مەزهەبیانە، بەڵکو زیاتر کەوتونە ژێر کاریگەری تەیاری عروبی کەبەسەر زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی عەرەب زاڵە، ئیسلامی کوردستانیش بە توندو نەرمیەوە لەژێرکاریگەریەکی سەختی ئیسلامی عەرەبە بەچەوت وڕاستیەوە، لەودەمە سەرەتای تەقەلایەك بەدی دەکرێ بۆ ڕزگاربوون لە ژێر ئەو بارە قورسە.

4- میلەتی کورد زۆر پێویستی بە یەکریزی هەیە، کەچی دەبینن ئەو هەمو کێشەیەی مەزهەبی وفقهی وسیاسی لە نیو موسوڵمانی کورد هەبێ، وادەردەکەوێ ئاین مایەی یەکڕیزی نیە.

5- ئەوەی ئێستا لەبەشێکی فراوانی عەلمانی کورد و باڵی ئیلحادی دەبینرێ هێشتا زانیاریە فەلسەفی و زانستی و گەردونیەکانیان زۆر کلاسیکیە،

[1] ڕۆلی عەلمانی لەدروست بوونی مەینەتی کورد ل 308-

کتێبەکانی (هۆبز) و (نیچە) و (رۆسۆ) و (مۆنتسیکۆ) توخمەکانی فیکری ڕۆشنبیری کورد پێکدەهێنێ.پیشتریش کتێبەکانی مارکس وئەنجلس ولینین و ترۆتسکی وماوتسی تۆنگ وکیم ئیل سۆنگ و ج پۆلیتزرو...کاریگەر بوون.

6- بەشێکی تری هۆکاری تایبەتی ئەوەیە زۆربەی رۆشنبیرانی عەلمانی کورد دەردی لاسایی و (تقزم الثقافي) و دوور و قۆڵیان هەیە، لەکاتێکدا لە کوردستان مارکسی گەرم بوو لە 1979 بەدواوە ڕاپەڕینێکی کرێکاری لەسەرانسەری ئەوروپایی رۆژهەلات لەدژی مارکسی دەکرا بەتایبەتی لە پۆڵەندا بە سەرۆکایەتی (لیخ فاونسا)، ئینجا لەهەمان سال ئێران گەورەترین شۆڕشی جەماوەری جیهانی بە هۆی ئاینی کرد، لەڕووی زانستی و ئابوری و فەلسەفی و... مارکسیەت دووچاری قەیرانی گەورەبوو.

ئەوانە هەموو وای کردوە ئیلحاد لە کوردستان لەنامۆی دەرچێت و گەلالەکانی خۆی ڕاستەوخۆ لە پرسیارە فەلسەفیەکانی (بوون و نەبوون) (مادە و رۆح)، (دروستکراو دروستکەر)... گوزارش نەکا، بەڵکو زیاتر لە رێ ی پرسی مەینەتی کورد و کێشەی مەزهەبی و کێشەی ئافرەت و مافی مرۆڤ و هەندێ کەلێنی زانستی تر بەکاردەهێنێ، رەواجیکی زۆری سیاسی وتەعلیمی پێ بدرێ.

ئەوانەش بەدەوری خۆی زەمینەیەکی لەبار بۆ جێبوونەوەی فەلسەفەی بەدەر لە ئاین دەکاتەوە.وەك دەبینین هەندێ پاساویان بەدەستە بەلام خودی ڕەوشەنبیری کورد بە جیایی چین وتوێژەکان قەیرانی عەقلی هەیە، بۆیە ناتوانێ گرفتە بنچینەییەکانی بدۆزیتەوە، ئەو ڕەوشە بوویتە هۆی دابەشیەکی تری سەربارلە نێو ڕەوشەنبیری کورد، نە ئاینیەکان هەلدەستن بە لیك جیاکردنەوەی ئەسلی ئاین کەزۆر دوورە لەو ڕەگەزپەرستیەی لەلایەن هەندێ مەزهەب وخەلیفە پەیڕەو کراوە، نە ڕەوشەنبیرانی عەلمانیش ئامادەن بەدوای توێژینەوەیەکی ڕاستەقینە بگەڕێن ولە جیاتی حوکم لە تاریکی (دژایەتی ئاین) مۆمیك پێ بکەن.

بەو شێوەیە وا هەست دەکرێ لەهەردوولا (ئاینی وعەلمانی) داهێنانی فکری خۆی نەبێ، زیاتر پەیڕەوی داهێنانی فکری خەڵکی تر دەکەن، هەر بەنمونە: ڕای دوو موفەکیری گەورەی کورد لەو بارەیەوە ببینە: مام جلال لە بەراوردی نێوان ئیسلام وسۆشیالیستی ڕای وایە کە سۆشیالیست دەڵێ بەهەشت بۆ ئەو دنیایە دەهینم هەرچی ئیسلامە دەڵێ خۆ ڕاگرن بەهەشتان لە دواڕۆژ پێ دەدەم [1].

ئەوە دەقی ڕای ئەنجلسە لەبارەی مسیحی دەڵێ : (أن الفارق بين الحركتين يتمثل في أن المسيحيين الأوائل قد نقلوا الخلاص إلي الآخرة بينما تتصوره الاشتراكية في هذا العالم الدنيوي)[2] ئەوەش لە بنەچەدا لە پێچەوانەی دروشمی شۆڕشی ئاینی تۆماس مونزیر بۆ رزکاری جوتیارانی1513 هاتوە، کەبریتی بوولە: وامەزانن تەنها ئاسودەیی بۆ رۆژی دواییە بەڵکو ئاینەکەمان ئەو بەهەشتە بۆ دنیا دەهێنێ،[3] هەمان بەراورد موفەکیری گەورەی کورد عبدالله ئۆجەلان دەیکا دەڵێ: پێغەمبەرو ئیمام علی لە ئێمە سۆشیالیزم تر بووینە ئەوە دەقی وەسفی مارکس وئەنجلس لە مانیفیستی شیوعی دەڵێن سەرکەوتنی ئاینی مەسیحی لەکاتی خۆی سەرکەوتن بوو بۆ مێژووش[4]، د جورج حناش کەدەڵێ پێغەمبەرەکان سۆشیالیستی بووینە پیش ئەوەی سۆشیالیستی بیتە کایەوە[5].

بەو پێیە بەرەی رەوشەنبیری عەلمانی(لەو دەمە) زیاتر بەلای رۆژئاوایی و رەوشەنبیرانی ئاینیش زیاتر بەلای عەرەب، بە تێکڕاییش قەیرانی عەقلیەتی کورد دروست بوە، هۆکارێکی زۆر تایبەتە بۆ بەردەوامی مولحیدی لەکوردستان دەسازێنێ.

---

[1] بڕوانە :دەقی ووتارەکەی مام جلال بە بۆنەی یەکگرتنەوەی ئالای شۆرش و(ی ن ك).
[2] مایكل لوفي - **الماركسية والدين** ترجمة : بشير السباعي ص3
[3] ماركسية قرن عشرين ص150
4 ماركس– انجلس ، بيان الشيوعى ص64
[5] قصة الإنسان ص65

# بەشی سێیەم

# زانست و فەلسەفە و ئایدیۆلۆژی بەشەری

## مەنهەج لە پرسیارە نەمرەکانی فەلسەفە:

لەکۆنەوە کۆمەڵێك پرسیاری فەلسەفی گەڵاڵە کراوە، گوایە ئەوە پرسیارە بێ وەڵامەکانی فەلسەفەن، لەسەردەمی مەدرەسەی یۆنانی ئەو پرسیارانە شێوەی (کێ؟ چۆن؟ کەی؟ بۆ؟ جیهان دروست بووە؟) فەیلەسوفە مولحیدەکان پشتیان بە زانیاری گەردوونی ئەو سەردەم دەبەست کە دەگەڕێتەوە بۆ پیش بەتلیمۆس (90-168ز)، زیاتر بۆ سەردەمی (ئەنکسیمۆندری 650 پ.ز) و (رساله السموات-ئەرستۆ) دەبەست، کە ئێستا هەڵە دەرچوون.

هەرسێ پرسیاریان بە ئاسانی وەڵام دەدایەوە بەوەی کە ئەو جیهانە کەس دروستی نەکردووە و هەر هەبوە و هەرواش دەمێنێ و ئامانجیشی تێدانەبووە، بەو شێوەیە پرسیاری (بۆ)ی ناوێ و وەڵامی نیە.

لەوەوە بیرۆکەی (کون الساکن-قدم العالم)هاتە کایەوە، فەیلەسوفە باوەڕدارەکان لەژێر سایەی زانستی و ئاستی عەقلی ئەو سەردەم وەڵامەکانیان یەکلاکەرەوە نەبووە.

دوای ئەو پرسیارانە لەسەردەمی نوێدا گۆڕا بۆ: ئاخۆ مادە لەپێش رۆحە یان بەپێچەوانە؟ ئەوڕێك وپیکەی سروشت خوا بە (ترتیب)ی داناوە یان پرۆسەی گەشەسەندن ڕێکی خستوە؟ دووبارە ناسکی و تەمەن کورتی روح و لەبەرامبەر

پۆلاینی و تەمەن درێژی مادە چی دەگەیەنێ.

وەڵامی ئەو پرسیارە لە قازانجی فەلسەفەی (مادی) مولحید بوە، هەریەکە لە (یاسای پاراستنی مادە)ی کیمیا (واتە مادە لەناو ناچێ و نەمرە)، دژ بەو ئایەتەی (کل شیئ هالك...) قورئانی بوو کە دەڵێ هەمو شتێك لە ناودەچێ، ئەوەتە مادە لەناوناچێ، تێروانینی گەردونی (الکون الساکن) (الکون اللانهائی) یارمەتیدەری هەرە گەورەی فەلسەفی مادی بوە، فەلسەفە مادیەکان بەتایبەتی فەلسەفەی مارکسی لەبەشی (المادیە الدیالیکتیە) زۆر بەسانایی دەیسەلماند کە مادە پێش رووحە، بەوەی گەردوون و وزەوی بەسەدان ملیۆن ساڵ پێش سەرهەڵدانی ژیان (و رۆح) هەبووینە، ئاسان تر ئەوەبوو کە هەر کارەساتەکی مادی بەسەر جەستەی هەر گیاندار و (ڕوح لەبەرێك) یەکسەر دەبوە نەمانی رۆح، کەواتە مادە لەپێش رۆحەو ڕەسەن تریشە[1]، بەپێ ی ئەو مەیدانە فەلسەفیەی بۆ فەیلەسوفە باوەڕدارەکان دروست کرابوو بە سانایی لێ ی دەرنەدەچوون.

ڕاستیەکەی بەو شێوە نیە، نە (کێ؟ چۆن؟ کەی؟ بۆ؟) پرسیاری نەمرن، نەپرسیاری فەلسەفی بنەڕەتیش بریتیە لە ئاخۆ مادە لەپێش رۆحە یان بە پێچەوانە؟ نابوایە فەیلەسوفانی باوەڕدار بە مەنهەجی فەلسەفی ئەو پرسیارانە وەك پرسیاری یەکلاکەرەوە ڕازی بن، چونکە پرسیاری بنچینەیی لە فەلسەفە ئەوانەیە: ئەو جیهانە لەچیەوە پەیدابووە؟ کێ دروستی کردووە؟

ئینجا سەر دەفتەری پرسیار ئەوەیە ئایا ئەو هەماهەنگی و ئامانجداریەی بونەوەر لەخۆوە عەبەسیانە پەیدابووە(یان وەك ستیڤن و بەشێك لە فیزیاویانی کوانتەم دەڵێن خوا یاری بە زار کردوە)[2] یان بەبەرنامە و زانینەوەیە؟ ئایا بۆ هەر

[1] بۆ زیاتر لەو مەیدانە بڕوانە: جورج بولیتزر-اصول فلسفە المارکسیە – درس العاشر- ج1ص168.

[2] دیزاینی مەزن ل210 زۆربەی فیزیای کوانتەمیەکان ئەو ڕایەیان هەبوو ئاینشتاین دەیوت خوا یاری بە زار ناکا.

پرۆسەیەك كامیان گرنگ ترە:هۆكاری دەرەكـی یـان نـاوەكی یان هـەردووكیان؟..
بەهۆی ئەوانەش چۆن مرۆڤی ستاندەر دروست بكەین؟

مەنهەجی وەلامی ئەو پرسیارانەی پیشـوو تـر وای كـرد زانسـت و عـەقلٚ لـە قازانجی فەلسەفی مادیدا بێت، ئەو كاتە ڕایەكانی (ئەرنست همنگوای) وئەبوعلای معەری وهوایتهید دێتەدی كەدەڵێن هەمو بیریارێـك بەسروشـتی خـۆی بـیٚ بـاوەڕ دەبیٚ، هەرچی مەنهەجی ئەو پرسیارانەی بەشـی دوەمـە ئـەوا هـەر دۆزینەوەیـەك لەیاساكانی سروشت دەبێتە پاڵپشت بۆ فەلسەفەی بـاوەڕی ومرۆڤایـەتی، هـەروەك زانای ئەمریكی(ماریا میتچال) وتەنی"هەر یاسایەكی سروشتی دەدۆزرێتەوە ئـەوا پەخشانێكە بەسەر خودا"، ئەوكات (وەك ئەفلاتون ئاسا)نۆرەی (پیـادەكردن) دێـت چۆن بەهۆیەوە (دادگەری) پەیڕەو بكەین، دیكارتیش وتی ئەو جیهانـە مەكتەبەیـە هەر شتێك بدۆزیەوە ئەوا كتێبێكی ئایینیت خوێندەوە، ئیستا تا ڕادەیەك كۆتـایی بە فەلسەفەی مادی (مولحیدی) هاتووە، چونكە زانست و عەقلی سـەردەم نـاتوانن جیٚ ی نەبوونی خودا و دروستكەر لە زانستەكانی گەردوون و كیمیـا و وبایلۆژیـا و بەشی هەرە گرنگی فیزیا بدۆزنەوە، مادام گەردوون تەمەنی هـەبێت و دروسـتكراو بێت، مادام لە كیمیا مادە بە (نـەمر)ی نـەماوە، (كـل شـیئ هالـك) ی قورئـان هاتەدی، (نەی وتوە كل شیئ یموت، وتویەتی هالك) گرفتی هـەرە گـەورە ئەوەیـە سیستەمی (زانست) سیستەمێكی عەلمانیە، بۆیـە سـنوری خـۆی وا دیـاریكردووە گوایە ئەوەی بكەوێتە ژێر ئەزمون و تاقیكردنەوەی راستەوخۆ زانستە، بەوشـێوەیە خۆی لە پرسی دروستكراو دەدزێتەوە و دەڵیٚ ئەوە ئـەركی فەلسـەفەیە یـان ئـایین، بۆیە لەكاتە پێویستەكان زانست بڕیـاری خـۆی نیـە، ئـەگینا ئـەو مشـت و مـڕە لەسەدەی (21) یەكلابوویتـەوە، چـونكە زانسـت زۆر لای گرنگـی لـەو پرسـیارە ڕۆنكردۆتەوە (بیٚ ویستی خۆی)، زانستی ئێستا لەگەڵ زانستی كۆن زۆر جیـاوازن،

بەو شێوەیە دەچینە نێو بڕگەیەکی گرنگ و گۆڕانی تێڕوانین وئایدیۆلۆژیای بەشەری ئەو سەردەمە.

## زانست و فەلسەفەو گۆڕانکاری لە عەقلی بەشەری

ئەگەر بە دروستی عەقلّ کاربکات، ئەگەر بە ساغی لە یاساکانی سروشت بگەین، ئەگەر پەیامی پێغەمبەرەکان وەك خۆی مابێتەوە ئەوا عەقلی مرۆڤ و یاساکانی سروشت و پەیامی پێغەمبەران یەك سەرچاوەن، هەر سێکیان هەماهەنگن و یەك پەیامیان پێ یە، یەکەمیان (مثاق الفطرة- قورئاني باتنية)[1]، دووەمیان قورئانی بینراوەیە، سێ یەمیان قورئانی خوێنراوەیە (وەك شێخ سەعید نەوڕەسی لە-رسائل النور- سيد قوتب لە —في الضلال-باسی کردوە)، ئەگەر ئەو هەماهەنگیە نەبووئەوا کێشەکە لە بنچینەدا لەعەقلی بەشەری سەرهەڵدەدا کە بە دروستی بەکارنەهێنرێت یان بەهۆی خراپ بەکارهێنانی یان لەبەر نزمی ئاستی، بەوشێوەیە عەقلّ لەگەڵ پەیام لێك دەترازێ (بڕوانە:عەقلّ وپەیام- لەبڕگەکانی داهاتومان)، کاریگەریەکانی دەوروبەر و خۆویستی و خۆدەرخستن و.. باقی فاکتەرەکانی ئابوری و جنسی وکۆمەلآیەتی.. والە عەقلّ دەکەن سیستەمێکی بیرکردنەوە و تێڕوانینی سەربەخۆ و جیای هەبێ لەگەڵ پەیام، بەتایبەتی عەقلی کۆن، کە ئاستی عەقلی ئەو سەردەمی زۆر کاریگەر بوە بە سروشت وژینگەی نزیك، کەزیاتر وەك(جیمس پروير) لە کتێبەکەی (الإلحاد الغربي Western Atheism) بە Naturalism ودەهری بەستەوە کەلەپێش سوکرات دەست پێ دەکاو هەریەکە لە(هرکليت و ئەناکسيمينس و ئەبيکۆڕ و ئەناکسيماندر..)

---

[1] (فبعث الله الأنبياءليستأدوهم ميثاق الفطرته ويذكروهم منسى نعمته ويثيروا لهم دفائن العقول).
ئەوە لە دفتر تیبینیەکانم بە فەرموده تۆمارکراوە لەسالی 1987، کە گەڕام بۆ (مسند)نەم دۆزیەوە.بەلام لە (نهج البلاغه)بە قەولی ئیمامی علی هاتوە.

دەهریان پێ وتراوە [1]، لەبەر ئەوەی پانتاییەکی زۆری عەلمانیەتیش دەچێتەوە سەر دەهری، لەوەوە هەندێك ماف بە خۆ دەدەن عەلمانی ودەهری پێکەوە لە پۆلی (مولحیدی) ڕیز بکەن، لەو بارەیەوە (شبلی عیسمی) دان بەوە دەنێ ودەڵێ: (...أن حركة الزندقة والدهرية تلتقي في هذه النقطة مع أصحاب العلمانية المتطرفة وجميعهم فى المادية الإلحادية)[2] ، هەر لەسەر ئەو بنچینەیە(جمال الدین افغانی ) لەکتێبێکی بەناوی (رد على الدهريين) وەڵامی فۆلتیر وروسو بنەماکانی شۆڕشی فرنسی داوەتەوە[3].

زۆربەی جاریش ئەو واقیعەی لە سروشت دەبینرێ مەرج نیە ئەوە ڕاستەقینەی سروشت بێت، هەڵخەڵەتێنەرە، ئەوە لەلایەك لەلایەکی ترەوە زۆربەی هەڵگران و میراتگرانی پێغەمبەرانی کۆن لە ئاستی بەرزی ئەو پەیامە نەبووینە، بەخێرایی توشی لادان و خورافیاتی نەریت و ئارەزوی دەسەڵاتداران بووینە.

ئەو دوو هۆیە وای دەکرد ڕووناکبیرانی ئەو سەردەم لەگەڵ خەتی ئایینی لێك جیابنەوە، لەسەر ئەو بنچێنەیە مەدرەسەکانی کۆنی زانیاری و فەلسەفەی تێروانینی گەردوونی و سروشتی (فیزیایی و کیمیایی و بایلۆژی)یان جیابێت، لەهەمووی گرنگ تر فەلەکناسی بوو، بەپێ ی هەندێ زانیاری بەرچاو وهەندێکیش ئایینی (دەستکاریکراو).. تا سەردەمی مەدرەسەی یۆنانی لە (ئەنسکامندر و فیساگۆرس و...) و ئەرستۆ لەکتێبی (رساله السماوات) بۆچوونی هەموو ئەوانە

---

[1] مانای دەهری لە سەرچاوە جیاجیاکان بەو شێوەیە هاتوە:أ-لسان العرب (ابن منظور مادة: دهر): الدهر اسم المدة العالم(عمر الدنيا)، رجل الدهري أي الذي لا يؤمن بالآخرة./ ب- راغب الأصفهاني في (مفردات الفاظ القرآن- مادة: دهر) رجل الدهري أي الذي لا يؤمن بالآخرة./ ج- منجد ص227، الدهري هو الملحد.

[2] العلمانية والدولة الدينية.. ص 36

[3] د.محمد عمارة - أعمال الكاملة.لجمال الدين الأفغانى، ط 1 1979م "المؤسسة العربية للدراسات والنشر –بيروت ج1 ص108

لەکتێبی (مەجەستی) لەلایەن (پەتلیمۆس ) دارِژرا، کەتیایدا باس لەوە کرا ئەو گەردوونە نە سەرەتا و تەمەنی هەیە و نە سنوری هەیە، ئەو بۆچوونە بوە ڕای گشتی لەنێو عاقڵمەند و فەیلەسوف و ئەکادیمیا، ناوینرا (قدم العالم) یان(کون الساکن). بەشێکی زۆری مێژووی زانست و فەلسەفە بریتیە لە: بوونەوەر هەر وا هاتووە و واش دەڕوا بێ کۆتایی نەسەرەتا.

لەو بارەیەوە (نیتچە) لەکتێبی (هکذا تکلم زرادشت) دەڵێ: ((ئەو جیهانە کارلێك دەکاو دەگۆڕێ، یەك دەگرێ و لێك جیادەبێتەوە، دەمرێ و دەژی.. بەڵام کاروانی (بوون) دەڕوا بێ کۆتایی)) هەمان بیرۆکە بەشیوەی تر ئەنجلس وزۆربەی مادیەکانی شارەزا لە کیمیاو فیزیا دەیلێنەوە[1].

تەنانەنەت فەیلەسوفە ئاینیەکانی وەك فیساگۆرسیش ئەو ڕایەیان هەبوو لەوەوە هانی فەیلەسوفەکانی ئیسلامیش درا بێنە سەر ئەو ڕایە، واتە هەر بەتلیمۆس (مەجەستی) خاوەنی ئەو بۆچوونە نەبووە، بەڵکو ئەرستۆ دەڵێ لەو بارەیەوە یەك ڕەئی بووین تەنها لە نیوماندا ئەفلاتون رای وابوو گەردون تەمەنی هەیەو دروست کراوەو دروست کەری هەیە [2]، اخوان الصفا رای وابوە کە گەردوون سنوردارەو ئەبەدی نیە [3]،هەروەها کندی لە کتیبی (رسائل)هەر پیی وایە سنوردارەو خلقەو ئەبەدی نیە[4] ,کندی هەمان {ای هەبوو کە گەردوون سنوردارە[5] , (موسوعە المشاهیر)دەلیٚ یەکەم کەس (هیپارخۆس170 پ ز)باسی گەردونی کردوە ،پیش

---

[1] ف انجلز- دیالکتیك الطبیعة ص212

[2]لە تهافت الفلاسفه ص15 دەلیٚ ئەرستۆ لە کتیبی (الطبیعة) ئەو باسەی کردوە.

[3] من رسائل اخوان الصفاء –جمع: دالبیرنصری نادر ,دار المشرق/بیروت , ط22007م ص106 وص31.

[4] بروانة : ابن رشد –تهافت التهافت, تقدیم:محمدعابدالجابری ,مرکزدراسات وحدة العربیة /بیروت ,ط1 1998 ص126

[5] رسالة الکندی الفلسفیة (لابی یوسف الکندی) –تحقیق: محمد عبدالهادی بریدة , مطبعة حسان /القاهرة 1978م قسم(1) ط2 ص152-153..

پتلیمۆس بە 200سال، ڕوونی نەکردۆتەوە چۆنی باس کـردوە ،بـەلام ئـەو یەکـەم کەس نیە بەلکو بەلایەن کەمەوە (تـالیس)ی دامەزرینـەری فکـری یۆنـانی باسـی گەردوونی کردوە ،ئینجا کتیبە ئاسمانیـەکانیش باسـیان کـردوە ، ئـەو ڕایانـە دوو پاساوو ئەستونگەی گەورەی هەبوو یەکەمیان نا ئاینیـەکانیش دەیـان ووت ئەگـەر (شت) هەبوە ئەگەر نەبووبێ بۆ بە درەنگەوە خوا شتی دروست کـرد لـە نەبوونـەوە ئەدی چەند لە مێژە چی دەکرد، دوەم ئاینیەکانی یۆنانی باوەڕیان بەوە نەبوو (شـت ) لە (ناشت) دروست ببێت، بۆیە هەردوولا (قدم العالم) یان بڕیاڕدا.

ئەو بۆچوونە زەمینەی پەیامی ئاسمانیشی هەبوو لەتەورات هاتوە:(3 والفاهمون یضیئون کضیاء الجلد والذین ردوا کثیرین الی البر کالکواکب الی ابد الدهور)[1]

لەمەزموری ژ:78 کە دەڵێ: (کالأرض اسسها الی الأبـد) ئەوەش ڕەگی تیـۆری (گەردوونی ساکن) وئەبەدیە.

ئەو بۆچوونە هەروەها هەندێ خورافیەت و پرسی ناوەندیەتی زەوی و سوڕانەوەی ئاسمان بـەدەوری زەوی وایکـرد بەسـانایی لەسـەدەی(13) لەسـەر دەسـتی تۆمـا ئەکوینی(1225-1274) بووە بەشێك لەبیروباوەڕی مەسـیحیەتیش، وەك بـیر هینانـەوەش لەسـەردەمی (قوسـتەنتینی یەکـەمی پاشـای ڕۆم) بـو یەکـەم جـار مەسیحیان وەرگرت[2]. لەڕێ ی (ئیبن رشد و ئیبن سینا وئەلبیرۆنی..) ئەو تێروانینە گەردونیە بە جۆرێکی ترو هەولدرا بـێ ڕووبـە ڕووبوونـەوە بهێنرێتـە نـاو فیکـری ئیسلامیش، یونانیەکانیش و ابن رشد وفەیلەسوفانی تری ئیسـلام کـە دەیـان ووت قدم العالم هەتاهەتایی دنیا ئەوا پشتیان بە فەلسەفەو ئاین پێکەوە بەستبوو:

---

[1] عهد القدیم -سفر دانیال اصحاح 12

[2] ابن حزم - الفصل في الملل والأهواء والنحل ج1ص24

1- فەلسەفە، لە تیۆری دیموکریتس و(ئەتوم) وای بۆچوو کە (خلق) مانای دەرهینانو ریکخستن لەو ئەتومە (کە بە یەکەی هەرە کۆتایی)هەژمار دەکرا، وای بۆچوە (لەناوچوونی رەها)نیە[1] .

2- ئاین، هەندی ئایەت کەدەلی (واستوی الی السماء وهی دخان)، (وهو الذی خلق السموات والأرض فی ستة ایام وکان عرشه علی الماء — الهود7) (ام خلقوامن غیر شيءام هم خالقون الطور 35) (وقد خلقتك من قبل لولم تك شيئا -مریم9)...واتە بوون هەبوە ئینجا خوا جیهانی لەوانە دروست کردوە، لەو پرسیارە ترسناکەش رزگار دەبوون کاتێ دەیان ووت خوا بوونەوەری دروست کردوە ئەوا لێیان دەپرسین ئەدی کێ خوای دروست کردوە.

بەو شێوەیە تەوژمی بۆچونی(قدم العالم —کون الساكن) زۆر بەهێز بوو، تەواو بوە بەشێك لە عەقیدەی مسیحی،زیاتر کاریگەری قەشە(تۆما ئەکوینی )بوو وای کرد ئەو تیڕوانینە گەردوونیە ببتە عەقیدەی مسیحی ،ئەو پیاوە زۆر زانا بوو دژی زولم بوو لایەنگری ئازادی ودیموکراسی بوو ،لەگەل برایەتی ئاینیش بوو ،زۆر جار بەرگری لە پیغمبەری ئیسلام وئاینەکەشی کردوە ،سەرەڕای ئەوەش کاریگەریەکانی زۆر نەگەیشتە زانایانی ئاینی ئیسلام،بەتەواوی نەبوەبەشێك لە عەقیدەی ئیسلامی بەهۆی قایل نەبوونی بەشیك لە فەیلە سوفان لەوانە کندی وغزالی وابوعلای معری اخوان الصفاو[2] بالّی فیقهیش بەتەواوی،بەلام بالی فقهی بەتەواوی کەوتە نێوبۆچونیکی تری گەردونی ئەویش (چەسپاوی زەوی ) وسوڕانی ئاسمان

---

[1] بروانە: ابن رشد-فصل المقال و...ص42-

[2] من رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء رسالة رقم 26ص30، موفەکیروشاعیریکی وەك ابوالعلا المعری کەناوی بەمولحید ڕۆیشتوە کەچی باوەڕی بە (قدم العالم)نەبوە وەك لەودیرە شیعرەی دەردەکەوی: وليس اعتقادي خلود النجوم ولا مذهبي قدم العالم

،لەوبارەیەوە (ابو حسين بن المنادى ) دەڵێت: **(لاخلاف بـين العلمـاءفى ان الارض مثـل القبـة وان العـالم مثـل الكـرة وانهاتـدوربمافيها مـن الكواكـب ثـابتين غيرمتحركين ،احدهما فى ناحية الشمال والاخر فى ناحيـة الجنـوب كـرو الارض مثبتة وسط السماء كالنقطة من الدائرة**[1]**.**

ئیستاش هەندێ موفتی عربی سعودی پەیڕەوی ئەو عەقیدەیە دەکەن ودەڵـێن هەرچی بڵێ زەوی دەسـوڕێ کـافرە[2]،نەیزانیـە ئـەو تیـۆرە ئـاینی نیـە بـەڵکو بـۆ پەتلیمۆسی یۆنانی دەگەڕێتەوە ،پەتلیمۆس گـۆتی ئەگـەر زەوی بسـوڕابوایە کـەس لەسـەر زەوی خـۆی ڕانـەدەگرت ودەکەوت،ئەرسـتاخۆس وفیسـاگۆریش دیـارە ئەوڕایـەیان هـەبوە[3] ، ئـەوەی کـرا تـەنها هـەردوو لای مەسـیحی و ئیسـلامی پارێزگاریـان لەبیرۆکـەی (زەوی ناوەنـدی گەردوونـە) کـرد تـا بیسـەلمێنن زەوی ناوەندیکی میتافیزیکی بونەوەریشە، لەهەموو کتێبـەکانیان وایـان دەرخسـت کـە ئاسمان بەدەوری زەوی دەسوڕێتەوە.

هەرچەندە ئەو ئایەتەی قورئان کە دەڵێ: يدبر الأمر من السماء الى الأرض..بە ڕوونی بیرۆکەی ناوەندیەتی زەوی رەت دەکاتەوە، باسیشـی لـە گـەردوون وتـەواوی بوونەوەر بە سنورداری و(الى اجل المسمى) کردوە.

---

[1] اخبار الدول واثار الدول فى التاريخ- احمدبن يوسف القارمانى ص25

[3] بۆ ڕای ئەو فەیلەسوفانە سەبارەت بە سوڕانی زەوی بڕوانە : الموسوعه المشاهير ص12

لە ئاینی بوزیش (اصل)ێك هەیە بەناوی(أنیكا anicca) تیایـدا هـاتوە ((هـیچ شتێك لەو بونەوەرە نیەهەمیشەیی بیت))[1]، واتە بیری (قدم العام-كون الساكن)یان ڕەت كردۆتەوە، ئەو دەنگانەی (كون الساكن)یان ڕەت كردۆتەوە زۆر لاواز بووینە.

زۆربەی بەشە زانستیەكانی تری وەك فیزیا و كیمیا و ئەندازە و بایلۆژی لەسـەر ئەو تـیٚ ڕوانینـی گـەردوونی ئەبـەدی بنیـات نـرا، بەشـێوەیەك لـەكیمیا یاسـای پاراستنی مادە لەلایەن(لافوازیە 1743- 1794 ) دۆزرایەوە لەلایـەن (مایـەر ووجول وهلمهۆلتیز) گەشەی پـیٚ درا تیایـدا (نـەمری و پـیرۆزی) بـەمادە درا كـە حـوكمی لەبوونـەوەر و سورشـت هەتاهەتایـە و نـە لـەناو دەچـیٚ و نەدێتـەبوون، دیكارتیش بۆ (جولاٚن)هەمان ڕای داو ووتی بڕی جـولاٚن لـە گـەردوون چەسـپاوە[2]، (مادە نەمرە) بوە دروشمـی مادیـەكان[3] ئـەوەی پێـی دەوتـریٚ فیزیـای كلاسـیكی (نیـوتنی) لەسـەر هـەمان بنـەما بـوو، لەئەنـدازە و بیركـاری سیسـتەمەكەی (ئیكلیدس)[4] چەسپا كەبریتی بـوو لـە حـوكمی (ڕاسـتەهێل) و بـیٚ كۆتـایی ئـەو هێلە،... لەسەر ئەو بنچینەیە زانستی مێژوو و جوگرافیا بناغەی بیٚ پایـان و بـیٚ سنوریان بۆ زانیاریەكانیان دارشت، هەموو ئەوانە بیری گەردوونی (كـون السـاكن- قدم العالم)ی پتەوكرد كە بووە زانستێكی بەلگّەنەویست و (حدوث العالم)ی ئـایینی لاوازكرد، دواگورز لە بیری ئایینی درا ئـەوەبوو (كۆپـەرنیكۆس، كیپلـەر، گـالیلۆ،

---

[1] موسوعة الأديان العالمية —مادة: بوذية.

[2] ديالكتيك الطبيعة ص87

[3] ديالكتيك الطبيعة ص346

[4] كتیبەكەی لە بارەی ئەندازە بە(اصول الهندسە)ترجمە كراوە-دەلین ئەلبیرۆنی یەكەم جار وای ترجمە كردوە، لە كتیبی(المعتقدات الدینیە لدی الشعوب- مشرف -جفری باریندر- ترجمە :د .إمام عبدالفتاح إمام ص8 باس لە هوە دەكا ئەلبیرۆنی 4 سال لە هند ماوەتەوە فیرە وەرگیرانی زمانی سنسكریتی بوەو هەریەكە لە (اصول الهندسە )و(مجستی) وەرگیراوە. بە ئینگلیزیەكەی بە(element) هاتوە بۆیە بەشیكی تر بە (العناصر)ترجمەیان كردوە.

برونو) هاتن و بیرۆکەی ناوەندیەتی زەویان وەرگێرا و وتیان زەوی هەسارۆکەیەکی سادەیە لە سیستەمی خۆر، زەوی بەدەوری خۆی دەسورێتەوە نەك ئاسمان بسورێ، لەدوای ئەوانەش گورزی (تیۆری پەیدا بوون وگەشە) بە تایبەتی داروین گورزی گەورەی لە ئاین دا کاتێ ووتی ئەسلی مرۆڤ مەیمونە لە باوکە ئادەم نەهاتوە..کار گەیشتە ئەو ڕادەیە یەکێ لەمەرجەکانی ڕەوشەنبیر دەبوایە دوورە ئاین بوایە، وەك (نمونەکەی ئەنجلس) سەنگەرەکانی ئاین یەکەیەکە دەکەوت.

## کاریگەری ئەو زانستە بەسەر فەلسەفە و باوەڕدا:

لە ڕاستیدا جیهانێکی بێ تەمەن و بێ سنور (ئەبەدی و ئەزەلی) جێ ی هەموو جۆرە تیۆرێکی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی لێ دەبێتەوە، مادام ئەو دونیایە هەر هەبووە، دەشێ لە ئەنجامی جموجۆڵی مادە لەنێوخۆ بە ڕێکەوت یان بەهەماهەنگی مادە و دیاردەی نوێ پەیدابێ، بەوشێوەیە لە زانستەکانی مێژوو و جیۆلۆجیا و بایلۆژیا، بیری (پەرەسەندن- تەتەور) ی بەسەردا زاڵ بوو، زۆر لە ووردەکاری و پێکهاتنی (ترتیب)ی بوونەوەر یارمەتیدەری ئەو تیۆرە زەبەلاحە بوون، لەوانە بینرا (ترتیب) لە توخمەکان هەیە (خشتەکی مەندەلیفی پێ دەوترێ یان وورد تر مەندەلیف- موزلی) بەپێ ی ژمارەی ئەلیکترۆن کە لەسادە دەست پێ دەکا (هایدرۆجین یەك ئەلیکترۆن) و هیلیۆم (2) و تادەگاتە دوا قورسترین توخم یۆرانیۆم (238 ئەلکترۆن)بەوەوە پیش بینی زۆر توخمی تری کرد کە لەدوای دۆزرانەوە یەکێکیان ئەوەبوو بە پێی ئەو پیشبینیە بوابۆدران(1838-1912)غالیومی لە 1875دۆزیەوە، زانای ئەلمانی یۆهان پود(1747-1826) پەیوەندیەکی ئەندازەیی لەنێوان دووریەکانی نێوان هەسارەکانی دەوری خۆر دۆزیەوە، لە سیستەمەکانی تری بوونەوەریش (ئەو سیستەمەگەشەییە) بەدی دەکرێ بەشێوەیەك هەرەسەروی (جماد) لەگەڵ هەرە خواروی (نەبات)، هەرە سەروی

(نەبات) لەگەڵ هەرە خواروی (حەیات)، هەرە سەروی حـەیوان لەگـەڵ ئینسـان... زۆر لێك نزیكن.

(اخوان الصفاء )پێش داروین ولامارك وهكسـلی ومۆرگـان بـیری (تەتـەوری ) داڕشتوه بە شێوازی (تەرتیب) ((ان اول مرتبة الحیوان متصلة بأخر مرتبـة النبـات، وآخر مرتبة الحیوان متصل باول مرتبة الانسان، كما ان اول المرتبة النباتیـة متصـل بآخر المرتبة المعدنیة، واول المرتبة المعدنیـة متصـل بـالتراب والمـاء))[1]، یەكـەم جـار (فارابی)سروشت وكۆمەڵگـەو مرۆڤـی وا بە(ترتیب)داڕشـت[2] وا پیدەچـی ئیخـوان لسەفا سودیان لەو وەرگرتبیّ، دەشگۆتریّ لە بنەچەدا ئەو بۆچـوونە بـۆ ئـەفلاتوون دەگەڕێتەوە لەكتێبێكی بە ناوی(تیماوس) باس لە (ترتیب)ی سروشت كردوە، دوای ئەویش ئەرستۆش لەسەر ئەو بۆچونە فەلسەفیە بەردەوام بوەو لـەوەش زیـاتر پێـی وابوە لەگەڵ ئەو ترتیبە سروشت خۆشی لەگەشەیە بەرەو سەروو[3].

هیگلیش پیی وایە سروشت بە(تدریج وترتیب) ڕێكخراوە[4]، بەو شـێوە بـەپیّ ی ئـەو تـەرتیب و تیـۆری (**super upper down**) و (**less upper down**) ئـەوا جیۆلۆجیا و ژیان، سروشت و ڕوەك و زیندەوەر و ئـاژەڵ و مـرۆڤ یـەك سەرچـاوەی گەشە سەندوویان هەیە، هەموو ئەوانەی هانی (مەدرەسەی گەشەسەندن) یـان داوە كە ئەو تیۆرە بكەنە بنچینەی (خلق- پەیدابوون) هەریەكە لە سپنسـر، هرسـكلی، هیكل،... ئینجا لامارك و داروین لەكتێبی (اصـل الانـواع) تیـۆری پەرەسـەندنی مرۆڤی هێنا ئارایەوە، كـە تیایـدا دەیسـەلمێنیّ مـرۆڤ لـە ئـەنجامی گەشەسـەندن لەپۆلەكانی تری گیانداران پەیدابووە بەهۆی تیۆری هەڵهێنان، داروین وتی: ئـەوەی

---

[1] رسائل اخوان الصفاء – كتاب الطبیعیات ص19.
[2] فارابی- كتاب السیاسة المدنیة ص38
[3] جون لویس- مدخل الی الفلسفة ص56
[4] المثالیة الألمانیة ص120

بە دەستکرد بەماوەیەکی کورت دەکرێ هەلبـژاردنی سروشـتی بەماوەیـەکی درێـژ پێـی دەکـرێ[1]، و یاسـای (تـوارث المکتسـبات) لەلایـەن لامـارك و(هەڵبـژاردنی سروشتی) داروین[2]، لەهەموان ڕوون تر ئەنجلس دەڵێ (کار)مرۆڤی هێنـا ئارایـەوە لە مەیمونەوە[3].

لە پیشوو تر نمونەی گەشەی تیۆروانینی ئاینیمان باس کرد لێرە نمونـەی تیـۆروانین بۆ گەشەی (خێزان) لەسەر بنچینەی (کون الساکن) بـاس دەکـەین بەنمونـە:(یۆهان باخۆڤن ) لەکتێبی (حق الام) بەپشت بە ڕای هیرۆدۆتس وای بۆ چووە کـە ئـافرەت بۆتە هۆی پەیـدابوونی خیـزان و ئـەویش سـەرەك خیـزان بـووە، **(چـۆن مـاکینین)** لەکتێبی (الزواج البدائیە ). هەروەها (چۆن لدیۆك ) لەکتێبی (اصـل المدنیـە) وای بۆ چوونە کە کۆمەڵ لەسـەرەتادا 1- فرەمێـردی بـووە 2- ئینجـا فـرە ژنـی 3- ئینجا تاك مێردی بەخۆوە بینیوە، ئەسلەکەشی دەگێرنەوە بۆ (الزواج بالخطف — ژن هەلگرتن ) (هاوسەری بە فڕاندن)[4] کە لەشەردا دەسـتیان دەکـەوت، ئـەوەش لـەو ڕایەی داروین هەڵدەقولێ کە مانەوەبۆ بە هێزە لە چوارچێوەی مل ملانـێ و دەڵـێ :چەندین نێر شەڕ لە سەر مێیەك دەکاو لـە کۆتایـدا بـە هێزەکـە دەسـتی بەسـەر دادەگرێ و نەوەی بەهێز تر لە جاران پەیدا دەکا[5].

---

[1] اصل الأنواع ص105

[2] بڕوانة "اصل الانواع- داروین" و "دور العمل في تمول القرد الى الانسان- ئەنجلس" و "طریق طویل الى الانسان- سلامە موسی"،

[3] فریدریك انجلس-دیالکتیك الطبیعة —دور العمل فی تحول القردال انسان ص194-208

[4] ئەوەیان جیایە لەگەل بەدووکەوتن، لەبەدووکەوتن هەردوولایان قایلن بەڵام لە (بـالخطف) فڕاندنە بێ ڕەزامەندی خۆی، لەو سەردەمە بە (إغتصاب) ناودەبرێ.

[5] جارلز داروین- اصل الأنواع —ص224.

ئەوانەو (لیڤی ستراوس)و زانیاریە تایبەتیـەکانی (مۆرگان)لـەکتێبیکی گرنگـی (المجتمع القدیم) ڕای گەیاند کە کۆمەڵگە لـە دڕندەییـەوە سـەری هەلـداوە[2]، لـەو زانیاریە بێ بنچینانە بەروارو هۆکاری کەوتنی مـافی ئافرەت(گوایـە) دۆزرایـەوەو خرایە ئەستۆی(دەزگای خێزان)، وەك ئەنجلس دەڵێـت: (یەکـەم نـاکۆکی چینایەتی لەمێژوودا وارێکەوت لەگەڵ گەشەسەندنی ململانی ژن و میرد لـە ژێرسـایەی تـاك میردی، وەیەکەم چەوسانەوەش وا هەلکەوت لەگەڵ بالا دەستی پیاو بەسەر ئافرەت لە ناو یەك خێزاندا)[2].

با دوورنەکەوینە ڕای پێچەوانەش هەبوە لەنێو جەرگەی خۆیـان، ئـەوەتا رۆسـۆ دەڵێت خێزان هەر هـەبوە وبریتیشـە لـە کـۆن تـرین کۆمـەڵگـەی سروشـتی[3]. لـە سەردەمی کۆنی یۆنانیش باس لە خێزان و لە لاوازی ئـافرەت لـە توانـاو بەرگـەی دەکا بە بەراورد لەگەڵ پیاو[4]، هیچ شارستانیەك نادۆزیەوە بێ خێزان.

بەوشێوەیە (القدم العالم) لانەی سـەرجەم تیـۆرە بـێ باوەڕیـەکان بـوە، گـورزی گەورەی لە فەلسەفەی ئایینی وەشاند و پرسیاری (کـێ دروسـتکەری ئـەو دونیـا و بونەوەرە)ی نەهێشت، تیۆری گەشەسەندنیش پرسیاری کێ مرۆڤی دروسـت کـردوە نەهێشت، ح.ئادەمی کردە ئەفسانەیەك نـەك ڕاسـتی، تیـۆری گەشەسـەندن بـووە گەورەترین زەخیرەی زانست و فەلسەفە و ئایدۆلۆژیا.

---

[1]- لەدوای ئەو دۆزینەوە کۆمەڵێك تیۆر بۆ قۆناغـەکانی گەشەی کۆمەلایەتی لە قازانجی فەلسەفەی مادی هاتە کایەوە، لەوانە:
مارکسیەت: دڕندایەتی-بەندایەتی- دەرەبەگی- سەرمایەداری- سۆشیالیستی- شیوعیەت.
-ئۆگست کۆنت: لاهوتی- میتافیزیکی- زانست
-فریزەر: جادوو- ئایین- زانست.

[2]انجلس-اصل العائلة والملکیة الخاصة والدولة ص82

[3] روسو- فی العقد الإجتماعی ص36

[4] برِوانة: جمهوریة افلاتون ص155

لەونێوانـە سیســتەمی تیـۆری گەشەســەندنی کۆمەڵگـەش هاتــەدی بــە هــۆی (سیستەمی نــاکۆکی) تادەگاتــە فەلســەفەی مارکســی، کــە زۆرتــرین کاریگــەری زانستی و فەلسەفی و سیاسی لەسەر جیهان هەبوو، بەشێوەیەك یــەکیتی ســۆڤیەت وفەلسەفەی مارکســی لــەنێوان 1923 و 1991[1] لەهــەموو ئاینــەکانی ســەر زەمین چالاکتر و بەهێزتر بوو، واچاکە بە خێرایی هەلوەستەیەك لەســەر فەلســەفەو مەدرەسەی مارکسی بکەین بزانین ئەو زەخیرە فکری وفلسفیە زۆرە هەمو داهێنانی خــۆیتی یــان بوویتــە میراتگــری مــادی بەگشــتی، بــەکورتی ناســنامەی بڕگــە بنچینەییەکانیان دەردەخەین:

لــەبارەی گــۆڕان و مولکیــەت مارکســیەت ســودی لــەو ڕایانــەی پــیش خــۆی وەرگرتبوو، لەوانە:

*ئەدمۆند بیرك (1870): کۆمەڵ بەپێی پێویستیەکانی دەگۆڕێت.

*ســـان ســـیمۆن (1760- 1825): کۆمـــەڵ دەگۆڕێـــت بـــەپێی گـــۆڕانی مولکیەت.

*بیریارەکــانی شۆڕشــی پیشەســازی: زۆربــەی داوای نەهێشــتنی مولکیــەی تایبەتیان دەکرد.

+ لەبارەی سیاسی و ئابووریش:

*(ئادەم سمیس و ریکاردۆ) ئەوانە سیاسەتیان بە ئابووری بەستەوە.

+ لەبارەی چینەکان:

---

[1] رووسیا لە 30/12/ 1922 لە سەر دەستی (لینین ) بووە یەکێتی سۆڤیەت کە پێك هاتبوو لە: (ڕوسیا، ئۆکرانیە، کازاخستان، ئۆزباکستان، ڕوسیایسپی، جۆرجیا، لتوانیە، ئازەربێجان، مالدڤیە، تاجکستان، لاتڤیا، ئەرمینیا، تورکمانستان، ئستونیە، قیرغیزستان ) ناوی نەتەوەیی بە ڕوسی (سویز سۆڤیتك سوسیالیستی سیکخ ریبدبیك)، لەبنەچەدا (سۆڤیەت ) وشەیەکی ڕووسیە بەمانای (ئەنجومەن ) یان (شورا ).

*ئۆگست پلانك (1805- 1881): پێشبینی داڕمانی برجوازیەت و هـاتنی پرۆلیتاریای کرد.

+ کاریگەریەکانی تر:

*هەریەکە لە کتێبەکانی (هۆلباخ- نظام الطبیعة)، (مۆرگان- المجتمع القـدیم)، و تیۆری پەرەسەندن و (مبدأ لافوازیـە)ی کیمیـا کاریگەریـەکی مـەزنیان لەسـەر مارکس هەبوو. (لینین)یش لەکتێبی (مـارکس والمارکسـیە) لـەو وەسـفەدا دەڵـێ مارکسیەت میراتگری:

1- فەلسەفەی کلاسیکی ئەلمانی (فیورباخ- هیگل)ە.

2- ئابووری کلاسیکی ئینگلیزی (ریکاردۆ- ئادم سمیث).

3- سۆشیالیستی کلاسیکی فەڕەنسی.

لەبارەی گەردوون وبوونەوەریش داکۆکیەکی زۆر توندی لە (کون الساکن) دەکرد و(لانهائیە العالم ووحدتە)ئەدریسی هەرەگەورەی مادیەی دیالکتیکی بوو، بنچینەی باقی تیۆرەکانی بووکەلە پیشە خۆی ڕای(کانت وسپینۆزاش )بوو.

فەلسەفەی مارکسی بەوەش نەوەستا گـورزێکی زۆر گەورەشـی لـەمیتافیزیکی بونــەوەرو کارگێڕیەکــەی دا بــەوەی کــە جاڕیانــدا ئــەو بوونــەوەرە بریتــی نیــە لەکارگێڕیەکی بە سیستەم ورژێم بەڵکو ناکۆکی وبێ سەروبەری لەسەرتاسـەریدایە، ئەوەش زۆر کاریگەری کردە سەر فەلسەفەی سەدەی 21 بەتایبەتی فیزیای نـوێ و لەویشەوە بۆ فیزیای کوانتەم، یان ووردتر بەشێکی ئـەکتیڤی فیزیـای کوانتــەم کـە پێی وایە ئەلکترۆن وتەنۆلکـە بچـوکەکانی تـر بەیاسـاوهۆکار کارناکـەن بەڵکوبـە ئەگەرو زار هەلدان ومانـای سیسـتەمێکی بـێ سـەروبەریەکی سەرتاسـەریت پـێ دەداڕەگەکەی بۆ ئەوتیۆرەی خوارەوە دەگەڕێتەوە، وەك زۆر بەکورتی باسی دەکەین.

# ناکۆکی سەرتاسەری(بوون ونەبوون لەیەك کاتدا)

لەمیانەی لیکدانەوەی فەلسەفی بۆ بوونەوەر وچۆنیەتی کارکردنی وسەرهەلدانی کۆمەلێك ڕاو بۆچوونی فەلسەفی هاتە کایەوە، هیچیان وەك فەلسەفەی (متناقظات)وەلامی زۆری پێ نەبوو،بۆ هەمو مەیدان وکیانێك ناکۆکی ناوەکیان لێدۆزیبۆوە،لەناوکۆمەلگە:ناکۆکی چینایەتی،لەناوجەنگ هیرشوبەرگری،لەناوفیزیاکاروکادانەوە،لەبیرکاریکۆکردنەوەولیدەرکردن،کیمیا یەکگرتن ولیکجیابوونەوە،بایۆلۆجیامردن وژیان ..هتد دەیان ووت هەمو ژیان ناکۆکیە،بەو هۆیەش بوونەوەرو ژیان پەیدابووەو دەمینیتەوە [1]،

لە هەموشیان ئالۆز تر ئەو بەشەی (بوون ونەبوون)، ناکۆکی سەرتاسەری..کە پێچەوانەی ئەسلیکی گەردوونی بوو کە بریتیە لە هەماهەنگی سەرتاسەری، بۆیە پێویست هەلوەستەیەکی لەسەر بکەین.

لەسەرەتای فەلسەفەی مادی لەگەڵ قولبونەوە بۆ(چۆنیەتی پەیدابوون وجولەو گەشەی مادە) وەسفیك دەکراخۆشیان سەریان لێ دەرنەدەچوو نزیك دەبۆوە لە سەفسەتیەکان، ڕەنگە لەهەموان ڕوون تریەکەم جار هرکلیت ووتی ناکرێ لە ڕووباریکدا دووجار هەمان ئاو ببینیەوە، ئیتر ئەو ووتەیە بە سەرەتای مێژووی دیالکتیك هەژماردەکەن، ئەو بۆچوونە ڕووچو بۆ مادەو تەنی تریش توشی دووڕوویی دەبوون لەو تەن ومادانە، وادەرکەوت : لە جوولەیەو وەستاوە، هەیەونیە، ئامادەیەو غائبە، مادەیەو نامادەیە..

لەوەوە فەلسەفەی گومان وڕاڕەوی دیالکتیك و بنەمای فەلسەفی(ناکۆکی – التناقض) سەری هەلدا، فەیلەسوف وزانایەکی وەك دیکارت لەوەوە کاتیکی زۆری

---

[1] لەهەمو کتیبە مارکسیەکان باسی ناکۆکی کراوە بەلام لەکتیبەکەی ئەنجلس(انتی دوهرنغ)لەهەموان زیاتر ئەو باسەی کردوە .

خۆی بۆ ئەوەی تەرخان کرد تا گەیشتە ئەو دلنیاییەی کەخۆی هەیە مادام بیر دەکاتەوە(لەکتیبی الرازی **المطالب العالية** ص35 و39و101و113و118 باسی "**انا افكر اذن انا موجود**" باس کردوە پیش دیکارت هەروەهاش مەبدەئی شك لەلایەن غزالی ) ، هەندێ جاریش وەردەچەرخا بۆ میسالی زاتی ونکولی لە بوونەوەر دەکرا تەنها دەیان ووت ئەو بوونەوەرە لەمێشکمان هەیە، لەهەموان ووردتر (هیگل) بۆ ئەو بابەتانە ڕووچووبو، پێی وابوو هەموو شتێك هەیە لەهەمان کاتدا نیە، هەندێ لای چەسپاوەو دەیەوێ بیپاریزی هەندێ لاشی دەیەوێ بیگۆڕی و دەبێتە ناکۆکی، لە ئەنجامدا دەبتە شتیکی تر، ئەویش بەدەوری خۆی بەهەمان خول تیپەڕ دەبێ و جولانەوەی دیالکتیك وگۆڕانی سەرتاسەری دروست دەکا، ئەو سێ هەنگاوە ناوی نراوە (سێ کوچکەی هیگلی)کە بریتیە لە : (بوون –دژ- پیکهاتەکی بالاتر)[365] یان (الشيئ، ضده، مركب الأعلى- **Theses -untiTheses- synTheses**)[2]، لەسەر ئەو بنچینە هیچ شتیك بوونی ڕەهای نیە، ئەوەشتە لەهەمان کات شتیکی ترە، شوبنهاور وەك هیگل وئەنجلس ئەو باوەڕە فەلسەفیەی هەبوو، هەولدرا ئەو بۆچوونە بگشتێنن و لینین بەسەر جولەی میکانیکی پیادەی کردو ووتی جولە بریتیە لە یەکیتی بەردەوامی ووەستانی(زەمانی ومکانی)، ماوتسی تۆنگ بەسەر پرۆسە جەنگیەکانی پەیڕەو کرد.

بلیخانۆف دەڵێ هەمو گیانداریك هەمو شانەیەکی ژیان مردنی لەگەڵ خۆی هەلگرتوە، کەواتە دەتوانین بلێین ئەوە زیندوەو لەهەمان کاتدا مردوە، هەموی

---

[365] جون لويز- مدخل الى الفلسفة دار الحقيقة بيروت، ترجمة:انور عبدالله، ط2 ص193-194دەلێن ئەو تیۆرە فلسفیە کۆنەلە پیش هیگلهەبوە بەشیکی تردەلین لەسەردەمی یۆنانی هەبوە .

[2] سبينوزا –رسالة في اللاهوت والسياسة، ترجمة:د حسن حنفي، دارالطباعة–بيروت، ط1 ص100

لەگۆڕانە بە هیچ خوایەك ناوەستێ[1].. بەو شێوەیەفەلسەفەی ماركسی ئەو بۆچونە فەلسەفیەی هیگلی بەسەر جم وجولە بایۆلۆجی وكۆمەڵایەتی وئابووریی وسیاسیش پەیڕەو كرد، دوای ئەنجلس لە هەموان زیاتر و جورج پۆلیتزر لە كتێبی(اصول فلسفه الماركسیه) ئەو جۆرە فەلسەفەیەی بەسەر سەرجەم سیستەمە (تناقض)یەكان پیادە دەكرد.

ئەگەر پیشوو تر لە فەلسەفەی دیالكتیكی هیگل مانای گۆڕان وگەشە بریتی بوو لە گۆڕانی سەلبی وپاریزگاری لە ئیجابی، لە تیۆرەكەی ئەنجلس مانایەك بۆ ئیجابی وسەلبی ڕاست وناڕاست، دادگەری و زۆرداری... نەدەماهەموی بە چاك وخراپەوە بگۆڕدرێت تا ئەو ڕادەیە بەپێی بنەمای (باكۆنین): (كل تحطیم للقائم هو الخیر لإنسانیة)[2].

سەرەنجام ئەزمونی ئەو تیڕوانینە فەلسەفیە چارەنوسی كۆمەڵگە ومرۆڤایەتی زۆر لاواز كرد، هەتا كاریگەری لە سیستەمی سەرمایەداریش كرد، وای كرد مرۆڤ لەبەرامبەر كاڵاو سەرمایە هاوسەنگ نەبێ،، تا ئەو ساتەش كاریگەری زۆر ماوە، لەو سەردەمەش مدرەسەی فرانكفۆرت وگروپی ڤیەنا و زۆری تركاریگەرن بەو تیۆرە فەلسەفیە، تەنانەت ڕەهەندی فەلسەفی (دیزاینی مەزن) و تەقەلاكانی فیزیای كوانتەم بۆ ئەو فەلسەفەیە دەگەڕێتەوە، بۆیە پێویستە هەلوەستەی چاكی لەسەر بكەین، چونكە ئەو بۆچونە گوزارش لە فەوزایەك دەكا لەو بوونەوەرە دەبێتە بنچینە بۆ هەمو تەیاریكی فەلسەفی مادی بێ سەرو بەر وەك بلیخانۆف پێی

---

[1] ج بلیخانوف- تطور نظرة الواحدیة الى التاریخ ص64

[2] مبادیء الثورة ئەو كتیبەیە كەناوبانگی باكۆنینی پێ دەرچوو تیایدا داوا دەكا دام ودەزگای ئیمپریالیزم هەلتەكینرێ بە چاكوخراپەوە، ریكخراوە تیرۆریستیەكانی وەك بادرماینهۆڤ وئەلویە ئەلحمرا و..لەو تیۆرە سەرچاوە دەگرن.

گەیشتوە دەڵێ : بەو شیوەیە دەگەینە ئـەنجامیکی گـرنگ ئـەویش ئەوەیـە هـەرە دادگەری لەهەمان کاتدا زوڵمە[1].

هەر لەچوارچێوەی ئەو گەلالە فەلسەفیە ماوتسی تۆنگ دەڵێ :مردن بـێ ژیـان نابێ، ژیانیش بـێ مـردن نـابێ بورجـوازی بـێ پرۆلیتاریـا نـابێ.. ئـەوە یاسـای هەرەفراوانە هەمو شتیك دەگریتەوە [2].

ئەنجلس داهێنانیکی گەورەتری لەسەر هەمان بنچـینە پیـك هینـا کـە وادەکـا بناغـەکانی گەردونیش بێ مانا وعەبەسی دەرچێ، بەکورتیەکەی دەڵێ: هەر تـەنێك کە دەجولێ لەسەر خالێکە لەهەمان کات لەسەر ئەو خالـە نیـە، لەسـەر خـالێکی ترە[3]، دەڵێ ئەوەش گـەورەترین نـاکۆکی بوونـەوەرەو سەرتاسـەری دەگریتـەوە لـە بایۆلۆجیاو کۆمەڵگەو تیکڕا، مردوەو زیندوە، جولەیەو وەسـتاوە، سـنوردارەو بـێ سنورە، ئەنجامەو لەهەمان کاتدا هۆکارە، ڕاستەو لەهەمان کات چەوتە...

بۆ ئەوەی بە ووردی ئەو بۆچونانە هەلسەنگێنین پێویستە ووتەکان بـە دروسـتی تۆماربکەین چونکە ئەو ڕستە فەلسەفیانە زۆر هەستیارن هـەر بـە پیتیـك مانـای دەگۆڕێ بەتایبەتی لەبارەی فەنکشنی(کات) و(خال) وچـۆنیەتی بەرامبـەری یـەکتر بە(one-to-one) کە گەلالە فلسفیەکەی ئەنجلسی لەسەر وەستاوە، (ئەلەکزەندەر سامۆیل-لە 1937مردوە) کەمێك لەبارەی (one-to-one) بەو شـیوەیە دواوە: سامۆیل لە نێوان دووڕای دژ بەیـەکی (برجسـون) کـە دەلـێ زەمـان سەرمەشـقی مەکانە و(برادلی)کە دەڵێ زەمان تەنها لایەکی چـالاکی مەکانـە هـەردوولای ڕەت کردۆتەوەو دەڵێت: (کل نقطة في المكان تتحدد وتتميز بـآنٍ في الزمـان، وكـل آنٍ مـن

---

[1] تطور نظرة الواحدية الى التاريخ ص64

[2] ماوتسی تونك- مؤلفات مختارة- حول التناقظ ج1ص398.

[3] فريدريك انجلس - انتي دوهرنغ- ترجمة فوئاد ايوب \ ط1 1965ص101 و ص144-145.

الزمان يتحدد بموضعه في المكان)[1] وادەردەکەوێ ئەو گەلالە فەلسەفیە ئالۆزەی هیگل وئەنجلس و لایەنگرانیان لەو (one-to-one) ووردنەبن، ڕاستە هەمویان لەمەکانیەکە یەك دەنگن بە(خال) گوزارشیان کردوە، بەلام بۆ کاتەکە بە سێ جۆر هاتوە :

1- لە ئەنتی دوهرینك لەلایەن ئەنجلسەوە کاتەکە بە(نفس الوقت) نەهاتوە بە(لحظة)و (برهة) هاتوە.

2- لە لای بلیخانوف(هەر لە ص64) بە(نفس الوقت)هاتوە.

3- لەلای مادیە الدیالکتیکیە بەوجۆرە هاتوە: (فلايمكننا التحدث عن الجسم المتحرك موجود، فی ای فترةمن الزمن فقط فی نقطة معينة)[2]...

واتە کاتەکە بە (نفس اللحظة ونفس الوقت ونفس الفترة ) هاتون، هەریەکە لەو سێ دۆخە بە پێی زانستی (زەوجی – بیرکاری بێ کۆتایی ) زۆر لێك جیان هەرچەندە بەیەك مەبەست ولە چوارچێوەی یەك مەدرەسە نوسراینەوە.

لێرەدا کۆمەڵێك پرسیار دروست دەبێ وەلامی نیە: ئاخۆ ئەو ناکۆکیەی (بوون ونەبوون) (لەسەر خالیکەو لەهەمان کات لەسەر ئەو خالە نیە)..ئەو ناکۆکیانە دەبنە سەرچاوەی جولەوگەشە وەك لە یاسای یەکەمی دیالکتیك هاتوە؟ ئایا ئەو ناکۆکیە ڕاستەقینەیە یان پارادۆکسی فەلسەفی مادیە؟ واتە هەرلە مێشکمان ئەو ناکۆکیە هەیە؟ ئەگەر ڕاستەقینەن با بزانین چەندە دوومەرجەکەی دیالکتیك دەیان گرێتەوە؟ بۆچی بە سێ شێوە هاتوە؟

وەلامی ئەو پرسیارانە وەلامیشە بۆ تەواوی بابەتەکە، جارێ لەپیشدا خودی ئەو گەلالە فەلسەفیە ناکۆکە لەگەڵ بەشەکانی تری مادی ومارکسی ئینجا فەلسەفەی گشتیش، چونکە هەمو لایەك بە مارکسیشەوە کۆکن لەسەر ئەوەی جولانەوەی

---

[1] الكزندر صاموئيل - المكان والزمان والألوهية ص60
[2] مجموعة علماء السوفيت- المادية الدیالکتیکیة ص262

میكانیكی وەك لە یەكەم یاسای میكانیكی بــە ڕوونــی دەری دەخـا بــە فاكتــەری دەرەكی دەجولیٚ {یظل الجسم على حالته الحركية (إما السكون التـام أو التحريـك في خط مستقيم بسرعة ثابتة) ما لم تؤثر عليه قوة تغيره من هذه الحالة}.

كەچی ئەو ناكۆكیەی ئەنجلس باسی دەكا زۆر ناوەكیە، ئەگەر ئەوە ناكۆكی بیت وسەرچاوەی جوولّەكە بیت ئەدی چۆن دەوەستیٚ؟ خۆ ئەگــەر وەســتا مــادام لەســەر خالیكەو لەسەر خالەكەش نیە ئەوا لەسەر چ خالیك دەوەستیٚ ؟

ئینجا لــە بــارەی مەرجــەكانی دیالكتیــك بەووتــەكانی ماوتســی تۆنگیشــەوە دەرناچیٚ، یەكەم مەرجی پەیوەندی دیالكتیكی بۆ هەر ناكۆكیەك ئەوەیە كــە هــەر لایەكیان مەرج بیت بۆ بوونی دوەم، ئەوەتا مردن بیٚ ژیان هەبوەودەبیٚ بەلاّم ژیــان بیٚ مردن نیەونابیٚ(یان وەك كتیٚبە گەورەكەی-اسس الماركسـيەاللينينيه-لــەبارەی دیالكتیكی نیٚوان كۆمەڵگەوسروشت) سروشــت بــیٚ كۆمــەڵگــە بــوەو دەبــیٚ بــەلاّم كۆمـەڵگە بیٚ سروشت نابیٚ..لەگەڵ زۆر پرسیاری تری بــیٚ وەلاّم، كەواتــە بــابزانین ڕەچەلەكی ئەو ناكۆكیە لــە چ هــاتوە لــە واقیعــە یــان لــە زیهــن ومیٚشــكی ئــەو فەیلەسوفانە هاتوە؟ لە ئــەنجامی بەرابــەر نــەبوونی چــركە لــە (زەمــەن)و خال(لــە مەكان)دا هاتوە؟

بازیاتر هەرسیٚ دۆخی ناكۆكیەكە بە (چركە) و(هــەمان كات)(نــەتوانین) هــاتوە گفت وگۆبكەین :

1- ئەوەی ئەنجلس دەلی تەنە جولاوەكە لەسەر خالیكەو لەهەمان چــركەدا لەســەر خــالیكی تــرە ئــەوا نــاكۆكی نیــەو ڕاســتە، كیٚشــەكە لــەوەوە ســەر هەلــدەدا لەبەرامبەر خالی مەكانی چركەی زەمەنی بۆ دیاری كــراوە وەك (هاوتــا) وئــیتر ناكۆكی لیٚ دەرچوە، كەچی وانیە خودی(چركەی زەمەنی) وەك (خالی مــەكانی) نیە، بەڵكو چركە بریتیە لە (فەترەی زەمەنی نەك خــالی زەمــەنی ) تــا ئیســتا ملیۆنیك بەشە چركە دیاری كراوە (1000000/1 ) كە ئیشی لەسەر بكریٚ،

زۆر لەوە کەم تر تەمەنی (ڕەنین-resonance) بە$10^{-23}$ چرکە دیاری کـراوە، کەم ترین پیوەری زەمەنی تا ئیستا بریتیە لە $10^{-43}$ کە پێی دەڵـێن (پیـوەری پلانك-chronon)[1]،بەلام بە تیۆری (کەمترین ئەگەری گـەردوونی بریتیـە لـە $10^{-150}$ ،یان جـاریش وایـە پێـی دەووتـریێ ڕادەی محال،کەواتـە لـە بەشـیکی بچوکی چرکە لەخالێکـەو لـە بەشـێکی تـری هـەمان چـرکە لەسـەر خـالێکی ترەوئەوە ئاساییە وناکۆکی نیە، لە چرکەیەکدا مرۆڤ دەتوانی دەیـان سـەنتیمەتر بجولیت، فرۆکە بە سەدان مەتر دەبڕێ، ڕووناکی هەزاران هـەزار کیلۆمـەتر لـەو چرکەیەدەبڕێ.. ئەگەر چۆن خالی مەکانی لە (سیستەمی زمـان) هەیـە ئـاواش خالی زەمەنی هەبوایە ئەوا ئەو ناکۆکیە زیهنیە سەری هەلنەدەدا، واتە کێشـەو ناکۆکیەکە لە واقع نیە، ڕاستەقینە نیە، زاتی و کەلامیە.

2- بەشی دوەم زۆرایەتی وا هاتوە کـە لەسـەر خالێکـەو لەهـەمان کـات لەسـەر خالێکی ترە یان وەك هیگل دەڵێ لەسەر خالێکەو لەهەمان کاتـدا لەسـەر ئـەو خالە نیە...، مادام (جێکەوتی) جولەکە لەسەرهیلە یان تەختە یـان هەرچـیەك بیت ئەوا جێکەوتەکە لە خالێ پێك هاتوە، هەڵبەتە ئەگەر لەسەر ئەو خالە نەبێ هەردەبێ لەسەر خالێکی تر بیت، کەواتە دەڵێن تەنە جولاوەکە لەسەر دووخالـە لە هەمان کاتدا، دووخالێش مانای (دووری-مسافە) دەبەخشـێ، بەبـەردەوامی ئەوجولە بەوسیستەمە واتە یان خێراییەکەی ڕەهایە وزەمەن سفرە، یان هەر لـە ئەسلدا ئەو جولەیە دووریەك دەبڕێ بەبێ زەمـەن، ئـەوەش مەحالە.کەواتـە لـە دۆخی یەکەم ودوەمی سەروو هەر کێشە لە گوزارش ودەربڕینە بەلایەك فـەترەی زەمەنی دروست دەبێ بێ بڕینی دوری(سـفری مـەکانی)، بـەلای دوەم فـەترەی

---

[1] بۆ ئەو ووردەکاریەی یەکەی زەمەنی بڕوانە: روجر بنروز، ابنرشیمونی، نانسی کارترایت، ستیفن هوکینغ- فیزیاء العقل البشری والعالم من منظورین ت:عنان الشهاوی ص23

مكانی دروست دەبێ بە (سفری زەمەنی) لە هەردووباردامانای نەبوونی پەیوەندی زەمان بەمكانە..كە محالە.

3- دۆخی سێیەم دەڵێ ناتوانین بڵێین تەنیك لە فەترەیەكی زەمەنی لەسەر خالیكی دیاری كراوە، ئەوە وەك دۆخی یەكەمە دەیەوێ بلێ لە چركەیەك (كەمتر یان زیاتر گرنگ نیە هەر فەترەی زەمەنیە) تەنی جولاو لەسەر خالیك نامینیتەوە، ئەوە ڕاستە هیچ (ناكۆكی) دروست ناكا.

ئیستا دەتوانین لەوەوە وەڵامی گەلالە ئالۆزەكەی هیگل وئەنجلس بدەینەوە لە بارەی جولەو بوون ونەبوون، ئەو دۆخەی سێیەم بەشیوەی تری جودا جودادەتوانین دەر ببڕین وبڵێین : گەیشتنی تیشكی ڕۆژ لەپارچە چركەیەكی زۆر بچوك لە هندە لەپارچەیەكی تری چركە لە ئەمریكایە، كەواتە لەهەمان چركە لە هندەو ئەمریكایە، هیلكە هیلكەیە لە هەمان هەفتە جوجكەیە، مندال منداله لەهەمان سەدە پیرە،.. بەو شیوەیە كۆدەكانی ناكۆكیەكە گوایە لەناو هەمو شتیك هەیە ڕاستیەكەی ناكۆكی نیە بەڵكو ناكۆكیەكە لە زیهن دێت كە وورد نیت لە دیاری كردنیكی بیركاریانەی زەمان ومكان وهاوكێشە هاوتاكانی.

**پیچەوانە- هەماهەنگی سەرتاسەری:** بەو شێوە ئەو بوونەوەرە بریتی نیە لەناكۆكی و فەوزای سەرتاسەری،عەبەسی نیە، بەڵكو هەماهەنگی سەرتاسەری هەیە هەروەك ئەكزیۆمی پینجەمی ئیكلیدس بەناوی (مبدأ عدم التناقض- Consistenc) هاتوە، كیپلەریشلەسەر هەمان بنچینە بۆچونەكانی لەكتیبیك بەناوی(التوافق الكونی )دانا بەمانای سازان وهەماهەنگی گەردوونی ،نیوتنیش پێی وابوئەو گەردوونە وەك كاتژمێرە هەماهەنگە نەك ناكۆك،ژیانی ڕاستەقینەو پیشكەوتن وبینای زانستی لێرە كراوەو دەكرێ ،لەوسەردەمە بەو جۆرە زانستە دەگۆترێ (هاوسەنگی سروشتی) ،تیایدا گونجان وسازانیكی سەرانسەری بەدی دەكرێ نەك لەسروشت بەلكو لەتەواوی بوونەوەر،لە نێو خۆو

لــە نێــو سروشــت خۆبەخۆ،سروشــت لەگــەل ژیــان ،ژیــان خۆبەخۆ،تادەگاتــە مرۆڤ،لەوێش مرۆڤ خۆبەخۆ ولەگـەل سروشـت ەژیــان وتەنانــەت لەگــەل خــودی خۆشی،بۆیە ڕەنگە بلـێین هاوسـەنگی گـەردوونی باشـتر بێـت لـە هاوسـەنگی سروشتی ،لە نێو هەمو ئەوانە نـاکۆکی ونـەگونجان وفـەوزای سەرتاسـەری نیـە ،بەلکو گونجان وهەماهەنگی ویەکتر تـەواوکردنیکی سەرتاسـەری هەیە،بوویتـە هاوسەنگی گەردوونی ،تیایدا ڕێکخستنێکی ئامانجدار بەرهەم دێنـێ ،بونـەوەر هــەر لــە بچــوکترین تــەن تــا کەشکەشــان هــەر هــەموی بــە یاســا کــاری کردوەودەکا،بواری یاخی بوون نیە .

کەواتە نـاکۆکی هەیـە بـەلام دۆخـە ،هەمیشـەیی نیە،هەرلەوەشـەوە بناغـەی تێڕوانینی عەبەسی و (صدفە) وناکاو وهەلدەتـەکێ،هیچ بوونێـك نیـە بێئـەرك وئامانج،زیادەبێت ،بێکار بێت ،هەر لـە ئەسـتێرەکی کـوازاری دوور تادەگاتـە دووپشك ومارویێویستن زیادە نین،بەلایەن کەمــەوە بەشـێکن لـەو هاوسـەنگیە گەردوونیە، تالە موویەك لـە ڕوومــەتی پلنگێـك بێئامــانج ولــەخۆڕا دروسـت نەکراوە ،ئەو موە لابدە ،کاریگەری لەسەر پلنگەکە وەك خۆی ئەگـەر کـەمیش بێت ،ئەگەر ئەو تالــە مــوە بەتــەواوی لە(نــەژادی پلــنگ) لابــدە بەماوەیــەك هاوسەنگی سروشتی تێکدەچێ ،ڕەنگە تێکڕای تەمــەنی نــەژادی پلــنگ تــەنها 5000سال دەوام بکاو لەناو بچی یان زیاد بکا لەهەردووباردا دیزاینەکە تیـك دەچی ،بەهەمان شێوە هەرزیادی وکەمیــەك لــە پۆلــەکانی تــری ژیــان هــەمان ئەنجامی گەورەتری دەبێت،ئەگەر بالت لە کۆتر ستاندەوە داتە دووپشك ،ئەگــەر قاچت لە مامز ستاندەوەو داتە مار ،ئەگەر عەقلت لە مــرۆڤ ســتاندەوەو داتــە مانگا ،یان بە پیچەوانە تێکڕای ژیان تیکو پیکدەچی ،نەك هەر ئەو ئالو گـۆڕە بەلکو زیادەو کەمیەکیش، تەنها بال بۆ مــرۆڤ هــەبێ کەوادەردەکەوێ(نعمــەت بێت)ژیــان نامێنێت،..بەهــەمان شـێوە هــەرزیادی وکەمیــەك لــە ڕێـژەی ئـاو

وئۆكسـجين وقـەبارەو خێرايـی زەوی مـانگ رۆژ تـەواوی بوونـەوەر هـەمو هاوسەنگیەكان تيك دەچیٚ وژيان نـامێنیٚ ئـەو جـۆرە دێزاينـەی گـەردوونيش نابێت ،جانازانین بيجگە لەو دێزاينە گەردوونيەی هەيە بوار هەيـە دێزاينـی تـر هەبێت ،نازانین و واپيدەچی نەبيت ،ئـەوە بـەجارێك بـوار لەبـەردەم عەبـەس و سـودفە و ڕەمـەكی هەلـدەگریٚ لەهـەمان كـات بەيـەكجاری بـوار لەبـەردەم بيركردنەوەش لە تيۆری تەتەورو پەرەسەندن(بە تايبەتی تيـۆری **البقاءللاصلح)** **(تنازع من اجل البقاء)** وهەرسیٚ ياسای ماديـەی ديالكتيك(ياسـای نـاكۆكی-ياسای وەرچەرخانی گۆڕانكاريە چەندايەتيەكان بۆ چۆنايەتيەكان – ياسای نەفی نەفی) ،ماركسيەكان وتەواوی ماديەكان هەستيان بەهەلەيی ئەو تيۆرە كرد، ستالين لەدوای ئەوانە هات هەرچەندە لايەنگری ئـەو گەلالەيـەی ئـەنجلس بـوو بەلاٚم كاريكی تری كرد لە كتێبەكەی(المادية الديالكتيكيه والماديه التاريخيه) لە جياتی ياسای سێيەم(نفی النفی) ياسای (إلتحام العـام)ی دانـا كەلەگـەلٚ ئـەو گەلالەيـەی ئـەنجلس وهيگـل تيـك ناكاتـەوە زيـاتر لـە گەلالـەی فەلسـەفی ئاينی(هەماهەنگی بوونەوەر) نزيك دەبێتەوە.

مـەرج نيـە ئـەو هاوسەنگيەی(هاوسـەنگی سروشـتی) چەسـپاوو سـتاتيكی بێت،لەناوەخۆ گۆڕانی بـەردەوام هەيـە لەدەرەوەش،جاريشـوايە لەسـەر ئاسـتی هاوسەنگيش دەگۆڕیٚ ئەوكاتـە پـێی دەلـێن هاوسـەنگی گـۆڕاو ،واتـە خـودی گۆڕانی هاوسەنگيش لە چوارچێوەی هاوسـەنگيە ،مقەيـەدە ،وەك هاوسـەنگی نێوان هيزی تيهەلدانی ناوەنـدی(**طـرد مركـزی**)گـەردوونی وهيـزی كيشـكردنی ناوەندی(**جاذبية المركزية** )گەردوونی ،كە لە فراوان بـوونی گـەردوون گـوزارش بوە ،ئەوە بەكارەو لە گۆڕانيشە ،هاوسەنگيەكی گۆڕاوە ،تيايدا ئەجەل وتەمەنی گەردوونيشی پێوە دياری دەكرێت ،ئەگەر ئەوجۆرە هاوسەنگيە نەبوايـە فـراوان بوونی گەردوونی يان نەدەبوو يان دەبووە موتلەق

،لێرەوە جاریکی تر دەردەکەوێ هەمو پارچەیەکی بچوك وگەورەی ئەو گەردوونە بە بینراوو نەبینراوەو پێویستن وزیادە نین، لێرەوە وەلامی ناڕەزاییەکی (فرانك کلۆز) سانا دەبێت کەلەسەردەمی خۆی زۆر قورس بوو ،ئەو ووتی ئەگەر مەبەستی خودا لەو بوونەوەرە تەنها مرۆڤە چ پێویستی دەکرد ئەو گەردونە گەورەیە دروست بکا هەر کۆمەلەی خۆر بەس بوو ،ئیتر باسی لەوە کرد ئەو بوونەوەرە پڕیەتی لە ئەستێرەو نیازك وکەشکەشانی بێئیش وکارو زیادە دروستکراو یان ئەوەتا خوا نەیزانیە بە دانایی کارەکەی بکا یان ئەوەتا ئەوبیرۆکەی کە گوایە خوا جیهانی دروست کردوە ڕاست نیە ، ئەو بۆچوونە ئاینپەروەرانی جیهانی مەسیحی ویەهودی وموسولمانی دلتەنگ کرد کە وەلامەکەی زۆر زەحمەت بوو لەو سەردەمی لە ژێر سایەی نەبوونی زانستی (هاوسەنگی سروشتی) ،بوە هۆی سەرهەلدانی زیاتری فلسفەی مادی وتیۆرە زانستیەکانی تری وەك تیۆری پەرەسەندن، زەمینە یەکی بەهێزیشە بۆ یاسای داروینی (هەلبژاردنی سروشتی)،..

دوای دۆزینەوەو گەشەی عەقل وزانست بەتایبەتی(هاوسەنگی سروشتی) دەرکەوت ئەو نارەزاییەی (کلۆز) هیچ بنچینەیەکی نیەو لە گریمانەیەکی هەلە بیناکراوە ،دەرکەوت دوورترین ئەستێرە پەیوەندی بە سروشتی سەر زەوی هەیە ،پەیوەندی بە ژینگەش هەیە،ئەگەر هەر کۆمەلەی خۆر هەبوایە بۆیەك چرکەش ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو ،بۆیە تەواوی ئەو گەردوونە پێویستە بۆ ژیان .

ئەو ناڕەزایی وبۆچوونە جاران بۆ سروشتی دەوری زەویش هەبوو ،دەووترا لە جیاتی ئەو هەمو ئۆکسجنە بافۆسفۆر بوایە لەجیاتی ئەو هەمو ئاوە نەوت بوایە لەجیاتی بارینی بەفر شەکر بباریبایە ..یان دەیان ووت ئەو هەمو دارودرەختە بیسوودە چیە دروست بوە،ئەوەش ووتراوە لە یەك کاری جنسی ملیۆنان خانەی جنسی لای نێر بۆ

مێیەکە دەچێت کەچی یەکخانە پیویستە ،ئینجا کۆمەلناسەکان دەیان ووت ئەو هەمو شەڕو کارەساتە بۆ؟ (ئەبیکور) دەیووت ئەو هەمو کارەسات وشەڕە یان ئەوەیە کاری خوایە کە خراپە یان خوا توانای نیەچارەی بکا مادام بۆ بیپەرستم ، بەهەمان شێوە لە گومانی ژ:2ی (دیڤید هیۆم)دەلێ ئەو هەمو ڕووداوە بیسەروبەرو بێئامانجە لە گڕکان ولافاوو کارەساتی سروشتی وشەڕو ..،لە ڕاستیا هەریەك لەو گریمانا بهاتبایە دی ژیان نەدەبوو نەبەردەوامیش دەبوو ،مەگەر ئۆکسجین ئاوا زۆرنەبوایە وبەردەوام دارو درەخت بەهۆی (رۆشنە پیکهاتن) دوەم ئۆکسیدی کاربۆنیان بۆ ئۆکسجن نەگیڕابوایە ژیان ئیستا تەواو ببوو ،ئەوانە هەموی لە چوارچێوەی (سلم الترتیب)ی سروشتچارەسەر کرا کە لەپیشوو باسمان کرد، ،یان وەك لەهەرەمی ماسلۆ بێت بۆ پیویستیەکان ، لەماسلۆ مرۆڤ پیویستی بە ئۆکسجن وخواردن وخواردنەوەو ئینجا سەرووتر ژیانی جنسی کۆمەلایەتی و تامرۆڤ پیویستی بەمادەیەك زیاتر بێت لەسروشت زیاتر هەیە ،ئۆکسجنی زۆر پیویستە لە هەوا هەیە بیئەزیەت ،نۆرەی ئاودێت کە ئۆکسجین بەردەست نیە،،تا دەگاتە کەمالیەکان زیاتر تەقەلای دەوێ وکەمترە ..بەو شێوەیە فلسفەی مولکیەتی تایبەتیش لێرە دیاری دەکرێ ئەوانەی زۆر پیویستن مولکیەتی گشتین دەبێ دەولەت پاریزگاری لیبکا،ئەوانەی کەم پیویستن بۆ کەمالیاتە دەکەویتە بەر چالاکی مولکیەتی تایبەت وکۆکردنەوەو هەلگرتن ،لێرەوە فلسفەی بازرگانی وشارستانیش دیاری دەکرێت ،ئال وگۆڕو بازرگانی وشارستانی لە کەمالیاتەکان زیاتر بەرپا دەبێت،لەوەی پیویستیەکانی هەرە بنچینە لەهەمو شوێنیك هەیە بەلام کەمالیاتەکانی ژیان لەهەمو شوینیك نیە لیرەوە ئالوگۆڕو بازرگانی وناوەندی ئەو بازرگانیەو شارو ئیدارەو دەولەت دروست دەبێت .

بەو شێوەیە ئەو بوونەوەرەو سروشت وژیـان فـەوزاو عەبەسـی نیـە بـەلکو سـازان وهەماهەنگی وتەواوکاریە ، لە بۆچونی یەکەما زەمینەیەکی مولحیدیت بۆ ئامـادە دەکا لە دوەمیشا زەمینەیەکی باوەڕی،لەیەکـەما عەبەسـیوگوێپینەدان خۆویسـتی ولاوازی مرۆڤایەتی ودادگەری ،لەدوەما پیچەوانە.

** ** ** **

بـەکورتی لەسـەدەی 18 تـا سـەدەی 20 بـیری گـەردوونی بێسـنور و تێـك ڕووخـانی ناوەندیـەتی زەوی و تیـۆری پەرەسـەندنی دارویـن و سـەرهەڵدانی مارکسیزم.. لەبەرەکانی زانستی و فەلسەفی و فیکری بیری ئایینی زۆر لاوازکـرد، ئەگەر تیۆرەکانی گەردوونی کۆپەرنیك وجوردانۆ و گالیلۆ شۆڕشیان لەسـەر بـوونی زەوی وەك مەلبەندی مادی گەردوون کرد، ئەوا تیۆری پەرەسەندنیش بـوونی مـرۆڤ لەسەر زەوی وەك مەلبەندی میتافیزیکی گەردوون نەهیشت.

فەلسەفەی مارکسی وئەو گەلالەیەی ئەنجلس- هیگل روحی بونەوەری دەرهیناو ئامانج ومەنهەجی تیدا نەهیشت، زیـاتر ڕێ ی خۆشـکرد کـە دەسـەڵاتی سیاسـی ئایینی لـە ئـەوروپا و دوایـش دەسـەڵاتی ئـایینی (کـەخۆی لەخەلافـەتی ئـایینی دەبینیەوە) لەسەرەتای سەدەی بیستەم (بەیەکجاری لـە 3-3-1924) کۆتـایی بێت و جیهانێکی مۆدێرن لە ئاستەکانی (زانستی و فەلسەفی و یاسایی و سیاسی و فەرهەنگی و دیپلۆماسی) عەلمانی بێتەکایەوە، دەتوانین بڵێین فەلسـەفەی ئیلحـادی لەو دووسەدەیە بەهاری زێرینیان بووە.

## وەرچەرخانەوە بۆ ئایین:

لە فەزای زانست و فەلسەفە بێ ئومێدیەکی زۆری ئایینی بەدی دەکـرا، دەوتـرا جدلی فەلسەفی لەبارەی (خلق) و (مادە و رۆح)... یەکلابۆوە لـەدژی ئـایین، ئـایین چوە خانەی (ئایدیا)، تەفسـیری زانسـتی و فەلسـەفی زۆر نـامۆ بـۆ ئـایین دەکـرا،

بـەکورتی خرایـە لیسـتی وەسـفەکانی(تاریکی ونـەفامی و..) وەك لـەوەو پـێش ئەوتوێژینەوە هەندێکمان تۆمار کرد، تۆماری ئەو جارە لەبارەی ئەسـلی ئاینـە، وا هەندێکی تر(وەك خۆی بـەکوردی وعربی)کـە لەگـەڵ ڕەوتـی ئـەو باسـە دەگـونجێن تۆماردەکەین:

ڕەنگە بناغەی (پەیوەندی ئاین وترس وچینایەتی )لەلایەن (کریتیاس )هاتبێـت کە دەڵێ: ئاین لەلایەن دەسەلاتدارەوە داهینراوە بۆ زیاتر ملکەچی هاوولاتیان.

- ئەرسەر شۆبنهاوە(1788-1860) وفیۆرباخ و میشیل ئونفری دەیان ووت: الدين هو من صنيعة البشر ابتكروها لتفسير ماهو مجهول لديهم مـن ظـواهر طبيعية او نفسية او اجتماعية،
- سان سیمون لەکتێبی (المسيحية الجديدة) ئاینی بـەو نـەفامی وەسـف کـردوە وەك مارکس پێی وایە لە قازانجی چینی برجوازیە دژ بە هەژاران داهینراوە.
- نقطة البداية لوجودية سارتر هي جملة دوستويفسكي الشهيرة: "إذا كـان الـرب غير موجودا، هذا يعني أن كل شـيء مسـموح". واتـە ئـازادی پێچـەوانەی بوونی خودایە، خواهەبی مرۆڤ ئازاد نیە.
- محمّد عابد الجابري لة كتيَبی (الدين والدولـة وتطبيـق الشـريعة) دەڵێـت هـەر **ئاین تیکەلی ژیانی رۆژانەوسیاسەت بیت دەبێتە جەنگی ئەهلی.**
- فەلسەفەی مارکسی: ئاین ئەو ئامرازەیە بۆ مل کەچی چینی هـەژار هاتۆتـە کایەوە.ئاین سەرخانە نەك ژێر خان.
- دیفیدمیلز: ان قرأةالكتب المقدسـة بشـكل دقيـق سـتكون اهـم دافـع للالحـاد.

-اسحاق اسيموف 1920– 1960: ان الموت عباره عـن اللاشـيء وشـكرا لالحادي الذي خلصني من هذا الرعب.

- کارل ساغان(1934-1996)الادعاءات غير العاديه تتطلـب اثباتـات غـير عاديه.

- ارنست همنغواي: كل مفكر هو ملحد لامحاله.
- مارك توين : من المؤكد ان البغل الذي اخترع اول ديانه سيكون اول بغل ملعون.
- سيجموند فرويد: الدين عباره عن وهم.
- كور فيدال: ان ديانات التوحيد هي اكبر كارثه حلت على البشرية.
- ريتشارد فايزمان عالم فيزياء: تم اختراع الاله ليفسر ويشرح الاشياء التي لا نفهمها. والان وبعد ان اكتشفنا كيف تعمل الاشياء جردنا هذا الاله من اسباب وجوده واصبحنا لانحتاج الى وجوده.
- توماس باين: المسيحية عبارة عن عار على المنطق[١].

لە ڕووی واقعیشەوە خەلافەتی ئاینی ڕووخاو زیاتر لەوەش لە مەلبەندی ئەو خەلافەتە ئەو هەنگاوانە دژ بە ئاین وەرگیرا:

لە1920/7/1 سنوری شەرع لادرا ویاسای جنای هاتە جێی.

لە 1922/11/1 سەلتەنەت بە یەکجاری لادراو دەسەڵاتی ئاینی ودنیایی لێك کرایەوە.

لە 1923/10/29 ڕۆژی وەرچەرخانی خەلافەتە بۆ کۆماری بە سەرۆکایەتی ئەتاتورك.

لە 1924/3/3 بەدەنگدانی پەرلەمانی بەفەرمی خەلافەت هەڵوەشایەوە.

لە 1924/4/28. هەڵوەشانەوەی دادگا شەرعیەکان.

تەنانەت لە 1928/4/10 ئەو مادەیەش هەڵوەشینرایەوە کە لە دەستور دەڵێت: (دین الدولة الإسلام).

لە 1928/11/1 پیتی ئیسلامی گۆڕدرا بۆ پیتی لاتینی...

---

[1] ئەوانە لە بەشی یەکەمی کتیبی(**atheist universe**) لەلایەن (دیڤیدمیلیز) نوسراوە پیك هاتوە لە 12 بەش.

شـێوەی ئـەو هەنگاوانـە لـە زۆربـەی وولاتـانی ئیسـلامی ڕوویانـدا، یەکـەم دەولەتیش بە ئاشکرا جاڕی بێ ئاینی دابیت لە جیهـانی ئیسـلامی ئـەلبانیا بـوو بەسەرۆکایەتی ئەنوەر خۆجە لە 1970...

لەناو عربیش ڕای دژ بە ئاین ومولحیدی سـەری هەلـدا، شـووبلی شمیـل یەکـەم کەس بوو بیری (فەلسەفەی گەشە)ی هینـا نـاو عـەرەب لـە ڕێـی کتێبـی(فلسـفة النشوء والإرتقاء)، هەریەکە لە (نجیب عازوری، احمد لطفي سید، ساطح الحصری، اسماعیل مظهر، قاسم أمین، طه حسین، محمد عـزة دروزة، سـةلامة موسـی، انطـوان سـعادة ، بطـرس بسـتانی، شـبلی شمیـل، فـرج أنطـوان، میشـیَل عفلـق، جمـال عبدالناصر..)پێشڕەوی ئەو رەوتە بوون، تا ئەو ڕادە ئەگەر کەسێك بێ دین نەبوایە ناکرا پێی بلێی ڕەوشەنبیر.

بەو شێوەیە واهاتە پیش چاو جیهان لە کۆل کارەساتی ئاین بۆوەوجیهـانی نـوێ بەهەمو ماناکانی تەعلیمی وسیاسی ویاسایی و ئابوری وفەرهـەنگی.. ڕاسـتەڕێی گەشەو پێشکەوتنی وەرگرت، ئەو ڕاستیە لە دەستوری وولاتان تۆمـاردەکرا، زیـاتر حزبە سیاسیەکان پێشڕەوی تیك شکاندنی ئاینی بوون، هەر بە حاستەم ئاینی بـوون تاوان بوو.

لەو بارەیەوە مـارکس دەلێـت: (.. ان "حریـة الاعتـقاد" البرجوازیـة لا تعـني بالفعل سوى التساهل بجميع الأنواع الممكنة من" حرية المعتـقد الـديني "وأن يعلـن أنه بالعكس يسعى جاهدا إلى تحرير الضمائر من الأوهام والخرافات الدينية)[1].

بۆ هەمو ئەو هەنگاوانەش لقەکانی زانست وپیشکەوتنەکانی لـە قـازانجی ئـەو ڕەوتە بوو، ناچار ڕەوشەنبیرانی ئیسلامی ئەو سەردەم تەنها بواری ئـەوەیان مـابوو کە ئاین بگونجێنن لەگەڵ عەقلانیەتی نـوێ، زاراوەی ئاویتـەی وەك سوشیالیسـتی

[1] كارل ماركس- نقد برنامج غوتا ص17

ئیسلامی ودیموکراسی ئاینی.. هاتە کایەوە.

تەنانەت جمال الدینی ئەفغانی دەڵێ تیۆرەکەی داروین ڕاستە بەڵام زانایانی ئیسلام پیش داروین (التطور)یان دۆزیوەتەوە[1]، لەکاتیکا ئەوە (سلم التطؤر )ە ئەوەی ئاینی(سلم الترتیب)ە.

لەناکاو لە ناوجەگەری زانست، لەو شوینەی کە بەشیکی زۆر لە فەقیهەکان ناویان بە (علم الشیطان) دەبرد تەقینەوەیەکی فکری پێچەوانە دەنگی هات، دەنگی لە پایتەخت هات،، لەلایەن لامپتێر و ئەینشتاینیشەوە لەتیۆری (نیسبی) دەرکەوت ئەگەر ئەو گەردوونە بێ سنور بێت ئەوا دەبێ (تێکڕای چڕی گەردوون سفر بێت)[2] کە وانیە.

یان وەك لە (پەرادۆکسی ئۆپلێر) هاتوە ئەگەر گەردوون بێ سنور بێت ئەوە دەبوایە بەشەو تاریکی وڕووناکی ئەستیرەمان نەبینیبوایە بەڵکو هەموی ڕووناکی دەبوو، هەرلە زانستی فیزیا (دیاردەی دۆپلەر) دۆزرایەوە کە گەردووناسان ئەو دیاردەیان بەسەر ئەستێرە و مەجەڕەکان تاقی کردەوە بەتایبەتی (هیبل)، بۆیان دەرکەوت ئەو گەردوونەی وای تێگەیشتبوون کە بێ کۆتایی و بێ سنورە و (ئەبەدی و ئەزەلی) وانیە، تیرەی گەردوونیشی دۆزیەوە کە پەیوەندی هەیە لەگەڵ (ڕەگی دووجای) چڕیەکەی، لەلایەن (کیمیا و فیزیا) تیشکێکی (بۆماوە) دۆزرایەوە نهێنی گەردوونی زۆر لابوو،...

هەموو ئەوانە ڕێیان خۆش کرد بۆ لەدایك بوونی تیۆری گەردوونی لێك کشاو (الکون المتسع) کەلەلایەن (هیبل و فریدمان و هۆیل ولامایتەر) بوە دارشتنی تیۆری تەقینەوەی مەزن (**big bang**).

بەوشێوەیە کۆتایی بەبیرۆکەی گەردوونی وەستاو (الکون الساکن- قدم العالم)

---

[1] جمال الدین الأفغانی-الأعمال الکاملة –تحقیق: دمحمدعمارة ص100

[2] بڕوانە: کون الاحدب ص258 – ص260

هێنرا و جارێکی تر (حدوث العالم) ی ئایینی سەری هەڵداوە، لەدوای ئەو ڕووداوە گەورەیەی فەلەکی، سەنگەرەکانی تری فەلسەفەی مولحیدی لە کیمیا و فیزیا وماتماتیك و بایلۆژی.. یەکە یەکە کەوتن، چۆن ئەنجلس وەسفی کەوتنی سەنگەرەکانی ئاین بە (فریدریك ولیامی سێیەم)ی چواندبوو کەسەنگەر بەسەنگەر لە مەیدانی جەنگی دەیان دۆڕاند[1] ئەو وەسفە وەرگەڕا بۆ فەلسەفەی مادی ئاوا سەنگەر بەسەنگەر دەیان دۆڕاند.

لە کیمیا دۆزینەوەی (مادة المضادة) و (ثقوب السوداء) گەردوونی وایکرد (یاسای پاراستنی مادە) پیرۆزی نەمێنێ، دەرکەوت مادەش پەیدابووە و لەناویش دەچێ، هەموو شتێك هاتۆتە بوون و لەناویش دەچێ، لەماتماتیك دەرکەوت ئەندازەی ئیکلیدس تەنها لەسەر زەوی و لەمەودا کورتەکان ڕاستە، ئەگینا بۆ گەردوون نابێت، هێلی ڕاست لە گەردوون هەر نیە، تەنانەت تیشکیش بە هێلی ڕاست ناڕوات بەڵکو لار دەبێتەوە لەگەڵ بارستەی گەورە، بەرەبەرە ئەندازەی ریمان جێی گرتەوە.

لە بایلۆژیاش دەرکەوت هەر سێ تیۆری پەرەسەندن (هەڵهێنان- توارث المکتسبات، هەڵبژاردنی سروشتی) هەڵەن، یەکەم جار (ئۆپارین و باستۆر) گومانیان لەوەکرد کە کاتێ گۆشت کرمی دەبێت (لەخۆڕا هەڵیهێنابێ)[2]، دوایی تاقیکردنەوە دەرکەوت ئەو کرمانە لە گۆشتەکە پەیدانەبوون بەڵکو ئەوە گەرای

---

[1] دیالکتیك الطبیعة ص230

[2] نەبوونی ئەو زانیاریە زۆریك لە زانایانی ئیسلامیشی بەهەلە بردوە، ابن حزم وا تیگەیشتوە هەڵهێنانی کرم لە گۆشتی بۆگەن بەڵگەیە کە خودا بەردەوام ژیان دەخولقینێ، وەك دەقی خۆی: أن الحیوان نوعان: نوع متولد یخلقه الله تعالی من عفونات الأبدان وعفونات الأرض فهذا لا ینکر تولده بإحداث الله تعالی له في کل حین، وقسم آخر متوالد قد رتب الله تعالی في بنیة العالم أنه لا یخلقه إلا عن مني ذکر وأنثی فهذا هو الذي صار في تلك الجزائر عن دخول إلیها بلا شك وبالله تعالی التوفیق.ابن حزم-الملل والنحل.. ج1 ص33

کرمە لە هەوا ڕادێنن.

بەو شێوەیە (تیۆری هەڵهێنان- توالد الذاتي) شکستی هێنا کە تیۆریکی زۆر سەخت بوو، دوەم شکست بریتی بو لەوەی سیفەتی نوێ ی گیاندار ناگوازرێتەوە وەك لامارك پێشبینی کرد، تیۆری داروینیش لەبارەی (هەڵبژاردنی سروشتی) و هاتنی مرۆڤ لە مەیمون بەیەکجاری شکستی هێنا، لەگەڵ دۆزینەوەی (ئەندازەی جینەکان) تیایدا دەرکەوت گۆڕانکاری لە شێوەی مرۆڤ و گیاندارانی تر دەبێ، بەڵام لە نەژاد و ناسنامەی نابێ، چونکە هەر نەژادێك، هەر گیاندارێك شوێنی جینی خۆی لەناو کرۆمۆسۆم هەیە بە تەرازوەکی ئەندازەیی وورد، هەر دەستکاریەك لەو ستاندەر و تەرازوە دەبێتە هۆی (تشويه خلقي) نەك گەشەسەندن.

بەوشێوەیە دەرکەوت لەوەتەی مرۆڤ هەیە هەر وەك ئێستا بووە، لە مەیمون نەهاتووە و جارێکی تر ئادەم بۆوە باوکی مرۆڤایەتی، هەموو ئەوانە کاری زۆر مەزنی کردە سەر مەدرەسەی فەلسەفی و تەیارە ئایدۆلۆژیەکانیش، تەنانەت تاکی مۆدێرنیش، لەهەمووان کاریگەرتر فەلسەفەی مارکسی بەری کەوت، چونکە فەلسەفەی (مادیە الدیالیکتیك)بەشێکی سەربەخۆی بەناوی (لانهائیە العالم و وحدتە)[1] هەبوو ئاوا تێکشکا، هەر لەو فەلسەفەیەدا پێگەی دوەمی دیاری کردبوو کە بریتی بوو لە دۆزینەوەکانی (مۆرگان- لە کتێبی مجتمع القديم)، سێ یەمیش تیۆری پەرەسەندن بوو بەگشتی، هەموو پێگە زانستی و فەلسەفیەکانی شکستی هێنا، ڕەنگی دایەوە لەسەر خانی سیاسی و (وەك ڕوخانی خەلافەتی عوسمانی ئاسا) بلۆکی شیوعیەت بەسەرکردایەتی یەکێتی سۆڤیەت لە تەمەنی (79 ساڵ و یەك ڕۆژ) ڕووخا بەیەکجاری لە1991/12/31.

بەوشێوەیە زانست وەرچەرخا بەرەو ئایین، بەڵام بە ئەرکی (زانستی) نازانن

[1] بڕوانە : عرض موجز للمادية الدياليكتيكية ص50

وەڵامی پرسیارەکانی فەلسەفی و ئاییینی بداتەوە تا لە (کێ و بۆچی و چۆن و کـەی) ڕەت بـبن، بێنـە سـەر پرسـیاری فەلسـەفی: چـۆنیەتی دروسـتبوونی بونـەوەر، هەماهەنگی لەبەشەکانی بونەوەر، پەیوەندی مـادە و ڕۆح، فاکتـەرەکانی کۆتـایی بونەوەر،..دوای ئەو شکستە گەورانـە فەلسـەفەی مولحیـدی تەقـەلای زۆر نـامۆی دەدا، ناوە ناوە جـاڕی دەدا کـە فەلسـەفە کـاری نـەماوە، سـەردەمی ئایـدۆلۆژیا ڕۆیشت، زانست بڕیاری (خوا) هەبوونی نەداوە، دوا تەقەلاکانی تیـۆری گـەردوونی هەژان(هات و چوون) هەروەها فرەگەردوونی لەلایەن لایبنتـز وهوایتهیـد ولیفریـت وویلەرو ئینجا (ستیڤن هۆکنگ- کەلەدوایی باسی دەکەین)زیندوو بکرێتەوە.

بەوشێوەیە فەلسەفەی مادی بواری بەردەوامی زۆر تەسك بوویەوە، لە کۆنگرەی هەزارەیی کە لە هەفتەی کۆتایی مانگی 2002/8 نیۆیۆرك بە بەشداری هـەزاران زانای جیهانی جۆربەجۆری ئەکادیمی و سیاسی و ئەنسرۆپۆلۆجی، بڕیاریـان دا کـە ئاین و سیاسەت و دەوڵەت لێك جیا ناکرێتەوە و سەدەی (21)یشیان بـە سـەدەی گەڕانەوەی ئایین پێش بینی کرد[1]، لە کاتێکافەلسەفەی مارکسی ئاوا پشت بەسـتو بە زانست وفەلسەفەو دەولەت بوو، لینینـی سـەرۆك لـە سـالی 1920ەوە جـاڕی یەکسانی ژن وپیاوی لە سـۆڤیەت دا، بـۆ مـاوەی70 سـالیش لـە مـادەی 122 و123ی دەستوری سۆفیەتی داکۆکی لە یەکسانی نێرو مێ کردبوو[2]، کەچـی دوای هەمو ئەوانەکار گەیشتۆتە ئەوەی دیاردەی پۆشاك لەووڵاتانی پێشووی سـۆڤیەتیش ئەوەندە زۆر بێت دەسەڵاتداران لە دژی بوەستن.

لەدوای رووخانی فەلسەفەی مادی و ڕووخانی قەلای شیوعەتیش ئەوا بـەردەوام ئامارەکان دەری دەخەن کە (بـێ بـاوەڕی) لـە کزبووندایـە، مەوسـوعەی بریتـانی بەناوبانگ وهەندێ دەزگای تر ڕاپرسی جیاجیان لە جیهان کرد هەر لە 2001 ەوە

[1] مەوسوعەی جودی ل53

[2] بڕوانە : القانون والإشتراكية ص35

تا 2005 ەوە دەرکەوت بەگشتی مولحیدی لە جیهان تەنها لە3٪ ماوە[1]، لەهەموان زیاترلەسوید بوو ڕێژەکەی گەیشتە 32٪ ولە فرنسا (گومان نەك مولحید) یەکەم بوو، بەگشتی فەلسەفەی مولحیدی ڕووی لە کزیە، لەوساتەدا ولآتێك لە جیهان نەماوە لە دەستورەکەی خۆی ئایین وەك سەرچاوەی حوکمی تۆمارنەکرابێ، لە بڕگەکانی پێشووهەندێکمان بە نمونە وەرگرت، تەنها دەستوری فرنساو ئەمریکا بەو ڕاشکاویە تۆماریان نەکردوە.

لەدەستوری فرنسا: مادە(2): فرنسا جمهورية لا تتجزأ علمانية ديمقراطية اجتماعية وهي تضمن المساواة أمام القانون لجميع المواطنين دون تمييز بسبب الأصل أو الدين وهي تحترم كل[2].

لە دەقی جاڕی سەربەخۆیی ئەمریکا (وثيقة جيفرسون)ئەو دوو مادەیەی واهاتوە - إعلان الاستقلال امريكا 4 يوليو عام 1776م: نحن نعتبر هذه الحقائق بديهية:

1- إن الناس جميعًا خلقوا متساوين، وإن خالقهم حباهم بحقوق لايجوز الافتئات عليها، وإن من هذه الحقوق حق الحياة، والحرية، والسعي وراء السعادة.

2- وإنّه تأمينًا لهذه الحقوق، فقد أُنشأت الحكومات مستمدة سلطاتها العادلة من موافقة المحكومين.

---

[1] ئەوە مانای ئەوە نیە 97٪ەکەی تر باوەردار بن، نەخێر جۆربەجۆری تیدایە ئایندارو دوور لە ئاین وبێ لایەن و...ئیمە باس لە مولحید دەکەین.

[2] دەستوری فرنسا لە4ی ئۆکتۆبەری 1958 دەرچوو 92مادە بوو، هەرچی دەستوری ئەمریکایە(کە لە1787/9/17 گەواهی کراوە) لاگیری ئاینیە بەلام نەیکردۆتە مەرج وەك لەبڕگەی(3)ی مادەی(6) وا هاتوە: يكون الشيوخ والنواب المشار إليهم آنفاً، وأعضاء المجالس التشريعية لمختلف الولايات، وجميع الموظفين التنفيذيين والقضائيين التابعين للولايات المتحدة ولمختلف الولايات، ملزمين بموجب قسم أو إقرار بتأييد هذا الدستور. ولكن لا يجوز أبداً اشتراط امتحان ديني كمؤهل لتولي أي منصب رسمي أو مسئولية عامة في الولايات المتحدة.

❊❊ ❊❊ ❊❊ ❊❊

ئەوەی سەروو کورتەیەکی خێرای سەربردەی فەلسەفەی کلاسیکی بووبە تایبەتی لە بەشی یەکەم، لە بەشی دوەم سەرەنجامەکانی دەرکەوتن، ئەوە تەنها بۆ زانیاری و وەك میژوەکی فەلسەفە نیە، ناکرێ باس لە تەیاری فەلسەفی نوێ بکەین بی ڕەگ وڕیشەی ئەو فەلسەفەیە، ئیستا دەست کراوە دەبین بۆ قۆناغی تری بالای توێژینەوەی فەلسەفی لەبارەی دروست کەرو پەیوەندیەکانی بە دروست کراو چارەسەری کێشە فەلسەفیە ئالۆزەکان دەکەین، هەول دەدەین بەسادەیی گوزارشی بکەین.

# بەشی چوارەم

# فەلسەفەو خودا

## وەڵامی فەلسەفە بۆ بوونی خودا:

گرنگترین بەشی فەلسەفی بەهەموو لقەکانیەوە وەڵامی ئەو پرسیارەیە ئاخۆ ئەو بوونەوەرە لەخۆیەوە دروست بووە یان دروستکاری هەیە؟ ئیتر لەوەوە فەلسەفیانەی پێکراوە پرسیاری وەك مادە و ڕۆح، ماهیە و وجود، علە و المعلول،.. دروست بووینە.

هۆکاری بنچینەیی بەردەوامی فەلسەفەی ئیلحادی ئەوەیە (خوا) غائیبە، بەو ڕوونیە دیار نیە وەك ابن تیمیە پێی وایە وەك ڕۆژی ڕووناك دیارە، نەخێر ئەوە بۆ مەنهەجیکی بیری فەلسەفی وایە نەك بۆ گشتی، ئەوەی دەگوزەرێ لەچاکە و خراپە، زوڵم و دادگەری،.. لەدەست بەشەر و سروشتە، واتە ئیرادەی خوای ڕاستەوخۆ بەدی ناکرێت، ئیرادەی سروشت و بەشەر بەرجەستە و ڕاستەوخۆیە، لەکاتێکدا لایەنی ئایینی زۆر داکۆکی لە ئیرادەی خوا دەکەن و بەو وەسفەی ئەوانیش نایەتە دی.

هەرچی داکۆکی فەیلەسوفانیشە لە واقیعێکە کە بەرهەمی بەشەری و سروشتیە، بەڕوونی دەردەکەوێ دوەمیان چالاکترە لەیەکەم، بۆیە بەری فەلسەفەی ئیلحادی زۆر تەڕ سەوزترە، ئایینییێك دەڵێت (ئەجەل بەدەست خودایە-نوسراوە)

کەچی لەسەدەی 17 بەپشتەوە یەك کەس لەو جیهانە ئەجەلی بە لێدانی کارەبا نەهاتووە، یان ڕووداوی سەیارە، حوکمی ئیعدام دەردەچێ لەکات و شوێنی خۆی جێ بەجێ دەکرێ[1]، وادەبینرێ کە ئیرادەی بەشەر و سروشت لەسەروی ئیرادەی خوایە، ئەوە سەرچاوەی پاڵپشتیەکانی فەلسەفەی ئیلحادیە بەهەموو لقەکانیەوە، کەچی وا نیە لە ئەسلدا ئەو بیرو بۆچونەی (مسەیەری بەشەر) ونوسرانی هەمو (چارەنوسیك) لەکاردانەوەی ئەوە هات بەشیك دەیان ووت خودا نازانی چ ڕوودەدا وەك مقدسی لەهەندیکیانی نەقل کردوە (القول بأن الله ـ عز وجل ـ لم یزل عالمًا بالأشیاء قبل کونها لأن المعدوم عنده لیس بشيءٍ فلا یجوز أن یعلم )[2]. سیفەتی(زانین)ی خودا موتلەقە هەمو شتیکی بوون وپیش بوون دەزانی،..بەگشتی بابزانین کێشە لە فەلسەفەیە یان لە ئایین یان لە ئایندارەکان؟

زۆر ڕوونە کێشەکە لە ئایین نیە، زیاتر دەکەوێتە ئەستۆی ئایینداران کە زانیاری باڵاو وردیان لە بارەی پەیوەندی خوا و سروشتەوە وەك پێویست نیە، بەشی دووەمیش دەکەوێتە ئەستۆی فەیلەسوفان کە ناچن بەلای خودی ئایین (زانیاری لە دەق و پەیامەکان) وەرناگرن، دەچن زانیاری هەڵە لە ئاییندارەکان وەردەگرن، ئینجا فەیلەسوفان لەسەر مەنهەجی پرسیار ناوەستن پرسیاری بەدەر لەتوانای وەڵامی ئەقڵی دەکەن، لەلای ئاییندارانیش وا دەبینرێ کە تا دەسەڵاتی خوا (خالق) مەزنتر بکرێت و دەسەڵاتی مەخلوق بچوکتر بکرێ وا دەزانن لە خزمەتی ئایینە.

ئەو پرۆسە ڕۆمانتیکە بەرەو تەسەوف و (لا ادری... نازانم)ت دەبات، فەلسەفەی ئیلحادیش بەرەو زانیاری و عەقلانی دەبا، نەك لای فەیلەسوف و زانا و ڕۆشنبیر هەتا لای کەسی ئاسایش زۆر بە ئاشکرا ئەوەی دووەم مەعقول و ڕاستتر

[1] جاریش وایە شاز هەیە وەك سەربردەی ئەو ئیعدامەی لە کتێبی "کۆنترین نهێنیەکانی جیهان" هاتووە.
[2] البدء والتاریخ ص366

دەردەکەویٚ، لەنێو مەدرەسەکانی فەلسەفەی یۆنانی ئەو دووڕایە هەبوو، یەکەمجار ئەبیکۆر(342-270 پ.ز)وتی نە ئێوە ڕاستن نە ئەوانیش خوا دنیای دروست کردووە و وازی لێهێناوە[1].

لەوەوە تەیاری فەلسەفی دیزم هاتەکایەوە و عەقڵی زۆربەی فەیلەسوفانی داگیرکرد هەتا هەندێ فەیلەسوفی ئاینیش، لەوانە (مارتن لوتەر) دەڵێت خودا بوونەوەری دروست کردو ڕێکی خست وبۆ ئادەمیزادی بە جێهێشت[2]، هەروەها (قەشە ولیام سامپل)-لەکنیسەی کتنبری بریتانیا دەڵێ:(ان الله لايشرع الدين بوحده، بل يشاركه الانسان))[3]، لەسەردەمی نوێ (هربرت تچیرپۆری 1583-1648)بەیەکەم دامەزرێنەرەوەی دیزمی هەژمار دەکرێ[4]، دیکارتیش یەکەم کەسە کە یاساکانی سروشتی ئاوا دارِشت ودەڵێ:خوا سروشتی دروست کردوە ووازی لیهیناوە، سروشت وژیان بێ خوداکاری خۆی دەکا بۆیە لە توێژینەوەی خوا تەنها بۆ یەکەم پرۆسەی (خلق) پێویستە[5]، نیوتن پێی وابوو ناوەناوە ئەو بوونەوەرە پێویستی بە فۆرمات کردن دەبێتەوە خوا پێی هەلدەستێ.

هەرچی لەنێو جیهانی ئیسلامیە تەیارێکی کۆمەڵایەتی کۆتایی بەو دۆخە دێنن بە ئامۆژگاری ئەوەی دەڵێن ئەوەی بەرەوفەلسەفە وعەقلانی بڕوات تێکدەچێت، تا ئەو ڕادەیە بەشێکی زۆر لە ئیمامەکانی فیقهی ئیسلامی و مەسیحی و یەهودی و ئایینی تریش (نەك هەر فەلسەفەی ئیلحادی) دژ بە تەواوی فەلسەفە وەستان، جار وایە لەوەش ڕەت بووینە دژ بە عەقلانیەتیش وەستاون..، ئەوەش دەرفەتێکی زێرینە بۆ فەلسەفەی ئیلحادی جەنگەکە بباتەوە و بەکەیفی خۆی بڕیار بدات و

---

[1]- موسوعة الفلسفية المختصرة ـ ص22

[2] شبلي عيسمى - علمانية ودولة الدينية.. - ص22

[3] هەڵبژاردن لەنیوان عەلمانی وئیسلامی.-توێژەر ص13

[4] موسوعة الفلسفية السوفيتية ص227

[5] الفيزياء ووجود الخالق ص25

بلێت: خوا نیە، ئەو جیهانە بریتیە لە مادەی جولاو وەك (هۆلباخ)، (لینین)..زۆری تر دەیانگۆتەوە، دەتوانین ئەو جیهانە مادیانە لێکبدەینەوە بێ ئەوەی پێویستمان بە بوونی خوا و هیچ باسێکی نامۆ بێت وەك (ئەنجلیس)، (لاپلاس) دەیانگۆت، بیرۆکەی خوا لەترس هاتووە وەك (فریزەر)وزانایانی تر دووبارەیان دەکردەوە.

هەرچی لای فەلسەفەی مولحیدیشە کێشەی بنچینەیی ئەوەیە بە واقیعی مادی و بەپێوانەی (دروستکراو- مخلوق) ویستویەتی (دروستکار- خالق) بناسێت، یان زانیاری لێ پەیدابکات، کە مەنهەجێکی دروست نیە، لەوەوە دەچینە نێو توانای عەقلی مرۆڤ لە ئاست کێشەیەکی فەلسەفی ئاوادا.

## پرسیارەکانی سەرووی عەقڵ

فەیلەسوفەکان وێل بووینە بۆ پێناسی خودا وەك چۆن پێناسی دارو بەردو ئاگر، (ئەو پێناسەی کە پێناس ناکرێ) ئێمە ئێستای یەخەی بابەتێکمان گرتوە کە پێناس ناکرێ، ناخرێتە هیچ قاوغێك بۆ لێکۆڵینەوە، باشترین ڕێنوێنی ئەو فەرمودەیەیە (لاتفکرو فی الله لم تحصل الا حیره، بل تفکرو فی خلق الله) بەلام ئەوە مانای ئەوەنیە وەلامی ئەو بۆچون و تێڕوانینە جیاجیایانە نەدەینەوە لەو بابەتە، یاخود دەرگای لێ کۆڵینەوە لەو بونەوەرە (دروستکراوی ئەو خودایەش) داخەین.

بۆ لێکۆڵینەوە لەو بابەتەدا پێویستە لە بەلگەی مادی هەست پێکراو دەست پێ بکەین تا ڕێگەیەکی زانستی وفەلسەفی بگرینە بەر تیایدا بە ڕوونی دەرکەوێ لێکۆڵینەوە لە (خوا)مەحالە، وەك دەرکەوت لە (مبدا لادقە)دوایش لە(روح)دوای لە هەمو لقێکی زانستی ئەو مەحالانە هەیە هەردوو تیۆری گۆدل لەبارەی

بیرکاری[1]، هەزاران وملیاران بابەتی تری مەحالمان هەیە، هیچ ئەنجامێکی نابێت جگە لەزیاتر سەرسامی،مادام باس لەسەرووی عەقلیە زیاتر پیویستی بە زانستی لۆژیك هەیە،تابزانی پرسیارەکانت ڕێکبخەی بزانی چ دەپرسی، بۆیە لەسەرەتا بابزانین ئاخۆ مەودای توانای فکری ئادەمیزاد چەندە و لەتوانای دایە لە پرسێکی وا بگات؟ چونکە لەو بونەوەرەدا (معیار) هەیە بۆ هەموو شتێك، هەروەك ئێمە ناتوانین (تەنێك گرانی هەڵگرین) ناتوانین (بە پێ) بەسەعاتێك بگەینە لوبنان، ناتوانین یەك بەرمیل ئاو بخۆینەوە، هەرواش بۆ هەموو شتێك...

ئەوە بۆ هێزی فکریشەو سنور (معیار)ێکی هەیە، جاری لەسەرەتا دا هەستەکانمان کە کلیلی مەخزەنەکانی فکرن هەر هەمووی سنوردارن، چاو ئەو تەنانە دەبینێ کە ڕوناکی شەپۆلی لەنێوان (4-7) هەزار ئەنگسترۆمە، هەروەها گوێ و تام، هەڵخەڵەتانی (لمس)یش ئاشکرایە، ئینجا فکریش خۆی مەودای تەمەنی کورتە لەتەمەنی ئادەمیزاد خۆی کورت ترە، جا هەر لە ڕووی زانستیشەوە توانای تۆمارکردنی دیاردەکان لە (بیر) سنوردارە بە پێچەوانە ڕای (ئەنجلیس) کە وای زانی بێ سنورە[2].

جا ئێستا لێ کۆڵینەوە لەو جۆرە بابەتە وەك ئەوەیە ئادەمیزادێك بیەوێ 1000 تەن هەڵگری بەڵکو گەلی زیاتر، ئێمە جارێ هەر لە دونیای خۆمان لە دەریایەك زانیاری دلۆپێکی دەزانین، پەیوەندی ئەو دلۆپەزانیاریەش بە دەریای نەزانی بەرێسایەك دەڕوا کە (ڕالف سۆکمان) بۆی کیشاوەو دەڵێ: تا دورگەی زانیاریمان زیاتر بێت لیوارو ڕۆخی نەزانی فراوانتر دەبێ[3]، کەواتە لەو دلۆپەیەش

---

[1] هەردوو تیۆری گۆدل:

1- في اي نظام رياضي عددي متسق يوجد عباره لا يمكن التحقق من صحتها اوعدم صحتها .

2- لكي يكون النظام الرياضي العددي المتسق غير متعارض لابد ان يكون غير متكامل .

[2] ف انجلس —انتی دوهرنك ص145

[3] خەیام دەلێ: بە خویندنەوە کراوەفرچك وگیانم زانستەمژیم وبۆتەئاوو نانم

ئەو فەیلەسوفە چەندی بەرکەوێ، تا ئەوەندە لە خۆبایی بێت و بیەوێ یەکسەر لە بابەتێکی وا بکۆڵێتەوە، ئەو پرسە هەروەك ئارەزوەکانی تری ئادەمیزادە وزیادەڕەوی دەکاو پێشی ناگا، کەچی مەودای زانیاریمان دیارو سنوردارە، لە باشترین و پێشکەوتوترین دۆخماندا تەنها لەشتە بەرهەستەکانمان دەگەین، ئەگینا لەڕەهەندە نامادیەکان ناگەین.

بۆ نمونە ئەگەر لای یەکێکی بیابانی بتگوتایە گیاندار هەیە لە ئاو بێتە وشکانی دەخنکێ دەبێ چ زانیاریەك لەسەر دەریا لای ئەو دروست ببێت، ئێمە جاری ناتوانین قسە لەسەر دەرەوەی ئەو زەویە بکەین کاتێ یەکێ لە یاساکانی زەوی نوقوستان بێت، وەك کێشکردن بەنمونە، چۆن ژیان لە ژێر ڕۆشنایی (بێ کێش) دەگوزەرێ، یان چ قسە لەسەر (ئەستێرە رەشەکان و سپیەکان) بکەین کە ڕێ نادا هیچ زانیاریەکمان بۆ بێ هەتا نایەلی تیشکیشی لێ دەرچێ، چۆن لەسیستەمێك بکۆڵینەوە کە بەجۆرە یاسا و ڕژێمێکی تر هەڵدەسوڕێت.

ڕەنگە (وەك وێلەر دەڵێت)چەندگەردونێکی تر لەتەك گەردونی ئێمە ئیش بکات بەڵام بە یاسا و ڕژێمێکی جیا لە ئێمە، باشە ئێمە چ لە ڕووداوەکانی ئەو گەردونە بگەین ئاخۆ جموجۆڵ و پرۆسەی ئیشکردن و بەڕیوەچوون چۆنە؟ ئەتۆم لەوێ هەیە؟ ئەستێرە هەیە؟ ژیان هەیە؟ یاسای کێشکردن هەیە؟شارستانی لێ هەیە؟ ئەوشارستانیە جنن؟ پەیوەندیان بە گەردوونی ئێمە چیە؟ بەهەزاران پرسیاری تر هەیە و وەڵامی نەك هەر نیە و ناشبێ، ڕەنگە ئەو پرسیارانە لەوێ هەر بێ مانا بێت.

جا لەپرسیکی وا لەو شێوە هیچ نەزانین کە هەر لەچوارچێوەی مادی و

حەفتاودووسالەبیردەکەم، دەخوینم واتازە دەزانم چ لە هیچ نازانم
سوکراتیش لەکۆنەوە ووتی من دەزانم نازانم بەلام ئەو خەلکە نازانن کەنازانن.

دروستکراوان (خلق) ئەی چۆن وا بازدەین بەو توانا فکریــەمان بــۆ پرســی نامــادی وەك(روح) و هاوکێشــە نامادیــەکانی وەك پرســی عــەقلٚ وهــۆش وفکــرو..، یــان دروستکاری هەموو ئەوانە کە (خودا)یە، جا ئەو پرســیارە لەســەر (خــوای مــەزن) ئاخۆ لە کوێیە؟ چۆنە؟ هەر ئەو پرسیارانە بیٚ مانان!

ئەوانە لەجیهانی مادی مانای هەیە بەڵام خوا شت نیە (لیس کمثلـه شـيء)زۆر گرنگە ئەوەی لەمە تێبگات، لەڕەوتی ئەو توێژینەوەیە ئەو ئایەتە لەهەموان زیــاتر ئیعجازی تێدایە، هەرچی عەقڵی بەشەریە نەیــدەتوانی وەســفی زاتێــك بــەدەر لــە (موجودات-شت-مادە) بکا، هیچ گومانیك ناهیلیتەوە کە ئەو قورئانە لەسەرووی عەقڵی بەشەریەوە هاتوە، مەنهەجیکیشــمان بــۆ دادەڕێــژی کــە چــۆن لــە (خــودا) بکۆلینەوە، تەنها دەتــوانین بــوونی لــە بەڵگــەکانی دروســتکراو هــەڵنێنجین، بــەو شێوەیە بەرەبەرە نزیك دەبینەوە لــە دەروازەکــانی فەلســەفەی خــوایی ومەنهــەجی بیرکردنەوەو توێژینەوە لەو بابەتەفلسەفیە ستراتیژیە.

## بوونی خودا لەوەڵامی فەلسەفەی ئاینی

ئــاینی ســاغ باســی لــە (ڕاســتیەکانی ئەوبونــەوەرە ـــــ بــە ژیــان و بــیٚ ژیانەوە)کردووە، ڕاستیەکانیش هەمووی لە پــێش چــاونین بەشــێکی عــەقلین و لــە ناخی شت و مەکەکانە، زەحمەتێکی دەویٚ تا دەدۆزێتەوە، لەلایەکی تریش یــەکێك لە سیفەتەکانی (راستی) ئەوەیە (تاقەنەیە ـــــ وحیــد)، زانســت و فەلســەفە ئــەو زەحمەتە دەکێشن و ڕاستیەکان دەدۆزنەوە، بۆیە زانست و فەلسەفەی ڕاستەقینە لــە کۆتاییدا لە قازانجی ئاین وڕاستیەمادام ئاین لە ناخی مرۆڤ ڕەسەنە -(ویــری الـذين اوتوا العلم الذي انزل اليك من ربك هو الحق )[1]، هەردووکیشــیان لەگــەڵ عــەقلی

---

[1] سورة سبأ- اية 6

دروست و یاساکانی بونەوەر(یان ڕاستیەکانی بونەوەر) یەکتر پاساووبەهێز دەکەن، هیچ نیگەرانیەك لە چارەنووسی گەشەی عەقلی ئادەمی زاد نیە، ئەو نیگەرانیەی بەرامبەر فەلسەفە و زانست و بەرهەمی عەقلی مرۆڤ لەجێ ی خۆی نەبووە، نیگەرانی لە ئایدیۆلوژیای سەقەتی بەشەری هەیە.

مەرج نیە هەمو بەرهەمەکانی عەقڵی وفەلسەفی ساغ وپێوانەیی بن، لە کاتی سەرهەڵدانی فەلسەفە لە جیهانی ئیسلامی ئاوا بەشێك هەوڵیان دا بە تۆبزی قورئان و فەلسەفە پیك بگونجێنن، دوای کە دەرکەوت هەندێ لای فەلسەفە لەگەڵ ئاین پێچەوانەن، زۆربەی زانایانی ئیسلام دژ بەو کارە وەستان، دوای زیادە ڕەوی تیا کراو دژ بەخودی فەلسەفەش وەستان، بۆیەش دەبینین ڕەهەندی فەلسەفی لە تەفسیری ئایەتەکانی قورئان فەرامۆش کراوە (جگە لەهەندی موفەسیر نەبی کە بەرهەمەکانیان بزر کراوە)، ئێمە لەو توێژینەوەیە چەند ئایەتێك (کە ڕەهەندی فەلسەفی تێدایە)لە قورئان بەکاردەهێنین بۆ بناغە دارشتنی دۆزینەوەی (فەلسەفەی خودا) کە بریتین لە:

1-وفي كل شيء خلقنا زوجين
2- ليس كمثله شيئ
3- الا له الأمروالخلق..

ئیستا نۆرەی وەستانێکی فەلسەفی قووڵە لەسەر ئەو ئایەتانەیە، بۆ ئەوەی بزانین پەیوەندی (دروستکراو-مخلوق) و(دروستکەر-خالق) بە (زوج) ی چیە؟چۆن لەو ڕێگەوە خوا دەناسین؟بەو شێوەیە بەلای لیکدانەوەی فەلسەفی ئەو ئایەتانە دەچین و هەندێ نمونەی زەوجی لە بوونەوەر وەردەگرین، جیاوازی دروستکراو ودروستکەر لەوییەوە دەدۆزریتەوە.

# چەمکی فەلسەفی(جووتەدژ) زەوجی

مەبەست لەو چەمکە ئەوەیە کەبوونەوەر بەگشتی وشت ومەکی ئەو بوونەوەرەش لە (زەوجی) پیك هاتوە، گەورە بچوك، سارد گەرم، خیرا هیواش، سەروو خواروو، نیر مێ، رووناکی تاریکی،...لە چەمکی فەلسەفە بە (اضداد) و (تناقض)..وەسف کراوە، لەقورئان زەوجی وەسف کراوە(وفي كل شيئ خلقنا زوجين).. بزانین ئەوچەمکە چیە؟ رۆلی لە بوونەوەر، لە پەیوەندی دروستکراو بە دروستکەر، تادەگاتە تیگەیشتن لە خودی خودا.

## موفسیرەکان چۆن باسی ئەو ئایەتایان کردووە :

لە ڕەوشی دۆزینەوەی مانای (زوج) و (ضد)لە مەعجەمە گەورەکانی وەك(راغب الأصفهاني- مفردات ألفاظ القرآن ) (ابن منظور - لسان العرب) (فيروز ئابادی-قاموس المحيط).. ئینجا ئەو تاکە ئایەتەی لە قورئان کە(ضد)ی تێدایە(كَلاَّ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا -مريم82).

لەگەڵ تێڕوانینی فەلسفەی یۆنانی بەشی ئاینی(فیساگۆر بەتایبەتی) جۆرە تێگەیشتن و مەنهەجێکی تایبەت سەری هەڵدا، لە کتێبە ئاینیەکانی تری وەك مەزموری ح.داود تیایان نیە، لە تەورات لە 25 شوێن (زوج) تێدایە بەلاّم بەڕوونی قەتیسی کردووە لە هاوسەری، لە ئینجیلیش بە هەمان شێوە، لە نێو عەرەبیش زانیاری لەبارەی (شمولیەتی زەوجی)زۆر لاواز بووە، وایان دەزانی مرۆڤ وئاژەل دەگرێتەوە هەندێکیش لەدرەخت تەنها بۆ دارخورما هەستیان بە نێرو مێ کردوە، بە گشتی موفەسیرەکان بە سێ جۆر ئەو ئایەتەیان تەفسیر کردووە :

**بەشی یەکەم**: بەمەبەستی نێرو مێ وهاوسەری لەوانە :تفسیرالفخر الرازی قەتیسی کردوە لە(جنس)وباسی(ضدان)یشی کردوە[1]، مجاهدوقتادە قورتبی بەهەمان شێوە[2]، لەدوای ئەوانە(پرسوی)هەلدەبژێرین دەڵێ:مەبەستی(کل الشیء) (جنس)ة[3]، لە موفەسیرە کوردەکانی سەردەم ماموستا عوسمان عبد العزیزهەلدەبژێرین کە بەهاوسەری لێك دایتەوە[4]، لەلای مەزهەبی شیعەش (بن فضل الطبرسی وسبزوی والرضوی)بە نیرومێیان لیکدایتەوە، لە هەموان ڕوون تر تەفسیری(العلامەالسعدی) دەڵێ: لەو ئایەتە مەبەستی هەمو شتێك نیە، دەڵێ گشتە لە (جنس)ی نیرو مێ ناپەڕێتەوە بۆ سروشت.

**بەشی دووەم**: سنووری (زوج)یان فراوان تر کردووە بۆ ئاژەل و دار و درەخت و بە حاستەم باسێکی (دژ)یشیان کردووە، لەوانە : تفسیر الکشاف - زمخشري، تفسیر البیضاوی، تفسیر امام الآلوسی والمیزان فی التفسیر طبا الطبائی...، امام طبری[5].

**بەشی سێیەم** (نزیکترینیانە لەو توێژینەوەیە)، لەپۆلەکانی ژیان پەڕینەوە بۆسروشت وبونەوەریش وبەڵام مەنهەجی توێژینەوەکەیان لە فەلسەفەی چینی سەدەی 6-4 یان ڕەت نەداوە، لەوانە:ابن کثیر وا (زوج —ضد)ی ڕێزکردوە: (سماء وأرض, ولیل ونهار, وشمس وقمر, وبر وبحر, وضیاء(نور) وظلام, وإیمان وکفر, وموت وحیاة, وشقاء وسعادة, وجنة ونار، تفسیرالجلالین (الذکر

---

[1] امام الرازی —تفسیر الکبیر—دارالفکر ط1 ج1 ص6205

4 تفسیر قرطبی—جامع الأحکام، دارالکتب العرب لبنان، ج17ص49لە تفسیری (سبحان الذی خلق الأزواج کلها..) دووپاتی دەکەنەوە.

[3] تفسیر روح البیان، دار الفکر-ج9ص172

[4] عثمان عبدالعزیز-تفسیری قورئانی پیرۆز- چ2 ب9 ل751 ئەوانە وەك سنفی دوەم کەمێك باسی زەوجیان لە دارودرەخت وگیاندار کردوە، بەلام سەنتەرایەتیان بە نیرومێی ئادەمیزاد داوە.

[5] تفسیر الطبری—دارالقلم دمشق، ط1 ج7 ص93.

والأنثي, والسهل والجبل, والصيف والشتاء, والحلو والحامض) بۆ زیاد کردوە، ابن جریج و مجاهد: (والهدى والضلالة، والإنس والجن) زیاد کردوە، هەمان ئاست لە مجمع البیان فی تفسیر القرأن لە مەزهەبی شیعە بەدی دەکریّ.. لەوسەردەمەش فی ظلال -سید قطب[1] قولّتری بۆچووە.. هەروەها (التفسیر المنیر)ی وهبە الزحیلی وەك ئەوانەی پیشووبوە(بر وبحر)یشی زیاد کردوە[2]، هەندیّ موفەسیری هاوچەرخیش لەگەلّ ئەوانەو سالب و موجەب و ئەلکترۆن و پرۆتۆنیان زیادکردووەبە هەمان مەنهەجی توێژینەوە لە هەموان بە هیز تر (مورتەزا موتەهیری).

ئەوەی زۆر باسی (ضد)ی کردوە (فارابی)یە، بەلاّم قەتیسی کردوە بۆ دنیای زەمین ودووری خستۆتەوە لە ئاسمان، لەلایەکی تر ئەو چەمکەی نەبەستۆتەوە بەو ئایەتەی(من کل شيء خلقنا الزوجین).

بەروونی لەهەمو ئەوانەی سەروو دیارە دوو بەشی یەکەم لە موفەسیرەکان سەرکەوتووونەبووینە لە بەرهەمهێنانی ئەعجازە بنچینەیەکەی ئەو ئایەتە، چونکە باسی زەوجیان کردوە لە نیرو میّ کەچی باسی (ضد)یشیان کردوە، هەمولایەکیش دەزانن هاوسەری خۆشەویستیە نەك زدایەتی کەواتە پیاو ژن دوو جەمسەری دژەکەنین بەلّکو نیرو میّ دووجەمسەرەکەن، بەشی سیّ یەم زیاتر لیّ ی نزیك بووینەوەو پیّیان وایە(شیء) بە (نکرە) هاتوە قەتیس نامێنیّ لەرەگەزێك،، بەلاّم ناگاتە پلەی (دۆزینەوەی ئەعجاز ) چونکە پشتیان بە زانیاریە فەلسفیەکانی پیّشوو بەستاوە کە کەم وکورِی هەیە، وەك لە برِگەی داهاتوو باسی دەکەین.

---

[159] فی الظلال القران-دار الشروق، ط10 ج6 ص3385 ئەوانەی شیعەش لە (میزان) ی طباطبائی لە ئەنتەرنیت وەرگیراوە.

[2] وهبة الزحیلی –تفسیر المنیر-دار الفکر دمشق، ط8 ج14 ص45

## جووتە دژ(زوج)ی لە مێژووی فەلسەفەدا

کۆن ترین باس فەلسەفی (بەردەست)لە بارەی ڕێسای دژ (قاعدە الزوجین) بەشێوەی(یان ویین) لەلایەن فەلسەفەی چینی(لاوتزی، کۆنفۆشیۆس، تاوی ) هاتووە لە نێوان (6ـــ 4)پ ز[1]، لە فەلسەفەی هندی و عەجەمیش بە شێوەی خوای شەڕ و خێر (ئەهریمان و ئەهورمازدا)، لە میسری کۆنیش بەشێوازی (نون ونونیت )لە ئاو (ئامون وئامونیت) واتە مادی ونامادی، (هوە وهوهیت )لە رووناکی وتاریکی، (ئیزیس وئۆزیس)لە نێرو مێ، هۆك وهۆکیت لە بێسنورەکان، ئیس وئەلیس لە بوونو نەبووندا..

هەمو ئەوانە بە ئەکادیمیانە تر لە فەلسەفەی یۆنانی کراوەتە مادەی گرنگی فەلسەفی، لەلایەن دیموکرتیس (مبدأ الأضداد یان الضدین) بە نێرومێ لێك دراینەوە، بەڵام فیساگۆرس دەڵێ: (الأضداد والتناغم یتحقق بوحدة الایجابي والسلبي والمادي وغیر المادي)، دواییەکەی دەڵێ هەمو شتێك لە دژو نێرو مێ پێك هاتوە.

(هرکلیت576-480ق.م) پێی وایەشتەکان دژەکانیشیان لەگەڵ خۆ هەلگرتوە، لایەنە دژەکان دەگۆڕێن وشوێنی یەکتر دەگرنەوەو لەململانێی بەردەوامیشدان و ئەوەش سەرچاوەی گۆڕانە، لە کتێبی (جمهوریە افلاتون) ووردتر بە ئەدرێسی (الموجود و المعدوم) ڕەنگی داوەتەوە[2]، لەسەدەی (3) بەدواوەمەزهەبی مانەوی لە مەسیحی سەری هەڵدا لەسەر بنچینەی دوو دژی(ڕووناکی وتاریکی)[3].

---

[1] لەو فەترەیە کەسانی مێژوویی زۆر گەورە هاتنە دنیا بە پەیامەوە، لەوانە:فیساگۆرس لە یۆنان، کەمیك پیشتریش لە عەجەمستان زەردەشت ولەهند بوزا..

[2] جمهوریة افلاتون –ترجمة:حنا خباز، دارالقلم-بیروت ط2 ص176

[3] روجیه غارودی-مارکسیة قرن عشرین ترجمة:نزیه الحکیم، دارالأداب –بیروت ط4 ص7

بەدڵنیاییی بیری (زەوجی و دژ) لە هەمو شارستانیە کۆنەکان ئاینیە بە دەقیش لە ئنجیل برنابا هاتوە: (..الجحیم واحدة وهي ضد الجنة کما إن الشتاء هو ضد الصیف والبرد ضد الحر..)[1]، فارابی وئەوانەی بە فەلسەفەی ئەرستۆو ئەفلاتون کاریگەرن بە جۆریکی تر بۆ (دژ) چووینە پێیان وایە پیکهاتەی ئاسمان دژی نیە ئەوە بۆ دنیای ئێمەیە(والأجسام السماویة فإنها فی جواهرها علی کمالاتها... ولاتضادفیها ولالها اضداد)[2].

لە کتێبی (اهل المدینة الفاضلة) باس لە تەواوی خولگەی ئاسمانی دەکا دەڵێ بازنەییە کە تەواوترین خولگەیە[3] بۆیە دژی نیە، ئەگینا تارادەیەك باشی بۆچوە، هەرچەندە ئەویش دوودژی وەك قۆناغی بالای ناکۆکی وەرگرتوە ئینجا دژی دەرەکی وناوەکیشی لیك کردوتەوە بەڵام وەسفیکی زۆر جوانی پەیوەندی نێوان دژو سنورداری کردوەو دەڵێ: (..بنسب متضادة..المادة والصور المتضادة التی یلزم وجودها فیها هی التی تلتئم بهاالأشیاء الممکنة الوجود)[4].

لە رسالەکانی (اخوان الصفا)ش ژمارە(30) بەناونیشانی(مثنویة الإنسان) دەڵێت:مرۆڤ پیك هاتوە لەدوودژی، جەستەی مادی ودەروونی ڕووحانی یەکەمیان بۆ دنیا کاردەکا ودوەمیش بۆ دوارۆژ هاتوە[5].

---

[1] انجیل برنابا- الفصل الستون-ایة(1). ئەو ئینجیلە پێك هاتوە لە(222)فصل لە ترجمەی د خلیل سعادە، لەلای مسیحیەکان دانی پیا ناهێنرێت لای موسولمانانیش ئەوە بە ئینجیلی ئەسل هەژمار دەکرێ

[2] فارابی –کتاب السیاسة المدنیة ص65

[3] فارابی – اراء اهل المدینة الفاضلة ص20 وص63

[4] فارابی –کتاب السیاسة المدنیة ص56

[5] رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء- رسالة رقم:30ص112-113

بەو شێوەیە (زوج)ی لەنێو فەیلەسوفان و مەدرەسە فەلسەفیەکان باس کراون تـا دەگاتــە ســەدەی 17 -18 (ســپینوزا)و (شــلنگ)ئینجا(هیگل) بــەفراوانی (دژەکان)ی وەك پەیڕەوی توێژینەوە بەکارهێناوە، باوەری وابوە بـۆ هەرشـتێك، بـۆ هەر پرۆسەیەك دژێکی بۆ پەیدا دەبێ، لە ململانێی هەردوولا پێکهاتێکی بـالاّ تـر لەهەردووکی پێشوو سەر هەڵدەدا، کە بە (ثالوث الهیغل- سێ کوچکەی هیگلی)ی ناوزەد دەکرێ، لە ریسایەکی فەلسەفی موکوم کۆکراوە بە ناوی جولەی دیالکتیکی (بوون —دژ-پیکهاتەکی بـالاتر)[1] الشـیئ، ضـده، مرکـب الأعلـی- synTheses - Theses -untiTheses[2]، ئــەو گەلالــە فلســفیەی هیگــل زۆر کاریگــەر بووبە،بەشیکی زۆر پێیان وایە لەپیش هیگل هەبوە ،لە فلسفەی (شـلنگ)یش ئـەو (ثـالوث)ەی هەیە[3]،لە فیختــەش بــەدی دەکـرێ، لیــنین دەڵێ ئــەو سێکوچـکەیەی بەناوی هیگل لە ئەسلدا بۆ هەندێ زانای ئەگریکی دەگەڕێتەوە[4] ،بەلام دوای زیـاتر ووردبوونەوە لە بنەچــەدا ئــەو ســێ کوچــکەیەی هیگــل تاڕادەیــەك بـۆ (فـارابی) دەگەڕێتەوە کەوای داڕشتبوو: (المادە —الصورە —المرکـب مــن المـادە والصـورە)[5]،د محمد شحرور دەلێ لە قورئان کە بـاس لـە(..وکل في فلك یسبحون) دەکـا ڕێـك ئەوەبەرجەستەی ئەو سیکوچکە دیالکتیکیەی هیگلە[6].

---

[221] جون لویز- مدخل الی الفلسفة دار الحقیقة بیروت، ترجمة:انور عبداللة، ط2 ص194

[2] مدخل الی الفلسفة - ص193.

[3] المثالیة الألمانیة-شلنغ، دارالنهضة العربیة، القاهرة 1965ص367.

[4] لینین — المختارات—ج1ص529—530

[5] فارابی— اراء اهل المدینة الفاضلة ص65

[6] د محمدشحرور— الکتاب والقران ص247،ص258،ص486

سپینوزا ئەو گەلالەی بە پیچەوانە پەیڕەو کردوپێی وایـە (ئـاین) و(ڕوونـاکی) ئەو جووتـە دوودژەن[1]، ئەرمنسـت هەمـەنگوای و هوایتهیـد و هـەتا ابـو عـلای معریش هەمان رەئیان هەیە.

ئەو تیۆرە فەلسەفیانە لەلایەن مارکسیەوە زۆر بە قوڵ تـر قۆزترایـەوە، جووتـە دوودژی کردە کرۆکی فەلسەفەکەی(وەك لینین دەڵێت)، بەو شێوەیە لە مارکسـیەت لە پرۆگرامی تۆێژینـەوەی فلسـفی پەڕیـەوە بـۆ پرۆگرامـی سیاسـی و مێـژووی و مەعریفـە و... تـا دەگاتـە پـەیڕەوکردنیش، سـێ یاسـای دیـالکتیکیش لەسـەر بنیاتکرا:

1ـ قانون وحدة وصراع الأضداد.

2ـ قانون نفي النفي.

3ـ قانون التحول من تغيرات الكمية الي تغيرات الكيفية[2].

هەولیان دا لە هەموو شتێك دژ و ناکۆکی ببینەوە بەو شێوەی خوارەوە :

1ـــ لە سروشت : (بڵند نزم)، (گەورە بچووك)ن، (خێرا هێواش)...

2ـــ لە بیرکاری : (+، -)، (تەواوکاری داتاشراو)،...

3ـــ لە فیزیا : کارو کاردانەوە

4ـــ لە کیمیا : مادە و مادەی دژ، یەککگرتن وهەلوەشانەوە..

5-لە بایۆلۆجیا:مردن وژین، نوێبونەوەو فەنا..

[1] سبینوزا –رسالة فی اللاهوت والسیاسـة، ترجمـة:د حسـن حنفـی، دارالطباعـة-بـیروت، ط1 ص15 وەرگێڕی هەمان کتێب لە ص100 ئەو (ثالوثـة)ی هیگلی وادارشـتوە :ئـاینی یـەهودی تایبـەت Theses، ئاینی مسیحی دژی unti Theses کە ئیسلامیش هات ئـەوا syn Theses، علی عزت بیکۆڤیجیش لە (الإسلام بين الشرق والغرب)هەمان ڕەئی دووبارە دەکاتەوە.

[2] بروانە: أ- انجلس – ديالكتيك الطبيعة ص78 ب- بودوستنيك وياخوت- عرض موجز للمادية الديالكتيكية ص89-112

6ــ لە ئابوری: ململانێی هێزی بەرهەم وپەیوەندی بەهەم هێنان

7ـ لە کۆمەڵگەو مێژوو: مل ملانێ ی چینایەتی [1].

8ــ لەگیاندار:ململانێ بۆ مانەوە[2].

تا دەگاتە ووتە بە ناوبانگەکەی (لینین) کە ووتی : هەرچی ناوی (شتە) پێك هاتووە لە کۆمەڵە لایەنێکی ناکۆك، ناکۆکی سەرچاوەی بوون و جولەیە[3]،.. جیاوازیان نەکردوە لە نێوان (دژ )و(ناکۆکی) جگە لەوانەی سەروو بە ڕاشکاوانە تر لەلایەن المادیە الدیالکتیکیە هاتوە(الفارق شکل اولی للتناقظ، ثم یتحول الفارق فی سیر تطورها الی تضاد) [4].

ئەوە زۆر بەکورتی سەرنجێکی مێژوویی بوو بۆ فەلسەفەی(زوج)ی، بە ڕوونی تێکەلیەك بەدی دەکرێ، بۆ چاکردنی ئەو خەلەلەپێویست دەکا بزانین پێناس وتێگەیشتنی (ضد) و (زوج)ی لەو مدرسانەچۆنە؟ زۆر بەکورتی سیفاتی (ضد) و (زوج)یان بەو شێوەی خوارەوە گوزارش کردوە:

1ــ زدەکان (زوج) لە یەك کیان (لە یەك شت)نین بەڵکو دووکیانی جیان، نێر و مێ جیایە، شەو و ڕۆژ، سپی و ڕەش،...جیایە.لە فەلسەفەی مارکسی بە ڕوون تر باس لە دوو جۆر (ضد) دەکا دەرەکی وناوەکی [5] هەروەك پیش تریش لە فەلسەفەی فارابی و یۆنانیەکانیش (دژی دەرەکی وناوەکی) بە جیا

---

[1] بڕوانە : مارکس- انجلس، بیان الحزب الشیوعی، دار التقدم- موسکوص65 لەوێ کۆمەلگەی سەرەتایی لێ پەڕێنراوە چونکە گوایە چینایەتی نەبوە.

[2] تشارلس داروین- اصل الأنواع- مکتبة النهضة بغداد ص190-

[3] بۆ زیاتر بڕوانە : (انجلس- دیالکتیك الطبیعة249-256 ) مارکس - رأسمال، انجلس-(انتي دو هرنك) و، لینین - دفاتر الفلسفیة، جۆرج بولیتزر - اصول فلسفة المارکسیة، ماوتس تۆنك - في التناقض، ستالین - المادیة الدیالکتیکیة والمادیة التاریخیة.

[4] مجموعة علماء السوفیت- المادیة الدیالکتیکیة ص266

[5] المادیة الدیالکتیکیة ص274

باس کراوە.

2 ــ ئەوانەی ناونراوە (زوج) تەواونیە، ئەو کاتە دوودژن کە لەنێوانیان دۆخی سێیەم نەبێ، لە نێوان (ڕەش و سپی) زەرد و سەوز و سور.... زۆری تر هەیە، لەنێوان (چاك و خراپ) مام ناوەندی و پەسند و زۆری تر هەیە، لە نێوان ژن وپیاو نێرەموکیش..هەیە، کەواتە ئەوانە سیفەتی دوانەیی(زوج)ی هەڵناگرن کەتەنها دوودۆخ بێت.

3 ــ لە ڕوانگەی ئەو مدرسانە (لە هرکلیتەوە تا مارکس)دوو جەمسەری دژ جێیان دەگۆڕنەوە، گەلێ جاریش لایەك بەسەر لایەکی تر زاڵدەبێ و دەگۆڕێ و دژەکی تر سەر هەڵدەدا.

4ــ هەر لەو ڕوانگانەوە دەردەکەوێ کە دژێك هات دژی بەرامبەری دەڕوا وەك (مقدسی) جوانی گوزارشت کردوە و دەڵێت: (فبطل قول القائل أن ضد الجسم لا جسم وضد العرض لا عرض وضد الزمان لا زمان وضد المكان لا مكان وضد الشيء لا شيء لأن الأضداد أشياء متنافية)[1]، واتە پێکەوە لەیەك (کیان) لەیەك کاتدا کۆنابنەوە، لەسەر زەوی شەو و ڕۆژ کۆدەبنەوە، بەڵام بەبۆچوونی ئەوانە لەناو خودی شەو ڕۆژی ڕووناکی تێدانیە،... ئەوەش دەقا و دەق سیفاتی (تناقض)ە، نەك دژ.

بەکورتی لەوانەی سەروو دەردەکەوی کە :

1ــ هەریەکە لە(جیایی)، (خلاف)، (تنافس)، (تناحر)، (ضد)، لە فەلسەفە لێك نەکرایتەوە[2]، ماوتسی تۆنگ هەمان ڕای لینینی گواستۆتەوە کە لە (فی مسائل الدیالکتیك) ووتبوی:ان اتحاد (تطابق، وحدة، تواحد) الضدين

---

[1] البدء والتاريخ ص11

[2] عرض موجزللمادية الديالكتيكية..ص267 (ان مفهوم الفارق و التضاد يعبران عن واقع الواحد عن تناقض الداخلية)

مشروط، موقت، عارض، نسبي. أما صراع الضدين المتعارضين فهو مطلق، تماما كما أن التطور والحركة مطلقان)[1]، لەشوێنیکی تر لینین دەڵێت ململانیی دژەکانە گەشە بەدەست دەهینی[2]. ئەو لیك نەکردنەوەیە ماکینەی فەلسەفەی سەفسەتائیەکان بوە، نەیان زانیوە (زەوجی -دژ) تەنها دوە، هەرچی جیایی وناکۆکی و..ئەوانە سیفەتی(بەرامبەریان) نیە ئەوەیان ئەوسیفەتەیان بەکارهیناوە بۆیە توانیویانە بیسەلمینن کە مادام (من وتۆ جیاین کەریش لە من جیایە کەواتە تۆ کەری!).

لەلای زۆربەی موفەسیرەکانیش وا تیکەل کراوە هەروەك (ابن ابی حجلە- دیوان الصبابە ) دەڵێت:(...وإنَّما ضدُّ القوة الضعف، وضد الجهل العلم، فالإختلاف أعم من التضاد، إذ كل متضادين مختلفين)، زۆربەی موفەسیرو مەعجەمیەکان وەك زکریا انصاری دەڵێن: (الضدان امران وجوديان يستحيل اجتماعهما فى محل واحد)[3]، (ابن عربی)یش هەمان ڕای هەیەودەلی: (فما في الوجود مثلٌ، فما في الوجود ضد، فإن الوجود حقيقة واحدة والشيء لا يضاد نفسه)، لەکاتیکا لەدوایدا دەردەکەوێ کە(ضدان يجتمعان ويستحيل فصل بينهما)، فارابی بەوە قایل نەبوە کە دژ و جیاوازی یەك بن بەڵام لەدوایدا دژی هەر بە ناکۆکی تیژ لیك دایتەوە[4]، لەوەو پیش ڕای

---

[1] ماو تسي تونغ- في التناقض، مؤلفات المختارة، دار النشر باللغات الأجنبية،1968 بكين، ج1 ص495

[2] لينين- مختارات ط انكليزى م11 ص81-

[3] القاضى الأنصارى-الحدودالأنيقة والتعريفات الدقيقة-تحقيق:د مازن مبارك، دار فكر المعاصر-بيروت ط1 ص73

[4] فارابى –كتاب اهل الدينة الفاضلة ص41

ماركسيشمان تۆمار كرد كە باسی لە (دژ) ی دەرەكی كردبوو، ڕەنگە ابن خلدون لە هەموان نزيك تر بێت كە دەڵێ(نقصان الضد عن ضده الكامل) [1].

2 ــ نەزانراوە كە خودی ئەو لايەنانەی (زوج)ی شيتەڵ دەبن، وەك (شەو كە پێك هاتوە لە ڕووناكی و تاريكی ) [2].. كە چی جەمسەرەكانی زەوجيە شيتەڵ نابن.

3 ــ بۆ زياتر خشتەكێكی جياوازيەكانی (ضدين) لەگەڵ (تناقض) دەكەين :

| | ضد | تناقض [3] |
|---|---|---|
| 1. | تەنها لە دوولا پێك دێت(دوانەی جمكن). | لە دوولا زياتر. |
| 2. | لايەنەكانی دژ(زوج) لە شت و مەكەكان دەمێنێت و ڕێژەيان دەگۆڕێ. | لايەنەكان نامێنن ودەگۆڕێن. |
| 3. | ململانێيان نيە | ململانێ ی يەكتر دەكەن. |
| 4. | هەر لايەی مەرجی مانی بەرامبەريەتی. | مەرج نيە. |
| 5. | بە ديل نين بۆ يەكتر. | بەديلن. |
| 6. | دژەكان تەنها ناوەكيە. | ناوەكی و دەرەكيە. |
| 7. | ڕەها و نەگۆڕن. | ڕێژەيی و گۆڕاون. |

---

[1] ابن خلدون –المقدمة ص100.

[2] لە تەورات ئەو ئايەتە زۆر نزيكە لەو باسە : (وَدَعَا اللهُ النُّورَ نَهَارًا، وَالظُّلْمَةُ دَعَاهَا لَيْلاً. وَكَانَ مَسَاءٌ وَكَانَ صَبَاحٌ يَوْمًا وَاحِدًا) ".سفر التكوين 1:5– هەروەها هەر لە سفر التكوين-اصحاح 1ئايەتی16 فعمل الله النورين العظيمين.النور الاكبر لحكم النهار والنور الاصغر لحكم الليل.والنجوم.

[3] هەندی مەعجەم جياوازيان كردوە لە نێوان (ضد) و(تناقض) بەلام زۆر بەسادەيی، لەوانە ابو الحسن الجرجانی لە(التعريفات)، بەلام زاناو فەيلەسوفەكانی سەردەم بەباشی ئەو بەراوردەيان كردوە لە هەموان وورد تر (محمد باقر الصدر- فلسفتنا).

| | | |
|---|---|---|
| 8. | نەفی لایەکیان یە کسانە بە ئەوی تر نیە. | مەرج نیە. لایەکیشیان پێوانەی لاکەی تر بیت. |
| 9. | جەمسەرەکانی دژ دیارنیە. | دیارە. |
| 10. | لێك جیا نابێتەوە و بە تەریبی لە گەڵ یەکن | لێك جیادەبێتەوە. |
| 11. | یەکتر تەواو دەکەن. | بە دیلی یەکترن. |
| 12. | یەکتر سنوردار دەکەن. | لەسەر کەوتنا لایەکیان گەورە دەبێ. |
| 13. | لایەکیان بەبێ لایەکەی تر مانای نامێنێ و ناسنامەی (شت) لە دەستدا. | بەبێ لایەکەی تر هەر ناسنامەی دەمێنێ. |
| 14. | سنور لە نێوانیان نیە ئاوێتەن | زۆربەی جار سنورێکی روون لەلایەنە ناکۆکەکان هەیە |
| 15. | سنورەکان لە ناوەڕاست نین، واتە هەرشتێك لە دوو ڕێژی جیا (دژ) پێك هاتووە. | سنوریان دیارە و کیانی سەر بە خۆن |
| 16. | کۆن ونوێی تێدا نیە | تێیدایە |
| 17. | حەلی نیە. | حەل کردنی دەبتە گەشە و زاڵ بوونی لایەك بەسەر لایەك |
| 18. | زەوجی(دژ) لە یەك شت بە هاوتای پڕلەگەڵ یەکن | لەدووشت وناسنامەی جیان |

# خوداو سیستەمی (زەوجی)

**هەندێ پێناس:** لەو توێژنەوەیە پێویستمان بە چەند زاراوەیەك دەبێ کە زۆریان بەکاردەهێنین لەلایەکی تر پێناسەیەکی تایبەت و فەلسەفی پێویستە وکەمیش بەکارهاتوە بەو جۆرە مەنهەجە.

جەمسەر: مەبەستمان لێی جەمسەری لایەك لە دوو دژەکەیە، لایەك لە پێکهێنەری زەوجیەکەیە، لەو کاتە پێ ی دەووترێ (جەمسەر) کە لای بەرامبەری نەمێنێ، ئەگەر جەمسەری گەرمی بە نمونە وەرگرین ئەوە جەمسەرەکەی ئەوەیە لە هەر گەرمیەکی بونەوەرو ڕابینراو گەرمترە، واتا لەو کاتی بەتەواوی (سارد) لەتەنەکە (شتەکە) نەمێنێ، بەو شێوەیەش بۆ(جەمسەری گەورە)، (جەمسەری پۆزەتیڤ )،.....

بێ کۆتایی- **infinity** : مەبەستمان لێ ی پێچەوانە و دژی (سنوردار)یە، واتا لەپشت کۆتاییەکان، لەپشت سنورە... یان بەکورتی بەدەرە لە بونەوەر.

ڕووت (پەتی- خالص) : لەباری ئاسایی کاتێ کە دۆشاوێکی بەتەنها لە ترێ یان لە خورما یان هەر میوەیەکی تر پێی دەوترێ دۆشاوی ساف(خالص) یان ڕوون یان پەتی، لەو بابەتەش کاتێ بەرەبەرە لایەك لە دوو دژەکە لەتەنەکە زاڵ دەبێ، واتا لای بەرامبەری دەردەکات، ئەوا بە (ڕووت) یان (پەتی- خالص) ناودەبرێ وەك ساردی ڕووت، (گەورەی ڕووت).

ئیستا بەوپێناس و دەروازانەو بە مەنهەجێکی توێژینەوەی تازە دەچینە نێو سیستەمی زەوجی لە بونەوەر، لەوێشەوە بۆ ناسینی خوا، هەوڵدەدەین لە نمونە ساناکانەوە دەست پێ بکەین.

# جەمسەرەکانی زەوجی لەبوونەوەردا

ئەگەر تۆزێك سەرنج بدەین دەبینین هەر شتێك پێکهاتووە لە کۆمەڵێك (دوو دژ) (ازواج) کەیەکیٚ لە بەندە هەرە گرنگەکانی بوونەوەرە، کە لە ئایەتی (وفی کل شیئ خلقنا زوجین) هاتوە، وەك (سارد، گەرم)، (سەر و خوارو)، (خێرا، وەستان)، (رەق نەرم)، (زانین نەزانین) خۆی لە ئەسلدا هەر "بوون"ێك بەهۆی هەردوو دژ بوویتە بوون سنوردارە بۆ ئێمە رەخسێنراوە، ئەگەر سارد نەبێت هەر هەموو تەنێك لەو دونیایە لەبەر دەسەڵاتی گەرمی موتلەق دەبووە هەڵم، یاخود هەر بوونی نەدەما هەروەهاش بۆ هەموو شتێك..

جا ئێستا ئەگەر ئێمە هەر لە بوونی دژێك بۆ (دوو دژ) دەسەڵاتی ئەوی تر وا ڕەها بێت. دیارە خوای گەورە نەك هەر دژی نیە بەڵکو خۆی دروستکاری ئەو (دوو دژانە)یە، بۆیە دەسەلاتی تواناو زانیاری و تەمەنی.. هەر هەمووی بیٚ کۆتاییە (واتا سنوری نیە)، کە لەبیرکاری بە (ئینفینیتی) نیشان دەدرێت، بیٚ سنوریش تەسەور کردنی ئەستەمە، بۆیە سیفەتەکانی خوای مەزن موتلەقە بەسەر ئەو بونەوەرە و بونەوەری تر هەموو شتێکی پێدەکریٚ و لەهەمووی ئاسانتر دووبارە زندوو کردنەوەمانە، بەو شێوەیە دەچینە نێو ئەو بابەتەو هەندیٚ نمونەی(جەمسەرەکانی) زەوجی لەو بوونەوەرەی خۆمان وەردەگرین.

## یەکەم: زەوجی لەبڕ و ژمارەدا

بۆیە ژمارەمان هەڵبژارد چونکە لەهەمان کات مانای (کمیە- بڕ) یش دەبەخشیٚ لە سروشتدا، لەلایەکی تر هەر ژمارە و بڕێك چ موجەب چ سالب زۆر بە موتلەق وڕووت دەردەکەویٚ، کەچی لەناوەوەدا زەوجیە، هەردوو دژی هەڵگرتووە لەچەندین لاوە، موجەب و سالبی هەڵگرتوە، سنوردار و بیٚ سنوری هەڵگرتووە،

گەورە و بچوکی هەڵگرتووە، بەکورتی لێرە دەریان دەخەین:

## 1- زەوجی موجەب و سالب:

هەر ژمارەیەك چ موجەب چ سالب لەناوەوەدا لە دوو ڕێژەی دژ بەیەکی (زوج)ی پێکهاتووە، سادەترین نمونەی ژمارە (2) وەردەگرین، وادەردەکەوێ زۆر پتە و موکوم موجەب بێت، موجەبی پەتی بێت، کەچی سالبیشی هەڵگرتوە، پێك هاتووە لە (+5، -3) یان (+12، -10) هەر یەکن، هەرچی ژمارەیەکی تر بگری بەو شێوەیە پێکهاتووە، دەتوانین هەمان کردار بۆ هەر ژمارەیەکی سالبیش ئەنجام بدەین و شیتەڵی بکەین بۆ دوو دژی زەوجی، ئەگەر نمونەی (-6) وەرگرین وادەردەکەوێ لە (سالبی) ڕووت(موتلەق) پیکهاتبێت، کەچی ئەویش لە دوو بڕی دژ بەیەکی زەوجی پێکهاتووە، لە (-8، +2) یان (-20، +14)، ئەو بۆ گەورەترین ژمارەو بچوك ترینیان هەروایە وسالبو موجەب لە یەك ژمارەی سادە کۆبوویتەوە، کەواتە هیچ ژمارە و بڕێکی موجەب یان سالب نادۆزیەوە ڕووت، موتلەق، هەموی زەوجیە.

ئەگەر (موجەب) بکەینە گەورە و سالبیش بکەینە بچوك ئەوا لەڕووی (کمیە، بڕ) کار ئاسانیمان بۆ دەکات کە بزانین هەموو تەنێك هەموو شتێك لەو گەردوونە لە دوو لای زەوجی بچوك و گەورە پێکهاتووە، گەورە و گەورەتر و گەورەترین.. ئەو مانایە وەردەگرێ کە بچوك و گەورە لەناو ئەو تەنانە کۆبوینەوە، هەر بۆیەش لەیەك تەن دەتوانین بەهەردوو ئاراستەی گەورە و بچوك وەسفی بکەین، کە دەڵێین ئەو بەردە گەورەترە لەبەکتریا، لەهەمان کاتدا بە ئاراستەی پێچەوانە دەتوانین بڵێین ئەو بەردە زۆر لە شاخێك بچوك ترە (واتا سیفەتی بچووکی و گەورەیی) هەڵگرتووە، هەر لەبنەچەشدا (نیسبیەتی) وەسفی ئەو تەنانە لەوەوە هاتووە کە لە زەوجی پێکهاتوون هەرلەبچوکترین تەن تا گەورەترین تەن لە بوونەوەر، بەهەمان

شێوەش بۆ ژمارەکان، چەند گەورە بن لە سالب ڕزگار نابن بە زنجیرەیەك گەورە و گەورەتری یەکجار زۆر، تادەگاتە نزیکەی (infinity ) بیٰ کۆتایی، کە بەنیشانەی (∞+) دیاری دەکرێت، لای سالبیش (∞-) هێما دەکریٰ، واتا موجەبی ڕووت، موتلەق،.. یاخود پیٰ ی دەوتریٰ جەمسەری موجەب، لەتەنەکانیش پیٰ ی دەوتریٰ جەمسەری گەورە (یان گەورەی موتلەق) واتا گەورەتر لەهەر تەنێکی گەورەی ڕابینراو، بەهەمان شێوە بۆ بچوك، ئەو لێکدانەوەیەی سەروو زۆر جیایە لەگەڵ زەوجی لەشێوەی نێر و میٰ (+، -)، (شەو، ڕۆژ)،... کە لەتەفسیری ئەو ئایەتە هاتووە، هەروەها لە فەلسەفەکانی مارکسی و هیگل هاتووە، لەباشترین دۆخ کە زەوجیان بۆ ژمارە و بڕ دۆزیبێتەوە وایان تۆمار کردووە: "بۆ هەر ژمارەیەکی موجەب ژمارەیەکی سالب بەرامبەری هەیە"، بۆ (2) ئەوا (-2) هەیە، بۆ (-6) ئەوا (+6) هەیە، وەك نێر و میٰ بەرامبەر یەکتر، لەدەرەوەی یەکتر، ئەوە (هاوتا)یە نەك (دژ) و (زوج)، ئەوەی لێرە باسمان کرد لەدەرەوەی ژمارەکە نیە، گەورە و بچوکەکە لەدەرەوەی تەنەکە نیە، لەناوخودی خۆیەتی، ڕەنگە هەندیٰ (متناقضاتي بارادوكسي)ی بیرکاری بهێننەوە و بلێن کوا بەسەر هەموان پیادە نابیٰ، لە ڕاستیدا لە بیرکاری پرۆسەی پێچەوانەی وەك (کۆکردنەوە و لێکدەرکردن)، (ڕاستەهێل و چەماوە)، (تەریب و یەکتربڕ)، (ژمارەی خەیاڵی و ژمارەی ڕاستەقینە)، (یەکگرتن و یەکتربڕین) (داتاشراووتەواوکاری) (تواناو ڕەگ).. ئەوانە دژ نین وەك ئەنجلس لیی بەهەلە داچوە، بەڵکو پرۆسەی پێچەوانەن[1]، هەر لەبارەی ژمارەو پرسی نێرو میٰ ئەوە فیساگۆرس ژمارە تاکەکانی بە (نێر) گوزارش کرد

---

[1] ئەو بابەتانە بەدرێژی لە هەردوو کتێبی (دیالیکتیك الطبیعة)و (انتي دوهانك) ی فریدریك ئەنجلس تۆمارکراوە، ئەنجلس دەلیت :چۆن بیرکاری واپیش کەوت بە هۆی تیخستنی (گۆڕاو)لەلایەن دیکارت، ئاواش چەمکی جولان پیش کەوت کاتی ئیمە دیالکتیکمان تیخست (دیالکتیك الطبیعة ص301).

وژمارە جوتەکانیش بە مێ، کەچی ئەوە ڕاست نیە چونکە ژمـارەی تـاك وجـووت موتلەق نینە خالی نین لە یەکتر، بۆ نمونە ژمارەی 3 پێك هـاتوە لـە کـۆی(1+2) واتە هەمو ژمارە تاکەکان توخمی جوتیشی تیدایە.

بەهـەمان شـێوەش بـۆ ژمـارەی جـوت، ئـەو بەشـانەی بیرکـاری سـەروو کـە بەڕاستەقینە ڕەنگدانەوەی واقیعی وسروشتی بێ ئەوا زەوجیەکەی بەشێوەی سـەروو بەسەردا پیادە دەبێ، بەڵام بەشە خەیاڵیەکەی تەنها لە بیرکاری پەتی هەیـە (نـەك واقیعی) ئەوا لیٚ ی بەرپرسیار نین.

لێرەدا دەردەکەوێ کە بیرکاری پەیوەندی بە (فەلسەفەی خوایی) هەیـە هـەروەك فیساگۆرس ودوایش لە(رسائل اخوان الصفاو)باس کراوە، کەچی ئیمام غزالی پێـی وایە ئەو زانستە زۆر دوورە لە زانستی (ئیلاهیـات)ودەڵی: (أمـا الرياضـيَّات التـى هى نظر فى الكم المنفصل — وهو الحساب - فلا تعلق للإلهيات)[1].

## 2- زەوجی سنوردار و بێ سنور (المحدود و اللا محدود)

ئەگەر تەنێك چەند جار کەرت بکەین وکەرتە تازەکە کەرت بکەینەوە، دەبینین ئەو پرۆسەیە کۆتایی نایە شتێك هەر دەمێنی[2]، تـا ئـەو ڕادەیـە سـنوری نـامێنی

[1] حجە الإسلام أبی حامد الغزالی - تهافت الفلاسفه ص6 دەبی خوینەر ئاگاداربێ لە چاپی تر (ص6)نیە، لەچاپەکەی (موریس بویج) کە د ماجدفخری پیداچوونەوەی کردوە ص44.

[2] لە فلسفەی یۆنانی کۆن لەسەر دەستی ئەبیکرات ئەتۆمی کردە ئەو پارچەیەی چیتر پارچە پارچە ناکرێ، کەچی ئیستا لە ناو ئەتۆم ئەلکترۆن وپرۆتۆن ونیوترۆن ولەناو ئەوانەش کوارك دۆزراوەتەوە هیچیش لەوانە کۆتایی نیە، کوارکیش وەك تەنیکی ئاسایی لە هەزاران پیکهاتەی بچوك تر پیکهاتوە، وەك بیرێکی بێ بنە، لەکۆنەوەش ئەرستۆ ووتبووی هیچ پارچەیەکی بچوك نیە پارچەنەکریتەوە تا بێ کۆتایی، المطهر بن طاهر المقدسی-البدء والتاریخ ص9 **وا** هاتوە: ولما جاز لقائل أن يقول أن الله قادر على أن يرفع من الجسم كل اجتماع خلقه فيه فأقل الاجتماع بين جزئين قال ابن بشار النظام وهشام بن الحكم أنه يتجزأ تجزءًا بلا نهاية.

ئینجا کۆتایی دێت، ئەوکاتە کۆی کەرتە بێ کۆتاییەکان دەکاتەوە تەنە ئەسلیەکە، کەواتە هەر تەنێکی سروشتی لەو بونەوەرە خۆی سنوردارە بەڵام لە کەرتی بچوکی بێ کۆتایی پێك هاتوە، بۆ ئاسانکاری با ئەو پرۆسەیە بە بیرکاریانە گوزارش بکەین : بۆهەر ژمارەیەك خۆی وادەردەکەوێ بە ڕووتی سنوردارە، کەچی لەناوەوە لە کەرتی بچوکتری بێ پایان پێك هاتووە، بەسادەییش لە بڕێکی ژمارەیی گوزارش دەکرێ، با دووبارە ژمارە (2) وەرگرین دەبینین سنوردارە، کەچی لەهەناویدا ژمارەیەکی بێ پایان (بێ سنور) لەژمارەی بچوکتر لەخۆی پێکهاتووە، کە بریتیە لە 1+1\2+1\3+1\3+1\4+... کەواتا لەهەناوی ژمارە(2) سنوردار و بێ سنور، کۆتایی و بێ کۆتایی کۆبویتەوە، بەهەمان شێوە هەر بڕێکی ترو هەر تەنێکی تری واقیعی و سروشتی لەو بونەوەرە ئاوا خۆی سنوردارە بەڵام لەپارچەی (بێ کۆتایی) بچوکتر پێکهاتووە.

ئەوەش دەقاودەق مانائەعجازیەکەی ئایەتەکە پێشان دەدا کەزەوجی لە هەمولایەنەکان ولەهەمو شتێکدا هەیە، لەوەدا ئێمە توانیمان ئەوەندە شێوەی (زوج) بدۆزینەوە، زۆری تریشی تێدایە جارێ بە ئێمە نادۆزرێتەوە.پێویستە لێرە هەلوەستەیەك بکەین ئەگەر ئەو پرۆسەیەی وا لێرە بە (دژ-زوج)ی گوزارشی دەکەین ڕەنگە مارکسیەکی نوی یان هیگلیەکی هاوچەرخ بلی ئەوەتا ئەوە (ناکۆکی ودیالکتیك)ە لە ناخی هەموشتەکان هەیە، بەبەراوردیك زۆر سادەو بەبەکارهینانی ئەو خشتەکە جیاوازیەی لە نێوان (چەمکی دژ وچەمکی ناکۆکی)یمان کرد، دەردەکەوێ ئەوە دژو (زەوج)ی نەك ناکۆکی.

## دوەم: زەوجی لە ڕووداو

1- **حەتمی و مەحاڵ:** زەحمەتی هەرە گەورە لەو جۆرە تویژینەوە دۆزینەوەی جەمسەرەکانیەتی، هەندێکیان ناوی هەیە هەندێکیان هەر ناوی نیە(نەك لە

زمانی کوردی لە عەرەبیش) دەبێ بۆی بتراشرێ یان نـاو ناسـنامەی تـازەی پێبدرێ، خۆش بەختانە زاراوەی ئامادەو باو هەیـە بـۆ هـەردوو جەمسـەری (ڕووداو)، بریتین لە (حەتمی و مەحاڵ)، حەتمی بەمانای هەر دەبێ ڕووبدا لـە کـات و زەمینـی خـۆی، مـەحالیش پێچـەوانە و دژایـەتی، واتـە بـەهیچ شـێوەیەك ڕوونـادا، بـە ڕوونـی دیـارە هاتنـەدی حـەتمی لـە ڕووداوە کۆمەڵایەتیەکان زەحمەت ترە، مەحال ئاسان ترە

لەوەوە مەزهەبی جەبری سەری هەڵـداو پێیـان وابـوو ڕووداوەکـان لەدەسـت مرۆڤ نیە ومسەیەرە، لەناو فەقیهانی ئاینی وبەتایبەتی ئیسـلامی زۆر بـڵاو بوو، تا ڕادەیەك بەشێك لە فەیلەسوفان وخودی فەلسەفەی مادی میکانیکی و دیموکریتس وەك مەزهەبی جەبری رایان وایە هەمو شتیك جـەبرە، ڕاسـتە لەو دنیایە ئازادی و(خیار)کەمترە، ڕووداوەکان بە لای جـەبری زیـاترە نـەك ئیختیاری، بەڵام جەبری نیە بەتەواوی، هەرچی ڕووداوە واتا پیناسەی ڕووداو هەڵدەگرێ، لە دوو جەمسەر پێك هاتوە، هاتنی شەو لـە دوای ڕۆژ، زسـتان لە دوای هاوین، پیری لە دوای گەنجی،... ئەوانە ڕووداو نین- بەڵام دیسان لە نێو ئەوانەش هەردوو لای (زوجی) حەتمی و مەحاڵی تێدایە، ڕووداو ئەوانـەن کە بەرێکی دووبارە نابێتەوە یان هەر لە پێشتر هەر رووی نەداوەوبەدەرن لـە یاسای سروشتی زانراو، توخمی لە (ناکـاو)ی تێدایـە، ئـەو جـۆرە ڕووداوانـە چڕترو زیاتر دەبن تا لە سروشت زیـاتر بـەرەو ژیـان بـڕۆی، لـە (6) جـۆرە جوڵانەوەکەش بەرە بەرە زیاد دەکات تا دەگاتە کۆمەڵگە، بۆیە پیش بینـی ڕووداو لە سروشت ئاسان ترە نـەك لـە کۆمەڵگـە، ڕووداوی سروشـتی وەك بروسك و زریان و داڕمان و بوڕکان و...ڕووداوی کۆمەڵایەتی و گیاندارانیش دیارن، هەر لە چالاکی فـایرۆس و بـەکتریا تـا ڕووداوی دڕنـدەکان و شـەڕو شۆڕی نێو کۆمەڵگە و زۆری تر دەگرێتەوە، سەرەڕای ئەو پۆلێنەش هەرچـی

ڕووداو هەیە هەرگیزو هەرگیز ئەگەریە(ئیحتمالیە)، تەنانەت ئەوانەی ئێمەش ناوی لێ دەنێین حەتمی یان مەحالْ، هیچ لایەکیان رووت و پەتی نین، هەرگیز حەتمی و مەحالی تێدایە، بۆیە پێش بینی موتلەق 100٪ لەو بونەوەرە نییە، ئێستا لە ڕاڤەی (کێشەی ڕێکەوت –الصدفە-) جوانتر ئەو (زەوجیە) لەهەموو ڕووداوێك بەشێوەی بیرکاریانە گوزارشت دەکەین.

لەلایەن فەلسەفەی مارکسی و هەندێ تەیاری میسالی دوو جەمسەری ڕووداولە(ڕێکەوت و پێویستی –الصدفة و الضرورة) کۆکرایتەوە، بەجۆرێك (گوایە) ڕووداوە (زەروریەکان) بەهۆی هۆکارە ناوەکیەکان ڕوو دەدەن وحەتمین، ڕووداوە ڕێکەوتەکانیش بەهۆی کۆمەڵێك هۆکاری دەرەکی ڕوودەدات، هەردوولاش دژ بەیەکن[1]، لە ڕاستیدا قەبارەی بەشداری هۆکارە ناوەکیەکان پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە (حەتمی) کە (ناوی زەروورەی ناوە) هەیە، هەرچی بەشداری هۆکارە دەرەکیەکانی هەر ڕووداوێکە پەیوەندی بە لای (محال) هەیە (کە لێرە ناوی صدفەی لێنراوە)، هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش دەبێ ئاگاداربین گەلێ ڕووداو هەیە لەلای ئێمە بە محال پۆلێن دەکرێ (یان پێچەوانەوە) ئەوا لە ئەسلدا وانیە، زانیاری وتوانای ئێمەیە جارێ دەست کورتە و وادەزانین حوکمەکەی وایە، ئەگینا لە جێی خۆی مەوزوعیانە جۆرێکی ترە، هەر لەوەشەوە بۆمان دەردەکەوێ بەپێ ی زانیاری (نیسبی) ئێمە ئەو ڕووداوانە بە (صدفە) لێك دەدەینەوە و مەرج نیە وابێ، ئینجا ڕووداوە (صدفە)ییەکان مانای (محال) نابەخشێ، کە ببێتە جەمسەر دژ بە (ضرورة-یان- حتمي)، محال مانای هەر ڕوونەدانە، بۆیە بەشێك لە زانایانی ئایینی سەردەم (لەوانە سیدقوتب) دەگاتە ئەنجامێکی پێچەوانەی ئەوانە و دەڵێ (صدفە) ڕێکەوت لەو گەردونە هەر نیە، لەپێش ئەو دیموکریتیس لە (تیۆری ئەتۆمی)

---

[1] عرض موجز للمادية الديالكتيكية ص129 هەروەها بڕوانە:ف انجلس –ديالكتيك الطبيعة ص252

نكولی له (صدفه) كردبوو، لوكريت (99-55 پ ز)و (تۆمـا ئـەكوينی)یش ئـەو ڕایەیان هەبوو، تەنانەت هولباخ زۆر مادیە كەچی ئەویش ڕای وایە ڕێكەوت بوونی نیە.

له ڕاستیدا ڕێكەوت هەیە بەڵام:

(1) جەمسەری دژ بە حەتمی نیە.

(2) ڕووداوی ڕێكەوت بە ڕووتی و پەتی لە هۆكـارە دەرەكیـەكان پێـك نایـەت وەك ماركسیەت بانگەشەی بۆ دەكات.

(3) ئـەویش لەژێرسـایەی یاسـایە بـەڵام زەحمەتـە دۆزینـەوەی بۆیـەش نـاوی (ڕێكەوت)ی لێنراوە[1]، مادام ڕیكەوتیش لە چوارچێوەی یاسایە ئـەوا بەشـێكە لـە (نظرية الاحتمالات).

بۆ ساغكردنەوەی (بەكورتیانە) پاڵپشت دەكەینە شێوازی زانستی (ئەگەرەكان- نظرية الاحتمالات). ئەگەر ڕووداوێك یـان ئەگـەرێك حـەتمی بێـت ئـەوا نرخەكـەی (1)ە، ئەگەر محالیش بێ نرخەكەی (سفرە), بەو پێیە ئەگـەری هەرچـی ڕووداوێـك لەنێوان (0,1) دا دەبێت[2]، كەواتا ئەگەر (صدفه) دژی (حتمی) بێـت ئـەوا دەبـێ نرخی ڕوودانی سفر بێت، واتا هەر ڕوونادا و جـوت دەبـێ بـە (محـال)، بـە ڕوونـی دەردەكەوێ ئەو بۆچوونە هەڵەیە، سەرچاوەی هەڵەكە لەوە دێت كەوا تێگەیشـتوون (صدفه) تەنها بەهۆكارە دەرەكیەكان ڕوودەدەن ، هەر خودی ڕووداوەكە پێویستی بە (خود) هەیە، هەتا ئەگەر هەمووشی هۆكاری دەرەكی بێت وەك (كاریگەر) ئەی (كارلێكراو)؟ ئەوە خودی تەنەكەیە (شتەكە)یە، كە ڕووداوەكـەی بەسـەردێت هـەر

[1] ئەگەر بەووردی سەیری لێدانی ئەو ژمارانە بكەین وابڕوا: 0، 2، 24، 256... زەحمەتە بزانین لە پێنجەم ژمارە چیە و وادەزانین بە ڕێكەوت دەكەوێتە سەر ژمارەیەكی تر، بەلام ئەگەر یاسایەكەمان دۆزیەوە ئەوا زۆر ئاسان دەبێ، كە بریتیە لەیاسای $(n^n - n)$ ئەوا چاوەڕوانی سودفەكە ناكەین بەلكو دەزانین دەكەوێتە سەر ژمارەی(3125).

[2] تێبینیەكی زۆر لەسەر (سفر) هەیە بەڵام وەك باوە لەو نەزەریە هەروا لەسەری دەڕۆین.

دەبێ (زەوج)ی بێت، هەر لەبەر ئەوەشە دەبینین هەندێ (صدفە) هەیە زۆر دوورترەلە هەندێکیان، سودفەی لێدانی کارەبا لە ئەندازیارێکی بەشی کارەبا نزیکترە لە جوتیارێك، (صدفە)ی بەرکەوتنی شوفێرێك بە ئۆتۆمبێلێکی تر نزیك ترە لە سەربازێکی دەریاوانی، با ئەو نمونانە بە بیرکاریانە گوزارشت بکەین، بۆئەوەی ئەگەری ڕوودانی پێکانی جوتیارێکی کورد بە بروسك لەشاری مەککە (بەنمونە) سەعات 9:20 ئەوەندە ئەگەرودۆخانەی خوارەوە وەردەگرین:

- دەشێ ئەو ساڵ نەچێتە حەج ونەچێتە مەککە... $a_1$
- دەشێ بیەوێ بچێ بەڵام باری ماددی ڕێگربێ... $a_2$
- دەشێ بیەوێ بچێ بەڵام نەخۆش بوو ... $a_3$
- دەشێ بیەوێ بچێ نەهات بوو ... $a_4$
- دەشێ بیەوێ بچێ بەڵام ناوی دەرنەچوو ... $a_5$
- بۆی ڕێککەوت بچێتە حەج ومەکە بەڵام ئەو ڕۆژە و سەعات 9:20 لە ڕۆژێکی هاوین بوو کە ڕوودانی بروسك زۆر دورە... بەو شێوەیە هەزاران ئەگەری تری لە پێشەبۆ ڕوودانی، دەبێ هۆکاری زۆر زۆر و لەیەك کات و ساتدا کۆببێتەوە ئینجا ڕوو بدات.

کەواتا $a_1+a_2+....+a_n=A$ ئەو لایەنانەن دژی ڕووداوەکەن، مەحالیەکەیتی، کەدەکاتە هەزاران دۆخ، ئەگەری ڕوودانی (صدفە) کە دەبێتە: $A\backslash^1$ ئەگەرێکی زۆر کەمە وەك دیارە ئەو نرخە هەرچەندە زۆر بچوکە بەڵام سفر نیە.

ئەگەر $A\backslash^1$ ئەگەری ڕوودانی(صدفە)کە بێت، ئەدی نرخی($1-A\backslash^1$) چیە؟ ئەوا نرخی (محالی) ڕوودانە، کۆی هەردوولای دژ(زەوجی) دەکاتە (1) [1]، ئەوەش نرخی

[1] یەکی لە نیشانەکانی (زەوجی-دژ)وتمان یەکتر تەواو دەکەن، مانا بیرکاری تەواو کردن ئەوەیە کۆی(دوو دژ) دەبی بکاتە (1).

ڕووداوەکەیە بەتەواوی لە دوای ڕوودانـی، کـەواتا (صـدفە)ش زەوجیـە و دوولای (حەتمی و مەحال)ی تێدایە، دەتوانین بڵـێین ڕوون تـرین شـێوازی زەوجـی لێ بـەدی دەکرێ، بەو شێوەیە نەك هەر ڕووداوە (صدفیەکان) بـۆ هـەموو ڕووداوەکـان ئـەوا زەوجیە، کەواتە چۆن هەموو وەسفێك نسبیە ئاواش هەموو ڕوداوێك ئیحتیمالیـە، و ڕووداوەکان لەنێوان (1، 0) بەکەوانەی کراوەش نەك داخراو بۆچی؟ مـادام هـیچ ڕووداوێك لەو جیهانە 100٪ محال نیەو 100٪حەتمیش نیە.

## سێیەم: زەوجی لە جوڵان

لەیەکەمـدا زەوجیمـان لەبەشـێك لـە پێکهـاتن دیارخسـت، ئـەوجارە بـەلای دۆزینەوەی زەوجی دەچین لە جوڵانەوە، ئـەویش لایەنـەکانی (دوورکەوتنـەوە نزیـك کەوتنە)، (خێرایی و وەستان)، (چەپ و ڕاست)، (سـەروو و خـواروو)... ئینجـا کاریگەری فاکتەری دەرەکی و ناوەکی لە جوڵاندا باس دەکەین، لەم ڕووەوە هەنـدێ موفەسـیر ئامـاژەی باشـیان بەلایـەنێك داوە و (الحرکـە و السـکون) وەك زەوجـی نیشاندراوە، کەلەگەڵ مەنهەجی ئەو توێژینەوە کەمێك نزیکە، هەرچی لەبەشەکانی تری فەلسەفە بەتایبەتی فەلسەفەی مارکسیزم و لەسەر دەستی ئەنجلس لـە کتـێبی (انتی دوهرنگ) و(دیالکتیك الطبیعة)باسي لایەنێکی گرنگی کردوە بە ئەدریسـێك دەڵێ (الحرکة نفسها تناقض-کة لةدواي بةدريذى باسي دةكـةين) بەڵام ئـەو نەچـووە زەوجـی لـێ بدۆزێتـەوە، بـەڵکو زیـاتر بـە فەلسـەفەی هیگـل دەچـێ کـە دەڵـێ (تنـاقض)ەکە لەوە دێت هەر تەنێك کە دەجـوڵێ لەسـەر خاڵێکـە لەهـەمان کـات لەسەر خاڵێکی ترە[1]، ئەوانە تەواو گـوزارش لـە(زەوجی) ناکـات، وەك لـەخوارەوە باسی زەوجی راستەقینە دەکەین.

[1] فريدريك انجلس -انتي دوهرنغ- ترجمة: فوئاد ايوب، ط1 1965ص101 و ص144-145.

1-لەمەكانی (دوركەوتنەوەو نزیكبوونەوە): لەهەر خـاڵێكی سـەر ئـەو زەویـە دەسـت بەجولـە بكـەین بـەرەو هـەر ئاڕاسـتەیەك ئـەوە لەیـەك كاتتـدا پرۆسەوجولەیەكە دوركەوتنەوە و نزیك بوونەوەیە لەهەمان هەنگاودا، كاتێك لەشاخێكی وەك جودی بتەوێ بچیە ئازەربیجان بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێ دەكەوین لەسەرەتادا وا دەردەكەوێ بە ڕوون و ئاشكرایە دوركەوتنەوەیـە، كەچـی بـە حیسابێكی زۆر سادە دەردەكەوێ كە ئەوە نزیك بوونەوەشە لە جودی.

ڕەنگە ئەو هەنگاوەی دوركەوتنەوە لە شاخی جودی تا نزیك ئـەمریكا ڕوون نەبێ چۆن نزیك بوونەوەیە لەوێوە هەر بەهەمان ئاراستەی ڕۆیشتن دەبینی وا بەرە بەرە ڕوو لە رۆژهـەڵاتی و پشـتت لـە ڕۆژئـاوا كـردووە، كـەواتا هـەر هەنگاوێكی جووڵە دوو گوزارشی جیای دژ بەیەك دەخوازێ، دەتـوانی بڵێـی 10 كم دووركەوتەوە بە ئاراستەی ڕۆژئاوا لەهـەمان كـات بـەو بـڕە نزیـك بۆتـەوە لـە رۆژهـەڵاتی هـەمان شـاخ بـەدەوری زەوی، واتـە هەرجولەیـەك دوركەوتنەوەو نزیك كەوتنەوەیە لە هەمان كاتدا، ئـەوەیان لەوفەرمایشـتەی ئیمامی علی نزیكە كە دەڵـێ(رب بعیـداقرب مـن قریـب، وقریـب ابعـدمن بعید)[1]، ئەوەیان بە ئاڕاسـتە جیاجیاكـانی چـەپ وڕاسـت و هـەمو لایـەك ڕاستە، ئەو ڕاستیە هەر زەوی ناگرێتەوە بەڵكو تەواوی بونـەوەر دەگرێتـەوە مادام ڕاستەهێل و تەختایی گەردونی نیە بەڵكو چەمانەوەیە[2].

لەو نمونە لایەكی تر لە زەوجـی بـەدەر لـە جوڵانـەوە دەدۆزیتـەوە، ئـەویش پەیوەستە بە مەكانی، واتا هەر خاڵێك لەسەر زەوی لەهـەر شـوێنێك پێـك نەهاتووە لەیەك دووری، بـەڵكو لەچـەندین لاوە بگـرە بـە بـێ كۆتـایی لـە

[1] الف كلمة مختارة-دار الأندلس ص88

[2] بڕوانە: اینشتاین والنظریة النسبیة-تعلیق:د محمدعبدالرحمن مرحبا، دارالقلم، ط8 ص135-، هەروەها كتێبی(الكون الأحدب).

ئاراســـتەی جیـــای دوو دژ، (دوور و نزیـــك) پێكهـــاتووە، وەك شـــێوازی ڕووتەختی دیكارتی ئاســا، واتــا ئەگــەر بمانــەوێ دوری جــودی بــۆ لەنــدەن گوزارش بكەین بە دوو ئاراستە دەكرێ، دەتوانین بلێین (X-هێندە)كم بــەلام بەئارستەی دژ (ڕۆژهەلات) (y-هێندە)كم دوورە (یان نزیكە)، كــەواتا هــەر خالێك لەسەر زەوی بە ئاراســتەی چــەپ و ڕاســت بــە ئاراســتەی ســەروو و خــواروو، بـــە ئاراســـتەكانی نێـــوان ئەوانـــە دوو دووری یـــان دوو نزیكـــی هەلگرتووە، ئەوەیان بۆ گەردوون و تەواوی بوونەوەرە.

2- زەوجی لە فاكتەری دەرەكی و ناوەكی بــۆ جــولان: وەك لــە پیشــوو باســمان كردلە تێكرای جولانەوە (6) جۆر بەدی دەكرێ:

(1-جولانەوەی میكانیكی 2-جولانەوەی جیۆلۆجی
3- جولانەوەی كیمیایی 4-جولانەوەی بایۆ لۆجی
5-جولانەوەی كۆمەلگە 6-جوولانەوەی فكری ).

سێ پۆلی یەكەم جمو جۆلی سروشتیە، زۆر جیایە لەگــەلێ (3) جولانەكــەی تــری ژیانی، هەروەك لە فەلسەفەكانی هیگل ومارکیسزم و باقی هاوتاكــانی تــر بەیــەك چاو تەماشای كردوون، لە كاتێكا (تناقض)ی كردۆتە یاسا بۆ جولێنەری سروشت و كۆمەلگە و فكر وەك فاكتەری ناوەكی، كەچی نــاتوانن یــەك نمونــە لــەو سروشــتە بهێنێتەوە كە (وەسف ومەرجی تناقض) هەلگرێ[1]، ئینجا جولەو (تەتەور-گەشــە) لێك جیــان، جولــەی سروشــتی بازنەییــە لــە شــێوەی (ئاوشــلە-هــەلم-ڕەق-ئــاو) (مریشــك-هێلكــە-جوجكــە-مریشــك)..، واتــە لــە سروشــتدا نــە گەشــە هەیــە نە(تناقض)، چ جای (دژ) كە بــە گوزارشــتی ئــەوان پلــەی بــەرزی(تنــاقض)ە، لــە

[1] لە زۆربەی كتێبە ماركسیەكان مەرجی دیالكتیكی تێدایە بەلام ماوتسی تۆنگ لە(**حول التناقض**) لەهەموان ڕوون ترئەو دوو مەرجەی نوسیە:1-هەردوولای (**تناقض**)مەرج بن بۆ یەكتر2-جێی خۆیان بگۆڕنەوە.

جولەی کۆمەڵگەدا (تناقض) هەیە بەڵام ئەو مەرجانەی دیالێکتێك ناهێنێتە دی، ئەوەی دەهێنیتە دی فاکتەری دەرەکی وناوەکیە.

ئەوەی ئێمە لێرە باسی دەکەین بریتی نیە لە دۆزینەوەی دینەمۆی جولە و گەشە، بەڵکو دۆزینەوەی (زوج-دژ)ی کاریگەری فاکتەرەکانی دەرەکی و ناوەکیە لەکاتی جولە، بۆ ئەو مەبەستەش دەتوانین ئەو (6) جۆرە جوڵانەوەی لە پێشدا دیاریمان کرد بە سیستەمی تر گوزاشت بکەین، دەتوانین بڵێین بریتین لە:

**یەکەم** جولەی لەجۆری (گواستنەوە) وەك بەردێك دەگوازرێتەوە لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر، زیاتر جوڵانەوەی (یەکەم و دووەم) دەگرێتەوە.

**دووەم** جوڵانی چەندایەتی وەك زیاد بوونی ژمارەو بڕو نەشونمای جەستەیی و..بێ ئەوەی خۆی گۆڕانی بەسەر بێت، ئەوەیان جوڵانەوەی زیندەگیشی پێ دەوترێ، لایەك لە جوڵانی(سێ یەم و چوارەم و پێنچەم )دەگرێتەوە.

**سێ یەم** جوڵانی چۆنایەتیە، ئەو جۆرەیە کە گۆڕان و گەشە بەسەر خودی ناسنامەکەی دێت، لە جۆرێکە بۆ جۆرێکی تر دەگۆرێت، لە هێلکەوە دەبێتە جوجکە، لە نەفامەوە دەبێتە فیلسوف ئەوەی شەشەمیش دەگرێتەوە.

دەبێ کەمێك بگەڕیینەوە بۆ بابەتی جوڵانەوەو ئەو ریسایانەی تۆمارمان کرد، لە بارەی گۆڕانی ڕۆلی فاکتەری دەرەکی وناوەکی لە ڕەوتی گەشەی جووڵەی هەر تەنێك، دەرکەوت فاکتەری دەرەکی لە یەکەمەوە زۆر بەهێزە، بەرە بەرە تا بەرەو جوڵانەوەی شەشەم (یان بەرەو چۆنایەتیەکە) بڕۆین ڕۆڵی فاکتەری دەرەکی کەم دەبێتەوەو ڕۆلی فاکتەری ناوەکی زیاد دەکا، بەڵام لە هەموو بارەکان ڕۆلی (فاکتەری دەرەکیەکان) کۆتاییان نایەت، ئەو ڕۆلەش سانەوی نیە وەك فەلسەفەی مارکس وای بۆ چووە و دەڵێ: (لە هەموو بارەکاندا ڕۆڵی فاکتەری دەرەکی تەنها

سانەوی و-عامل مساعدە- نەك سەرەكی)[1]، هەرچی فەلسەفەی میسالیشــەدەڵێ تەنها ڕۆڵی فاكتەرە دەرەكیەكان گرینگــە، لێــرەدا هەڵوێســتێكی شــازی ســپینوزا هەیە هەرچەندە مادیشە بەڵام نكولی لە فاكتەری نــاوەكی دەكــاو دەڵــێ جوڵانــەوە تەنها بــە فاكتــەری دەرەكــی دیتــەدی[2]، تاڕادەیــەك شــوبنهاوەریش بــەو ئاڕســتە ڕۆیشتوە، لە ڕاستیدا هەردوو ڕۆڵ گرنگن هەرگیز لە هەموو بارەكاندا هەردوو ڕۆلی نــاوەكی ودەرەكــی لــە پلــەی (پێویســت) دانابــەزن، هــەم لــەو (6) سیســتەمەی جوڵانەوەی دیاریمان كرد هەم لە ڕێڕەوی گەشەی یــەك سیســتەمیش، نمونــەی ســانا گەشەی كۆمەڵگەیە، دەبینین لە سەرەتای كۆمەڵگە كاریگــەری فاكتــەری دەرەكــی وسروشتی یەكجار زۆربووە، بەرە بەرە لەگــەڵ گەشــەی كۆمەڵگــە ئــەم ڕۆڵــە كــەم دەبێتەوە ڕۆلی ناوەكی زیادی كردوە.

دەتوانین بلێین لەســەرەتا مــرۆڤ لــە ژێــر ئینتــدابی سروشــت بــوە بــەڵام ئیســتا تاڕادەیەكی چاك كۆنترۆلی سروشت كراوە، بەهــەمان شــێوە گەشــەی فكــریش بــەو شێوەیەوخەســت تریشــە، كەواتــە جوڵانــەوە چــیە؟جوڵانەوەوەك یاســای یەكــەمی میكانیكی زیاتر مانــای هــەر 6سیســتەمی جوڵانەوەیــە، كەبەفاكتــەری دەرەكــی دەست پێ دەكاو وەڵامی فاكتەری ناوەكی تەواوی دەكا، كەواتە لــە هــەموو جــۆرە جوڵانەوەیەك لەو بوونەوەرە ناكرێ و نابێ (زوج) ی كاریگــەری دەرەكــی و نــاوەكی نەبێ لەیەك كاتدا، لەوەی سەروو دەردەكەوێ بە گشتی بۆ جووڵەو گەشــە هــەردوو عامیلی دەرەكی وناوەكی بەكارن.

هەندێ نمونەی قوڕس تر بابەس بكەین بۆ ڕوون بوونەوەی ڕۆڵی هەردوو فاكتەری دەرەكــی ونــاوەكی، لــە هــەموان ســەخت تــر پرســی فەلســەفی (صــدفە)یە، كــە مەدرەسەی مادیەكان ووتیان ئەوە ڕوودەدا تەنها بە فاكتەری دەرەكی بێ بەشــداری

---

[1] مجموعة علماء السوفیت- المادیة الدیالكتیكیة ص275

[2] الفیزیاء والفلسفة ج1ص47

ناوەکی، کەچی لەسەروو ڕوونمان کردەوە کە فاکتەری نـاوەکیش لـەویش بەشـدارە، ئەوەی زۆر مشت ومڕی لەسەرە زیاتر بزری فاکتەری دەرەکیە.

وادیتە پیش چاو کاتیٚ ئۆتۆمبێلەك دەڕوا خۆی خۆی بڕوێنێت بۆیەش ناو نـراوە (خودڕەو) کوا کاریگەری فاکتەری دەرەکی؟ یان هێلکە لە ناوەخۆی گەشە دەکا بـۆ جوجکە کوا فاکتەری دەرەکی یەکە؟... لـەوەی ئۆتۆمبیلەکـە گـەلی زۆرە هـەموو چرکەیەك جولأنەکەی دەکەوێتە سەر کارو کاردانـەوەی پێچـکەکانی لەگـەڵ زەوی، ئینجـا بـە (سـوتەمەنی) دەجولێ...هـەموو میکانیکیـەتی (مەکینـە)و بـاقی دەزگاکانی بە فاکتەری دەرەکیە، هەرچی هێلکەیـە بـەهۆی (تلقـیح)و ئینجـا ئـاو هەوا پلەی گەرمی و شوێنەکەو ژینگە...هەموو ئەوانە فاکتەری دەرەکـین، ئەوانـە ئاسانن ئەوەی قوڕسە پرسی (خەون) وپەیوەندی بە واقیعە، چـۆن بزانـریٚ فاکتـەری دەرەکی بەشدارە چونکە خەون چڕتر و داخراو ترە لە نوسـتن، نوسـتنیش چـڕترە لـە چالاکی عـەقڵی، چالاکی عـەقلیش لە هەموو بوونەوەر چڕترە، لە پرۆسەو پرسـێکی تریش بەشیك لە ئاینیەکان دەڵێن لە خـەون ونوسـتن فاکتـەری دەرەکـی بەشـداری نامینێت..کەچی وەك لـەخوارەوە ڕوونـی دەکەینـەوە پرۆسـەی (خـەون) یـش بـیٚ فاکتەری دەرەکی ئەنجام نادریٚ (هەلبەتە زۆر بەکورتی).

**خەون وفاکتەری دەرەکی:** خەون دوای دوو پرۆسـەی دوورکەوتنەوەیـە لـە واقیـع، نوستن ئینجا خەون، بۆیە بەشێك پێیان وایە دابڕانە لە فاکتەری دەرەکی، لەپێشـدا دەبیٚ بزانین نوستن زیندەگیە، چونکە لایەنی (عـەقڵی ناوەکی- یان لا ارادی) لـەکار ناکەویٚ، دڵ و گەدەو سیەکان و.. کۆمـەڵێك ئەندام ودەزگای تر ئیش دەکەن، بـەلأم عـەقڵی ئیرادی چالاکی نامێنیٚ، ئا لێرەدا نهێنیـەکانی خـەون خـۆی مـەلأس داوە، نازانریٚ ئاخۆ پەیوەندی هەستەکان و عـەقڵ بە چ ئەندازەیەك کەم دەبێتـەوە، بـەلأم بە مسۆگەر ناپچڕێن، ئەگینا هەرمرۆڤێك بنوسـتابە بـە دەنـگ و بـانگ کـردن و

جوڵاندنیش بەخەبەر نەدەبۆوە، واتە پەیوەندی هەست و عەقڵ دەمێنێ، بەڵام بە لاوازی.

لەپێشوو باسێکمان کرد زیاتر دەردەکەوێ کەگەشەو کاری عەقڵی پێویستی بە فاکتەری دەرەکی و ناوەکی هەیە، بەجۆرێك فاکتەری دەرەکی بریتیە لە کارلێکردنەکانی واقیع لەسەر عەقڵ، لەرێی پێنج هەستەکانەوە، فاکتەری دەرەکی یارمەتیدەر بۆ بیرکردنەوەو تەعەقول واقیعی ماددیە، بەڵام فاکتەری ناوەکی نامادی و روحییە، ئیتر عەقڵیش رۆڵی (تۆنێلە رەشەکان-ثقوب السوداء) و (تۆنێلە سپیەکان) دەبینێت لەنێوان واقیع و روحدا، لەنێوان دنیای مادی و دنیای نامادی، عەقڵانیەت لە قۆناغی پێگەیشتن دارنینە لە واقیعی ماددی و هەستەکان زیاتر لە روحی نزیك دەبینەوە، هەڵبەتە خودی نوستن خۆی لەخۆیدا تارادەیەکی زۆر ئەو دابڕینەیە.. بۆیە لە ئایینی ئیسلامیشدا لە کاتی نووستندا سزاو پاداش نیە، واتە (مکلف نیە)، خەونیش لە نوستندا دیسان دۆخێکی تایبەت ترە لە دابڕان و پچڕانی لە واقیعی ماددی، بۆیە خەون تارادەیەکی زۆر بریتی دەبێ لە عەقڵێکی خۆبەخۆ (کە روحیەتە)، واتە گواستنەوەی زیاترە لە دونیای مادی بەرەو دونیای روحی، کەواتە ئەو خەونە چەندە قوڵ بێ واتە خاوەن خەونەکە چەندە نوستنەکەی قوڵ بێ و لە دنیا دابڕابێ زیاتر روحانی تر دەبێ، بۆیە لە زانستیشدا لە پاراسایکۆلۆجی خەون بەجۆری نوستنی قوڵ لێك دەداتەوە، تیایدا زەمەنیش دەگۆڕێ، چەند ساڵێکی خەون ناکاتە چەند چرکەیەکی واقیعی. کەچی ناتوانین بڵێین خەون تەواو دابڕانی روحە لە جەستە، ئەگەر وابوایە ئەوا خەونیش پەیوەندی بە چالاکی لەش نەدەما، نمونەیەکی زەق و خێرا، خۆ هەر لە خەون بینینا دەبینیی لەگەڵ ئافرەتێك دایەو تا ڕادەی جنسی لەدوای تەواوبوون هەر خەونەکە نیە بەڵکو دەبینیی کۆئەندامی جنسی بەتەواوی بەشداری کردووە تارادەی دەرچوونی

شەهوەت، ئەو نمونەیەش تاقانە نیە کە ناویان نـاوە (شـەیتانی)، بـەڵکو بـەرروونی چالاکیەکانی هەست لە خەون بەدی دەکرێ، یاخود دەکرێ بڵێین لە هەموو خـەونێك دا رەهەندی هەستی لیّ بەدی دەکرێ، ئەویش ئەو هەستەیە کە لـەکاتی نوسـتنیش بە هۆیەك لە هۆیەکانەوە تەواو لە چالاکی ناکـەوێ، ئـیرادی و نائیرادیەکـەی لیّـك جیانابێتەوە، بەنمونە ئەگەر زۆرت خواردبێ، یان زۆرت میز بێ، یان چاوت بێشـێ، یان دەستت کەوتبێتە ژێر خۆت..، هـەموو ئەوانـە لـە خـەونیش گـوزارش دەبـێ بەشێوەیەکی تر، بەڵام کەبەخەبەر هاتیەوە دەبینـی ئـەوە کاریگـەری لەشـت بـووە بوەتە خەون، هەموو ئەوانە دەسەلمێنێ کە خەون هـەر لـە چوارچـێوەی جەسـتەیەو مانای جودایی نیە، دابڕان نیە لە فاکتەرە دەرەکیەکان(هەست و واقیع)، واتـە روح جیانابێتەوە لەلەش وەك هەندێ زانای فیقهی وایان لیك دایتەوە، ئەگەر جیا بیتەوە مانای وایە خەون یەکیکە لەوپرۆسانەی بێ فاکتەری دەرەکـی ئـەنجام دەدرێ، جـار وایە لەکاتی نوسـتن نەخۆشـیەکت لیّ سـەرهەڵدەدا وەك چاوئێشـە، ئـیتر لەخـەوتا وادەبینی یەکێك دێت و مستێك لە چاوت دەدا، وادەزانن ئەوە لـە خـەوا دەسـتی لێوەشێنراوەو دەچنە لای پیاوچاك و جاروایە بۆلای جادوگەر و ئەویش دەیداتە پـاڵ ئەجندەو شەوەو دێو و شتی نادیـارتر.. کەچـی راسـتیە زانسـتی و فەلسـەفیەکەی شتێکی ترە، هەموو ئەوانەش یاسای خۆی هەیە کە لە هەستەوە دێ بـۆ مێشـك و لایەنی عـەقڵی وروحـی جەسـتەو ئـەو جـۆرە ئیسـتجابەی دەبـێ هێشـتا نـەمان دۆزیوەتەوە، بەڵام دەردەکەوێ خەونیش بی کاریگەری فاکتەری دەرەکی ئەسـتەمە، خەونیش دەکەوێتە نێو سیستەمی زەوجی، زۆر جۆرە زەوجـی، لەوانـەش بەشـداری فاکتەری دەرەکی و ناوەکی.

کەواتە لەم دنیایەدا هیچ پرۆسەیەك بە فاکتەری ناوەکی پەتی یان بـە فاکتـەری دەرەکی پەتی ئەنجام نادرێ، کەواتە (جووتە-دژ-زوج) لە جووڵەوگەشـەی ئاسـۆیی وستونی هەیە، لەسەر گۆڕانکاری چەندایەتی وچـۆنایەتی هەیـە، لەبەرئـەوەی لـەو

بونەوەرەش وەستان وستاتیك نیـە، هـەموی لەگـەڵ هـەموی لـە جولەدایە..ئـەوە دیسان لایەکی فراوان وگەورەی تری گەردوونمان دۆزیـەوە کەڕێسـاو یاسـای (زوج)ی دەیگرێتەوە.

## چوارەم: زەوجی لەناخی مرۆڤدا

لەوەی پێشـوو بۆمـان دەرکـەوت پێکهاتـە وجولـەی لەشـی مـرۆڤ وەك بـاقی پێکهاتەکانی تر زەوجیە، نێرایەتی ومێیاتی بەشێکە، لایەنی فیزیکـی وجەسـتەیی و پێکهاتەیش هەر زەوجیـە وەك لـە ئینجیلـی برنابـاش وەسـفێك لـەو شـێوەیەی پێکهاتەو ناخی مرۆڤ دەکا:

(5.. ووضع الله فيه النفس والحس بمثابة يدين لهذه الحياة 6 وجعل مثوى الحس في كل جزء من الجسد فتتسلط علي الحياة كلها 7 فبعد ان خلق الله الانسان هكذا وضع فيه نورا يسمي العقل ليوحد الجسد والحس والنفس لمقصد واحد وهو العمل لخد مة الله)[1] رسـالەکانی (اخـوان الصـفا)ش ژمـارە(30) بەناونیشـانی(مثنويـة الإنسان) دەڵێت: مرۆڤ پیك هاتوە لەدوودژی، جەستەی مادی ودەروونـی ڕووحـانی یەکەمیان بۆ دنیا کاردەکا ودوەمیش بۆ دوارۆژ هاتوە[2]، ئەوەیان تەنزیریش بوە بـۆ پاپـاو ئیمپراتـۆر: هـەروەك مـرۆڤ لـەدوولای مـادی وروحـی پێـك هـاتوە دەبـێ دەسەڵاتیش لەو دوولایە پێك بێت، ئاین وپاپا بۆ روحی ودوا ڕۆژ مرۆڤ و دەوڵەت و ئیمپراتۆریش بۆ جەستەو دنیای.

(باسکال) پێـی وایـە نـاخی مـرۆڤ دوو لایـە، زانیاریـە عـەقلیـەکان دەتـوانرێ بسەلمێنرێ، هەرچی زانیاریە دل ودەرونیەکانە ئەوا وەك باوەڕ دەبێ تەسلیمی بیت.

لە قورئان بەزەق تربۆمان دەردەکەوێ کەلە ناخیشیدا زەوجیە، لەدوو دژ (دیاد-

---

[1] الفصل الثالث والعشرون بعد المئة –اية 5و..

[2] رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء- رسالة رقم:30ص112-113

جووتە-زوجی) ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لاَ يَعْلَمُونَ﴾ پێك هاتووە:

**لایەنی یەکەم:** لایەنی دەروونیە (نفس) ئارەزووی زاڵ بوون و دەست بەسەراگرتن و تێر نەبوون و سنور بەزاندن و خوازیاری زۆر و تەمەلوك و جنس و دەسەڵات و خۆ دیارخستن.. (لأمارة بالسوء) لایەنی مادی و شەهوانیەکەیە کە زیاتر بەلای دڕندایەتی مەیل دەکا.. بەکورتی لایەنی سەلبی مرۆڤە.

**لایەنی دووەم:** بڕواییە، یان هەندێ جار بە (ئەخلاق) تۆماری دەکەن یان بەگشتی بە (عەقل)ی دروست دەری دەبڕن. وەك لە کۆنەوە لە جمهوریەی ئەفلاتون وا هاتوە: (..القوتان المتضادتان فی النفس، هما قوةالعقل وقوة الشهوانیة..)[1]، ئەو هێزە لەدژی بەرەی یەکەمەو لە جەنگدان، دەبتە هۆی ڕێ گرتن لەو داخوازیە بێ سنورانەی (دەروون)، ئەو دوو دەزگا دژ بەیەکە لەناخی هەرتاکێك هەردەم لە جەنگێکی بێ دانوستانن، بەشێوەیەك ئەگەر عەقڵی دروست بەتەواوی سەرکەوت ئەوا مرۆڤێکی میان ڕەوو ڕەووشتداری ئیجابی لێ دەردەچێ، ئەگەر دەروونیش سەرکەوت ئەوا مرۆڤێکی (هۆبز گۆتەنی) دڕندەی بەدڕەوشتی سەلبی لێ دەردەچێ، بۆیە (ح.ابوبکر) دەڵێت (طوبی لمن کان عقله امیرا، وهواه اسیرا.. ویل لمن کان هواه امیرا و عقله اسیرا).

بەکورتی هەموو مرۆڤێك لەو جیهانە لە نێوان ئەو دوو ئەنجامە دایە، واتە سروشت و تەبیعاتەکانیشی ئەوەستێتە سەر ئەنجامی ئەو جەنگە [2]، بە هۆی

---

[1] جمهوریة افلاتون (هـ س)ص137

[2] فارابی لە (کتاب الملە) دەڵێ: لەکاتی دەروون زاڵ بوون بەسەر عەقڵا ئەوا هەم کۆمەڵگایەکی نەفام وهەم سەرۆکەکەش نەفام دەبێت

نەدۆزینەوەی ئەو هاوکێشەیەی (زەوجی) لە ناخی مرۆڤ وەسفی زۆر هەلە بۆ مـرۆڤ کراوە، تا ئەو رادەیە بە گورگ ودڕندەووەسف کراوە، فرۆید دەڵێ تـەبیعات ونـاخی مرۆڤ بەقەبارەی چالاکی جنسی دیاری دەکرێ.

(شۆبنهاور) دەڵێت (الغريزة الجنسية هي توكيد الأكبر لإرادة الحياة[1])، ئـەنجلس دەلی بە بازاڕی، مەدرەسەی لیبرالی دەلی بە بەرژەوەندی، ناشیۆنالیزمەکان خـوێن و بەشێکیشیان نیشتمان وتەنانەت بەشێکیان (چینایەتی)دەکەنە ئەو بنچینەیە[2].

هەر لەسەر ئەو بنچینە ڤۆلتێر ووتی مێژوو بریتیـە لـە تۆمارگـای تـاوان[3]،... لەووەوە تیـۆری ڕەش بینـی زال دەبـی بەسـەر چاکسـازی ودیـاردەی فاشـی ونـازی وحوکمی دڕندەیی سەر هەلدەدا، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە هیچ کەسـێك سەداسـەد دەروون باز نیەوسەداسەدیش عەقڵی نیە، {ان الله خلق الانسان وركب فيه العقـل و الشهوة، وخلق الملائكة وركب فيها العقل، وخلق البهائم وركب فيهـا الشـهوة، فمـن غلب عقله على الشهوة فهو أعلى من الملائكة، ومن غلبت شهوته على عقله فهـو أدنى من البهائم}[4] (فەرموودە).

بەو شێوەیە هەمو مرۆڤێك لە ناخیدا زەوجیە لە چـاك وخـراب، ئـەو ڕێژەیـەی چاك وخراپیش چەسپاو نیە، ئیمان چەسپاو نیە، تەبیعەتی مرۆڤ چەسپاو نیە.. ئەو دۆزینەوەیە بەکارهێنانی گەلێ زۆرە بۆ چاکسازی تاك وکۆمەل وزۆر لای تر [5].

---

[1] كامل فواد -الفرد فی فلسفة شوبنهاور ص92

[2] ئەفلاتون: جیاوازی نێوان شاو و هاوولاتی گوایە لەو (متراجحه=**in equility**) هاتووە، شاکان عەقڵیان زاڵە بەسەر دەروون بەڵام هاوولاتی بەپێچەوانەوە..

[3] توینبی منهج التاریخ وفلسفة التاریخ ص7

[4] بۆیە لە قورئان کاتی مرۆڤی بەد بە ئاژەل دەشوبهێنێ بەوە ناوەستێ ودەلی :(..**كالأنعام بل هم اضل..**)

[5] ئەو زانیاریانە زیاتر لە (مەوسوعەی جودی )لە مادەی(ناخی مرۆڤ) وەرگیراوە.

## پینجەم : زەوجی لە هەموو شتێك

لەوانەی سەروو زۆر لای تری (زوج)ی نوێمان بۆ دەركەوت بە تایبەتی مرۆڤ بە جەستەو ناخەوە، مرۆڤیش جیهانە بچوكەكەیەو جیهانیش مرۆڤە گەورەكەیە هەروەك لەفەرمودەهاتوە[1]، كەواتە(دیوی مادی) هەموجیهان و بونەوەر زەوجین بە تاك وكۆوە، ئەگەر پێدا بچین دەبینین ئەو شێوە زەوجیە بە سیستەمی دژ بەیەك سەرتاسەرییە، بۆ هەر تەنێك ئاوا (زۆر و كەم) (سنوردار و بێ سنور)، (بەرز و نزم)، (گەرم و سارد) (سلبی و ئیجابی) (سالب و موجەب)، (نەرم و شل)، (دڕ و لوس)، (خێرا و وەستاو)، (پڕ و بەتاڵ)، (گۆڕاوو نەگۆڕ)، (بوون و نەبوون)... لێ كۆبویتەوە، تەنانەت تەواوی بوونەوەریش لە زەوجی مادی ونامادی، ئەمرو خلق، یاساو بوون، هۆو ئەنجام..پیك هاتوە، لەناویەك كیان وناسنامە كۆبووینەوە نەك وەك مەنهەجی تفسیری كلاسیكی، ئەوەی كێشەیە ئێمە جەمسەرەكانمان بە ڕوونی لە ڕووی واقیعی و بونی زاراوەی گوزارش كەمە..، لەگەرمی و ساردیدا دەبێ جەمسەرەكان بە گەرمی موتلەق (یان ساردی موتلەق) دەربڕین، بۆچوونێك هەیە پێ ی وایە بەفر و سەهۆڵ(یان پلە سفرەكان) جەمسەرن و لەگەرمیش ئاگر جەمسەری بەرامبەریەتی، ئەگەر وابێت ئەو كات چ جیاوازیەك دەمێنێ لەنێوان تەنێك پلەی گەرمی سفرو یەكێكی تر 20 پلە لەژێر سفرە و هەیە 273 پلە لەژێر سفرەوزیاتریش.. كەچی ڕێژەیەكی گەرمی لەخودی نێو بەفر و سەهۆڵیش هەیە، بەهەمان شێوە لەنێو ئاگر.

بەوشێوەیە تاریكی موتلەق و ڕووناكی موتلەق جەمسەرن، خێرایی موتلەق و وەستانی موتلەق...نیە، سنوری موتلەقیش لە نێوان ئەوانە نیە، بەشێك وا دەزانن ئەو سنورە دیارەی لە نێوان سێبەر ورووناكی لە بینایەك ئەوە ئەو

---

[1] وتزعم انك جرم صغير وفيك انطوى العالم الأكبر-فەرمودە-فی ظلال ج6ص3379

سنورەیە...کەچی نە ئەو سنورە نە پانتایــە سـیبەرەکە نــەپانتایی ڕووناکیەکــە دژ بەیەك نین(زەوجیەکە) ئەوە نیە، بەڵکو لە نــاو خــودی پانتــایی سـێبەرەکە ڕێـژەی ڕووناکی تیدایە، ئـاواش بـۆ پانتـایی ڕووناکیەکـە، لـە بـارەی خیرایـش هــەر بـۆ ڕوونکردنــەوە خێراتــرین تــەن دۆزرابێتــەوە خێرایــی ڕووناکیــە کــە لەچــرکەیەکدا 300000کم دەبڕێ، هەڵبەتە لەوە خێراتر گەلێ زۆرترە، خێرایی موتلەق زەمەنی تێدا نامێنێ، لەگەورەیی موتلـەقیش زەمــەن نـامێنێ، لـە موتلەقــەکان جووڵــەو زەمەن و هەمو حوکمێك مانای نامێنێ، کەواتا نەخێرایی موتلـەق و نــە گــەورەی موتلەق هەیە، هەمووی نیسبیە، بەهــەمان شـێوەش بـۆ وەسـتان، تەنانــەت ئــەو تەنانەی کە وادەردەکەون وەستاون کەچی لــەناوەخۆ و لــەدەرەوەش لــە جووڵــەدان، ئەگەر بتوانین هەموو جولەیەکی هەستپێکراوی تێدا بوەستێنین ئــەوا نــاتوانین ئــەو جولەیەی بوەستێنین کە زەوی لەگەڵ خۆی بەدەوری خۆیدا دەیسوڕێنێ.

قورئانیش لەشێوەی پرسیارێك ئەمەی وروژاندووە (وترى الجبـال تحسـبها جامـدة وهى تمر مر السـحاب...النمل-88)، بەو جۆرە لەهــەموو شـتێك زەوجـی هەیــە، هەندێکی دەزانین هەندێکیشی نازانین(..مما لاتعلمون).

تیبینیەکی گرنگ: ئێمە لێرە ووتومانە بۆ هەمو شـتیك زەوجـی هەیــە، دەبــێ خوینەر وورد بیت کەدەلێین شت، خلق، مادە،..چونکە پاش کەمێکی تر هــەر لــەو دنیایە ڕووبەڕووی سیستەمی نازەوجی دەبینەوە لە ڕەهەندی دوەمی بوونــەوەر کــە بریتین لە ئەمرو یاسای سروشتی وپەیام و..

**لەدوای ئەوانەی سەروو.. ئەو دونیایەی ئێمە چیە؟ دروستکراو چیە؟**

کەواتە لە پێناسەی (شت) ئەگەر بلێین "بریتیە لەکۆمەڵێك زەوجی دژ بەیەك"، یان ئەگەر پێناسەکەی (لینین) و ئەوانەی پیش خۆی ڕاست بکەینــەوە کــە دەڵــێ : شت بریتیە لە کۆمەلە (متناقضات)ێك، ئەویش لــە هیگلــی وەرگرتــوە کــەدەڵێت

(الحقيقة الكاملة انما هی تركيب من المتضادات )[1]، واپێدەچیٚ لە بنەچە ئەو ڕایە بـۆ فیساگۆرس بگەڕێتەوە، تەنها ئەگەر وشەی (تناقض) لە لینین لابـبـەین و لـەجیٚ ی (ضد) دابنێین، (حقیقەت) لە هیگل لاببەین -چونکە (حقیقەت) زەوجی نیـە- لـە جیی (شت) دابنێین ڕاست دەردەچیٚ[2]، وای بگۆڕین: کە(شت) بریتیـە (لەکۆمـەڵێك زەوجی دژ بەیەك )، ئەو وەك مارکسیەك وا لە (تنـاقض) گەیشتووە کە ناکۆکیەکە لەناو شتەکان گەشە دەکا و ناکۆکی تر جێگەی دەگرێتەوە بـە ناسـنامەیەکی جیـا لەوەی پێشووی، هەرچی (ضدین-زوج) وەك ناسنامە چەسپاوە لە شتەکان مەگـەر سنوری ڕێژەی نێوانیان جار جار بگۆڕێت.

ئەگەر (لینین) ئەو ئایەتەی (ومن كل شيئ خلقنا زوجـين) بزانیبایـە مەنهـەجی توێژینەوەکەی دەگۆڕاو گەورەترین دۆزینەوەی فەلسەفی ئەنجام دەدا، بە پشـت بـەو ئایەتە ئیستا بە مورتاحی دەتوانین بڵێین (شت-مادە -مخلوق) بریتیە لـە کۆمـەڵێك زەوجی دژ، ئەوەش سەرچاوەی بـوون وهاوسـەنگی وسـنورە، لـەبارەی هاوسـەنگی سەرتاسەری بونەوەر دەردەکەویٚ کە لەنێوان ئەو (زەوجیە) دژانـە: گـەرم و سـارد، خێرا و وەستان، شل و ڕەق،... هەزاران دۆخ هەیە، کەچی بۆ مەبەستی ژیـان شـت و مەکەکان، ئاو وباران و تۆخمەکان و نەرمی و شـلی و گـەرمی.. بەئەندازەیـەکی دیاریکراو هەن و دادەبەزێنرێن (وإن من شيءإلا عندنا خزائنه ومـا ننزلـه الا بقـدر معلوم -الحجـر 21)، گەورەترین ئەعجازە لەو گەردوونە، لەوەش زیاتر لە کۆتایـدا (محدودیە) ی بوونەوەر سەرچاوە دەگریٚ، بۆ هەمو شتێك سـنور دروسـت دەبـیٚ (ان الله بالغ امره قد جعل الله لكل شيء قدرا)[3].

---

[1] مدخل الی الفلسفة ص214

[2] لەسەرەتادا وا مەزەندە دەکریٚ کێشەکە لە تەرجەمەی رووسی ولاتینی بۆ عەرەبی بێت، بەڵام دوای بەدواداچوون دەردەکەویٚ کێشە لە زمان و تەرجەمە نیە کێشە لەجۆری تێگەیشتن ومنهجی توێژینەوەیە لە فەلسەفەی چینی ویۆنانی موفەسیران تا دەگاتە مارکسیەت.

[3] الطلاق-اية 3

تا ڕادەیەك شلنگ لە (الطبیعة..ماهی) بە جۆرێکی تر لەو کێشە گرنگەی پێچیتەوە بەڵام نەبوونی مەنهەجێك بە ئەنجامی نەگەیاندوە، ئەودەڵێ گەشەی سروشت شت وەك بەرهەم دێنێ ولە هەمان کاتدا و ڕێگریەکانی بەرهەم دێنێ[1]، دەیەوێ بلێ سروشت بەهەلەی بەرهەمەکانی خۆی سنوردار دەکا،.. ڕاستیەکەی وانیە ئەوە دەقاودەق ئەرکی وایە کەبەرهەم بێنێ بەپێی ئەو (ئیمکانیتەیە)و ئەوبەرنامەو ئەجندایەی، بەشەکەی تر ڕێگری نیە بەڵکو قەیدە تا بازنەداو هەریەکە ناسنامەی خۆی بپاریزی و سنور هەبێ (محدودیە) هەبێ کەلە بنەچەدا لە (زەوجی) دێت، ئەوەش دەرگای گەورە لە بەکارهێنانی ئەوبەشەی فەلسەفە دەکریتەوە بۆ پرسی یەکجار زۆر گرنگ، وەك لە بڕگەی داهاتوو باسی دەکەین.

## پیادە و بەکارهێنانی (سیستەمی زەوجی)

هەرچەندە فەلسەفە کەمتر توانیویەتی لە واقیعدا(بەکارهێنان و پیادە)ی هەبێت، بەڵام چونکە ئەوە بناغەی ئایەتێکی قورئانیە ئەوا سەرەنجام و بەکارهێنانی زۆری هەیە، وەك لەپێشوو هەندێکمان باس کردو لە بوارەکانی فەلسەفی و زانستی ئایینی و سایکۆلۆژیشی هەیە (لێرەدا ماوە نیە باسیان بکەین)، بەلاَم بەلای ساغ کردنەوەی پرسێکی فەلسەفی و ئایینی زۆر گرنگ دەچین، ئەویش لەژێر ڕۆشنایی ئەو توێژینەوە بزانین چی دەتوانین بڵێین لەبارەی پێناس وتوانا و زانیاری و سیفەتەکانی (خوا)، لەبارەی فۆرمی پەیوەندی بە دروستکراوەکانی، ڕاستەوخۆیە یان لەرێ ی دەستور و یاساوەیە، بۆ ڕاستەوخۆ نیە؟ پێکهاتن و بزوتنەوەی چۆنە؟ ڕێڕەوی لوگێکی ئەوەیە بیری لێ بکەیەوە یان بیر لە دروستکراوەکانی بکەیەوە...

[1] المثالیة الألمانیة ص253

پێش ئەوەی بچینە نێو ئەو بابەتە ئالۆزە و بۆ ئەوەی عەقڵ بتوانێ ئەوەی پێویستە پەسندی بکات، چەند سەرەنجامێکی توێژینەوەکەمان لەبارەی جەمسەرە بێ کۆتاییەکانی زەوجی باس دەکەین کە پەیوەندیدارە بەو بابەتە.

## سیفەتی جەمسەرەکان (بێ کۆتاییەکان):

بەکورتی سیفاتەکانی (زەوج-دوو دژ) بەکورتی ئەوانەیە:

1- دژ، زەوجی لەگەڵ هەریەکە لە:جیاوازی وناکۆکی وململانێ... لیك جیان.

2- دژەکان، زەوجیەکان لەدەرەوەی یەکتر نین لەناخی بوونەوە لەگەڵ یەکتر هەن.

3-هەریەکە بۆ ئەوەی تر مەرجی مان وبوونیەتی وبەتیکرایش گوزارش لە بوون دەکەن.

4-نەفی یەکیان یەکسەر ئەوەی ترە، پێچەوانەشی بە پێچەوانە.

5- سروشتی سیستەمی زەوجی وایە تا بەرەو سەرووله(سلم الترتيب)ی بوونەوەر بڕۆیت ئەوا زەوجیەکە لێك جیا دەبێتەوەو کیانی نیمچە سەربەخۆ وەردەگرن، وەك سیستەمی جنسی(نێرو مێ) لە مرۆڤ لیك جیاکرایتەوە لە هەندێ کرم لەیەك کیاندان لەدارودرەخت زیاتر..کە دەگاتە (جماد) سیستەمی زەوجی لەیەك کیانن (ئەوە ووردبوونەوەو توێژینەوەیەکی سەربەخۆی پێویستە).

6- ئەوانەن دروست کراو، زەوجی ودژ نیشانەی بنەڕەتی(خلق)ە.بەهەمویان: دیویك، ڕەهەندێ لە بوونەوەر پێك دەهێنن، رەهەندی دوەم (یاسای سروشتی وروح وپەیام وعەقلە)، ئەوانە زەوجی نین، لەهەمان کاتیشدا(خالق) نین، ئەوانە پەیوەندی نێوان دروست کراوودروستکەرن(کە لەدوای زیاترباسیان دەکەین)، ئەدی بوونی خودا لە نیو ئەوهاوکێشە قوڕسانە لە کێیە؟

بۆنزیك بوونەوە لەوەڵامی و سانا تێگەیشتن کەمێك پێویستیمان بە (بیرکاری بـاڵا) دەبێت، بەتایبەتی بڕە بیٚ کۆتاییەکان (**Infinity**) کە بە (∞) گوزارش دەکریٚ.

1- جەمسەری دژەکانی (زەوجی) مەبەست لیێیـان گـەورەی موتلـەق وگـەرمی موتلەق و خیٚرایی موتلەق...ئەوا ئەو جەمسەرانە لەبونەوەر نین، (شت) نین، هەروەك (∞) ژمارە نیە، پیٚناسی نیە لەبیرکاری، بۆیە وەسف کردنیـان زۆر زەحمەت دەبیٚ، ئەو جەمسەرانە ئەو سیفەتانەیان هەیە (گەورە و بچوك، زۆر و کەم، جولاٌن و وەستان) لەویٚ مانای نیە، هیچ پرۆسەیەك لەویٚ مانای نیە، ئەگەر بیرکاریانە گوزارش بکەین ئەوا:

∞+∞=∞، ∞-∞=∞، ∞جاران یان دابەش هـەر ∞، ∞ جـاران سـفر دیارنیە...هتد

واتا یاسا و ڕیٚساو جولەو زەمەن لەویٚ نیـە دەتـوانین بلـیٚین کۆتـایی بوونـە وجۆرە بوونیکی ترە، یان وردتر بلٚـیٚین وەسـفی (شـت-شـئ) یـان (مـاددی) هەلٚناگریٚ، بۆیە ئەو جۆرە پرسـیارە سەفسـەتائیانەلەو بابەتـەش پـیٚ وەلاٌم نادریٚتەوە، باش نازانین ئاخۆ خوای گەورە لەڕیٚ ی ئەو جەمسەرانە تەحەکوم لەسەر بونەوەر دەکات، یاساکانی سروشتی وبونەوەر لەویٚ یەك دەخریٚ، یـان ئەوێیە پەیوەندی خوای گەورە بەبونەوەر، کە دەلٚیٚ (ان الله یمسـك السـموات والأرض ان تزولا...) ئاخۆ ئەوێیە وای کردوە ئەو گەردوونە تیـك نـەڕووخیٚ بە هۆی (کیشی ناوەندی —جاذبیة المرکزیة) نیوتن وزانایانی دوای ئەویش بیٚ ئەوەی ئاگای لەو پرسیارەی نێو قورئان بێت لەبارەی کیشـی گـەردوونی (ان الله یمسك السماوات والارض ان تزولا ولئن زالتا ان امسکهما من احـد مـن بعده انە کان حلیما غفورا - سورة فاطر ایـة41) هـەوڵی داوە ئـەو نهێنیـە بدۆزیتەوە کە بۆچـی ئـەو گەردونـە لەئـەنجامی کیشـی سەرتاسـەری تیـك ناڕووخیٚ، زۆر وەلاٌم دراوە تا ئیسـتا وەلاٌمـی دلنیـایی نیـە،.. وا پیٚدەچـیٚ

وەلامەکە لێرەو لەو جەمسەرانەی (زەوجی-دژ) بدۆزرێتەوە کە نایەڵێ (کێشی گشتی) گەردوون تێك بڕووخێنێ، بەوەی کە چۆن کێشی ناوەندی دروست دەبێ ئاواش لێك دوورکەوتنەوەی ناوەندی دروست دەبێ، بەهەمان شێوە لێك کشانی گشتی گەردوونیش بەشێکی تر لە هێزی لێك دوورکەوتنەوەی پێچەوانەی کێشی ناوەندی دروست دەکا، بەو شێوەیە ئەو گەردوونە بە ئەستێرەو هەسارەوە بەبێ ئەستونگا وەستاون بەسەریەك دانارمێن.

لەبارەی پرسیاری ئەوەش ئاخۆئەو جەمسەرانە خالقن یان مەخلوق؟ڕەنگە لەدوای دەروازەیەکی تەسك بۆ ئەوە بکەینەوە.

2- لەلای بێ کۆتاییەکان جەمسەرەکانیش لەیەکتر نزیك دەبنەوە، (گەرمی موتلەق و جولە و شل وپۆزەتیف و...) لای(ساردی موتلەق وەستان و ڕەق و نێگەتیف..)، وەك بڵێی لێرە (ئەمروخلق )کۆدەبنەوە ،ڕەنگە تیگەیشتن لە پرسی(عرش) لێرە ڕوون بکرێتەوە ،کەتائیستا وازانراوە ئاخۆ عەرش بۆ شوینی حەوانەی خوا بێت، بەشیکی تریش ئەوە بەکفر دەزانن،هەردوولا یەکتریان تەکفیر کردوە تەنانەت هەندیکی تر فەرمانی کوشتنیان داوە وەك: (سمعت محمد بن صالح بن هانئ يقول سمعت إمام الأئمة أبا بكر بن خزيمة يقول: من لم يقر بأن الله على عرشه استوى فوق سبع سماوات وأنه بائن عن خلقه فهو كافر يستتاب، فإن تاب وإلا ضربت عنقه وألقي على مزبلة لئلا يتأذى بريحه أهل القبلة وأهل الذمة، ومن ينكر رؤية الله في الآخرة فهو شر من اليهود والنصارى والمجوس وليسوا بمؤمنين عند أهل السنة والجماعة)، لە (البدايە والنهايە) دەلیّت عرش

مەخلوقە[1] ..ئێ چۆن مەخلوق خالق هەلدەگرێ ؟مادام مخلوق بێت دەبێ زەوجیش بێت .کوا هاوتا زەوجیەکەی ؟کوا دژەکەی؟ نەخێر زۆر دوورە لەو جۆرە وەسفانە، (ن ربکم الله الذي خلق السماوات والارض في ستة ايام ثم استوى على العرش)کە لەدەرفەتیکی تر باسی دەکەین .

پێش ئەوەی یەکسەر بەلای تێگەیشتن وتوێژینەوە لەبابەتی(خوا) بچین دەبێ بیر لە زاتێك[2] بکەینەوە (بێ دژ- نا زەوجی) واتە بە دەروازەی ئەو بێ کۆتاییانە(∞).
واتە لە بوونەوەری خۆمان دەتوانین لە (چەمکی خوا)بگەین لە دەروازەی (نەبوونی زەوجی-نەبوونی دژ)، مەرج نیە تیگەیشتن بێت، ڕەنگە وەك (لادقەی هایزنبرگ) مەحالی تیگەیشتن بێت، دەبێ ئەوەش دیاری بکەین کە (نەبوونی زەوجی-نەبوونی دژ) تاکە دەروازەی توێژینەوەی خوایی نیە، ئینجا ئەوە نەخشە ڕێگەی توێژینەوەی ئەو بوونەوەرە بێت، بۆ دۆزینەوەی زانیاری (حودا) نابێت واتێبگەین ئەو بوونەوەرەی ئێمە تاکە دروستکراوی خوایەو هەر ئەو کارەی کردوە، هەروەك زۆربەی تیۆرەکانی باوەڕداران ولەبارەی (کون الساکن-قدم العالم) لەوە هاتوە دەلێن ئەگەر ئەو بوونەوەرە هەرەکۆن وئەبەدی وئەزەلی نەبێ مانای وایە خوا کارەکانی دواکەوتوە لەبەر کەم وکوڕی..ئەوەیان پاساوی ئەرستۆو ڕێبازە فەلسەفیەکەی بوە[3].

---

[1] ابن كثير –البداية والنهاية ج1ص26

[2] تێبینی ئەوە بکە (نالێین شتێك) دەلێین (زاتێك) لە ڕاستیدا ووشە نیە گوزارش لەو بابەتە بکا، زۆربەی ئەو ووشەو ڕستانەی لەو بابەتە (لەبابەتی خودا)هەلەیە، چونکە ئەو ووشەو ڕستەو چەمکانەی بەکاری دەهینین هەر قولاوی شت ومەکە، کەچی داوامان لیکراوە (ليس كمثله شيء)

[3] معالم الفلسفة الإسلامية ص66

سانت ئۆگۆستین(430-354)ز هەولی داوە وەلامی ئەو پرسیارە بەوە بداتەوە و دەلێ خوا بێسنورو بێ کات وموتلەقەو بیری ئێمەو خۆمانیش سنوردارو نسبین ناتوانین ئەو پرسیارانە بکەین ولەوەلامەکەش ناگەین[1]، ئەوە وەلامی سەدەی (5)ز ئیستا زیاتر لەوە دەتوانین بلێین مادام سیفاتی خوا (خلاق)ە ئەوابێ پایان جۆرە دروست کراوی هەیە لەهەریەکەیان بە جۆرە یاساو ڕێسایەك، کەلەوێ دیاری دەکرێ چۆن ئاسەواری خودا لە دروستکراوی دەدۆزرێتەوە..

## تەقەلای تێگەیشتن لەخوا بەدەر لەو ئایەتانە

تەقەلایەکی زۆر دراوە بۆ وەلامی پرسیارە نەمرەکانی مرۆڤی سەردەمە جیاجیاکان، سەبارەت بەچەندایەتی و چۆنایەتی خوا، لە گەورەیی وتواناو شێوەو ژیانی، هاوکارو هاوبەشی، زیاتر لەوەش بوون ونەبوونی، هەمو ئەو توێژینەوانەی بە لۆگیکی (شت-شیء-مادة-مخلوق) بۆی چوبێ بەدەر لە ئایەتی زەوجی و ئایەتی(لیس کمثلە شیء) نەیتوانیوە سەنتێك لە زانیاری لێ هەلکرێنی و گومڕابوە وەك پیشینەکانی خۆیان، ڕەنگە زاراوەوپەرەگراف و بیرۆکەی نوێیان بەکار هینا بێت، بەلام لە کۆتایدا پرسیارە کۆنەکانی سەردەمی سەرسامی یۆنانی وچینی وهندیان پێ وەلام نەدراوەتەوە، چەندین مەزهەبی فەلسەفی لێ سەری هەلداوە، عادەتەن کۆتایی بە نکولی لێکردنی هاتوە لە شیوەی فیۆرباخ گۆتەنی خوا مرۆڤی دروست نەکردیە بەلکو عەجزی بیری مرۆڤ فکرەی خوای خولقاندوە.

ڕەنگە ئەودەردە یەکەم جار بەسەر (کریتیاسی) گەورەپیاوی یۆنانی هاتبێ ووتبی خوا نیە بەلکو لە نەزانی دۆزینەوەی هۆی ترسەکان هاتبێ، ئەوە پوختەی ڕای مەدرسە فلسفیەکانی مادی کۆنە تا فیۆرباخ، فەلسەفەی مارکسیش بەمادیانە تەقەلای داو گەیشتە قەناعەتی : هەرچی هەیە بریتیە لە مادەی جولاو وەك لینین

[1] هنری تۆماس-بەسەر هاتە نەمرەکانی فەلسەفە ل115

گۆتەنی[1]، ئەوەش هەمان ڕای شوبنهاوەرو هولباخ ولایبنتزو.. کە لە بنەچەدا ڕایەکی کۆنی دیموکریتیس بوو کە وتبوی:(لا یوجدفی الکون غیر الذرات والفراغ)[2]

ئەنجلس دەڵێ دەتوانین لەو بوونەوەرەو نهینی ژیان بگەین بێ پەنابردنە بەر خوا، لینین زۆر سەرسام بوو بەو ڕایەی هرکلیت کە ووتبووی(بوونەوەر یەکەوکەسیش دروستی نەکردوە، هەرواش دەمێنێتەوە، بەڕێك وپێکی دەگۆڕێ) لینین ووتی ئەوەبنەماکانی دیالکتیکە[3] دورکایم بە پێی تیۆرە(گەلە کۆییەکانی) پێی وایە ئاین زادەی چالاکی کۆمەڵگەیە نەك غەیبی، زانستیش بە بیانۆی میتافیزیکی بابەتەکەو بەدەر لە تاقیگە خۆی لێ دوور خستۆتەوە، ئەگینا زانای ئەلمانی(ئەلویزو بنزل) دەری خست کەئەو تێگەیشتنەی گوایە جیهان بریتیە لە مادەی جولاو وانیە فیزیای نوێ پێی وایەمادەش زیندوەو دەزانی چ دەکا؟

ئەوەی تیبینی دەکرێ ئەو ڕێچکە فەلسەفانەی باسی خوایان مادیانە کردوە هەتا سەر بەیەك مدرەسەش بن هەر بەجۆری جیاجیا وەسفی خوایان کردوە، جاروایە بە پێچەوانەی یەکتریش، تەنانەت ئەوانەی کە کەمێك میان ڕەویش بووینە هەر کەوتوونە ئەو دۆخە، هەیانەبە (وحدە الوجود -ئەویش دوو بەشە وحدە الوجود المادی و وحدەالوجود الروحی) یەکەمیان باوەڕی بە بوونی نەبوە، هەرچی (وحدە الوجود)ی روحی ئەوانەن ویستویانە دان بە خودا بهێنێ بەڵام لە چوارچێوەی بوونەوەر ودروستکراوەکان، کریگارس دەڵێ مادەوشت ومەکەکان جەستەی خوان، لەوەوە هەندێ لە مەسیحیە رۆمیەکان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە بڵێن:ان یسوع هو الله قد جاء الي العالم[4]، یان وەك نەستوریەکان بلین مسیح نیوەی مرۆڤەو

[1]لینین —مؤلفات ص162

[2] الفلسفة والفيزياء ج2ص60

[3] ملاحظات فلسفية- ط روسية ص318

[4] ئینجیل برنابا-فصل 91

نیوەکەی تری خودایە، تالیسیش شیوەکی وادەلــێ هــەمو شــتێك بــوونی خودایــە، ئەوەیان ئەسلیکی مسیحی هەیە لە قاموسی مسیحی راستەوخۆ تر وای باس دەکا (.. **إذ هو دائـم الوجـود في كـل مكـان** (مـز 139 : 7 – 10، إرميـا 23: 23 و24).

ئەرستۆ دەڵێ زنجیرەی بوون لە مادە دەست پــێ دەكــا بــەرەو ســەروو دەڕوا تــا دەگاتە خودا[1]، ئەوەش بە شێوەیەك لەگەڵ فەرمودەی ترتیبی ئاسمانەکان وعەرش و خوا لەسەر عەرش لیك نزیکە.

عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه قال: ما بين السـماء إلى الأرض مسـيرة خمسمائة عام، وما بين كل سماء إلى الأخرى خمسمائة عام، وما بين السماء السابعة إلى الكرسي مسيرة خمسمائة عام، وما بين الكرسي إلى الماء مسيرة خمسمائة عـامٍ، والعرش على الماء، والله على العرش ويعلم أعمالك، وقال ابـن مسـعود رضـي الله عنه أيضاً: أنه فوق العرش لا يخفى عليه شيء من أعمالكم. قال أبو القاسم: يريـد فـوق العـرش لأن العـرش آخـر المخلوقـات لـيس فوقـه مخلـوق، فـالله تعـالى أعلـى المخلوقات دون تكييف ولا مماسة[2].

ئەو زانیاریانە بۆ ئەو سەردەمە لە ڕوانگەی زانستی ئەکادیمی وشەرعی وئینجـا فەلسەفی بەدەیان پرسیاری بێ وەڵامی بۆ دروست دەبیت، واتە پەیوەندی خودا بــە خلقی خۆی –عرش- بۆ حەسانەوەیە، واتە لەڕێی امــر نیــە، ئــەدی پــیش ئــەوەی ئاسمانەکان دروست بکا ئەوا خوا بێ لانە بــوە، هــەمو ئەوانــەو ڕایەکــەی ئەرســتۆ پرۆتۆگراس و ئەوانەی خودا لەچوارچێوەی مکانی لەسەرووی هــەموان ڕێــز دەکــەن بەشیکن لە تێڕوانینی (وحـدە الوجـود)ی روحیــە، لەوانــە وەســفی خــودا لەلایــەن

[1] المعتقدات الدينية لدى الشعوب ص60

[2] ابن قيم- اجتماع الجيوش الإسلامية ج1ص37، ص43 پیویستە شارەزایانی (علم الحديپ)ن پیداچوونەوە بۆ ئەو جۆرە فەرمودانە بکەنەوە.

(عبدالحق الأشبيلي -سەدەی 7)ڕەنگە لە هەموان جوان تر هاتبێ کەچی هەلەشە، وا هاتوە: (إن الخالق والمخلوق هو مجموع المادة والصورة وأن ما يخص الخالق تبارك وتعالى من ذلك هو المادة وأنه بدون الصورة لا صفة له وفي هذا يقول: ((وللمتصور من حيث هو لا من جهتها -أي بدون الصورة- لا وصف ولا نعت ولا اسم ولا رسم ولا حد وإن كان له شيء من ذلك كله ولكن بأول مرتبة صورية إطلاقية فله الاطلاقات الأحدية ))[1].

بەشیکی زۆری فەیلەسوفان لەوەسفی خوداو پەیوەندی بەسروشت سەریان لە (وحده الوجود) دەردەچوو، لە ئەرستۆوە تا دەگاتە هیگل، نەك لەوسەردەمە لەو سەردەمیش وەلأمیان درایتەوە لەوانە (اخوان الصفا) دەلێن هەیە خوای پێ وەك کەسێکی بەهیزدیتە پیش چاو، یان لەسەر عەرشە یان لە ئاسمان..دەلێ ئەوە بۆچوونی عامی ونەشارەزایانە[2].

زۆر جۆرە ڕای تر کە لە پێشوو تر ڕای (ئیجابی وسەلبی) مادی ونامادیمان تۆمارکرد سەبارەت بە دروستکەرودروستکراو، ئەوەی مایەوە تەنها دەقی ئاینی (پەیام) لەو بارەیەوە وەسفی ڕاستی کردوە، جاروایە عەقڵی مرۆڤی ئاینیش بە هەڵە داچوە ئەگەر ڕاستەوخۆ لەژێر دەقی پەیامی دەرچوو بێت.

هەروەك لەئینجیل و تەورات لەدەیان شوێن باس لە خودا وەك (مەخلوق) بەوەی خواش دەست و پێ و توڕەبوونی هەیە، یان باسی ڕۆیشتن وگواستنەوەی دەکەن وەك لەهەندێ ئایەتی تەورات هاتوە:**(الرب يتعب ويحتاج الراحة )**، **(صوت**

---

[1] شيخ الإسلام ابن التيمية- بغية المرتاد..ص419. هقروةها بروانة: الأعلام ج3ص280
[2] من رسالة اخوان الصفاء رقم:21ص99

**مشي الله )، (السحاب هو غبار رجل الله)** [1]، ئینجیلیش بە باوك ناوی دەبا(فتقدم الیه المجرب وقال له ان كنت ابن الله فقل ان تصیر هذه الحجارة خبزا)[2].

لە بارەی وێچواندنی خودا بە دروست كراو هەلەیەكی قوولّە لە برگەی داهاتوو دەردەكەوێ، لەبارەی باوك بوونی خودائەوە هیچ ئەسلێكی پەیامی نیە بەلّكو لەكاتی خۆی سەربازەكانی رۆمانی ئەو كێشەیەیان بۆمسیحیەكان ووروژاند هەروەك لە ئینجیلی برنابا ئەو نهێنیە گەورەیەی ئاشكرا كردوە[3].

لەلای هەندێ مەدرەسەی ئیسلامیش لێی بە هەلّەدا چووینەو بە مەخلوقیان چواندوەو ویستویانە گەورەی بكەن كەچی زۆر بچوكیان كردۆتەوەو هەروەك ئەو ئایەتانەی ئینجیل وتەورات ماندووبوەو شەرمی لە بەشەر كردوەو شوینی حەسانەوەی ویستوەو وجولاوەو..، تەنانەت ئیمام شعرانی دەلّێ مردنی مەولاناشمس الدین الحنفی لەلایەن خواوە بە راوێژی خۆی بوو، خواو مەولانا رێك كەوتن ئینجا فەرمانی مردنی هات[4].

بەو جۆرە زیاتر وێچوونی خودا بە مەخلوقی لە بوونی چاوو وگوێ وجەستەو جوولّەوشەرم(شەرم كردنی لە ح.ئەبوبكر) وهەبوونی دەست..زۆربەی ئەوانە لە ئەسلدا لە تەورات وا هاتوە:(لأَنَّ فِي يَدِ الرَّبِّ كَأْسًا وَخَمْرُهَا مُخْتَمِرَةٌ.. )[5]، لەوەش

---

1سفر الخروج (31 : 17 )، سفر التكوین(3 : 8 ) سفر ناحوم (1 : 3).

[2] كتاب المقدس –العهد الجدید، انجیل متی(مت 4: 3 )

[3] ئنجیلی برنابا (الفصل الحادي والتسعون ) یەكتەم ئایەت تائایەتی 6وا هاتوە: (1وحدث في هذا الزمن اضطراب عظیم في الیهودیة كلها لأجل یسوع 2 لأن الجنود الرومانیة أثارت بعمل الشیطان العبرانیین قائلین : ان یسوع هو الله قد جاء لیفتقدهم 3 فحدثت بسبب ذلك فتنة كبري حتي ان الیهودیة كلها تدججت بالسلاح مدة الأربعین یوما فقال الابن علي أب وأخ علي الأخ 4 لان فریقا قال _ " ان یسوع هو الله قد جاء الي العالم " _ 5 وقال فریق أخر : " كلا بل هو ابن الله " 6 وقال اخرن : " كلا لأنه لیس لله شبه بشري ولذلك لا یلد بل ان یسوع الناصري نبي الله

[4] طبقات الصوفیة ج2ص66

[5] سفر المزامیر 75: 8

(ح.مسيح) زۆر بە توندی وەڵامی داینەوە وەك لە ئینجیلی برنابا ڕوون کرایتەوە: فإذا كان لله يدان فله اذا شبه بالبشر. أجاب يسوع : " انك لفي ضلال يا متي..[1].

یان دەڵێن ئادەم لەسەر شێوەی خوا دروستکراوە[2] وفي حديث ابن حاتم عن النبي (ﷺ) قال إذا قاتل أحدكم أخاه فليجتنب الوجه فإن الله خلق ادم على صورته، ئەوەش لە ئەسلدا لە تەورات هاتوە(فخلق الله الانسان على صورته.على صورة الله خلقه.ذكرا وانثى خلقهم) [3].

ابن تیمیە لە کتێبی (درء التعارض العقل والنقل) وەك ئەبو حەسەنی ئەشعەری لە بارەی ویکچووی سیفاتی بەشەری وسیفاتی خودا دەڵێ:(.. فقد ذكر القرآن جميع الصفات الإلهية التي وصف الله بها نفسه من العلم و القدرة و العلو و الاستوا..) ئەو نەیتوانیە ئەوە لیك بداتەوە کەسیفاتەکانی خودا موتلەقەو ئەو سیفەتانەی بەشەر نیسبی و سنوردارە لە چوارچێوەی (انی جاعل فی الأرض خليفة) پێی داوە.

بەشێکی تر جووڵەو مەودا وئاڕستە بۆ خودا دیاری دەکەن، ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەینە ئەو فەرمودەیە: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ قَالَ:يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ فَيَقُولُ مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ..[4]، هەرچەندە(اخراج)ی گەلی زۆرە وەك لە پەراوێزەکە تۆمارکراوە بەڵام بە ووردی دەردەکەوێ ئەو عەقلەی ئەو گوفتەیەی لێ دەرچوە نەیزانیوە لەلایەکی زەوی

[1] ئنجیلی برنابا-فصل 105 ئایەتەکانی 11 و12

[2] بروانة:شرح العقيدة الواسطية لشيخ ابن التيمية- شرح علماء: هراس وابن عثيمين، ابن فوزان-دار ابن جوزی قاهرة ص70-، 303-

[3] سفرالتكوين-اصحاح 1 ئایەتی27

[4] أخرجه مالك (1/214، رقم 498)، وأحمد (2/487، رقم 10318)، والبخاري (1/384، رقم 1094)، ومسلم1/521)، رقم 758) وأبو داود (2/34، رقم 1315)، والترمذي (5/526، رقم 3498). وابن ماجه (1/435، رقم 1366).

شەوە لاکەی تری ڕۆژەو خوای گەورە لە شەوی کام لای زەوی دادەبەزێ[1]، ئینجا لەو کاتەی لەمدینەو شام (ثُلُثُ اللَّيْلِ )ە لە پاکستان ڕۆژ هەلاتوەو لە ئەندەلوس نیوە شەوە، هەمان ووردبوونەوە بۆ ئەو مشت ومڕەی لەبارەی ئەوەی کراوە ئاخۆ یەکەم جار شەو دروست بوە یان رۆژ!

(كان الابتداء أبالليل أم النهار فإن العلماء اختلفوا في ذلك فإن بعضهم يقول إن الليل خلق قبل النهار ويستدل على ذلك بان النهار من نور الشمس فإذا غابت الشمس جاء الليل فبان بذلك أن النهار وهو النور وارد على الظلمة التي هي الليل وإذا لم يرد نور الشمس كان الليل ثابتا فدل ذلك على أن الليل هو الأول وهذا قول ابن عباس) [2] هەمو ئەوانە نەبوونی زانیاریە لە بارەی خڕیەتی زەوی کە شەو رۆژ تیایدا نسبیە، دووبارە ئەوانە لە عەقلیك هاتوە كە نەیزانیوە لایەك شەوەو لایەك ڕۆژەو زەوی خڕەو دەسوڕێ، ئەوە تیگەیشتنی فەقیهی ئاینیە نەك دەق، ئەو فەقیهانە ئەگەر ئاوا لەگەڵ فەلسەفەو عەقلانیەت دژ نەبوونایە تووشی هەلەی ئاوا ترسناك نەدەبوون، فیساگۆرس لەسەردەمی خۆی زانیویەتی کە زەوی ناوەند نیەو بەڵکو هەسارێکە دەسوڕێتەوە بەدەوری ئاگرێك، بەلام ئەو(وەك ئەرستۆ) دیاری نەکردوکە رۆژ بیت[3].

لەوەوە وا پێدەچێ سەرچاوەی ئەو زانیاریەی پەیام بوو بێت بە تایبەتی خۆی قوتابی (ح.سلیمان) بوە، ئەلبیرۆنی ویاقوت حموی وزۆری تری زانای ئاینی

[1] عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ص): (إن الله يمهل حتى إذا مضى شطر الليل الأول أمر مناديًا فينادي أن ربكم يقول: هل من داع فأستجيب له.. ) ئەوەش هەمان کێشەی هەیە، واتە خوای گەورە بەلایەکی دنیا سەرقالە لاکەی تری فەرامۆش کردوە، لەلای هەمومان هەرچی فەرمودەی ڕاستەقینە بێت باوەڕمان پێی هەیە، ئەوە بە جێ دێلین بۆ پسپۆری تایبەتی خۆی.

[2] تاريخ الطبري ج1ص21

[3] ارسطو-السماء والعالم ج2 فصل13 ص265 – ئەنجلس لە کتیبی(ديالكتيك الطبيعة ص214) لیی وەرگرتوە.

زانیویانە ئەو جۆرە زانیاریانە هەلەن، ئـەلبیرۆنی بـە بیرکـاری و(سـاین وکۆسـاین) نیوەتیرەی زەوی دۆزیتەوە..ئاوا زانیاری هـەبوە. ئینجـا دابـەزینی خـودا بـە پێـی زەوجی و ئایەتی(لیس کمثله شـیء)جولاَن وبە جێهێشـتن و پیـادەکردنی یاسـاکانی میکانیکیە، بۆیە ئـەو فەرمودەیـە تـەخریج و ووردبونـەوەی تـری پێویسـتە، لـە بنەچەدا لەو جۆرە دابەزینەی خوا بۆ سەر زەوی لەلایەن تەوراتەوە هاتوە:

1-(وَأَتَى اللهُ إِلَى لاَبَانَ الأَرَامِيِّ فِي حُلْمِ اللَّيْلِ وَقَالَ لَـهُ: «احْتَـرِزْ مِـنْ أَنْ تُكَلِّـمَ يَعْقُوبَ بِخَيْرٍ أَوْ شَرّ (2-(فَأَتَى اللهُ إِلَى بَلْعَامَ لَيْلاً وَقَالَ لَهُ: إِنْ أَتَى الرِّجَـالُ لِيَـدْعُوكَ فَقُمِ اذْهَبْ مَعَهُمْ، إِنَّمَا تَعْمَلُ الأَمْرَ الَّذِي أُكَلِّمُكَ بِهِ فَقَطْ )[1].

هەمو ئەوانەو(عەرشی خوداله ئاسمان) وایان کردوە کە ناوی خوا دێت خەڵکی تەماشای ئاسمان بکەن، بوونی خودا لە ئاسمان لە کتێبی پیرۆزی ئینجیل وتەورات وزەبوور دەبینرێ :(الله من السماء اشرف على بني البشر لينظر هل من فاهم طالب الله)[2]، تا ئەو ڕادەی خوا لە ئاسمان بچوك تر دەرکەوێ، لە ئینجیلی برنابا وورد تر هاتوە (فقال حينئذ بطرس : يا معلم لابد ان تكون الجنة أكبر من الله لأن الله يري داخلها، أجاب يسوع : صه يا بطرس لأنك تجدف علي غير هدي)[3]، **ناحەقی بگرس نەبوە ئاوای ووتوە مادام خوا لە ئاسمان بێت ولەزەوی نەبێت مانای وایە ئاسمان لە خوا گەورەترە، (یسوع)بەتوندی وەلامی (بطرس) دایتەوە کە هەلەیە،بەلام نەبوە چارەو هەر بەردەوام بوون لەوەی شوێن بۆخودا ئاسمان دیاری بکەن ، لە (قاموس الکتاب المقدس ) شوێنی خودای لة ئاسمانی روحی دیاری کردوة نةك ئاسمانة هیویلیةکة(.وهناك السماء الهيولية والسماء الروحية, ...أما**

[1] سفر التكوين 31: 24، سفر العدد 22 : 20

[2] كتاب المقدس- مزمور 53: 2

[3] انجيل برنابا – فصل 78 اية 11-12

**السماء الروحية فهي مسكن الله الخاص)**[1]، ئەو جۆرە بەندکردنەی خودا بە (مەکان) پێچواندنە بە مەخلوق، ئەگەر خوا لە ئاسمان بێت ولە زەوی نەبێ مانای لەهەندێ شوین هەیەو لەهەندێ شوین نیە ناچارە بۆی بگەڕێ ودووری ببڕێ،مانایەکی تر ئەوەیە لەو گەردوونە جێی خوا دەبێتەوە ،واتە گەردوون لە خوا گەورە تر دەبێت ، هەموی چەوتە، وەك ئیمام غزالی وەلاَمی داینەوەو دەڵێ:کما أن الله ليس خارج العالم ولا داخل العالم وكذى الملائكة..، ابن سیناو کندیش دەڵێن لە خوا ناپرسرێ لەکێیە پرسیاری مکانی وزەمانی لێ ناکرێ[2]، شاعیری گەورەی کورد(مولوی)دەلێت:

**فكل مانبصرة وماتسمع   وكل مافى وهم علم يقع**

**وكل خاطر جرى ببالك   فربنا على خلاف ذلك**

زۆر جوانە چۆنت بەخەیال داهات چۆنت هاتە پیش چاو خوائەوەیە کەوانیە ،(ولیام ئۆکام)یش ئاوا ووتی عەقلی بەشەری توانای پیناسی خوای نیە ، خۆ ئەگەر خوا لەئاسمان بێت ئەوا پیش ئەوەی ئاسمانی دروست کردبیت لە کێ بوە؟ وەك ئەو پرسیارەی (لە ئیمام ئەحمەد دەگێڕنەوە)لە پیغمبەر (د خ)کراوە ئایا خودا لەپیش دروست کردنی گەردوون لە کێ بوە ؟وەلامەکەی بەفەرمودە:(كان فى عماء مافوقه هواء وماتحته هواءثم خلق عرشه على الماء)هەرگیز نابێت وابێت ،ئەو فەرمودەیە دانراوە یان گۆڕاوە ،هەر خودی پرسیارەکە (لەکێی بووە؟)لە نۆ پیت پیکهاتوە زیاتر لە 100 هەلەی تێدایە ،توخمی زەمانی ومەکانی هەیە بۆ خودا ناکونجێ، ئینجا مادام سەرووی وخوارووی هەوا بێت مانای سنورداره ،هەرنابێت ،ئەوە بە تێڕوانینی عەقڵی دونیایە کە خوا ئەو بوونەوەرەی بۆ خۆی دروست کردبیت تا لێی بحەوێتەوە

---

[1] قاموس الكتاب المقدس –دائرة المعارف الكتابية المسيحية–مادة:سماء

[2] د. سعود بن عبد العزيز الخلف- قول الفلاسفة المنتسبين للإسلام في توحيد الربوبية –المبحث الأول ص13-

وەك لەنێو هەر سێ ئاينيش ئەوە باو بوە(لە كوردەواريش دەڵێن: خوادنياى بۆ سەيرانى خۆى دروست كردوە)،لە (البدايە والنالنهايە) وەسفيكى ترى خودا دەكا جێى سەرنجە،خودا ئەوەيە:(فكل ماسواه تعالى فهو مخلوق له)[1]،ئاميدى فەيلەسوفيش لە پيناسى (العالم)وادەلێ (واما العالم فعبارةعن ما غير الباريء سبحانه وتعالى ،من الموجودات)[2]، ئەوەش تەقەلايەكى زۆر گەورەى وەسفى خودايە كەچى زۆر هەلەيە ،پيچەوانەى ئەو فەرمودەشە(...أنت الأول فليس قبلك شيء وأنت الآخر فليس بعدك شيء - رواه مسلم). ،جارێ بەدەر لە خودا هەر خلق نيە بەلكو ئەمريشە (الا له الخلق والامر)، ئينجا ئەو وەسفە لە بيركارى زياتر ماناكە دەردەخا بە ماناى دوو كۆمەلەى B, A وەك تەواوكەرى يەكتر(متممە- complement) بەهەمو ماناكان بە بيركاريشەوە ماناى يەك توخمى مادى دەبەخشى ،رێك لەگەل ئەو ئايەتەى (**ليس كمثله شيء**)پيچەوانە دەبێتەوە .

لەو بارەيەوە فەيلەسوفەكان ڕايان ووردتر بوە لەو جۆرە زانائاينيانـە، ئەرسـتۆ دەڵێت خوابەرجەستە نابيت و لە هيچ شـوێنيك نيـە بـەڵكو بزوينـەرى هەموانـە، قەشە ئۆگستين (كەلاى فەلسەفەى بەسەر زالە)باشترى بۆچوەو دەلێ خودا لەهـەمو شوێنيك هەيە بەلام نابينرێ...، كەواتە تێگەيشتن لە خودا زۆر بـە لـەنگى بـوە چ فەيلەسوفانى بێ باوەڕ چ باوەڕدارە ئا ينيـەكان ئەگـەر بـە ووردى لـە ئايەتـەكانى قورئان نەگەيشتبن، ئەو ئايەتانەى(زەوجى) دەرگاى مەزن لە ڕێكخسـتنى زانياريـە فەلسەفيەكانمان بۆ دەكەنەوە.

---

[1] ابن كثير- الباية والنهاية ج1ص22

[2] المصطلحات الفلسفية للقيلسوف الامدى ص89-90

# زەوجی و تێگەیشتن لە خودا(التعریف الذی لا یمکن تعریفه)

لە کۆنەوە تا ئێستا خەڵکانێك هەن زۆر بە لە خۆباییەوە دێت و پرسیاردەکات لە بارەی خودای گەورە دەڵێ: خوا لە کێ یە؟ کێ خوای دروست کردووە؟ ئەدی ئەوەی خوای دروست کردوە کێ دروستی کردوە؟یان وەك ستیڤن هۆکینگ دەڵێت ئەگەر خوا گەردوونی دروست کردبێت ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ پیش بوونەوەر چی دەکرد؟، ئەگەر بۆ هەمو شتیك هۆیەك هەبێ هۆی بوونی خودا چیە وەك دیڤیز وەڵامی داوەتەوە؟...هتد

ئەو پرسیارانە لە چوارچێوەی یاساکانی بونەوەر یان لە چوارچێوەی دیاردەی سروشتی و دەوروبەری بۆ دروست بوە کە لە سەر بنچینەی (زوج)ی و (تێگەیشتنی مادیانە، شتانە، لۆکاڵیانە)ی بۆ هاتوە، یان وەك لە فەرمودە هاتوە ئەوە پرسیارێکی شەیتانیە. پرسیار لەسەر زاتێك دەکات (زوج)ی نیە، شت نیە، مادی نیە...بۆیە خودی پرسیارەکە هەڵەیەو بەدەرە لە لۆژیك، بەشێکی هەڵەیی ئەو پرسیارانە دەگەڕێتەوە بۆ هەلەیی وەسفی خودا لە لایەن ئاین پەروەران بە وێچواندنیان بە دروست کراو، هەروەك ئیمام غەزالی ووتی نیوەی تاوانی مولحیدی دەکەوێتە ئەستۆی ئاین پەروەران، بۆ ئەو خاوەن پرسیارە کەبزانێ پرسیارەکەی (پرسیار نیە) جارێ ناتوانی لە بوونەوەریش هەموپرسیارێك دروست بکا، ئەگەر بڵێن 3جاران4 یەکسەر دەڵێ (12)، ئەو نازانی ئەوە بەپێی سیستەمی (دەییە-عشریە)[1]، بیرکاری زانەکان دەزانن3جاران4 ڕەنگە بکاتە 18 یان 28...بەپێ سیستەمی (بیستی) یان (چلی)..، ئەو سەری سوڕ دەمێنێ و نازانێ چیترپرسیار بکا، چونکە لە ڕەهەندێکی تری بەدەر لە تێگەیشتن و نەریتی عەقڵی ئەوە، ئەگەر

[1] ئەو سیستەمە دەگەڕێتەوە بۆ زانستی هندی کۆن بۆ 700ز.

بە ماسیەك بڵی ی چۆن تۆ لە دەریا دەربچی دەخنكێی ئەوا مخلوقیش هەیە بكەوێتە دەریا دەخنكێ هەر سەری سورِ دەمێنێ، نازانێ پرسیار لەو بارەوە بكا، ئەگەر پرسیاریش بكا وەك ئەو پرسیارانەی لەبارەی زاتی خوا دەكرێ ئاوایە، چونكە رِەهەندو ژینگەی ماسی ئاوە.

زانایان دەڵێن بە (فرضیة) ئەگەر خودێك لە یەك رِەهەندی بژی لە دوو رِەهەندی ناگا، دوو رِەهەندی لە سێ رِەهەندناگا...هتد، لەلایەكی تر دەروازەكانی عەقڵی ئێمە بریتین لە (5)هەست[1]، ئەوانەش زۆر سنوردارن عەقڵێكی سنوردار دروست دەكا، لە باشترین دۆخیدا تەنها لە چوارچێوەی سیستەمی (زوجی) لە شتەكان دەگا، لە چوارچێوەی ئەو چوار رِەهەندەی بونەوەری خۆمان تێ دەگا، جا پرسیارەكە ئەوەیە ئەگەر بابەتێك بەدەربێت لەسیستەمی (زوجی) چۆنی تێدەگەی؟ (ومن كل شیئ خلقنا الزوجین.. ) سیفەتی(مەخلوقە شت)لە سنورداری وبەرجەستەیی وجولەو ملكەچی بۆ یاسای سروشتی..، هەرچی بوونی هەیە هەر لە بچوكترین تا گەورەترین لەو بونەوەرە چەمكی (شت -شیئ) دەیگرێتەوە لە چەمكی(مادە) فراوانترە[2]، بە پێچەوانەی رِای (جان ستون) لة كتێبی (هل لوجودنا معنی) دەڵێ مادە (شت) نیە هەروەها(ئەرسەر كۆیستلەر) كەلەباسی ئەلكترۆن و(مبدأ اللادقە) دەڵێ: (..انها لیست جسیمات، كما انهالیست أشیاء..)[3]، ئەلەكترۆن وفۆتۆن و هەرچی هەیە شتەو زەوجیە، لە بنچەدا رِای مەدرەسەی ئەفلاتوونیە هاوچەرخەكانە كەدەڵێن (ان المادة لیست شیئاوسموها -لیس-)[4]

---

[1] ابن سینا زەوجی لە هەستەكانیش دۆزیتەوە لەبینین(سپی ورِەش)، لە بیستن(دەنگی هیواش وتوند)، لە تام(شیرن وتال)،...

[2] عرض موجز للمادیةدیالكتیكیة ص32

[3] ارثر كویستلر- جذور المصادفة –ترجمة: فوزیة ناجی، وزارة الثقافة والإعلام-العراق ص42

[4] المثالیة الألمانیة ص339

مەدرەسەی ئەشعەریەکان وئیمامی و هەندێ فەیلەسوفی تر (شت) و(بوون) یەکسان کردبوو[1]، واتە بوون بریتیە لە کۆمەڵێك (زەوجی ودژ)، کە ئەو توێژینەوە بەرەو لای خودا دەبەین یەکسەر دەبێ دوو هەنگاوی گەورە بنێین یەکەمیان نەشوبهاندن بە بونەوەر(لیس کمثلە شیء)، دوەم دوور خستنەوەی لە سیستەمی (زەوجی —دژ).

ئیستا بە پرۆسەیەکی زۆر سادە دەتوانین بۆ تێگەیشتن (لەو ڕووەوە) لە باسی خودی (خوا) بچین کە زاتێکە دژی نیە، زەوجی نیە، بۆیە بۆ تێگەیشتنی بەدەر لە تێڕوانینی (شت- مادە) بۆی بچین بە تێڕوانینی(لیس کمثلە شیئ)، دوور لە جووڵەوڕەهەندوکۆئۆردینەیت.

ئێمە لە سەرەنجامی توێژینەوەکە بۆمان دەرکەوت کە هەرشتێك ناوی شتە هەر لە یەك لا لەدوو دژو زەوجی پێك نەهاتوە، بەڵکو لە ناوەوەو دەرەوە چەندایەتی و چۆنایەتی و جولە و گەشەو کارلێك کردنی و...لە جوتە دژی (زوجی)پێك هاتوە، وای کردووە بەر هەست بکەوێ، سنوردار ومەوجود بێت، تواناو جولەو پێکهاتنی بەر جەستە بێت (وکل شيء عندە بمقدار —الرعد 8)، هەرچی خودایە لەهەموو رووەکان بێ دژە[2]، زەوجی نیە. ئەو وەسفە لەلایەن فەیلەسوفانی ئیسلام بەگشتی هاتوە وەك ابن سیناو کندی دەڵێن: وهو واحد ولا تصدر عنه الكثرة، وهو عقل محض لا جنس له، ولا ماهية له، ولا كيفية ولا كمية، ولا أين له، ولا متى، ولا ندَّ

---

[1] محمد جواد مغنية -معالم الفلسفة الإسلامية ص32

[2] زۆربەی هەرە زۆری موفەسیرو موفەکیرو فەیلەسوفی ئیسلامی بە جیایی مەزهەبەکان کۆکن لەسەر ئەوەی خوای گەورە بێ دژە، لە هەندێ ڕاو بۆچونی هەندێ زانای سعودیە لەوانە (**ابن عثيمن وشيخ الفوزان**)دەڵێن لە زاتی خودا (نەفی وئیسپات)کۆ بوویتەوە —بروانە:شرح **العقيدة الواسطيةلشيخ الإسلام ابن تيمية** -هەمان سەرچاوە ص110 ڕەنگە نەیان زانیبێ ئەوە مانای زەوجی بۆ خوای گەورە دەبەخشێ.

له، ولا شريك، ولا ضد له، ولا حد له، وليس هو شيئاً من الأشياء بعده [1].

لەو سەردەمەش باش ترین وەسف لەو ڕەوتە (فەیلەسوف مرتەزا موتەهەری)یە، کەواتە تواناو هێزی پێکهاتەو...هەرچی هەیە موتلەقە سنوری نیە، بۆیە نە مەحدودە نە مەحسوسە، نە بەرجەستەیە نە مادیە، نە ڕابردوە نە داهاتوە، نە شتە (لیس کمثله شیء)، نە جولاوە ونەوەستاویشە، ئەوە نەبوون نیە بەمانای (معدوم)بەڵام بەو شێوەی (خلق) مەوجود نیە، بۆیە ئەو هەمو هێرشەی بۆ سەر موعتەزیلەو ئیبن سینا وکندی وفارابی لە بارەی وەسفی خودا بە هەلە لێیان تێگەیشتون.

توێژینەوەیەکی فەلسەفی بەناوی(قول الفلاسفه المنتسبين للإسلام فى توحيد الربوبيه)زۆر بە توندی هێرشی بەکوفر کردۆتە سەر(أحمد حميد الدين الكرمانى، الحامدى، محمد بن داودالرفنه، ئینجا بۆ سەر فەیلەسوفانی ئیسلام کندی وابن سینا، فارابی، ابن رشد..)، کەچی نوسەر وەك بەشێك لە فەقیهەکانی جاران لەو بابەتە نەگەیشتوە، وەسفی خودا وایە نەڕەشە نەسپی، نەگەورە نەبچوك نەبوونە نەنەبوونە...بەدەر لەو وەسفە ئەوە هەلسەنگاندنی خودایە بە تەرازووی (شت، دروستکراو، مادە،..)کە نابێ، چونکە (لیس کمثله شیء)، ئەوەبەدەرە لەزیهنی ئێمە، کێشەی توێژینەوەلە فەلسەفەی خودایی لەلایەن فەیلەسوفانی مادی و(دژە فەلسەفیەکانی ئاینی) ئالێرەدێت.

مادیەکانیش دەیانەوێ توێژینەوەی خوای بخەنە تاقیگاومحالە، واناکەویتە نێوئەوسنورە فراوانەی عەقڵ چۆن دەکەویتە تاقیگا، دەیەوێ بناغەی زانیاری دابڕێژی وبەرەبەرە فراوانی بکا، لەکاتێکا ئەوەی ئێمە پێناس ودۆزینەوەی زانستی

---

[1] **د. سعود بن عبد العزيز الخلف**- قول الفلاسفة المنتسبين للإسلام في توحيد الربوبية – المبحث الأول ص13-

خوا نیە، ئەوە دۆزینەوەی نەدۆزینــەوەی خودایــە، زانســتی خــوایی بــە پێچــەوانەی زانستی تر کەلە کەلەکردنی زانیاری ودەرگا کردنەوە نیە، بەڵکو بــە سروشــتی خــۆی دەرگا داخستنە، ئەوە زانستی عەقیدەی ڕاستەقینەی ئاینیە، ئینجــا ئــەوە بــە پێــی بوونەوەری خۆمان ئەو لایەمان لیٚ دۆزیەوە، لەهەر بوونــەوەر ودروســت کــراوی تــری ڕەهەندی ئاوای تیدایە، دوور نیە لەهەر شتێك لەو بوونەوەرەو دروستکراوی تری ئاوا (شدید المحال) بدۆزرێتەوە، لەوەوە لە سیفات و ناوەکانی دەگەین کــە چــۆن (مهــیمن، متکبر، أول، أخر.. احد) دەگەین، ناتوانین هەلی سەنگێنین بە پێــی (شــت ومــەك- مەخلوق)ئەگەر بە (مبالغە)ش بێــت وەســفی گــەورەی بــە ملیــار هــەنکی گەردوون وەك لە ئینجیلی برناباش وەسفەکی زۆر گەورەی کردوە بەڵام هەر دروست نیە (في حضرته أن الکون أمام الله لصغیر کحبة رمل، والله أعظم مــن ذلــك بمقدار ما یلزم من حبوب الرمل لملء کل السموات والجنة بل أکثر)[1].

ئیتر ناتوانین بــەپیٚ ی بونــەوەری خۆمــان پــیٚ ناســی خــودا بکــەین جگــە لــەو وەسفانە، ناتوانین لە ڕیٚ ی مادی و شت و مەکی ئەو بوونەوەرە پرسیاریش لەســەر خودا دروست بکەین، پرسیارەکانی لەکیٚ یە و بۆچی و چۆن و کــەی...مانای نیــە، چــونکە جولــەو زەمــەن و مکــان کۆئۆردینــەیتی... نیــە، ئــەوەیان (عــەقیــدە)ی ڕاستەقینەی زۆربەی هەرە زۆری ئاینەکانی تریشە. فارابی وتی مادام عەقڵی ئێمــە لەگەڵ مادە تیکەلە ناتوانین لە خوا بگەین، بۆیــە پرســیار و تێگەیشــتن یــەکجاری دوور دەکەوێتەوە لە تێگەیشتنی خوا بە ڕوانگــەی بوونــەوەر، کۆتــای هێنــان بــەو تەقەلاٚیە بە شێکە لە (زانست) هەروەك (مبــدأ اللادقــە)ی هــایزینبرگ لــە فیزیــا کۆتایی بــە دیــارکردنی شــۆێنی ئــەلکترۆن و خێراییەکــەی هێناو(دیــاری نۆبــل)ی وەرگرت لە 1931.

[1]: إنجیل برنابا- الفصل(105) ایة10.

لێرەدا پەیوەندی (دروست کەر- خوای گەورە) بە (دروست کراو) زەوی و ئاسمانەکان و گیاندار و مرۆڤ پەیوەندی موتلەق بە (نسبی ومحدود)ە، بۆیە ئەو پەیوەندیە ڕاستەوخۆ نابێت[1]، کە ڕاستەوخۆ بوو ئەوە (موعجیزەیە)کە لە توانای خودایە (ادعونی استجب لکم -غافر 60)، بەڵکو لە ڕێ ی کۆمەلە یاسایەك دەبێ کە لە قورئان بە (أمر) ناوی بردوە وەك لە بڕگەکانی داهاتوو باسی دەکەین.

[1] لەوەوە ئەبیقور (242ـ270 پ.ز) دەڵێ لە خوای ناوەشێتەوە حوکم لەو بوونەوەرە بکا و خۆی بچوك بکاتەوە وازی لێهێنایە -موسوعە الفلسفیە المختصرە ـ ص22

# بەشی پێنجەم

# پەیوەندی دروستکەر و دروستکراو- الخالق والمخلوق

(A)

ئەو فەیلەسوفانەی باوەڕیان بە خواش بوە تا ڕادەیەك بەهەلە بۆ ئەو پەیوەندیە چووینە، ئەرستۆ لە چوارچیوەی ئەو دنیایەو بالآیی خودا، وای ڕیزکردبوو کە تا بەرەو خواو سەروو بچی عەقلّیە تا بەرەو خوارووش ئەوە مادیە، بەو شێوەیە خوا بە عەقلّی ڕووت یان وەك هیگل بە ڕوحی ڕووت وەسفی کردووە، تا ڕادەیەك فارابی و هەندێ فەیلەسوفی ئیسلامی بەو بۆچوونە کاریگەر بوون وخودا بە (**عقل المحض**) ناوزەد دەکەن، کەچی عەقلێ خودا نیە بەڵکو (ئەمری خودایە)، جولاّن و جولێنەر خوا نیە ئەمری خوایە، ، **لة بنةضةدا ئةو وةسفة كتاب المقدس هاتوة (...فالله روح...حامِل كل الأشياء بكلمة قدرته"** (عب 1: 3)، **" به نحيا ونتحرك ونوجد "** ( أع 17: 28)، **هو " أبونا الذي في السماء"** (مت 6: 9).

لەو بارەیەوە ئیمام غەزالی وا دەبینی: جولاو پێویستی بە جولێنەر هەیە کە خوایە، بەو شێوە وای دەبینی کە پەیوەندی خوداو بونەوەر ڕاستەوخۆیەو هەم خوداش لە جولەو چالاکیدایە، لە توێژینەوەیەکی تر بە ڕوون تر گوزارش لەو

بینینــەی ئیمــام غــەزالی دەکــاو دەڵـێ(أن دعــواهم إنــه محـرك لا يتحـرك: دعــوى متناقضة لأنه ما لم يكن بنفسه متحركاً فكيف يحرك غيره)[1].

لەو بارەیەوە وەسفی ئینجیلی برنابا وورد ترە کە دەڵێ: (ولما كان ليس لله جسم فهو لا يأكل ولاينام ولا يموت ولا يمشي ولا يتحـرك، ولكنــه يـدوم إلـي الأبـد بـدون شــبيه)[2] راستیەکەی ئەوەیــە خــوا لــە جولــەو چــالاکی نیــە ئــەوە ستایشــە بــەڵام ستایشێکی (انطلاق من الـذات)ە، ئینجا خوا راستەوخۆ (متحرك)نیە بۆ بوونــەوەر بەڵکو لەڕێی یاسا وەك لەدوای زیاتر باسی دەکەین.

لە پاش ئەو مەنهەجەی سەروو بۆ تیگەیشتن لــە تینەگەیشــتنمان لــەخودا، لــە دۆزینــەوەی دەروازەکــانی ناســینی خــودا، ئیســتا زۆر پرســیارهەیە ناســنامە لۆژیکیەکەی ڕوون دەبێتەوە کە پرسیار نیە، ناچێتە لــۆژیکی فەلســەفەی خــوایی، هەندێکیشی سانا کردو هەڵبەتە بەشی هەرە زۆریشی لێی نازانین، ئەوەی لەکۆنەوە تا ئیستاش پرسیاری هاوبەشە ودووبارە دەبێتەوە ئەوەیە دەڵێن خودا پــێش ئــەوەی ئەو جیهانەی ئێمە دروست بکا بە چی سەرقاڵ بوو؟

لەوەوە بیرۆکەی (كون الساكن-قدم العالم ) وبیری (ئەتۆم) هاتــەدی، پرســیارەکە بۆیە بەسەرسامی دێتە پێش واتێگەیشتوون کە ئیشی خودا تەنها دروســت کردنــی ئێمەو سروشت وگەردوونی ئێمە بێت، ئەوە یەك لــە دروســت کراوەکانــە، دروســت کراوی خودا بێ پایانە لە زەمەنی ومــەکانی ولــەجۆرو چــۆنایەتی چــەندایەتی..یان ڕەنگە هەر نەزانین وەسفی بکەین بەپێی ئەو یاســاو ڕێســایەی بەردەســتی ئێمــە دا هەیە.

ئێمە ئەگەر بتوانین شتێك لەبارەی سروشت وگــەردونی خۆمــان بــاس بکــەین و وەڵامی پرسیارە فلسفیەکانی سەردەم بدەینەوە بە پاڵپشتی زانستی دروست وئاینی

---

[1] قول الفلاسفة المنتسبين للإسلام في توحيد الربوبية ص13
[2] انجيل برنابا- فصل 17 اية1و2

ساغە، بەو شێوەیە دەچینە نێو پەیوەندی سروشتی ئێمە بە خوا، یان بە گوزارشی ئاینی پەیوەندی بونەوەر و بەخوا(خالق) بە(مخلوق)، بە گوزارشی فەلسەفی ئەکادیمی بە پەیوەندی مادە بە نامادی، یان سروشت وهۆکارەکانی یان علە الفاعلە المعلول دەردەبڕێ، سادەترین پرسیار هەلدەبژێرین کە بریتیە لە پەیوەندی خوداو سروشت، چەندین پرسیاری گرنگی لەگەلە، لەسەرەتادا ئەوە دەپرسین لەبارەی چۆنیەتی بەڕێوە بردنی سروشت وبوونەوەر، ئاخۆخوایاسای بۆ داناوە یان هەردەم خۆی ڕاستەوخۆسەرقالە پێی؟ لەبڕگەکانی داهاتو لەگەڵ وەڵامی ئەو پرسیارە دەڕۆین.

## ئەو دنیایەی ئێمە کێ بەڕێوەی دەبا؟

### یاسای سروشتی یان ئەمری خودابۆ خۆی

ئەهلی ئاین زۆر بەڕوونی وەلامی ئەو پرسیارە نادەنەوە ،دوودلن، لەلایەك دەلێ خودا لەلایەکی تریش پەنا بۆ (یاسای سروشتی)دەبەن،وەك وابێت دوو فەرمان هەبێت بۆ بوونەوەر (خواو یاسا) ،هەندیکی ئەو هەندیکی ئەم،بۆیە تیکگیرانێك لە نێوان ئاینی وئەکادیمی ڕوودەدا ،لەگەل گەشەی زانستی زیاتر بەلای ئەکادیمی لار دەبێتەوە کە یاساکانن ئەو دونیایە بەڕێوە دەبەن و وادەردەکەوێ کە ئاینی شکست دەهێنێ ،لەکاتێکا ئاوا نیە یاساو خودا پیکەوە گەردوون بەڕێوە نابەن ،یاسا شریکی خودا نیە ،یاسا ئەمری خودایە ،ئەو دوودلیە لەوەلاما شکستەکە دەهێنێ ،ووردتر ئاینپەرەوەری ڕەمەکی ڕێك وەلامەکەی ئەوەیە ئەوەی (هۆکار)ی ڕوون بێت ئەوە دەداتە پال هۆکارو یاساو مادیەت ،ئەوەی نەشزانی دەلێ ئەوە خوا خۆی

دەیکا ،لەوەوە ناو لەودۆخە نراوە (الە الفجوات- God of the gaps)[1] ،زانیت دەیلێی نەتزانی بۆلای خودای ڕەوانە دەکەی ..،لەوەش دیسان بەتەمای خوای(توکل)لەو ئەنجامانە دێت کە دیارنین ئەوەی دیارە نالێن بەتەمای خوا ،لە هەولێر فلکەیەك هەیە ناوی (فلکەی بەتەمای خوا) بەو مانایەی نارێکەو رژیمی بۆ دانەنراوە ئەنجامی دیارنیە ،ئەوەی موجازەفە بێت دەلێن بەتەمای خوا ..

کەواتە وەلامی پرسیارەکەی سەروو چیە؟ دوو وەڵامی سەرەکی بۆئەو پرسیارە هەیە، ئەوانەی پێیان وایە کە هەموو ووردودرشتی بوونەوەر لەلای خوا بەڕێوەدەچێت، چاك وخراپ، باران و بروسك، مردن وبوون، هەژارکردن وسەرکەوتن...گەلایەك لەدار بکەویتە خوارهەر ئەوە، ئەو پۆلە دلسۆزوکلاسیکین لەهەمو ئاینەکاندا، زۆر شارەزای فەلسەفەو زانستی سەردەم نین، زۆرشارەزای (مقاصد)ی پەیام نین، بەشی دوەم پێیان وایە خوای گەورە خۆی یاسا ورێسای بۆ بوونەوەر داناوەو ڕاستەوخۆ کارەکان بەڕێوە نابا، ئەوانەش چەند بەشێکن، بەگشتی لە ڕاستی نزیك ترن بەڵام کۆمەڵێك کێشەیان هەیە لەگەڵ دەق(لەوانە دوعاکردن)، تێکڕای فەلسەفەی مادیەکان لەو وەڵامە نزیك ترن وعەلمانیەتی فەلسەفی لێهاتە کایەوە کە بوە بنچینە بۆ عەلمانی سیاسی وئەکادیمی وتەعلیمی وفەرهەنگی..، سەرکەوتنی گەورەشیان بەدەست هیناوە بەڵام ناکەونە نێو ئەو توێژینەوە، چونکە پرسیارەکە ئەوەیە کەپەیوەندی خوا بە دروستکراوەکانی.

ئەوەی گرنگە لە ناوهینانی فەلسەفەی مادی ئەوەیە سودیان لەتێنەگەیشتنی ئەو ئاین پەروەرانەیە لە دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان (امر)ی خودا و یاساکانی سروشت، لەدوای کەمێکی تر بۆمان دەردەکەوێ یەك شتن تەنها زاراوەی جیای ئاینی وئەکادیمی ئەو کێشەیەی دروست کردوە، سەرەتای کێشەی (یاسای

---

[1] مطرقة البرهان ..ص70

سروشتی) بۆ ئاین پەروەران لەوە دێت کەئەویاسایانە دەدۆزرێنەوە بەناوی ئەو زانایە دەکرێ وەك یاسای بۆیل، یاسای ئەرخمیدس، یاسای نیوتن..ئەگەر زانیاری تەواوت نەبێ وادەردەکەوێ کە ئەو یاسایانە نیوتن وبۆیل وئاینشتاین دروستیان کردبێ وەك ئەلیکسەندەر پۆپ وتی ئەو یاسایانەی سروشتی لە تاریکیدا بوو نیوتن بەکاری خستنەوە، لەکاتیکا ئەو یاسایانە هەنە ئەوانە دۆزیویانەوە نەك بەکاری خستون، بۆیە لای ئاین پەروەر زۆر قورسە بلێ باران وبروسك خۆرگیران بە یاسای سروشتی دێتەدی، ناچاردەڵێن نەخیر بە ئەمری خودایە، بۆیە لەسالی 1277ز لەلایەن پاپا جۆنی یازدەم 219 هەلەو کوفری ڕێز کرد یاسای سروشتی یەك لەو تاوانانە بوو، کریستیان کاوس دەڵێ لەسالی1559 ز هەمو ئەو کتێبانەی باسی سروشت دەکا سوتینران[1].

جار وایە کارەساتە یان زولمی مرۆڤە لەلایەن مرۆڤ هەر دەڵێن بە ئەمری خوایەو توشی ناکۆکی دەبن، چونکە چۆن دەبی خراپەش امری خوابیت، لەدەقی ئایەت: (واذا فعلوا فاحشة قالوا وجدنا عليها اباءنا والله امرنا بها قل ان الله لا يامر بالفحشاء اتقولون على الله ما لا تعلمون)، (الشيطان يعدكم الفقر ويامركم بالفحشاء والله يعدكم مغفرة منه وفضلا والله واسع علي)[2]، یەکیك لە موعتەزیلەکان وای وەڵامدایەوە گوایە خوا دەسەلاتی بەسەر خراپەدانیە[3].

هەرچی جەبری و ئەشاعیرەکان نکولیان لەوە کرد کە مرۆڤ هیچ دەسەلاتیکی هەبێ هەموڕووداوەکان خواین[4]، بەو شێوەیە ڕووداوە سروشتیەکان دەکەونە نێوان ئەمری خوداو یاسای سروشتی، لەیەکەمیان بریتیە لەنەزانین ودوەمیش بریتیە لە

---

[1] نیکولاماکیافیلی-الأمیر- ص25

[2] القرأن الكريم (سورة الأعراف - آية 28، سورة البقرة آية 268)

[3] لە بنەچەدا ئاینی زەردەشتی دەلیت کارە خراپەکانی بەشەری خۆی دیکا نەك خودا، ئەفلاتونیش دەلێ خوا بەشدار نیە لەکاری خراپی بەشەر..بۆ زیاتر بڕوانە جمهوريه افلاتون ص68-..

[4] معالم الفلسفة الإسلامية ص102، ص120

شارەزابوون ودۆزینەوەی نهینیەکان وبەکارهینانی لە ژیانی رۆژانەمانداو ئەو تکنۆ لۆژیاوپیشەسازیە گەورەیەی لیّهاتتە ئاراوە، کەواتە ئەمری خواو یاسای سروشتی دژ بەیەکن یان هەر یەك شتن؟

بۆ وەلامی ئەو پرسیارە فەلسەفیە ستراتیژیە پەنا دەبەینە بەر ئایەتیکی یەکلاکەروە لە سورەتی ئەعراف ﴿..أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ..﴾[1]، ئەوە باسی دوورەهەندی جیا دەکا، باس لە(خلق) و(امر) دەکا، ئەو دوورەهەندەش کیشەی سەرتاسەری فەلسەفەیە لەسەرەتای بەشەریەوە تا کۆتای بە هەمو مەدرەسەکانەوە، بوونەوەری ئیمە هەر (خلق) نەکراوە بەلکو (امر)یشی بۆ دانراوە، ئیمە لە خلق گەیشتین واتە لە نەبوونەوە هیناویە بوون، ئەی (امر) مانای چیە؟

لیرە مانای دروست بۆ ئەو زاراوەو مەبەستەکانی لە قورئان هەمو کیشەکان چارەسەر دەبیت، زۆربەی موفەسیرو فەقیهەکان مانای تەواوی خۆیان پیّ نەبەخشیوە زیاتر مانای ئەوامرو نەواهی (حرام وحلال)ی بۆمرۆڤیان کردۆتە تاکە زەمینە بۆ مانای ئەمر، بەشیکی تر وەك ئەوەی (تفسیر البغوی) هاتوە: (..له الخلق لأنه خلقهم وله الأمر يأمر في خلقه بما يشاء..)، بەشیکی تر تارادەیەك روون ترە (امر) تەنها بە قورئان وکلامی خودا لیك دەدەنەوە، لەوانە:ابن تیمیە، ابن قیم، ئیمام غەزالی، قرتبی..[2]، راغب ئەسفهانی بە(التدبير والتصريف) وەسف کردوە[3]، هەرچەندە فەرموودەیەك هەیە بە ژیر خانیکی ریوایەتی لاواز هاتوەو گرنگی پیّ نەدراوە بەلام (امر)ی نزیك لەو بۆچوونەی راڤە کردوە، بەو شیوەیە:

---

[1] تەواوی ئایەتەکە: [رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِى خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِى اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ الأعراف:54

[2] مجموع الفتاوى ج28ص275، مدارج السالكين ج1ص8، المستصفى ج1ص275..

[3] مفردات ألفاظ القرآن -المادة:امر

(حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ أَبُو أَحْمَدَ بْنُ رِزْقٍ، ثنا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ السِّمْسَارُ الْكُوفِيُّ، ثنا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ قَالَ : سَمِعْتُ سُفْيَانَ بْنَ عُيَيْنَةَ يَقُولُ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى " :(أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ)، قَالَ : الْخَلْقُ خَلْقُهُ، وَالأَمْرُ كَلامُهُ " تفسير قرتبی نقلی کردوه[1]، کەچی لە کۆی هەمویان مانای گشتی پێ نەدراوە.

ئەوەی زۆر بە ووردی بۆی چوە سید قوتب لە(فی الضلال) لە تفسیری (فقضاهن سبع سماوات في يومين واوحى في كل سماء امرها)[2]دەڵێ : وا پێدەچی مەبەست لە(امر) بریتی بێت لەو یاساو ناموسە گشتیانەیە کەخودا بۆ بوونەوەرو سروشت دایناون، ئەوەش دەبێتەدەروازەی توێژینەوەکەمان، ئەویش بەگشتگیرترمەبەست لە(امر)یاسای سروشتیە بەمانا فراوانەکەی، لێرەدا پەیام دەبێتە باری تایبەتی ئەمر، واتە هەر کەلامی خوا ناگریتەوە، بەڵکو پەیام ویاساکانی سروشت وروح دەگریتەوە، ئەو ئایەتانەش بەلگەن وپشتیان پێ دەبەستین بۆ دارِشتنی تیگەیشتن لە پەیوەندی نێوان ئەمرو یاسای سروشتی:

(وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً)، (بديع السماوات والارض واذا قضى امرا فانما يقول له كن فيكون) (فانطلقا حتى اذا ركبا في السفينة خرقها قال اخرقتها لتغرق اهلها لقد جئت شيئا امرا ) (ومن اياته ان تقوم السماء والارض بامره) (يدبر الامر من السماء الى الارض) (لله الأمر من قبل ومن بعد ) (قال ربنا الذي اعطى كل شيء خلقه ثم هدى)[3]، سەرجەم لە قورئاندا 230جار باسی لە (امر) کردوە، لەکۆی ئەو ئایەتانە پەیوەندی خوابە یاسای سروشتی... دەکەین، دەردەکەوێ رۆلی (ئەمر) لەو

---

[1] تفسير قرطبی ج7ص195

[2] سورة فصلت-آية 12

[3] القرأن الكريم- سورة الإسراء - آية 85، سورة البقرة - آية 117 سورة الكهف - آية سورة الروم— آية 25سورة السجدة- آية 5سورة الإسراء- آية 85، سورةالروم اية 4، سورة طه- آية50

بونەوەرە چیە، بەو شێوەیەی خوارەوە:

1- دوو پرۆسەی خوای بۆ بوونەوەری ئێمە کراوە، یەکەمیان (خلق) دروست کردنی هەموو لە هیچەوە دوەم لەدوای دروستکردنی یاساو ڕێسای بۆ داناوە، بۆ ئەوەی ئەو بوونەوەرە بێ سەروبەرو بێ ئامانج نەبێ (افحسبتم انما خلقناکم عبثا)[1]، بەشێك لە فەیلەسوفان باوەڕیان بەوە هەبوو خوابوونەوەری دروست کردوە بەڵام وازی لیهیناوە، ئیتر مادەی ئەو بوونەوەرە خۆی گەشەی کردوەو ئەو یاساوڕێسایەی بۆخۆی داناوە، ئەوە تەنها ئەو کاتە کەمێك ڕاست دەبێت ئەگەر هەمو پارچەکانی ئەو بوونەوەرە کۆنگرەیەکیان کردبێ لەدوای گفتوگۆیەکی زۆر ڕێکەوتبن لەسەر ئەرك وماف وسنور دابەش کردن، ئەگەر هەمو ئەوانەش بوو ئەدی چارەی پێویستیەکانیان چیە؟ کێ سوتەمەنی وخۆراك ووزەیان بۆ دابین دەکا؟کێ ئەو بەرنامەیەی بۆ دانان ئیوە واکار بکەن تا دوای ملیار سالی تر ژیان پەیدا بێت ومرۆڤیشی لێ بێتەدی؟ئەوانە هەمو مەحالن، ڕاستیەکەی ئەوەیە لەخالی دوەم بە پێی ئەو ئایەتانەی سەروو ڕوونی دەکەینەوە.

2- ئەو دوو پرۆسەی سەروو(خلق )و(امر)پرۆسەیەکی تری گرنگی هینا دی، ئەویش(ربنا الذي اعطى كل شيء خلقه ثم هدى) واتە بۆهەر سیستەمێکی دروست کراو هەر لە ئەتۆم تا کەشکەشان بەرنامەو ئیمکانیەتی پێ بەخشی، ئەوە مانایەك لەماناکانی (هدى)یە، (هدى)ی بوونەوەر یاسانی سروشتە، (هدى)ی کۆمەڵگەش پەیامە، لەوەش گرنگ تر هەماهەنگی وهاریکاری لە نێوان سیستەمەکانیش بۆ سیستەمی گەورەتر، لەوەوە تۆماس ئەکوینی و نیوتن و ولیام بالی و لەو سەردەمەش سیر جیمس(1877-1946) ووتیان

[1] سورة المؤمنون-اية115

ئەو بوونەوەرە دەلێی کاتژمێرە هەر بەشەو بەشەکانی تر تەواو دەکا، لەوەش ئەوەمان بۆ دەردەخا کە ئەو بوونەوەرە بە (ترتیب)ڕێز کراون نەك بە پرۆسەی گەشە ئەو واقعە مەوزوعیە هاتبێتە دی، لەو پرۆسانەیە کە گەشەی هێلکە هەر جوجکەی بدا، جولەی خۆر ووزە بەخشینە،...بەو شێوەیە لە جولەو گەشەی هەر ڕەگەزێك ئامانجدارە ناپەڕیتەوە لەسنوری خۆی، ئەوەش بنچینەی رژێمی تەواوی گەردوونە.

3- لەدوای زیاتر ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە (امر-یاساکانی سروشت-ڕاستی) (خلق-دروستکراو) نین، بۆیە ناکرێ یاسا بە(شت) یان(مادە) وەسف بکەیت، (خلق) مادیە بەڵام یاساکانی سروشت نامادینە، کەواتە یەکێ لە جیاوازیە بنچینەییەکانی (خلق) و(امر) ئەوەیە یەکەمیان مادیە ئەوی تریان نامادیە، لە چاپی یەکەمی ئەو کتیبە نەمان زانی بۆ (امر وشیو) هاتبوو لەو ئایەتە کەواهاتوە: (فانطلقا حتى اذا ركبا في السفينة خرقها قال اخرقتها لتغرق اهلها لقد جئت شيئا امرا) باس لەوە دەکا (شيئا امرا) زۆر تەقەلامان‌دا نەمان زانی لێکی بدەینەوە (امر) و(شيء) چ پەیوەندیەکیان هەیە،(لە چاپی دوەم بۆمان دەرکەوت ئەو(امر) نية بة(كةسرةية) .

4- لەبارەی (پرسی روح) ئەو هەمو توێژینەوەو نوسینەی لەسەرکراوە لە سەرەتای بەشەریەوە تا ئەو ساتە نەتوانراوە لەوەی ئەو ئایەتە ئاماژەی پێ کردوە یەك ملمی لێ هەلکڕێنن، ووتویەتی: (ويسألونك عن الروح قل الروح من امر ربي.. )، کەواتە (روح) بەشێکە لە (امر) واتە (خلق) نیە، مادە نیە، ئەمرو یاسایە، رەنگە بتوانین بلێین یاساکانی سروشت روحی بوونەوەرە، بەڵام ڕەنگە نەتوانین بلێین روحیش بریتیە لەیاساکانی ژیان، هەر ئەوەندە دەتوانین بلێین (امر) بریتیە لەیاساکانی سروشت وروح، روح موعجیزە نیە، موعجیزە ئەو دۆخە تایبەتیانەن لە بوونەوەر کە بەدەر لە(هۆ)و یاسا سروشتیەکان دێتە دی،

لە پیشەکی کتێبی گەورەی(رسالە فی السیاسە والاهوت) دووبارەی کردۆتەوە و دەڵێ ئەگەر راستە یاساکانی سروشت هەر ئیرادەی خوایە کەواتە موعجیزە دەرچوونە لە یاسای خودا[1]..، ڕاستیەکەی وایە:موعجیزەش (امر)ە بە لام یاسا نیە، کەواتە لێرە (امر)بوە یاساو روح وموعجیزە، دووپرسیاری گەورە لێرە قووت دەبێتەوە: ئاخۆئەمر هەر ئەو سێ تەوەرە دەگریتەوە یان زیاترەو ئێمە نایزانین، دوەم زاناو فەقیهوموفەسیران بەپێی ئەو ئایەتە(یسألونك عن الروح قل الروح من امر ربي وما اوتيتم من العلم إلا قليلا) ئەوا ووتوویانە قورئان دەرگای لەسەر توێژینەوەی(روح)داخستوە بەوەی ووتویەتی (الروح من امر ربی)بەلیکدانەوەیەکی نادروست بۆ زاراوەی(امر)وای بۆچون، کەچی بەووردبونەوەیەکی سەردەمی وقوول تر وادەرناکەوێ، بەڵکو مەنهەجێکی توێژینەوەی پێدای ودەڵێ پرسی روح لەدەوازەکانی مادە مەکۆڵەوە، بەڵکو لەدیوی دوەمی بوونەوەر کەبریتیە لە ڕەهەندی (ئەمر- یاسای سروشت) بکۆڵەوە، فەیلەسوف وزانایانیش بە پێچەوانەی مەنهەجی توێژینەوەی ئەو ئایەتە هەلساون(بەو کەمە زانستیە- وما اوتيتم من العلم إلا قليلا )لە زەمینەی مادی لە روحیان کۆلیوەتەوە، بۆیە هیچیان دەست نەکەوتوە، تا ئیستا نەهاتون لە زەمینەی ڕەهەندی دوەم (امر) لە رووح بکۆڵنەوە، هەمو ئەوانە بە جێ دیلین بۆ کەسانی زیاتر پسپۆر ئەو کیشانەمان بۆ چارەسەر بکەن.

5- هەر بە پێی ئەو ئایەتانە (ناوەندیەتی زەوی) بێ بنچینە بوە کەماوەیەکی زۆرزاناوفەقیهی ئیسلامیش لێی بەهەلەدا چووبوو، کەچی ئەو ئایەتە (یدبر الامر من السماء الى الارض) واتە ناوەندی یاسا لە ئاسمانە، ئەوە مانای

[1] رسالة فی السیاسة والاهوت ص66

ئەوە نیە خودا لە ئاسمانە هەروەك زۆرێك بە هۆی ئەو ئایەتە وایان بۆ دروست بوە (إثبات استواء الله علی عرشە بالكتاب ) لە كتێبی (اجتماع الجیوش المسلمین)ی ابن قیم وای بۆچوە، ئایەتەكە باس لە(امر)لە ئاسمان دەكانەك خودا، هەروەها پیشوو تر بە شێوەیەكی فراوان وای تێگەیشتبوون كە سیستەمی ئاسمان وسیستەمی زەوی لیك جیان، كەچی لەو ئایەتە(ومن ایاتە ان تقوم السماء والارض بامرە) بە ڕوونی باس لە یەك سیستەمی دەكا، باس لەوە دەكا ئەو یاساو ڕێسایانەی ئاسمان وزەوی یەكن. لێرەدا كێشەیەكی فەلسەفی وئاینی زۆر گەورە چارەسەر دەكا، لە پیشوو ترئایەتی(لە ملك السماوات والارض والی الله ترجع الامور)[1] لە چوارئایەتی قورئان باسی لە(والی الله ترجع الامور) كردوە، لەوەوەبەشی هەرە زۆری فقهی ئیسلامی وای لیك دایتەوە كە كەس چی لەدەست نیە وهەمو كاری بوونەوەر خوایە خۆی ڕاستەوخۆ دەیكا وەك زانیاریەكانی كۆنی ئاینی لە(نصوص قدیمەو ئاڤیستاو عهدین..) هەموی وا هاتوە، كەچی لێرە ڕوون دەبێتەوە كەكاروباری بوونەوەربە ژیان وبێ ژیانەوە، بە ئەجندەو ئادەمیەوە..بە ئاسمان وزەویەوە هەر هەموی لەدەست خودایە لە ڕێی یاساكانی سروشتی كە خۆی دایناوە.

6- لێرەوە هەر بەخێرایی دەردەكەوێ كە ئەو مادیانەی پرۆسەی خلق وگەشە دەدەنە پاڵ سروشت ،چەندە هەلەن ،كە دەلێن سروشت مانای یاسای سروشت دەنا سروشت مانایەكی تر نابەخشێ ، یاسای سروشتیش خلقی پیناكرێ تەنها ئیدارەی خلقی پێدەكرێ ،ئیدارەی ئەو ئیمكانیەتانەی خلق دەكا كە گۆڕان وگەشەشی تیّدایە .

---

[1] سورة الحدید اية5

7- بە پێی ئەو ئایەتە (بدیع السماوات والارض واذا قضی امرا فانما یقول لـه کـن فیکون) ئەوا یاساکانی سروشت سەرتاسـەرین ولەهـەمان کاتـدا زۆر خێـران، ڕەنگە جیبەجێ کردنی لە خێرایی رووناکی خێرا تر بیت، رەنگە هاوکات بێت، لەوەوە دەبێ بەووردی یاساکانی(سروشتی) خوای لەگەڵ یاسایەك جیاکەینـەوە کە لە پەرلەمانیك دەردەچێ وبەسستی دەڕوا، ئەوە هەرناوی یاسـای لینـراوە ئەگینا مەرج نیە یاسا بیت، یاسا بەردەوام دووبارە دەبێتـەوەو گشـتگرو زۆر خێراو ئۆتوماتیکە، واتە کاریگەری یاسای کیش لە نێـوان(زەوی) و(خـۆر) 8 خولەك ناخایەنێ وەك خێرای رووناکی بەڵکو یەکسەرە.

8- هەرچەندە لەناو خودی بونەوەر لەناو کیانی مرۆڤ، لەنیو خۆرو ئەسـتێرە، لـە نیو زەمین...توخمی مردنی هەلگرتوە، کەچی یاساکانی سروشت بەس نیە بـۆ کۆتایی هاتنی ئـەو بونـەوەرە، بۆیـە (موعجیزە)یـەکی تـری پێویسـتە ئـەو سورەتە ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ زِلْزَالَهَا، وَأَخْرَجَتِ الأَرْضُ أَثْقَالَهَـا، وَقَـالَ الإِنسَـانُ مَا لَهَا، يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا، بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا..﴾ واتـە ئـەو جـارە ئـەو لەرزینە گەورەیەی زەوی لە چوارچیوەی یاساکانی سروشت نایەتە دی، بـەڵکو بە ڕێنمایی وپەیامیکی تایبەتی خـوایی دیتـە دی ﴿بِـأَنَّ رَبَّـكَ أَوْحَـى لَهَـا﴾، هەرچەندە لە قورئان واهاتوە (الا له الأمر والخلق)بـەڵام وا پێدەچـی (پـەیام- وحی) فراوان تر بێت لە (امـر) یاسـای سروشـتی، چـونکە یاسـای سروشـتی لەچوارچیوەی پەیام هاتوە (واوحی الی کل سماء امره).

9- پرسێکی تر هەیە ئەگەر بتوانین لێرە چـارەی بکـەین ئـەویش ئەوەیـە :ئـاخۆ یاساکانی سروشت پیش سروشت دروست بوە یان پێچەوانە؟ کامیشیان حـوکم لەسـەر کامیـان دەکـەن؟دەتوانین لیکیـان جیـا کەینەوە؟بـە واتایـەکی ترپرسیارەکەی یەکەم ئایا (خلق-مادە) پیش (امر-یاسا) یان پێچـەوانە، ئـەو پرسیارانە کۆمەڵێك پرسی فەلسـەفی کـۆن ونـوێی زۆر بـاڵا چارەسـەردەکا،

مادیەکان بە بیّ دوودلی و بە خیرایی وەلاّمیان ئەوەیە کە مادە هەبوە ئینجا باقی بوونەوەری لەسەر پەیدا بوە، بەلاّم هیگلی ومارکسی و تەیاری نوێی فەلسەفی لەپال مادە جولەو زەمان ومەکانی وەك هاوتا هەژمار کردوە، ئەنجلس بە توندی رەدی مایکل دەداتەوە کە لە کتێبی (الانثروبوجونیاص707) دەلّیّ:((تقول النظرة المادیة الی العالم بأن المادة کانت موجودة قبل الحرکة)) ئەنجلس دەلی ئەوە هەلەیە پیّکەوە ن وەك جمك[1].

فەیلەسوفە ئیسلامیەکان بە پالپشت بە هەندیّ ئایەتی قورئان چوونە نیو تیۆری گەردوونی بیّ پایان(قدم العالم) وقبوولیان کرد[2]، لەو سەردەمەش فیزیای کوانتەم تووشی هەمان کێشە بوە، دەلّیّ یەکەم جار کیش هەبوە، واتە یاسا هەبوە، ئینجا (خلق-مادە)دروست بوە، دەیەویّ بیسەلمینیّ کە خوا خلقی نەکردوە بەلّکو بە یاسا دروست بوە [3]، ئەوە جۆریکی ترە لە ڕای دیکارت، کەچی یاساش هەر ئەمری خودایە، لەو ئایەتە (..واذا قضی امرا فانما یقول لە کن فیکون) ئەو ئایەتە گەورەترین وەلاّمی فەلسەفی گەردوونی پیّیە ئەگەر لیّی ووردبینەوە، دەبینین لەیەك کاتدا بەدوو وشە، گوزارش لەدووپرۆسە، لەدووڕەهەندی گەردوونی دەکا، (کن) بریتیە لە(فەرمان، یاسا، پەیام، هۆ..) (فیکون) یش بریتیە لە(خلق، مادە، بوون ودروستکراو، ئەنجام..) بەکورتی بە زاراوەی ئاینی (کن) ئەمرەو (فیکون) خلقە، هەرچەندە پرۆسەکە وەك یەك پرۆسە دەردەکەویّ، هاوکات، دەماودەست، کەچی لە

[1] ف انجلس-دیالکتیك الطبیعة ص241

[2] ابن رشد دەلیّ کاتی زەوی دروست کرا **(واستوی الی السماء وهی دخان)**، هەروەها بە پیّی ئایەتی(ام خلقوا من غیر شیء..)دەلیّ دخان هەبوو، (شيء) هەبوو، لەوەوە دەلیّ (مادە وخلق)هەبوو، ئەتۆم هەبوە وەك مادەی خاوی بوون، لە ئەتۆم بوونەوەر و هەر جۆرە دروستکراویك دادەهینریّ..، لەدۆخ دەگۆڕیّ بۆ دۆخی تر، خالی لاوازی فلسفەی ئیسلامی لیرەوە دیت.

[3] ستیڤن هۆکینگ- دیزاینی مەزن ل41-66

ناخیدا لە سێ ڕەهەنـد دەردەکـەوێ بـەڕێز یـەکیان پـیش ئـەوەی تـرە، بـە جـۆرە دەربڕێنێکی تر:(کن) ئەمرە، هۆیە (ف) گـوزارش لـەو فـەترە زەمەنیـە دەکـا کـە ئەمرەکە جیبەجێ دەبێ و(یکون) ڕوودانەکەیە، کەواتە کـن فیکـون سـێ پرۆسـەیە (یاسا —زەمەن-مادە).

ئیستا پرسیاری هەرە گەورە ئاخۆ ئـەو فـەترە زەمەنیـە گـەورەترە لەسـفر یـان یەکسانە بە سفر، ئەگەر گەورەتر بیت لە سفر ئـەوا سـێ ڕەهەنـدە، لـەوەوە ئیمـام تەبەری پشتیوانی لەو بۆچوونە دەکاودەڵێ (ما خلق الله تعالى من الأشياء قبل خلق الأوقات..)[1]، ئەوکاتی ڕێزەکە ئاوا دەبیـت(کن) لـەپیش (فیکون)واتـە: یاسـا لەپیش بوونە، هۆ پیش ئەنجامە، زەمەن پیش مادەیە، ئەگـەر کاتەکـەش یەکسـان بێت بەسـفر ئـەوا دوو ڕەهەنـدە یاسـاو مـادە (ئـەمروخلق) پێکـەوەو جمکـن وەك لەکۆنەوە فەشە ئۆگستین ووتیتی مادەو زەمەن پێکەوە دروست بووینـە، لەهـەردوو بار ئەوە ساغ دەکاتەوە کە یاسا ودیوە نامادیەکان حـوکم لەسـەر دیـوە مادیـەکان دەکەن.

لەو ئایەتەش (لله الأمر من قبل ومن بعد)هەر چەندە بۆنەی ئایەتەکە لە ڕەوتی جـەنگی رۆم وفارسـە، بـەڵام وادێتـە ئاسـۆ کـە یاسـاکان پـیش (مادەوسروشـت) هەبووبێ، بەلگـەی تـریش ئەوەیـە (خلـق-سروشـت)دەمرێ ولەناودەچـێ، کەچـی یاساکان نامرن، کەدەڵێ (کل شیء هالك)دەڵێ(شیء) واتە یاساو ئەمر ناگریتەوە.

لەوەوە فەیلەسوفانی ئیسلام یەخەگیری (نەفس)ببوون وبە نەمریان وەسف کردوە ئەو ئایەتە پشتیوانیانە ئەگەر مانای نەفس لە روح وئەمر نزیك بکەنـەوە، هەرچـی ئایەتی (قال ربنا الذي اعطى كل شيء خلقه ثم هدى) وادەردەخا کـە یەکـەم جـار سروشت ومادە دروست کراوە ئینجا بەرنامەی پـێ بەخشـراوە، واتـە قۆناغـەکانی

[1] تاريخ الطبرى ج1ص20

بوونەوەر واهاتوە: یاسا-بوون-بەرنامە. ساغ کردنەوەی ئەو پرسە کێشەی زۆر گەورەی فیزیای کوانتەمیمان بۆ چارەسەر دەکا بەتایبەتی ئەو بۆچوونە گەردونیانەی لەلایەن(رتشارد دوکینغز-وهم الإلـه)، (ستیڤن هۆکینگ-دیزاینی مەزن)...هاتون.

لە کۆتایدا یەکسان کردنی زاراوەی ئاینی(امر) وزاراوەی ئەکادیمی(یاساکانی سروشت) کێشەیەکی یەکجار زۆری نێوان ئەکادیمی وئاینی چارەسەر دەکا،..وەك لەدوای باسی دەکەین.

ئیستا وەڵامی پەیوەندی نێوان : مادی ونامادی، بونەوەر ویاسا، هۆو ئەنجام،.. زۆر ساناو کورت بۆوە، باسیکی دەکەین بە پێی پێویستیمان لێرە پیش ئەوەی بە قوول تر لەدوایدا لە دوو ڕەهەندی بوونەوەر باسی بکەین.

## یاساو مادە(ئەمر وخلق)

لەوەی سەروو لەگەورەترین کێشەی (سەرچاوەکانی ڕووداو) دەرچووین ئەوە لە هەمان کاتدا چارەی کێشەی (ئیجباروئیختیارە، زاتی ومەوزوعیە، هۆکاری دەرەکی وناوەکی )...لەگەڵ زۆر لای تر، دەرکەوت یاساکانی سروشت بریتیە لە فەرمانی خودا، دەرکەوت مادەو یاسا دوودنیای زۆر لیك جیان، یەکەمیان بەرجەستەونسبی وگۆڕاو..هەرچی دوەمە موتلەق چەسپاوو عەقلیە، نامادیە، لەکۆی گشتیش نامادیەکان حوکم لەسەر مادە دەکەن، نەگۆڕەکان حوکم لەسەر گۆڕاوەکان دەکەن، واتە ئەوەندە تیکەلی یەکترن ناتوانین لیکیان جیاکەینەوە، وادەردەکەوێ یەك بوون بن، یەك ڕەگەز بن، بۆیە تا ئەو ساتە هەمو فەلسەفەی مادی تەنها توانیویانە قسە لەسەر (مادە، خلق) بکا، نەیتوانیوە باس لە دیوی دوەمی بوونەوەر بکەن کە بریتیە لە یاساکانی سروشت(ئەمر)، لەبەر کەمی زانیاریان دانیان پێ نەهیناوە، لەوەش هۆڵباخ و مارکس دەڵێن مرۆڤ چیە

تەنهابریتیە لەسیٚ ڕەهەندی مادی (گۆشت و خوێن و ئێسك )[1]!

کەواتە ئەو کێشە گەورانەی لەسەردەمی یۆنانیەوە تا ئەو ساتە بە فەلسەفەی مادی چارەسەر نەکراوە بەڵکو پێچەوانەوە تاوەك (رالف سۆکمان )و(لامارتين) دەڵێن دەریای زانیاری زیادی کردوە لێواری نەزانینیش فراوان تر دەبیٚ، ئەوەکێشەیان لەگەڵ نیوەی بوونەوەر چ جای نیوەکەی تر هەر زانیاریەکیان نیە، ئەگەر فەلسەفەی مادی وستیڤن هۆکینگ وهاوڕییانی کە دەڵێن دەکریٚ ئێمە لەو جیهانە بگەین[2] بەفەرەزی بتوانن تفسیریکی پەیدا بوون بکەن بەرێکەوت یان بە جۆرێکی تر ئەوەندە زەحمەتیشە تا هاوتا(زەوجیەکەی —زدەکەی)پەیدا دەبیٚ، لەوەش گرنگ تر هەردوولا پێکەوە چۆن پەیدا بوون؟

ئەوە هەمو لەیەك لای بوونەوەر، لای مادی، بەشی دوەمی کە بریتیە لە یاساکان وئیمکان وبەرنامەی کە پێویستە بۆ بەردەوامی (بوون) یەکسەر لەگەڵ (مادە-خلق)یەکسەر یاساکانیشی لەگەڵ بێت، ئەگەر ئەوبونەوەرە بۆ یەك سات بیٚ یاسا بیت ئەوا ئەو بوونەوەرە تێك پێك دەشکیٚ، بیٚ ئامانج دەبیٚ، تەنانەت ئەگەر یەك یاسا نەبیٚ ببتە دوو ئەوا دیسان بوونەوەر گەندەل دەبیٚ وهەمو بەشەکان ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، کەواتە (بوون، مادە) و (یاسا) پێکەوە هەن، کەئەوە بۆ لیکدانەوەی پەیدابوونی ئەو بوونەوەرە بیٚ (دروستکەر، بیٚ خودا، بیٚ هیچ نامۆیەك..) ئەگەرەکان هەزاران جار زیاد دەکا ودەبێتە محال.

❊❊ ❊❊ ❊❊ ❊❊

ئیستا نۆرەی کێشەیەکی تری فەلسەفی گرنگە، ئەویش ساغ کردنەوەی ئەو (یاسا سروشتیە) ئاخۆ پەیوەندی بە خوداو بوونەوەر چۆنە؟ناوەندی پەیوەندی

---

[1] موسوعه الفلسفيه ص291

[2] دیزاینی مەزن ل46

ولەڕێزی فریشتەیە یان هاوبەشی خودایە؟یان خلق ودروستکراوەو پیک هاتوە لە جووتە دوودژ وچەسپاو نیە؟یان دیویکی تری بوونەوەرە؟..هەمو ئەوانە لە بڕگەکانی داهاتو چارەسەر دەکەین.

## نێوان خوداو بونەوەر(یاسای سروشتی)

### (ڕێخۆشکردن تا عەقڵ وەریگرێ)

ئەو پرسە گرنگ وکۆتاییە لەوی بەدواوە، لە پرسی (خالق) وەردەچەرخێینە(مخلوق)، بۆیە لێرەش پێویستمان بە(جووتە دژەکان)دەبێت، وەك بیرهینانەوە ئێمە باسمان لەوە کرد کە تەنها خودا بێ دژەو لە زەوجی پێك نەهاتوە، کەچی دروستمان نەگوتوە، ڕاستیەکەی ئەوەیەدروست کراوی خودا (زەوجین)، ئیستا کۆمەلێك سیستەمی تر لەوجیهانەی خۆمان دەبینینەوەلە(زەوجی)پێك نەهاتوە، وەك:یاساکانی سروشت، روح، ڕاستی، پەیام، تارادەیەك(بەدوودلێیەوە) زەمەنیش، پێش ئەوەی بێینە سەر ئەو بابەتە پێویستە پەنا بۆ قورئان ببەین بۆ چارەی ئەو پرسیارانە ئاخۆ ئەوانە(یاساکانی سروشت، روح، ڕاستی، پەیام) مادام زەوجی نین ئەدی خودان؟ یان هاوبەشی خودان؟ بەتایبەتی لە قورئان داوای لیکردووین (لاتشرك بالله شيئا)ئەوانە شت نین کەواتە ئەگەر بیکەینە شریکیش وەك ئاینە کۆنەکان مانگ وخۆر وسروشت و.. کردە شریك بۆ خواو دەیان پەرست لەو فەلسەفە قوولە هاتوە.

لە رسالەکانی ئیخوان سفا دەڵێت: پیکهاتەی ئاسمان(فریشتەوئەستیرە ورۆژو مانگ) نزیك ترین وپاك ترین دروست کراوی خوان بۆیە پەرستراون[1]، غەنوسیە

---

[1] رسائل اخوان الصفاء.. رقم:33 ص116

(ڕوحیەکان)یش پێیان وابوومادەوپیکهاتە زەمینیەکان پیسن ولەدروستکراوی خوانین بەڵکو لەدروست کراوی شەیتانە[1]، نەخێر، هەر بەو ئایەتەی سەروو وەلأمیەتی کەدەڵێ:(الا لە الأمر والخلق) واتە خلق وئەمر بۆ خوا دەگەڕێتەوە،شەیتان معارەزەیەکی سەرانسەری حوکمی خوانیە ،جارێ لە (امر)ی خودا هیچ دەسەلاتی نیە ،تەنها لە رەهەندی یەکەم(مادەو خلق)لەویش تەنها لەسەر زەوی و بۆ کۆمەلگە دەتوانێ معارەزەیی بەرجەستە بکات، لە بارەی روحیش (یسألونك عن الروح قل الروح من امر ربی..) یان روون تر هەمو ئەوانە یاساکانی سروشت وروح وپەیام ناگەڕێنەوە بۆسیستەمی خلق، بەڵکو بۆ سیستەمی فەرمانی خودا، ئینجا بە ئازادانە تر دڕ بەو بابەتە گرنگە دەدەین، بابزانین ئەوانەی(زەوج)ی و دژیان نیە چین؟ پەیوەندیان بە خودا چیە؟ دەکرێ بلێین ئەوانەن نێوانی خوداو بوونەوەر؟یان خوداو سروشت؟ لە برگەکانی داهاتو وەلأم وەرگرە.

[1] بۆلدیفیز-الإقتراب من اللة- بحث فی اصل الکون-ت:منیر شریف ص61

**ڕەهەندێکی تر**

## سیستەمە نازەوجیەکانی بوونەوەر :

لە پیشوو تر باسمان لە (شت-شیو)کرد وەك فراوان ترین چەمك لەو گەردوونە،ئیستا لەگەل خوێندنی سیستەمە نازەوجیەکان دەردەکەوێ (شت)فراوان ترین چەمك نیە ،چونکە نیوەی ئەو بوونەوەرە بەدەرە لە چەمکی(شت)،کە پێیان دەووترێ سیستەمی نازەوجی ،یان سیستەمە بیهۆکارەکان.

لەوەو پێش کۆمەڵێك سیستەمی زەوجیمان تۆمار کرد، ووتمان هەمو شتێك لەزەوجی پێك هاتوە، ئەوانە دیوی مادی بونەوەرن و نسبین دەگۆڕێن، ئیستا هەندێ سیستەم تۆمار دەکەین زەوجی نین، نەگۆڕن بەڵام بەرپرسن لەگۆڕان، ئەوان حوکم لەسەر مادە دەکەن، ئەوانە دیوی نامادی بوونەوەر پێك دەهێنن، بێ ئەوەی بتوانین سنور لەنێوان دیوی مادی ودیوی نامادی دیاری بکەین، کەواتەتەنها دووسیستەم هەیە لەو بوونەوەرە، زەوجیەکان شتن(مەخلوقن) مادین، نازەوجیەکانیش (ئەمرن) نامادین، ئەوانەی خوارەوەن نازەوجیەکانن:

## 1- یاسا

زۆربەی بەشەکانی سەروومان لەبارەی یاسا بوە،زیاتر مانای یاسای سروشتی دەدات، دەمێنێ بلێین : یاسای ڕاستەقینە چەسپاوو گشتگرە، هەموار ناکرێ، نابێ بەچاوی یاساکانی (دانراو-وەزعی) سەیر بکرێ، ئەوە هەر ناوی یاسای لینراوە ئەگینا یاسای راستەقینە لە هەمو بوونەوەر بەکارە، دۆخ وبێجگەی تیدا نیە،(لکل قانون شاذ) هەلەیە،یاسا شازی تیدا نیە ،ئەوە ریسایە شازی تێدایە،ئەگینا

گشتگرە، ئەگەر ئەوانەی تیدابوو ئەوا یاسایەکە بەتــەواوی نەدۆزرایتــەوە، نــاکۆکی وزەوجی تیدا نیە، پیك هاتوە لە حەتمی پەتی، مسەیەر، توخمی مەحالی تیدا نیــە، گەورە بچوك، ساردوگەرم، خیراو وەستاوی...تیّدا نیە، ئەگــەری نیــە، بــوونی فــرە ئەگەری لەکەمی زانیاری ئیّمە دیّت، بە پیــوەرە مادیــەکان بەشــتومەك نــاپیوریّ، بەکورتی زەوجی نیە، دژی نیە، هۆکاری نیە ،مــادی نیــە..ناکریّ بپرســی بــۆ ئــەو یاسایە هەیە ،یان بۆ ئیش دەکا ..بۆیە زالە بەسەر سەرانسەری بونــەوەر، لەدەســت کــەس نیــە ،ســەروەریەکی یاســایی موتلــەق هەیــە ،مانــای ســەروەری ئەوەیــە سازاوەلەگەل یاساکانی تر،موجازەفەی تیّدانیە، کەس ناتوانیّ بیوەســتیّنی (تحویــل) و(تبدیل)ی بکا،(ولا تجد لسنتنا تحویلا) (.. ولن تجد لسنة الله تبدیلا).کەواتــە شیّخ قەشە وکاهین ناتوانن نەخۆش چــابکەنەوە نــاتوانن دەمــی گــورگ ببەســتنەوە ناتوانن ڕووداو بگۆڕن ،ناتوانن ئەنجامی هۆکاریك بگۆڕن ،ئەگــەر پیّیــان کــرا ئــەوا یاساکان تیکدەگیریّن ،هەماهەنگیان نامیّنیّ ،لەلایەکی تــریش زانســتیش نــاتوانیّ حوکمی هیچ یاسایەك بگۆڕی تەنها دەتوانیّ سوود لەو یاســایانە وەرگــریّ ،کەواتــە سەروەری یاسای سروشتی بەمانای ئەو یاسایانە لە خوارووی کەس نیــە لەســەرووی هەموانە ،بۆ هەمو بەشەریەتیش وەك یەك هاتوە ،بۆ ئاین ونەتەوە جیاجیاکان ،کیّ بتوانیّ سودی لیّوەرگری دەشیّ،ئەو سودەش دەشیّ بەزولم بەکاری بهیّنیّ دەشــیّ بــە خیریشی بەکاربهیّنی ،لیّرەوە کیشەیەکی گەورەی پیّچــارە دەبیّــت ،کەلەســەردەمی (ئەبیقۆر)ەوە گۆتراوەو تا ئیستاش بەردەوامەو دەلیّن ئەو هەمو زولمە دەکریّ کەچی خوا بە جواب نایەت یان ئاگای لیّنیە یان نــاتوانیّ ،نــەخیر ،ئــەوە لــە چوارچــیّوەی سەروەری یاسایە ، سیفاتی زەوجی نیە بلیّین ڕیّژەییە ســودی جیاجیــای لیــوەرگیریّ ،نەخیر ،موتلەقە مادی نیە ،بیّهۆکارە وسەر بە سیستەمە نازەوجیەکانە .

# 2- پەیام

پیك هاتوە لە قورئان وڕێنمایە راستەوخۆكانی خوا بۆ پێغەمبەرەكان، یان فراوان تر بلێین بریتیە لە هەمو ئەو پەیامانەی لە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەكان هاتۆتە خوارەوە، ئەگەر یاسای سروشتی بۆ مادەو بوونەوەر هاتبێ، ئەوا پەیامیش بۆ كۆمەڵگە هاتوە، یەك ڕۆل دەبینین لەگەڵ جیاوازیەكی بنچینەیی، یاسای سروشتی بوار بەبەشەكانی سروشت نادات ئازادیان هەبێ، بەڵكو (مسەیەرن) چونكە عەقلیان پێ نەدراوە، هەرچی ئادەمیزادە لەو پەیامە ئازادی وئیختیاریان بۆ بەجێ هیشتراوە بە ئەندازەی ئەو عەقلەی پێیدراوە، هەرچی باقی گیاندارانی تریشە دووبارە ئازادیەكانیان بەو ئەندازەیەی ئەو هۆشیاری وعەقلیەیە پێیان دراوە، هەر بە پێی ئەو كەمە عەقلڵ وئازادیەیە لیپێچینەوەیان لەگەڵ دەكرێ، پەیامی خودا وەك یاساكانی سروشت دژی نیە، زەوجی نین،هۆكاریان نیە،نەمرن، بۆیە نە هەموار دەكرێ نە نسخ دەكرێ، گشت گرن بە ئاسۆیی وستونی، بۆهەمو زەمان ومەكانێك، بەشێكە لە ڕاستی، ئەگەر یاسای سروشت بزوینەری بونەوەر بێت ئەوا پەیامیش بزوینەری كۆمەڵگەیە، پەیام بەگشتی بە قورئانیشەوە لەگەڵ خلق جیایە كەلە زەوجی ودژ پیك هاتوە، پەیام وقورئان مخلوق نین بەڵكو ئەمری خودان، واتە ڕەهەندی یەكەم نیە بەڵكو ڕەهەندی دوەمە.

# 3- روح

زۆر كەمی لێدەزانین، تەنها دەتوانین هەندێ تیگەیشتنی مرۆڤ لەبارەی وەسفی (گیان-روح) هەلسەنگینین كە پەیوەندی بە(زەوجی) هەیە، روح وجەستە، روح ومادە لە پەیوەندیدان، نەك وەك شوبنهاوەردەلی دژ بەیەكترو ئیمام غزالیێ دەڵێ لێك جیان بەتەواوی (جوهر روحاني قائم بنفسه لا يتحيز وليس بجسم ولا منطبع في

الجسم ولا هو متصل بالبدن ولا هو منفصل عنه كما أن الله ليس خارج العالم ولا داخل العالم)، سپینوزاش دەڵێ یەك شتن [1]، وەك پەیوەندی خودا بە سروشت وینە دەكا، نەخێر پەیوەندی خودا بە سروشت لەڕێی یاساكانی سروشتە، پەیوەندی خودا بە سیستەمی ژیان ومرۆڤ لەڕێی ڕوحە، پەیوەندی روحیش بە مرۆڤ هۆشە (وەك پەیوەندی یاسا یە بە سروشت)، هۆشیش پەیوەندی سروشت ومرۆڤ دیاری دەكاتەوە لە ڕێی ئامراز..

بۆیەش ئەگەر جەستەی مادی مرۆڤ تێك بشكینی روحی تیدا نامینیٚ واتە لیك جیانین، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە كە مادام جەستە تیك شكاو روح نەما كەواتە روح وجەستە یەك مادە بن وەك فەلسەفەی ماركسی هەلمەتی هەرە گەورەی خستۆتە سەر ئەو پرۆسەیە، جەستە بیٚ روح (جماد)ە نەك(حیاة)، روحیش بیٚ جەستە ناكەوێتە (بوون) لەو بوونەوەرەی ئێمە، ماركسیەت وهەمو ئەوانەی نكولی لە روح دەكەن وهەر بە دیوێكی تری مادەی لیك دەدەنەوە هەرگیز ناتوانن جیاوازی لە نێوان ژیان وبیٚ ژیان، مردوو وزیندوو بكەن، ناتوانن پیناسی مردن بكەن، وا پێدەچی (یاساو سروشت) (روح وجەستە).. سیستەمی زەوجی (بوون) بن بە جۆرە گوزارشێكی تر كە جاری ناتوانین دیزاینیان بكەین،نازانین (خود)دیاری بكەین یان بەواتایەكی تر بەووردی ناتوانین ناسنامەی (زیندە)لە نێوان (عەقل وهۆش ورووح ونەفس)دیاری بكەین، نازانین خود لەكامیانەكەهاتوە(نحن اقرب منكم من حبل الوريد) ئەو (منكم) لەكێیە؟،كە دەلێن شیزۆفیر(انفصال شخصی) چ لە چ جیاكراوەتەوە ،یان كاتیٚ كەسێك خۆی دەكوژی ،لەناو خودی كوژراو تاوانبارو تاوانلێكراو كامەن؟ ئایا عەقل و هۆش ونەفس وروح كامەیان تاوان بارن كامەشیانە مەزلوم ؟ لەگەل زۆر پرسی تربەلام زانیاری لێیان مەحال نیە ، ئەوەی

[1] المثالية الألمانية ص226

دەتوانین بیلـێین روح زەوجـی نیـە، دژی نیـە، جەمسـەری چـەندایەتی وچـۆنایەتی وگەورەو بچووك ووەسفی خێراو ژماردنی بۆ ناکرێ، تەمەن و مردنی نیە،

# 4-زەمەن

لەفەلسەفەی کۆن تاڕادەیەك جولەو زەمەن ئەوەنـدە تێکـەلی مـادە نـەدەکران، وەك ڕەهەنـدو فاکتـەریکی سـەربەخۆ دەبینـرا، ئەرسـتۆ وئۆگسـتینو کۆمـەلێك فەیلەسـوفی تـر پێیـان وابـوە زەمـەن نـاگیرێ ڕابـووردوو ڕەت بـوەو، داهـاتووش نەهاتوەوئیستاش نیەو ناگیرێ، زەمەن خۆی دەخواتـەوە مـادام هەرچـرکەیەك دەڕوا خۆی لە خۆی دەڕوێنی[1].

لەسەردەمی هیگل و مارکس وئەنجلس و زانسـتی فیزیـای نسـبی هـەول دراوە وەسفی زەمەن و یاسا وڕاستی و.. هەر بە مادی وبەشێك لە چالاکی مادە بکرێت، دەیانەوێ بلێن زەمەنیش زەوجی و(تناقض) دەیگرێتەوەو لـە زەوجـی پێـك هـاتوە تەنها ئەوەیە زەوجی ودژ(لە زەمەن) کەمێك جیاترە، بەو شێوەدەست پـێ دەکـەن: هەموو کاتێکی زەمەنی بریتیە لە ڕابوردوو وداهاتوو.

زانیاری زۆر زیاتر پێویستە بۆ گوزارش کردنی (زوج)ی لە زەمـەن، تاڕادەیـەکی زۆر پێویستی بە (نظرية النسبية) هەیە، بۆ ئـەوەی بزانـرێ کـە (ئیسـتا) سـنوری نێوان ڕابوردوو وداهاتوو نیە بە موتلەقی، بەلکو هەمو کاتێـك داهـاتووڕابووردوو تێکەل بوە لەو بوونەوەرە[2]، هەرچەندە فەیلەسـوف ئامیـدی دەلێ (ئیسـتا)بەمانای کۆتایی زەمەن یان دوا پەیوەندی نێوان ڕابووردوو وداهاتوە[3].

---

[1] المثالية الألمانية ص121

[2] براتراند راسل-الف باء النسبية –ترجمة: فؤاد كامل، دار الثقافة العربية ص43

[3] المصطلحات الفلسفية للفيلسوف الامدى ص87

كاتێ دەلێین ئیستا ئەوە لەلای خۆر 8 خولەك وشتێك ڕەت بوە، لای ئەستێرەی ئەلفا كونتوراس 2سال ونیو تێپەڕیە، لای مجرەی ئەندرۆمیدیا زیاتر لە 2 ملیۆن سال تێپەڕیە..، واتە كاتی دەلێین ئیستا لێرە ئەوا لای ئەندرومیدیا 2ملیۆن سالی ماوە بۆ ئیستای ئێمە.

بەو شێوەیە ڕابووردوو وداهاتو بە زەوجیانە تێكەلی یەكتر بووینە، لەو بونەوەرەو ڕەهەندی زەمەنی پێك هێناوە، ئینجا ئەو زەوجیە لە پەیوەندی نێوان زەمەن وجولانەوە وزەمەن وخێرایی وبارستایی و..بەو شێوەیە تێكەلە.. ڕاستیەكەی وانیە، ڕاستە كە ئێمە دەلێین ئیستا ئەوا واقعی مەوزوعی جیاجیای ڕابووردوو تێكەلیەتی بەلام دووخالی گرنگ هەیە:

1-لەو زەوجیەی ڕابووردوو داهاتوو كوا توخمی داهاتوو نەبوو، مەحالە بە پێش زەمەن كەوتن، ئەو تیۆرەی خیراتر لە ڕووناكی وبە پێش زەمەن كەوتن هیچ ئەسل وئەساسێكی نیە تەنها (خەیالی علمە)، كەواتە نەبوە زەوجی (كە پیك بێت لە ڕابووردوو وداهاتوو)، كوا جەمسەرەكانی زەوجی ؟كوا سیفاتەكانی زەوجی كەلەپێشوو تر باسمان كرد؟

2-ئەوەی تێكەلە ئەوە لە ئەسلدا وانیە، كاتی دەلێین ئیستا تەواوەو موتلەقە، كێشە ئەوەیە ئامرازی گەیاندن موتلەق نیە، ئەو كێشەیەی (تناقض)دروست دەكا یان ئەوەی نایەلی (ئیستا)دیاری بكەین لەگەردوون ئەوە كێشەی نێوان (واقیع) و(ڕاستی)یە، یان زانیاری ئێمەو ڕاستیە، لەواقیعدا ئیستا نیە، بەلام لە(راستیدا)هەیە، وەك كێشەكەی(هایزنبگ1910-1976)كەپێی دەووترێ (مبدأ اللادقه- **indeterminacy principle**) كە لەیەك كاتدا شوین وخیرایی ئەلەكترۆن دیاری ناكرێ، ئەوە بە توانای ئێمە دیاری ناكرێ ئەگینا لە (راستی)دا لەخودی ناو ئەتۆمەكە هەیەو دیارە، بەهەمان شێوە بۆ گەردوونیش، ئەو واقیعەی ئێمە گەردوونی پێ دەبینین تەواو نیە، ئەگەر

خەبەرەکی گەردەلوولەکی خۆرمان سەعات 10 پیگەیشت مانای وانیە ئەوە ئەو کاتە ڕوویداوە وەك لە واقیـع وزانیـاری ئێمـە دەردەکـەوێ، بـەڵکو لـە شوینی خۆی لەناو خۆر 8خولەك پیشووتر ڕوویداوە، ئـەوە زانیـاری ئێمەیـە پێی ناگا، کێشە لە توانای ئێمەیە وەك (اللادقە)کە، کەواتە چ پەیوەندی بە زەمەن هەیە، کێشەکە زاتیە نەك مەوزوعی، کێشەکە زانیاری ئێمەیە نـەك ڕاستی، تەنانەت ئەو گۆڕانەی بەسەر زەمەن دیت لە خیرایی (وەك لە تیۆری نیسبی ئاینشـتاین هـاتوە) لـەدوا لیکدانـەوە هـەر زاتیـە، ڕاسـتە لەهـەر ئەستیرەوکەشکەشان وشوێنێکی تری گەردونی زەمەنی جیایە، شـوین هەیـە شەورۆژی 4سەعاتە، شوین هەیە شەورۆژی یەك سالە.. بـەڵام لـە کۆتایـدا یەك زەمەن هەموی بەڕێوە دەبا، هەر هەمو زەمەن بە ئاڕاستەی خۆی دەڕوا لە ڕابوردوو بۆ ئیستاو داهاتوو، بەو شێوەیە زەمەن پیکهاتەو زەوجـی نیـە، دژی نیە،خۆی مێژووی نیە بەلام مێژوو بۆ مادە دروست دەکا، ئـەدی چـیە وای کردوە زەمەن زۆر خیرا نەبێت وسنوردار بێـت لـەوەوە (دوودلیەکەیـە)، ئەگەرزەمەنیش بەشێك بێت لە یاسای سروشتی(یان بە فراوان تربەشێك بێت لە ئەمری خودا) ئەوە ئەو وەڵامەی ناوێ، ئەگینا ئەو پرسیارە وادەکا بیر لە زەوجی بکەینەوەو نـەشمان دۆزیتـەوە،کاتێ (کۆئۆردینـەیتی –احـداپیات)ی ڕووداوێك بە چوارخال(یان چوار ڕەهەند) دیاری دەکرێت (سـێیان) مەکانیـە ،چوارەمیان زەمانە ،سێیەکان سیفاتی زەوجی بەئاشکرا پێـوە دیـارە بـەلام چوارەم وای لێنابینرێ،لەوەوە ئینتمای سیستەمی نـازەوجی لێدەردەکـەوێ، کەچی کە زمان دەبەسترێتەوە بە (جولە)جاریکی تر جولە شـێدەکرێتەوە بـۆ (زەوجیەکان)،ئەو کاتە زەمان نزیك دەبێتەوە لە سیستەمی زەوجی، لـەوەوە

(ئیمامغزالی)دوودل نـەبوە لەوەسـفی زەمـان بـە (مـەخلوق)ودەلێ(الزمـان حادث مخلوق)[1] ،لەکۆتایدالە نێوان (خلـق) و(ئـەمر) لـەدوەمیان نزیـك تـرە هەروەك (مقدسی) وای وەسـف کـردوە :(..وبعضـهم یقـول أن الزمـان لـیس بشيء) وا مانا دەبەخشێ کە زەمەن مادی نەبێ[2]،کەچی لە هەمان کاتیشدا سیفاتەکانی(امر —یاسا)تەواو هەلناگرێ،یـەکێ لـەو جیاوازیـە بنچـینەییە ئەوەیە یاسا تەمەن ومێژووی نیە کەچی زەمەن مێژوو بۆ مادە دروست دەکا .

* * * * * * * *

هەمو ئەوانەی سەروو(سیستەمە نازەوجیەکان )کە شەبەنگی رژێمی (امر) پێك دەهێنن، دیوێکی بوونەوەر پێك دەهێنن، دیوەکەی تر مادەیە، مەخلوقـە، کەواتـە دەکرێ بلێین بوونەوەر لەدوو ڕەهەند پێك هاتوە، مادەو یاسا، یـان (ئەمروخـەلق)، ماکینەی کارکردنەکەشی بریتی دەبـێ لـە هـۆو ئـەنجام، بەشـیوەیەك هۆیەکـە لـە (ئەمر-نامادی-یاسا)دەردەچـێ، ئەنجامەکەشـی بریتیـە لـە(خلق-مـادی-بـوون)، کەواتــــە ئــــەو بونــــەوەرە دوو ڕەهەندەیە؟چـــۆن مـــرۆڤ دوو ڕەهەنــــدی ڕووح وجەستەیە،بوونەوەریش بەجۆرێکی تر دووڕەهەندیە، لەدوای دیاری کردنی ئـەو دوو ڕەهەندە زیاتر لە پەیوەندی (خوداو بوونەوەر) نزیك دەبینەوە، بابزانین ڕەهەندەکانی بوونەوەر چین؟.

---

[1] غزالی- تهافت الفلاسفة ص110-

[2] المطهر بن طاهر المقدسی – البدء والتاریخ ص9

# ڕەهەندەكانی بوونەوەر(كۆدەكانی گەردوون)

زانستی مرۆڤایەتی بە مەنهەج وشـێوازەوەكاریگەرە بـە بنـەما لۆژیكیـەكانی كتێبە ئاسمانیەكان، بۆ هەر قۆناغیكی گەشەی زانستی مرۆڤ جۆریك لە پۆلین كردن بە خۆوە دەبینی، لەو سەردەمە زیاتر شێوازی ئەكادیمی سەرمەشق هەژمار دەكرێ، زانیاریەكانی كتێبە ئاسمانیـەكان جـارێ وادەردەكـەون بەئـەدرێس و پـۆلین نـەبێ، ئەدرێس لای ئێمە لەوە دێت لەو دەمە چ گرنگە ئەدرێس بەوە بێت، مەرج نیە ئەو ئەدرێسە لای كتێبە ئاسمانیـەكان وا گـرنگ بێـت، جاروایـە بابـەتێك لـە زانیـاری مرۆڤەو بە چەندین هەزار لاپەڕە لەلایەن یـەك كـەس نوسـرایەوە لـەوێ بـە چـەند ئایەتێك زانیاری و ڕێنمایی مەنهەجی داوە.

ئەو بابەتەی ئێمە (ڕەهەندەكانی بوونەوەر)لەلای زانیاری مرۆڤ زۆرئالۆزو بالایە، كە بریتیە لە دۆزینەوەی توخمە هـەرە بنچـینەو پەتیـەكانی بوونـەوەر، كـە بـاقی بونەوەری لە شتومەكە جیاكان، لەچـالاكی و جولـەو گەشـەی ژیـان و بـێ ژیـانی سروشت،..لەسەر بنیات نراوە، لەو بارەیەوە كۆمـەڵێك ئـەكزیۆم دراوە، لەكۆنـەوە ناوی ئاو هاتبوو وەك ئەو ڕەهەندە، دوای ئاگر، ئینجا بوە چوار تـوخم (ئـاو، گـل، تیشك، هەوا)، لەو سـەردەمە هـەرە سـاناكەی بریتیـە لـەو چـوار ڕەهەنـدە بـاوە كـەبریتین لـە: ڕەهەنـدی(x-y-z)لـە دووریـەكانی بۆشـایی(مەكان) ورەهەنـدی چوارەمیش زەمەنە(T)، ئەوە زیاتر گوزارش لە چـەندایەتی وئەنـدازەیی بوونـەوەر دەكا ناتوانی گوزارش لە تەواوی جم وجۆلە بوونەوەریەكانی بینراو نەبینراو، مـادی ونامادی، جەستەیی وروحی،..باقی تەوەرە زەوجیەكان بكەن، دەتوانین بڵـێین ئـەوە گوزارش لە دیوی چـەندایەتی بوونـەوەر دەكـا بـەڵام نـاتوانێ گـوزارش لـە دیـوی چۆنایەتی بكا.

هەر لە چوارچێوەی ئەندازەی بوونەوەر دەبینین لەو فەزایەی چوار ڕەهەندیە ناتوانرێ (ڕەگی سالب 1)لەو فەزایە دیاری بکرێ، واتە ئەو فەزاچوار ڕەهەندیە ناتوانی نوینەرایەتی هەموو بوونەوەر بکات، لەوەوە کۆمەڵێك سیستەمی ڕەهەندی تر گەلالە کراون، لەوانە هارلوشاپلی(1885-1972) لە کتێبیکی بە ناوی (الکون والإنسان) دەڵێت ئیستا هەمو لایەك(بە تایبەتی گەردوون ناسان) کۆکین کە بوونەوەر پیك دێت لە چوار توخمی بنچینەیی(مادە، ووزە، زەمان، مەکان)، هەرچی (پۆخۆڤن)ە دەڵێ(مادەو ووزە)، لەودەمە لەهەموان چالاك تر 11ڕەهەندەکەی (**m-theory**) فیزیای کوانتەمە.

ڕەنگە توێژینەوەیەکی تر بێت بڵێ ئەو ڕیسا زەوجیانەی لە قورئان هاتوون (سیستەمە دژیەکانی وەك :گەورە بچوك، خیرا هیواش، مردن ژین،..) ئەوانە ڕەهەندەکانی بنچینەیی بوونەوەرن،..لەگەڵ زۆر ئەگەری تر، ئەوەی مرۆڤ گەلالەی دەکا لە باش ترین دۆخیدا زیاتر گوزارش لە دیویکی بوونەوەر دەکا کە دیوی مادیە، گوزارش لە یەك ڕەهەندی بوونەوەر دەکەن. زیاتر لەوەش ئەو دیوە تەسك تر دەبێتەوە بۆ پسپۆری وشارەزایی ئەو فەیلەسوفە یان ئەو مدرەسەیە، وەك لە فاکتەرەکانی گەشەی کۆمەڵگە بینیمان مارکس وفرۆید ودۆهرینگ وهیگل وکارلیل..هەریەکە فاکتەریکی کردبوە یەکلاکەرەوە کە بریتی بوو لە فاکتەری پسپۆریەکەی، مارکس دەڵێ فاکتەری ئابوری بزوینەری گەشەی کۆمەڵگەیە کەچی فرۆید دەڵێ نەخیر جنسە..،کاتی بیرکاری پەرەی سەند و دۆزینەوەی تازەی تیا دەرکەوت و پەلی ئاوێشت بۆ زانستەکانی تر، فەلەکناس (جیمس جینز)دەڵێ خوداخۆی گەورەترین بیرکاریوانە[1]، دیسان (فۆریر)و زۆر لە زانایانی بیرکاری سەروەریەکەی (فیساگۆرس)یان زیندوو کردەوەوەکە وای بۆچووبوو هەموو شتێك

---

[1] بۆل دیفیز-الإقتراب من اللة ص163

لەو جیهانە بریتیە لە ژمارەوبیرکاری، فۆریرووتی هەتا مۆسیقاش بە هاوکێشەی بیرکاری گوزارش دەکرێ هاوکێشەیەکی بۆ مۆسیقاش داڕشت: $Y_n = y_1 \sin(n_1) + y_2 \sin(n_2) + \ldots$ بەو شێوەیە پسپۆری وای کردوە ئاوا حوکمی تەسك بدەن، بۆیە لەو بابەتە گەورەیە عەقڵی ئێمەی مرۆڤ زۆر لاوازە لە چاو دۆزینەوەی ڕەهەندی بوونەوەر، کەواتە دەبێ بچین بەلای پەیام وبەلگەنامە کۆنەکان.

لە قورئان باس لە دوورەهەندی بنچینەیی دەکا کە هەردوو دیوی بوونەوەر بە هەمو ناوەڕۆك وسیستەمە زەوجیەکانیش دەگریتەوە، ئەویش لە پیشوو تر بە جۆریکی تر باسمان کرد بریتیە لە :(1-خلق 2-ئەمر)یان بە گوزارشێکی ئەکادیمی بریتیە لە مادە ویاسا یان وەك لەسەروو سیستەمە زەوجی وسیستەمەنازەوجیەکان، بەو شێوەیە هیچ ناسنامەیەك لە بوون وجوولە نامێنی بەدەر لەو دووڕەهەندە، لێرە (نامادی)رەهەندی دوەم (امر-یاسا..)دەگریتەوە ئەویش بوونە، بە پێچەوانەی تیگەیشتنی کلاسیکی (نامادی) و(نەبوون-عدم)یەکسان کرابوو بە حۆرێك (مادی ونامادی) هاوتای (ناسوت ولاهوت) دانرابوو، ناسوت دنیا ولاهوتیش دواڕۆژ، کەچی لێرە (نامادی)یش بوونە، خەریکە بلێین بوونی هەرە بنچینەیی بونەوەرە. ئەو دوو ڕەهەندە تەنها رەهەندی ئەندازەیی یان فیزیایی یان کیمیایی.. نیە، بەڵکو رەهەندی بوونەوەرن بۆ (جان ومان)، بۆ ئەو ئاسمانانەی کە لەگەڵ یاسای ئاسمانی ئێمە لیك جیان، بەڵام جارێ شی کردنەوەو زانیاری کەمە چۆن وەڵامی پرسیاریکی زۆر لەو بارەیەوە بدەینەوە، لەهەموی گرنگ تر:

ئایا ئەو دووڕەهەندە دەتوانێ (نە-بوون)یش بگریتەوە کە وامەزەندە دەکرێ بەشدارن لەو بوونەوەرەی ئێمە؟بکریتە سی کوچکەی(معدوم-مخلوق-مأمور)؟

چەندە دەتوانین زەمەنیش بخەینە نیو ئەو دووڕەهەندەو چۆن؟

پەیوەنـــدی ئـــەو دووڕەهەنـــدەو ڕێســـای زەوجـــی چـــیە، ئایـــا دەتـــوانین بڵـــێین ئەوسیستەمەی زەوجی بریتین لە تەوەرەکانی بوونەوەر نەك ڕەهەند؟.

کێشـــەی تـــر ئەوەیـــە لـــە 4 رەهەنـــدی مـــەکانی وزەمـــانی دیـــاری کردنی(کـــۆ ئۆردینەیت)ی هەر تەنیك بەهۆی زانیاری ئـــەو 4ڕەهەنـــدە دیـــاری دەکـــرێ، کەچـــی لەوەی ئیستای دووڕەهەندی زۆر ئالۆزترە، دەبێ لە 3 ڕێســـایەکەی جولـــەو گەشـــەو ئەو دووڕەهەندە (سلم الترتیب)ی لە پیشووتر دیاریمان کرد لەبارەی تەمەن وخێرایـــی وخۆراگری و گرنگی و توخمی هاوسەنگی و..شیوە کۆئۆردینیتـــەکی بـــە دیزاینـــەکی جیا بۆ هەمو شت ومەکەکان پیك دەهینێ،... ئەوەی ڕوونە بوونەوەرو سروشت بـــە پێی قەبارەی بەشـــداریان (ســـلم الترتیب)ێـــك پێـــك دەهێـــنن جیـــا نیـــە لـــەو (ســـلم الترتیب)ەی لە سەروو پیك هات، واتە بە پێی ڕێز بوون لە خـــوارەوە بـــۆ ســـەروو(لە جمادەوە بۆ نبات وژیان..عەقل)ئەوا بەرەبەرە ڕەهەندی دوەم زیاد دەکـــاو ڕەهەنـــدی یەکەم کەم دەکا، کەمێك ویچووی پەیوەنـــدی نێـــوان فاکتـــەری دەرەکـــی وناوەکیـــە لەکاتی پرۆسەی گەشە، وادەردەکەوێ کە تارۆلی فاکتەری ناوەکی زیاتر بێـــت ئـــەوا رۆلی ڕەهەندی یەکەم ومادی کەم تر دەبێتەوە ورۆلی ڕەهەنـــدی دوەم ورۆلی روحـــی زیاد دەکا، ئەو کاتی پەیوەندیەکان بە زەحمـــەت تـــر گـــوزارش دەکـــرێن لـــە شـــیوەی یاسای سروشتی وهاوکێشەی بیرکاری.

ئەو پرسیارانەو زۆری تر بە جێ دیلین بۆ شارەزاتر لەو بوارە، بـــەڵام بـــەلای کـــەم دەتوانین پەیوەندی نێوان ئەو دووڕەهەندە لـــە بـــەڕێوەبردنی بوونـــەوەر کـــەمێکی لێ بـــاس بکـــەین، ئەگـــەر فەلســـەفەی میســـالی (بـــارکلی -فیختـــە -مـــاخ -بەشـــیك لەوجودی..)نکولی لە مادەو واقعی مەوزوعی دەکەن، یـــەك ڕەهەندیانـــە دەڕواننـــە بونەوەر، جۆرە (وحدە الوجود)ی روحی پەتیە، ڕەنگە(وحـــدە الوجـــود)ی ئەرســـتۆیی کەمێك میان ڕەو تر بـــێ کـــە پێـــی وابـــوو بوونـــەوەر وخودابەڕێزبەنـــد دامـــەزراون، بەشیوەیەك خودا لەسەرووی هەموانە(هۆکاری یەکەم یـــان شـــەپۆلی یەکـــەم)و دوای

ئەو عەقڵ دیت دوای جەستە وئاژەل ودرەخت و..هتد، هەمان ئەو ڕێزبەندیەلە فەیلەسوفانی ئیسلام فارابی وئیبن سیناو تاڕادەیەك موعتەزیلە بەشیوەیەکی زیاتر روحی باس لەو (هەرەمەی بوونەوەر وخودا)دەکەن[1]، ئەو ڕێزبەندیە زۆر نزیکە لە فقهی ئیسلامی ئەو فەرمودەیەی (ما بين السماء إلى الأرض مسيرة خمسمائة عام، وما بين كل سماء إلى الأخرى خمسمائة عام، وما بين السماء السابعة إلى الكرسي مسيرة خمسمائة عام، وما بين الكرسي إلى الماء مسيرة خمسمائة عامٍ، والعرش على الماء، والله على العرش ويعلم أعمالك)[2].

له ئینجیلی برناباو له قاموسی مسیحی هەمان زانیاری ئاوا هاتوە، هەرچی فەلسەفەی مادیە ئەویش بەیەك ڕەهەندی دەڕوانیتە بوونەوەر، پێی وایە هەمو جم وجۆل وچالاکی وپەیداکردن و..بریتین لە چالاکی مادە وەك لە (الفلسفة والفيزياء) ئاوا تیکڕای ڕای فەلسەفەی مادی کۆکردۆتەوەوهاتوە:(جميع الأشياء والظواهر في الطبيعة ترتبط ببعضها خلال مادتها، وهذه المادية الموحدة للعالم، وحدة العالم المادية)[3]ئەوە سەرچاوەی (وحده الوجود)ی مادیە.

زانستی نوێ بەتایبەتی فیزیای کوانتەمی کەدەڵێ گەیشتینە هەمو شتێك وهەر لە هاوکێشەکەی شرۆدنگەرو (نظرية كل الشيء)ی جودل و ئاینشتاین وستیڤن هۆکینگ..هەموی لە باش ترین دۆخیدا یەك ڕەهەندیە، ئەوانە تەنها دانیان بە مادە هینا گوایە سەرچاوەی هەمو بونەوەرە. برۆنۆ دەڵێ:(المادە جوهر الحقيقه)، لە مادیەی دیالکتیکیش وەسفی (هۆش بە بالا ترین ڕێکخستن دەکا)، بەشیکیان بە (سلم الترتيب) وەسفیان کردوە بەشێکیش بە(سلم التطور) بەڵام هەمو ئەوانە گوزارشە لە یەك دیوی بوونەوەر، هەرچەندە سپینوزا هەولی داوە یاسای سروشتی و

---

[1] ابو نصر الفارابى –كتاب السياسة المدنية، تعليق:د فوزى النجار ص31-

[2] ابن قيم- اجتماع الجيوش الإسلامية ج1ص37، ص43

[3] الفلسفة والفيزياء ج1 ص50

یاسای خوای لیك جیا بکاتەوە، دەشلێ پەیام ویاسای سروشتی یەك ئەسل نیە، سروشتی بەشەرو یاسای خوای لیك جیان، بەلاّم لەو لایە وەك یەکەم کەس روح ومادەی خستە ناو یەك قاوغ، شوبنهاور دەلّێ سروشت گەشە دەکاو یەکەم بەریشی رووحە. لودفیج بوخنر(1824- 1899م) دەلّێ ئەوەی هەیە ژیان وبێ ژیانەوە بریتیە لە (مادەوهیز) هەردوکیشیان مادەن وبونەوەر یەك ڕەهەندە، هیگل دەلّێ لەدوا قۆناغی گەشەی سروشت دەگاتە روح [1]، بەشێك لە مەزهەبی ئاینی بە جۆرێك ئەو ڕایە یان هەیە - ابن عربي دەلّێ: (فما في الوجود مثلٌ، فما في الوجود ضد)، ئەگەر چی ئەو فەیلەسوفانەی سەروو روح ومادەیان یەك خستوە کەچی دیکارت وەك دوو ڕەهەند گوزارشی کردوە، هەردوولای میسالی ومادی هاوبەشن لەو هەلّەیەی یەك رەهەندی بۆ بوونەوەر چووینە.

ئەوەی زۆر نزیك بێت لەو ڕاستیە ئاینیە دیکارت بە دوو رەهەندی باسی کردوەو دەلّێت: (العالم يتألف من جوهري مادي واخر روحي)[2]، جاروایە لەکاردانەوەی مادی هەندێ لە ئاینیەکان بە جۆرێکی تر کەوتونە نێو یەك ڕەهەندی وئەویشیان داوەتە پال کاری خوا، زۆر لە زاناو فەیلەسوفی گەورەش دانی بەمادە هیناوە لە بوونەوەر، بەلاّم کارو بەڕێوەبردنیان ڕاستەوخۆبۆ خوا گێڕایتەوە، هەریەکە لە فیساگۆرس وئەرستۆ ودیکارت وکیپلەر وگالیلۆ ونیوتن و پۆپ و...زۆربەیان ووتویانە ئەوانەی ڕوودەدا لەوبوونەوەرە کاری خوان، ئەوەش لە کۆتاییدا مانای دوو ڕەهەندی نیە.

دەگەڕێینەوە سەر دیکارت مادی و روحی داناوە، بەلاّم ئەوە تەنها پۆلی ژیان دەگریتەوە نەك هەمو بونەوەر، ئەگەر دیکارت فراوانی بکردبایە (یاسا یان ئەمر)ی لە جێی روح دابنابایە زۆر ووردو دروست دەبوو، فارابی وابن سیناش وەك دیکارت

[1] المثالية الألمانية ص184، ص214، ص119
[2] الفلسفة والفيزياء ج1ص46

نەیتوانیوە ئاوا فراوانی بکەن ئەوان لە جیاتی (روح) ووتویانە(نفس) نەمرە[1]، هیگڵیش (ڕوح) و (نفس)ی یەکسان کردوەو دەڵێ: ڕوح دیالکتیکیانە گەشە دەکا، لە (الموسوعە السوفیتیە) هەمان یەکسانی بە ڕوح و نەفس دەلێ (الروح كلمە لاتینیە تعنی النفس)[2]ڕوون دیارە نفس لە سایکۆلۆجی لاتینی نزیکە نەك رووح، لە (فصل 123- ئایەتی (5)ی ئینجیلی برنابا باشتری بۆچووەو دەڵێ: ڕوح عەقڵی هێناوە بۆ ئەوەی جەستەو هەست و نەفس یەکبخا. ئیمام غزالیش هەر وای بۆچوەو دەڵێ (..أن النفس الإنساني جوهر روحاني قائم بنفسه..) لە ئینجیلیش بە جۆرێکی تر پلەی(روح) وابەرز کرایتەوە تا ئاستی خودا، (الله روح.والذین یسجدون لە فبالروح والحق ینبغي ان یسجدوا)[3] خوا روح نیە بەڵکو — قل الروح من امر ربی- واتە بەشیکە لە امر..) لەولایەش (نفس) ناگاتە پلەی روح وەك لەکۆماری ئەفلاتونیش واهاتوە (..القوتان المتضادتان فی النفس، هما قوةالعقل وقوةالشهوانیة..)[4]، لەلایەکی تر هەندێ زانای ئیسلامی وەسفی خودا بە (عەقڵی پەتی) دەکەن و وا هاتوە: (ولیس هو شیئاً من الأشیاء بعده وهو عقل محض)[5] لەڕاستیدا خودا نەڕوحەو نەعەقلە، بەڵکو عەقلیش داهێنراوی خواییە لە روح، روحیش بەشیکە لە ئەمر، نەفس و ڕوح زۆر لێك جیان، بە هەڵەیی یەکسان کراون، یان لەگەڵ ڕەهەندی یەکەم تێکەڵی دەکەن بە گوزارشی (جسم اللطیف)، (طاقة)، (شيء)، (مخلوق من مخلوقات الله)... هاتووە لەلایەن ئیمام غەزالی و ئالوسی و

---

[1] **د. سعود بن عبد العزیز الخلف-** قول الفلاسفة المنتسبین للإسلام في توحید الربوبیة —المبحث الأول ص21، ص87

[2] الموسوعە السوفیتیە ص231

[3] یوحنا اصحاح 4 اية:24

[4] **جمهوریة افلاتون ص137**

[5] قول الفلاسفة المنتسبین للإسلام في توحید الربوبیة —المبحث الأول ص13-

ابن تیمیه و ابن قیم و ئیمامی نەوەوی،[1] لەگەڵ (نفس)یش لێك جیان، هەروەك لەلایەن زۆرێك لە زاناو فەیلەسوفی ئیسلام یەکسان کراون، تەنانەت ابن تیمیه دەڵێ: (الروح مدبرة للبدرن التي تفارقه بالموت هي الروح المنفوخة فيه، وهي النفس التي تفارقه بالموت) ئەوەش لەلای ئیبن عباس وا گواستراوەتەو: (ان في ابن آدم نفساً وروحاً بينهما مثل شعاع الشمس، والنفس هي التي بها العقل والتميز، والروح هي التي بها النفس والتحرك، الا ان النفس والروح يتوفيان عند الموت في حين ان النفس وحدها هي التي تتوفى عند النوم) .

کەچی ڕوح نامرێ بەڵکو لەلەش جیادەبێتەوە، بەڵام نەفس دەمرێ (كل نفس ذائقة الموت)، روح نە زەوجیە و نە دژی هەیە، نە سوکە و نە قوڕس، نە جسمە و نە شتە، نە مخلوقە و نە ووزە،.. بەڵکو یەکێکە لە یاساکانی خودا (واتە: ئەمرە نەك خلق، لە ڕەهەندی دووەمە نەك یەکەم، (وكذلك اوحينا اليك روحا من امرنا) واپێدەچی یاساکان بنچینەی ڕەهەندی دوەم(امر)بن ،جاریکی تر گیانێك لەناو کۆمەلیك یاسادروست دەبێت کاتێك یاساکان سیستەمێك پیك دەهێنن ،واتە روح چڕبوونەوەی زیاتری یاسایە ،یاسا بۆ سروشت چۆنە روحیش بۆ یاسا ئاوایە ،کەواتە دەکرێ بڵێینە روح یاسای بالا ،دەتوانین بلێینە یاساش روحی سەرەتایی،ڕەنگە لەوەوە ووترابێت هەمو سروشت رۆحدارە،یان دەتوانین بلێین کۆمەلگەی ڕێك رۆحدارەیان ئەوەی پێی ووتراوە (ئومە)رۆحیك دروست دەکا لە نیویان ئەو کاتی بەهۆی ئەو رۆحەیە ( مَثَلُ المؤمنين في تَوَادِّهم وتراحُمهم وتعاطُفهم: مثلُ الجسد، إذا اشتكى منه عضو: تَدَاعَى له سائرُ الجسد بالسَّهَرِ والحُمِّ)،کەواتە رۆح دەرچوون لە لەش مانای تیکچوونی ئەو چڕبوونەوەی یاسا،بەو شێوەیە ڕووح سیستەمی بەلای ڕەهەندی دوەم پیك دەهێنێ .

---

[1] بۆ ئەو بۆچونانە بڕوانن: غەزالی (احياء علوم الدين) ص3 ح3، ابن تیمیه (مجموع الفتاوی)ص154.

زۆربەی زانایان وزانستی نویش بە جۆرێکی تر دان بـە دوو ڕەهەنـدی بوونـەوەر دەهینن، کیپلەری فیزیازان وەك دیکارت ئەو وەسفە دەکـا، فیزیـازانی کوانتـەمی ئیستاش زۆر بۆ ئەوە دەچن کە بۆ هەر هاوکێشەیەکی مادی هاوکێشەیەکی تەریبی نامادی لەگەلە، ئەوە دوو ڕەهەندیە بەڵام پەیوەندیەکەیان بە هاوتایی هەژمارکردوە نەك لەیەك کیان، مادام هاوکێشە لەرووی فەلسەفی بەیاسا هەژمار بکرێ ئەوا ئەو وەسفە ڕاست نیە، چونکە هاوکێشەی مادی نیە، هاوکێشەیەکی نامادی بەشەکانی مادی بەستۆتەوەبەیاسا..وەسفەکە واراستەکە مادی ونامادی ئاویتەن نـەك هاوتـاو تەریب، بە گشتیەکەی ئەوەیە (امر) نەمرە، لەڕاستیدا پەیوەنـدی نێـوان ئـەو دوو ڕەهەندە، ئەو دوودیوەی بوونەوەر، پەیوەندی نێوان(بوون ویاسا)، (مادەو نامـادی) (جەستەو روح) (خلق وئەمر)..بریتیە لە کارنامەی بوونەوەرکە لە قورئان بە(هدی) ناوی بردوە، لـە فەلسـەفەش بـە (خـروج مـن الفعـل الی القـوە) یـان بـەزاراوەی (امکانیە) دەربڕاوە، بە جۆرێك کە مادە (خلق) ە بە هـۆی یاسـاکانەوە دەکەویتـە کار، بەو هۆیەوە مادە گیانی جولەو گەشەی دیتە بەر،کە دەلـێن (جولـە) مـەرجی (بوون)ە،بەبێ جوولە بوون نامێنێ ..ئاوانیە ،ڕاستیەکەی ئەوەیە جوولە بەشێکە لە یاسا،بوون بێیاسا نامێنێ ونابێت،بەرجەستە نابێت ،هـدی دروسـت نابێت،لـەوەوە بوون وجوولەبەرجەستەیەکی ئەمرو خەلقە،رەهەندی یەکـەم ودوەمـە، مێـژوەکیش پێك دەهێنن لە چوارچێوەی (هۆو ئەنجام)کە بە دەستوری بوونەوەر هـەژماردەکرێ، یـان وردتـر بـە شاسـی پەیکـەری بوونـەوەر هـەژمار دەکـرێ، زەمینـەی ژیـان و تاقیکردنەوەکەش ئەوەیـە، لێـرەوە بـە ووردی مـەودای کـاری (شـانۆ-دۆمـەین-منطلق)ی مرۆڤ وکۆمەڵگە دیاری دەکرێ، ئـەوەی مـرۆڤ دەیکـا هـیچ گۆڕانکـاری بەسەر ئەمر پێ نایەت چونکە یەکانەیە، ڕەهایە، تەنها دەتوانێ سودی لێ وەرگـرێ بەڵام دەتوانێ رەهەنـدی دوەم (خلـق-مـادە) بگـۆڕی چـونکە زەوجیـە، نیسـبیە، فلیکسیبلە، ئەوەش مانای بەرپا کردنی شارستانی وبزوتنەوەی مێژوو ئەسلی پەیام

وئەركی مرۆڤە، واتە زانست دەتوانێ كار لەسەر (خلق) بكا بەسود وەرگرتن لە (ئەمر)، سود وەرگرتن لە توانای گۆڕانی خلق بەهۆی چەسپاوی ئەمر، كەواتەزانیاری لەسەر هەردوولا پێویستە ئینجا زانست وشارستانی دێتە دی ، زانایانی ئاینی واتێگەیشتبوون (قل الروح من امر ربی)داخستنی زانیاریە ..كەچی ئەوە خۆی ڕاڤەو پیدانی زانیاریە ،بۆیە ئەوان هەولی بەدەست هینانی زانیاریان لەبارەی روح نەداوە ،هەرچی فەیلەسووف وزانایانیشە لە چوارچێوەی مادی ڕوانیتیانە روح بۆیە نەیانتوانیە هیچ زانیاریەكی لێ هەلكرێنن ،كەچی قورئان ڕوونی كردۆتەوە كە روح لە ڕەهەندی دووەمە (ئەمرە) نامادیە نەك (خلق) ،هەر لەوەش تێدەگەین بۆچی نیوتن ووتی هەمو جیهانم بە هۆی(كێش) لێكدایەوە كەچی خۆم لە(كێش)نەگەیشتم [1]،ڕاستە تێی نەگەیشتوە چونكە ئەو دوو ڕەهەندەی لێكجیا نەكردۆتەوە ،نەیزانیە كیش یاسایە،چەسپاوە ،میژووی نیە ،نەمرە،هۆكاری نیە ، یاساو مادە لیك جیان ،مادە(خلق) دەگۆڕێ،نسبیە،هۆكاری هەیە ،..

لەوەوە لەلایەن زۆربەی فەیلەسوفان بەلای مادی چووینە چونكە وادەردەكەوێ شانۆی مرۆڤ مادیەكەیە، مرۆڤ سودلە (هۆ-یاسا) وەردەگری تا گۆڕانكاری لە قازانجی خۆی بەسەر مادە(خلق- ئەنجام) بهێنیت، بە جۆرێك (هۆ) لەیاساو ئەمر هەلدەقولێ، (ئەنجام) یش لە (مادە و خلق)، كەواتە ڕوون ترین پەیوەندی نێوان ئەو دووڕەهەندە(مادی ونامادی، یاساو بوون، ئەمروخلق..) بریتیە لە یاسای (هۆو ئەنجام) پەیوەندیەكی سەرتاسەریە، بەهۆیەوە (هدی) وسیستەمی بوونەوەر دیتەكایەوە، وەك لە قورئان 5 جار ناوی (سبب) هاتوە، لەهەموان بە سەرتاپایی (واتینا لكل شيء سببا) هاتوة، واتە هۆو شت لیك جیانابێتەوە، سەرەڕای ئەوەش نێوانیان بەو سنورە موتلەقیە نیە، چونكە هەمان (ئەنجام) بۆ ڕووداوەكی تر دەبێتە

---

[1] ئةو ووتةيةى نيوتن لة (ف ئةنجلس– ديالكتيك الطبيعة ص37) بخوينةوة .

(هۆ)، واتە مادی ونامـادی، یاسـاو بـوون، هـۆو ئـەنجام،..وا ئاویتـەن، مادەیـەو لەهەمان کاتدا نامادیە، خلقە لەهەمان کاتیش ئـەمرە، بوونـە لـە هـەمان کـات یاساشە..

ئەو وەسفانە وەك وەسفی هیگل وئەنجلس نیە بۆ (بوون)، ئەوان وای بۆدەچن کـە چۆن هۆیەکە بۆ ئەنجامە هەمان ئەنجام دەبێتە هۆ بۆ ئەنجام بەسیسـتەمی دەوری – داخراوی((سایکلیك)، لەکاتێکا لێرە ئەو ئەنجامەی بەهۆیەکەوە هاتۆتەدی نابیتەوە هۆ بۆهەمان ئەنجام بەڵکو دەبێتە هۆ بۆ ئـەنجامیکی تـر بـەوە بزوتنـەوەی مێـژوو گۆڕانکاری وگەشە دروست دەبـێ، واتـە تـوخمی (زەمـەن)ی دەکەویتـە نێوانیـان، پرسیارەکە ئەوەیە ئایا زەمەن رەهەندیکی سـەربەخۆیە(بە تایبـەتی کـە زەوجـیش نیە) یان لەنێوان مادەونامادە(خلق وئەمر-یاساو بوون) پەیدا دەبێ؟ئەگەربە واتـای فەلسەفی ئایـەتی (کـن فیکـون) لیکدەینـەوە، بەشـیکی گـرنگ لـەوەڵامی ئـەو پرسیارەمان دەست دەکەوێ، وەك لەپیشـوو کـەمێکمان لێ بـاس کـرد کـە (کـن) ئەمرەو (یکون) خلقە، (ف)یەکەش نوینەرایەتی زەمەن دەکا، هەرچـەندە پرۆسـەکە وەك یەك پرۆسە دەردەکەوێ، هاوکات، دەماودەست، کەچـی لـە ناخیـدا لـە سـێ پرۆسەی(ئەمر-زەمەن-خلق) پیك هاتوە بەڕێز یەکیان پیش ئەوەی ترە، ئـەو فـەترە زەمەنیە گەورەترە لەسفر یان یەکسانە بە سفر، ئەگەر گەورەتر بیت لـە سـفر ئـەوا سێ ڕەهەندە، ئەوکاتی ڕێزەکە ئاوا دەبیت(کن) لەپیش (فیکون)واتە: یاسا لـەپیش بوونە، هۆ پیش ئەنجامە، زەمەن پیش مادەیە، ئەگـەر سـفریش بیـت (وەك قەشـە ئۆگستین بۆی چووبوو)[1] ئەوا دوو ڕەهەندە یاساو مادە(ئەمروخلق)پێکەوەو جمکـن، هەلبەتە سفر نیە باهەرچەندە کەمیش بیت، ئەوەندەش نیە وەك ئیمـامی قورتـەبی دەڵێ جیبەجێ کردنی ئەمری خودا لە ئاسمـان بـۆ زەوی جاروایـە 50000سـالی

[1] ئەو بۆچونەی قەشە ئۆگستین لە(بول دیفیز- الإقتراب من الله ص68) بخوینەوە.

بردوە[1]، لەقورئان وەسفی جیبەجیکردنی ئاوا دەکا(وما امر الساعة الا كلمح البصر او هو اقرب)[2] کەواتە وەلامی پرسیارەکە بەکام لا کەوت ئاخۆ زەمەنیش رەهەندیکی سەربەخۆیە یان لە پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام دیتە ئاراوە؟ واپێدەچێ رەهەندیکی سەربەخۆ نەبێ (بەدوودلیەوە)، لەپەیوەندیەکە زەمەن دەخولقێنێ، بۆیە دەگەڕێینەوە سەر دوو ڕەهەندیەکە.

واتە هەرشتیك هەر تەنیك بریتیە لە کۆمەلە (زەوجیەك لەگەڵ کۆمەلە هۆیەك) پیشو تر (شت)مان واپیناسە کرد کە بریتیە لەکۆمەلە (زەوجیەك) ئەو پیناسە یەك ڕەهەندی بوو، ئەوەی ئیستا دوو ڕەهەندیە وتەواوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێسا زەوجیانەی لە پیشوو باسمان کرد، چۆن ناوەرۆکی بوونەوەر لە زەوجی پیك هاتوە وا پێدەچی ئاواش خودی بوونەوەر زەوجی بێت، پیك هاتبیت لە سیستەمی (زەوجی کە ڕەهەندی خلق -مادە)ە لەگەڵ (سیستەمی نازەوجی کە رەهەندی ئەمر یاسا) ە.

بەلام چ جۆرە زەوجیەك زەوجیەکی داکانە، بەو شێوەیە یاساکانی سروشتی لەگەڵ سروشت ئاویتە بوە، ئاواش روح لەگەڵ جەستە ئاویتە بوە، عەقڵ لەگەڵ هۆش وهۆش لەگەڵ دەروون وئەویش لەگەڵ هەست وهەستیش لەگەڵ واقیع ئاویتە بوە، ئەو تیکهەلکێشە ئالۆزە وای لە کۆمەلێك فەیلەسوفی گەورەی وەك هیگل وئەنجلس وشوبنهاور.. کردبوو کە بە جۆرێکی تر گومان لە (بوون)بکەن و وەسفی بوون و نەبوون لەیەك کاتدا بکەن، بلین هەیەو نیە وجۆرە عەبەسیەکی تری ترسناك پیشاندەدا وەك لە بابەتەکانی پیشوو (ناکۆکی سەرتاسەری) باسمان کرد.

ئەو دوو ڕەهەندە چەندە ئاویتەن ئەوەندەش دوو دنیای لیك جیان، ڕاستی

---

[1] الجامع الأحكام القرأن ج18ص281-282
[2] النحل اية77

وتیکڕای ڕەهەنـدی دوەم ئـەویش ئـەو سـیفەتەیەی هەیـە بـە (خلق)ناچـێ، بـەڵام پێکەوە(بوون—وجود)پیك دەهینن، واتە نامـادیش بوونـە، تـا ئیسـتا وا هـەژمار دەکرا نامادی مانای(عدم) دەدا، بەو پێیە پرۆسەی خلق بەمانای مادە لـە نامـادە بخولقینی، ئاوا نیە نامادیش بوونەجیایە لەگەڵ (نەبوون-عدم)، (مادە، شت، خلق) بەبێ(یاسا، ڕاستی، ئەمر) نایەتە واری جیبەجیبوونی بوون، ڕەنگـە ئـەو وەسـفەی ئیمام غزالی کەمەك لەوە نزیك بیت کەدەلی: (أن النفس الإنساني..لا هـو متصـل بالبدن ولا هو منفصل عنه)ئەگەر(نفس) بکەینە تەواوی (ئەمر) و(بدن)یش بکەینە تەواوی (خلق).

سیفاتەکانی ئەو دووڕەهەنـدە پیـك ناچـێ، نـاکرێ بەسـیفاتەکانی یەکـەم دوەم بناسیەوە، وەك لە ئینجیلی پیرۆز وەسفی روحی بە خراپ و چاك کـردوە، بـە (روح القدس) و(روح النجس)، نابیت کلامـی خواش(کـە دەکاتـە امـر-یاسـا بـە شـتی بچوینی-نەخلقە نەخالقـە بـەڵکو نێوانیانـە) بەشـت بچـوینی وەك لـەو ئایەتـەی ئینجیـل پێیچـواندوە : کـلام الـرب کـلام نقـي کفضـة مصـفّاه في بوطـة في الارض محوصة سبع مرات)[1]، یان وەك لەو ئایەتەی ئینجیل هاتوە دەڵێ روح زاوزێ دەکـا :(المولود من الجسد جسد هو والمولود من الروح هو روح)[2].

بـــەکارهێنان وپراکتیکـــەکانی : واپێدەچـــێ دوو ڕەهەنـــدی بوونـــەوەر پـــرس وکێشەیەکی زۆری فەلسـەفی کـۆن ونوێمـان بۆچارەسـەر بکـا، هـەر لـە پرسـیارە فلسفیەکانی ناوی نراوە(پرسـیارە نـەمرەکان) تادەگاتـە ئـەو پرسـیارانەی سـتیڤن هۆکینگ گەلالەی کردوە لە 3پرسیار لەبارەی یاسای سروشتی کە دەڵـێ: لـە کـێ

[1] ئینجیل- مز 12: 6
[2] یو 3: 6

هاتوە؟شازو موعجیزە هەیە؟ بەدیلیان هەیە؟[1] ئـەو پرسـیارانە گـران نـین وەك لـە دوای دەردەکەویٚ.ئیستا بەکورتی دێینە سەر چارەی هەندێ پرسی زۆر قورس:

1- پرسی (دوعا) گرانە وەك لـەوەی (ح.ابـراهیم) ڕاسـتەوخۆ خواهاتۆتـە نـاو ڕووداوەکان ویاساو ئەمری خۆی ڕاگرتـوە: قُلْنَـا يَـا نَـارُ كُـونِي بَـرْداً وَسَـلاماً عَلَـى إِبْرَاهِيمَ[2]، کە داوای تایبەتە وشازە.. هەمو ئاینـەکانیش وەك مەنهـەج کـاری پـێ دەکەن، قبولی دوعا دەقاودەق مانای وەستانی رەهەندی دوەمی بونـەوەرە، مانـای وەستانی ئەمری خودایە، ئەوە لای خوا ئاسانە، کەچی خـەڵکی سـادە هەیـە ئـەو دوعایە ئارستەی شیخ وقەشەو حاخام دەکات!، خودی دوعاوئەجـەل ونسـیب ڕێـك پێچەوانەی یەکترن، ئەگەر هەمو شتیك نوسرابیتەوە تـازە دوعـا چ سـودی دەبـێ، بۆیە (دوعا) لە چوارچێوەی (عیبادەت) مانای ڕوون ترە.

لەلایەکی تریش لەیەك کاتدا دوعـای نـاکۆك دەکـرێ، بـە تایبـەتی لـە نێـوان مونافیسەکان بە تاك وکـۆوە خـودا بـە گـوێی کـام لابکـا! ئەوانـە پێویسـتی بـە ڕێکخستنەوە هەیە، ئەو تیگەیشتنە بە هەلەیە وای کردوە ئـاین پـەروەر وا بزانـێ ئەمری خودا زیاتر لەوی نزیك تر بێت، وادەزانی سەرکەوتن وکـاری چـاك وتـەقوای دەبێتە هۆی کار ئاسانی لەو دونیایە، کەچی وانیـە، یاسـاکانی سروشـت وئـەمری خودا بۆ گشت مرۆڤایەتی وەك یەکە، وەك باران وایە بۆ چاك وخراپ وئـاینی وبـێ ئاینی دەبارێ، کامیان جوان تر لەو یاسایانە یان لەو هۆکارانە بگەن ئەو زیـاتر لـە دونیا سودمەند تروسەرمەشق دەبێ، ئاواش لە جەنگا با لایەکیان بەرگری لە ئاینی خوداو لاکەی تـری دژ بیـت مـادام نـەزانی (یاسـاو هۆکـار) بـەکار بهێنـێ ئـەوا سەرکەوتو نابێ (نمونەی جەنگی بـەدر)، واتـە سـەرکەوتن وهـەق وئاینـداری لێـك

[1] دیزاینی مەزن ل62
[2] الأنبياء- اية:69

گرێنەدراون، شکست ومولحیدیش لێك گرێنەدراون، هەژاری وبەندەیی تــوڕەیی خــوا نیە بووبێتە بەختیان وەك قەشە ئۆگستین دەڵێــت، نــەهاتی ووشکەســالی وبوڕکــان ونەخۆشی غەزەبی خوا نــین بــۆ هــیچ لایــەك، وەك هەنــدیك وای لیێ تیگەیشــتون، بــەڵکو هــەمو ئەوانــە یاســای خــوداین بــۆ گشــت لایــەك تەنانــەت خــانوادەی پێغەمبەرەکان دەگریتەوە، چجای نەوەکانی وەك هەندێك وای تیگەیشتون، ئــەوەتا لەناو خانەوادەی پێغەمبەر(د خ) منــدالی بــە نەخۆشــی مــردوە، واتــە یاســاکانی سروشت لەوێش نەوەستاوە، قەزاو قەدەرو تەوەکول مانای لــە چوارچــێوەی یاســای سروشتی دەبینیەوە بەشیکیشی لە (سودفە-کە پیشتر باسمان کرد)، تەوەکول لەسەر خودا بەمانای تەوەکول لەسەر ئەمری خودا واتــە یاســای سروشــتی نــەك هۆکــاری نادیاروموجازەفە، بەڵام بەگشتی یاساکانی سروشت وپەیام واداڕژراون کە لەکۆتایی هەق سەرکەویێ جا مەرج نیە هەمو دەم هەق لای ئایندارب‌یێ.

2- ئەو دووڕەهەندیەوەڵامێکی ڕوون ونویشی پێیە سەبارەت بە (ثوابت) و(متغیرات) بە جۆرە دیزاینەکی تر، لەگەڵ ئەو (ثوابت و متغیر)ەی باوە تێك ناکاتەوە، دەردەکەویێ ڕەهەندی یەکەم گۆڕاوەو ڕەهەندی دوەم چەسپاوە،هەتا ئەوەی ئاینشتاین بەچەسپاوی پۆلینی کردوە (خیرایی رووناکی) دەرناچیێ، ئەو حوکمەی فلسفەی مادیش(بەتایبەتی مادیەی دیالکتیکی) کە گوایە(هەمولەگۆڕانە تاکە نەگۆڕ گۆڕان خۆیەتی) ،وانیە ،رەهەندی یەکەم (مادە-خلق-شت.ز)دەگریێ بەلام رەهەندی دوەم نەگۆڕە ، لێرە هەموو ئایەتەکانی قورئان (ثوابت) و چەسپاون لەیەك کاتدا، چەسپاون وەك یاسا وەك(فەلسەفەی راستی) بەڵام بۆ جیهانێکی گوڕاو هاتوە، قورئانو ئایەتەکانی (ئەمرن-یاسان-..) نەدەگۆڕیێ نە(نسخ)یشی هەیە، هەروەك یاسای سروشتی چەسپاوو نەگۆڕە، یاسایەکی سروشتی یاسایەکی تری

سروشتی نەسخ ناکا[1]، ئەوانەی باوەڕیان بە نسخ هەیە مانای وایە باوەڕی بەبەشێك لە ئایەتەکان نەماوە واتە(**ویقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض ويريدون ان يتخذوا بين ذلك سبيلا** ) (**الم تر الى الذين اوتوا نصيبا من الكتاب يشترون الضلالة ويريدون ان تضلوا السبيل** ) ناسیخ ومەنسوخ وای کردوە فەقیهەکان تەنهاکار بەو ئایەتانە بکەن کە حوکمی خەلافەتە، ئیستاش حوکمی عەلمانیەو خەلافەت نەماوە، فقهی خەلافەت وفقه لە ژێر سایەی حوکمی عەلمانی زۆر جیایە، فقهی کلاسیکی فتوای بۆ ئیستا نامێنێ ونیە، بەو جۆرە فقهی ئیسلامی ومەزهەبیەت وەڵامی ئەو سەردەمەی پێ نامێنێ، هۆیە بنچینەییەکەی ئەوەیە ئەو ئایەتانەی بۆ ئیستا گونجاوە ئەوامەنسوخن وبەیەکجاری پەکی دەکەوێ..کەچی قورئان ناسخ ومەنسوخی تیدا نیە.

3- کۆتایش بەو تیکەڵیەی نێوان خوداو ئەمری خودا دەهینێ کە بە هۆی (تەئویل) کێشەیەکی زۆری فقهی بە ساغ نەکراوەیی بە جیهیشتوە، کە دەڵێن خوا خۆی دانابەزێ لە سێ چاریەکی شەو بەڵکو ئەمری دادەبەزێ، ئەو ئەمرە دابەزیەوبوونەوەر وگەردوون وسروشت بەهۆی ئەو ئەمرە ئیش دەکا، ئەوە تەئویلێکی هەڵەیە ،ئەمری خواو زاتی خوا لێك جیایە، بەهەمان شێوە بۆ دەقەکانی ئینجیل (فلما اعتمد يسوع صعد للوقت من الماء.واذا السموات قد انفتحت له فرأى روح الله نازلا مثل حمامة وآتيا عليه)[2].

4- هەروەها وەڵامی ئەو پرس وکێشەیەی نێوان موعتەزیلەو ئەشاعیرە کە

---

[1] کیپلەر پێی وابوو ناوە ناوە یاساکانی سروشتی پیویستیان بە فۆرمات کردنەوە و گۆڕان دەبێ تا بتوانن لەگەل خولگە گۆڕاووماندوەکانی ئەسستیرەکان بگونجینەوە، دوای دەرکەوت هەلەیە.

[2] العهد الجديد مت 3: 16

تائیستاش وەڵامــی یەکلاکــەرەوە نەدرایتــەوە، ڕەنگــە تەقــەلای وەڵامــی (اخــوان الصفا)لە هەموان چڕ تربێت وکەمێك لای ئەشاعیرەیان گرتوە ودەڵێن ئەشاعیرەکان جیاوازیان لە نێوان خلق وئیبـداع کـردوە ووتویانــە قورئــان خلـق نیــە ئیبداعــە[1]، (ابداع)یش هەرپلەیەکی تری (خلق)ە، وەك(بدیع السموات..) عبد الکـریم سـروش لە کتێبی(بسط تجربەی نبـوی) پرسـیارەکەی دووبـارە کردۆتـەوە ئـاخۆ پێغەمبـەر خولقینەری قورئانە[2]؟ بە ئاڕاسـتەیەکی تـر چـوەو دەڵـێ کاریگـەری هـەبوە، ئـەو کێشەیە پیش موعتەزیلە هەبوو هەریەکە لە (جعـد بـن درهـم وجهـم بـن صـفوان) ڕایان وابوو قورئان خلقە، موعتەزیلەش لەکاردانەوەی مشت ومڕی نیـو مەسـیحی لــەبارەی خلقــی (ح.عیســی)و (روح القــدس) و نوێکردنــەوەی لەلایــەن (یۆحنــا الدمشقی-ابن سرجون)کە دەیوت ئیسلامیش وەك مسیحی بێ سەروبەرە مسـیحی دەڵێن (المسیح کلمة الله الأزلیة تجسدت في المسیح) ئیسلامیش دەڵێ قورئـان(کلمـة الله الأزلیــة ) ئــەوە وای کــرد موعتەزیلــە ڕایــان وابــێ کــە قورئــان مەخلوقــە ودەمارگیریشیان بۆ دروسـت ببـوو تـاڕادەی بـەکارهینانی توندوتیـژی، کێشـە لـە ئەسلی پرسیارەکەی (ابی داود)ە کاتێ لەبەرچاوی مـەئمون لـە ئیمـامی ئەحمـەدی پرسی و ووتی ئایا(الله خالق کل شيء) ڕاستە یان نا ؟ ئەدی قورئانیش(شـيء)نیـە کەواتە قورئانیش مەخلوقە[3]، لـەو سـەردەمی زانیـاری لـەبارەی جیـایی ئـەو دوو ڕەهەندە لاوازبوە یان هەر نـەبوە، بۆیـە نـەتوانراوە چـەوتی لـەو پرسـیارە دیـاری بکریت، بەڵێ قورئان (شيء)نیە، با ووردبینەوە لە(..ورو‌ی هیثم عن أبي بشر عـن مجاهد عن ابن عباس قال الأرواح أمر من أمر الله وخلق من خلق الله )[4]بـە ڕوونـی

---

[1] رسائل اخوان الصفاء- -رقم:46 ص143
[2] عبدالکریم سروش-ئاین لەسەردەمی مۆدیرننیتەدا ل165-
[3] بڕوانە: موسوعة الفلسفة والفلاسفة ج1ص22
[4] المطهر بن طاهر المقدسی – البدء والتاریخ ص109

دەردەکەوێ کە ئەمرو خلق تێکەڵ کراوە،واش پێدەچی لەلایەن ڕاویەوە وا تێکەل کرابێت ، لەکاتێکا وەسفی ئەمر (مدبر) هەلدەگرێ وەسفی خلقیش خالق هەڵدەگرێ، لێرەوە ئەو کێشە گەورەیە ئاسان دەبێ ئەگەر ئیمام ئەحمەد بیوتبایە نەخێر قورئان (شيء)نیە، لەودووڕەهەندە وەڵامیکی ئاسان وکۆکەرەوەت دەست دەکەوێ، پرسیارەکە لەدووڕەهەندەکەیە، ئاخۆ کۆئۆردینەیتی قورئان لە رەهەندی یەکەمە(خلق)و(شيء)ەیان لە ڕەهەندی دوەم(امر)،هەتا وەلامی (کلام اللە)ش تەواو نیەئەوە زیاتر وەلامی ئینجیل وتەوراتە ،ئەگەر کلامی خوا بێت وەك ئینجیل وتەورات توشی پرسیاری قوڕس دەبێتەوە، ئەو کاتی دەلێن چۆن خودا وەك کەسی سێیەم قسە دەکا ،یان بەلەفزی خۆی خۆی بە (غائب) وەسف بکات ،بەلام ئەگەر (امر) بوو بە غائیب و زەمیری تر ناوزەد بکرێت ئاساییە، زۆر ڕوونە قورئان ئەمرەولە ڕەهەندی دوەمە(**وکذلك اوحيينا روحا من امرنا**)واتە قورئان رۆحی یاساکانە ،یاسای سەرووی یاساکان،داکانەکانی یاسا،،مەگەر (جدلیانە) بلێن ئەدی ئەو بەرگ ونوسینانە چیە هەلبەتە ئەوە خلقە، کەواتە وەڵامەکەئەوەیە قورئان مخلوق نیە مأمورە،

5- هەرلێرەوەش کیشەیەکی گەورەی زانستی قورئانی ترمان بۆ چارەسەر دەکا ،ئەویش (اسباب النزول) واتە بەستنەوەی ئایەت وسورەتەکانی قورئان بە هۆکاریکی ڕووداوی محەلی ،نەخێر، تەنانەت هیشتا (مناسبەنزول-بۆنەی دابەزین) چاکترە نەك (سبب نزول ) ،سبب نزول وای کردوە قورئان وەك ڕووداویکی میژوویی سەیر بکریت ،موسولمانانیش چاوی لە ڕابووردوو بێت نەك لە داهاتوو ،ئینجا بەگشتی (امر)ئەسبابی نیە ،(واتيناه من كل شيء سببا )هەیە (من كل امر سبب)نیە ، بۆیە بە هیچ شێوەیەك ناکرێ (اسباب نزول)بۆ قورئان دیاری بکریت ،هەروەك یاسای سروشتی ،روح ،پەیام ..ئەسبابی نیە ئاواش قورئان وئایەتەکان

سببی نیە ،زۆربەی بیرۆکەی نسخیش لە (اسباب نزول)هاتوە ،کەواتە بە پێی ئەو زانیاری و پراکتیکە کردنی (خلق وئەمر –رەهەندی یەکەم ودوەم)نە ئەسباب نزول هەیە نە نسخیش .

6- هەر لێرەوە تۆختر لە بنەمای (لا دقە)ی هاینزنبرك مەحالی هەرە مەحالە ژیان لە بێ ژیان دروست بێت، مادام بێ ژیان (مانای بێ ڕوح) بێت، واتە لە ڕەهەندی یەکەم ڕەهەندی دووەم دروست ناکرێ، ڕوونتر بڵێین: ئەلیکسی هایکل وتبووی ئێوە (مادەو کاتم) پێ بدەن ژیانتان بۆ دروست دەکەم، لەو سۆنگەوە هەندێ ئەگەر بەیان کراوە بۆ پەیدابوونی ژیان لە بێ ژیان، بەنمونە بۆ ئەوەی خانەیەکی زیندوو لەو جیهانە دروست بێت بە سروشتی (گوایە) 10[232] سالی پێویستە..تەنانەت ئەوەش هەڵەیەکی کوشندەیە، ڕەنگە ڕێزبەندی ڕێکخستنی دیزاینی نێو خانەیەك لە ڕووی مادی پێك بێت (وەك ڕەهەندی یەکەم)، بەلام مەحالی مەحالانە ئەو خانەیە زیندوو بێت و ڕوحی بێتە بەر، واتە لە باشترین دۆخی ئەو ئەگەرە (بەسودفەشەوە) لایەنی مادی خانەکە دروست دەبێ، ڕەهەندی یەکەم ڕێك دەخرێ.. ئەدی ڕەهەندی دووەم (ڕوح)؟.. ئەوە کۆتایی بە هەموو تەقەلایەك دەهێنێ کە ژیان لە بێ ژیان دروست ببێ.

7-لەلایەکی تریش ئەو هەمو وەسفەی بونەوەر بە(مادیانە) لەلایەن فەلسەفە بەگشتی ومەدرەسەی فەلسەفی مادی بە تایبەتی وەسفێکی هەڵەو یەك لایەنیە،پێویست دەکات دەستکاری منهجی تەعلیمی فەلسەفی لە زانکۆو ناوەندە ئەکادیمیەکان بکرێت.

8-هەر بە هۆی ئەو دوو ڕەهەندیە دەتوانین دیزاینی سیاسی کۆمەڵگەی ئێستا بە شیوازێکی نوێ وا پۆلین بکەین، ئەوانەی دەڵێن نە ئەمرو نەخلق بۆ خودایە بەڵکو بۆ سروشتە ئەوانە فەلسەفەی مادیە وتیۆرێکی سیاسی عەلمانی توندی لێ

وەبەرهەم دێت- مەدرەسەی شیوعەت بە نمونەیە، ئەوانەی دەڵێن خودا (خلقی) هەیەو ئەمریش بۆ ئێمەیە ئەوا عەلمانیەتی میان ڕەوە مەدرەسەی لیبرالی وسۆشیال دیموکراسی دەگرێتەوە، ئەوانەی دەڵێن خودا خاوەنی ئەمرو خەلقە ئەوانەش دووبەشن بەشیکیان ئاینی کلاسیکین وبەشیکیش بزوتنەوە ئاینیەکانن.

9-لێرەوەش دەردەکەوێ کە ئەو بۆچوونەی گوایە کە خودا جیهانی دروست کردوەو وازی لێهێناوە چەندەهەلەیە،لەکۆنەوە ئەوبیرە (دیزمیە)هەبوە تائیستا ،سارتەر دەلیَ نالیَم هەرخوانەبوە ،هەبوە لەسەردەمانیك ئەو بوونەوەرەی بۆ ئیمە دروست کردوەوپەیوەندی بە مرۆڤیش هەبوە دوای بزرمان کردوە تا ئیستا نەمان دۆزیتەوە ،زۆریشمان پیویست پیَ نەماوە ئەوە یاسا لە جیاتی ئەو ئیشەکە دەکا،ئەو بۆچوونە زۆر بلاوە بەوشیوەیەو بە شیوەی بیدەنگیش ، شارستانی نویش لەسەر ئەو بۆچوونە وەستاوە ،لە ڕاستیدا خودا خالق نیە بەلکو ئەمریشی هەیە ،بۆیە وازی لەگەردوون نەهێناوە هەردەم لە پەیوەندی دایە لەڕێی (امر)لەڕێی رەهەندی دوەم ،واتە ئیدارەی بوونەوەریش هەر لای خوایە .

10- پرسیکی پارادۆکسی گرنگی تر چارە دەکا ،یەکیان ئەوەی راسل گەلالەی کردو دەلیَ(بۆ هەمو شتێك هۆیەك هەیە هۆی بوونی خودا چیە)[1]،یان هەیە دەلیَ (**الله خالق كل شيء هل هوخالق نفسه**) لەگەل پرسیاری تری پارادۆکسی چارە دەکا ، ئەوە شت و(خلق)ە هۆکاری هەیە (واتيناه من كل شيء سببا) ،لە هی دوەمیشا دیسان (**كل شيء**) دەگریتەوە کە خودا بۆ خۆی (**شيء)نية** (ليس كمثله شيء).

10-لە کۆتایدا وەلآمی ئەو پرسیارانەی نوێی فیزیای کوانتەم دەداتەوە کە

[1] الاسس الفلسفية للحداثة ص373

لەلایەن ستیڤن هـۆکینگ ولیونـارد ملۆدینـۆ.. پیشـووتریش لایبنتـز وهوایتهیـد ویلەر، دیڤیز.. گەلالە کراوەو دەڵێن ئەگەر ئەو جۆرە یاسایانە نەبوایە جۆریکی تـر بوونایە چ ڕووی دەدا؟ لایبنتز وەڵامیشی دایتەوەو دەڵێ: ئەو جیهانەی ئێمـە خـوا وای هەلبژاردوە تا گونجاوترین بیـت بـۆ بـەردەوامی بـوون وژیـان[1]، وەڵامـی ئـەو پرسیارە لەدوای ئەو توێژینـەوە زۆرسـاناو سـادە دەبـێ بـەلای کـەمی ئـەو جـۆرە ئەنجامەی ئیستای نەدەبوو، واتە ئەگەر ئەو جۆرە یاسایانە نەبوایە جۆرە دیزاینیکی تری گەردون دروست دەبوو، یـاخود هـەر دروسـت نەدەبوو..تەنانـەت بتـەوێ (بـە گریمانە)یەك یاسای سروشتی هەموار بکرێ ئـەوا بـەلای کـەم ژیـان مـەحال دەبـێ ودووریش نیە کۆتایی گەردوون بێت.

خشتەکیکی جیاوازی نێوان ڕەهەندی یەکەم وڕەهەندی دوم

| | ڕەهەندی یەکەم<br>(خلق- مادە-ئەنجام- شت) | ڕەهەندی دوەم<br>(ئەمر- یاسا-هۆ-روح- پەیام |
|---|---|---|
| 1. | سیستەمی زەوجی ودژدار | سیستەمی نازەوجی وبێ دژ |
| 2. | جولاوناجیگیر | چەسپاو نەگۆڕ |
| 3. | مادی | نامادی |
| 4. | تەمەندارو زەمەندار | بێ تەمەن وبێ زەمەن و نەمر |
| 5. | شتە(شيء)،ئەنجامە،دروست کراوە | شت نیە،هۆیە،دروست کراو نیە |
| 6. | نسبی وسنوردار<br>7- سەبەبیە(هۆدارە) | گشتی وموتلەق وبێ سنورە<br>بێهۆوسەبەبە |

[1]مدخل الى الفلسفة ص128

بەڵام مانای ئەوە نیە ئەو جیاوازیانە وای کردبێ ئـەو دوورەهەنـدە نـاکۆك بـن، بەڵکو رەهەندی دوەم پەیوەندیەخۆبەخۆکانی نێوان رەهەندی یەکەم بەڕێوە دەبا.

❊❊ ❊❊ ❊❊ ❊❊

دوای ڕوون بوونەوەی هەردوو ڕەهەندو پەیوەندیان، ئیستا نـۆرەی ئەوەیـە ئـاخۆ کامیان ژێرخانی بوونەوەرە و کامیان سـەرخانە، دەردەکـەوێ ڕەهەنـدی دوەم ئـەو ڕۆلە دەبینی وناسنامەکان دیاری دەکا، ئەویش لە چەمکێکی فەلسەفی فـراوان تـر کۆ دەبنەوە بریتیە لە (فەلسەفەی ڕاستی) کە تیایدا کۆمـەڵێك سـیفاتی ڕەهەنـدی دوەمی بەگشتی لە خۆ گرتوەو ڕوونـی دەکەینـەوە، لـەوەوە قورئـان دەڵـێ هـەمو بونەوەرمان بە هەق دروست کردوە، واتە هەریەکە لـە یاسـاکانی سروشـت وپـەیام وروح و.. بەشێکن لە (ڕاستی) کە هەمو بوونەوەری بەهەمو رەهەندەکانەوە لەسەر بنیات نراوە، لێرە پێویست دەکا بۆچونەکەی برۆنۆ کە دەڵێ:(المادە جـوهر الحقیقـە) وەرگێڕین وڕاستی بکەینەوە بۆ(الحقیقە جوهر المادە)، کەواتە ئەو بوونەوەرە خەیالی وبـێ ئامـانج نیـە هـەروەك هەنـدێ تـەیاری فەلسـەفی وای بـۆ چـوون، بـەڵکو ڕاستەقینەیە، لێرەدا شیٚ کردنەوەی (فەلسـەفەی ڕاسـتی) ودۆزینـەوەی پەیوەنـدی نێوان هـەردوو ڕەهەنـد لـە شـیوەی ڕاسـتی وبوونـەوەر، راسـتی وواقیـع، راسـتی وعەقل،..یارمەتیەکی زۆر گەورەی تیگەیشتنی پەیوەندیەکانی خـوداو بوونـەوەر و چارەنوسی مرۆڤ وچۆنیەتی دامەزراندنی عەقیدەی دروستی مرۆڤ دەدا.

## فەلسەفەی ڕاستی

خۆشبەختانە زۆربەی مدرسە فەلسـەفیەکان وئـاین وپەیامـەکان کـۆکن لەسـەر (ڕاستی) کـە ناسـنامەی هـەموو شـتێکە، نـەك تـەنها لـە ڕووی کۆمەڵایـەتی و مرۆڤایـەتی و دادپەروەریـدا، بـەڵکو هـەموو ئـەو گـەردوون و یاسـا و ڕژێمـە

سروشـتیەکانیش لەسـەر بنچـینەی راسـتي دامـەزراون (خلـق السـماوات والأرض بالحق..).فەلسەفەو ڕاستیش لە پەیوەندیەکی ڕاسـتەوخۆن، وەك لەزۆربـەی پینـاس وئـەرکی فەلسـەفە دەردەکـەوێ، لەهـەمویان زیـاتر فەیلەسـوفانی ئیسـلامی، خوارزمی(997ز مردوە) لە کتێبـی (مفـاتح العلـوم) دەڵـێ (الفلسـفة هـی علـم الحقائق)، ابن خلدون لە (المقدمە)دەڵێت: اداة فصل بين الحق والباطل، کندی(873ز مردوە)و ابن سینا(1037ز مردوە) پێیان وایە بریتیە لە(علم الحق وعلم العلە)[1].

لە میانەی ئەو هەمو ڕایە جیاجیانەی لە بارەی (ڕاسـتی) دراوە بەشـێکی کـەم ڕاستی وەك دیاردەی کۆمەڵایەتی سەیر دەکەن لەوانە : فۆکـۆ و هـۆبز پێیـان وایـە دەسەلاتە ڕاستی دیاری دەکا، کارل پۆپەر دەڵێ راستی بێ هەلە هـەرنابێ، مـۆران وپاشلار دەڵێن ڕاستی زانسـتی هـەردەم هەلـەش هەلـدەگرێ، مێـژووی زانسـتیش بریتیە لە ڕاست کردنەوەی هەڵەو چەوتی...ئەوە ڕێـك (بزوتنـەوەی زانیاریـە نـەك بزوتنەوەی ڕاستی)، ولیام جیمس پێی وایە ڕاستی بریتیە لە بەرژەوەندی و دەتوانی وەك دارتاش(ڕاستی) دروست بکەی، هایدگەر پێی وایـە ڕاسـتی بریتیـە لـەئازادی (هەردووکیان لە چوارچێوەی کۆمەڵگەیەکی پراگماتیکی).

لەلایەن نیتچەو میسالی زاتی وهەندێ زانای کوانتەمی راستی هەر نیە بـەڵکو خەیالە، ئەوانە گەڕاونەوە سەر ڕایە کۆنەکانی جورجیاس وسەفسەتیەکان کە دەڵـێن ڕاستی نیە یان هەشبێ بەتەواوی نیە، لەوەش زیاتر فیختەو بارکلی لـە وەسـفیکی پەخشانی: ڕاستی بوونی مادی چڕی نیـە، بـەڵکوبوونێکی زیهنـی جـوانی هەیـە، فیختە دەلیٚ ئەو بوونەوەرە لەراستیدا نیە ئەوە لەناو زیهنی ئێمەیەو بەس، هەرچی کارل مارکسە ئاوا نالێ بەلاّم نزیکە لەو بۆچوونەو دەڵێ تاکە ڕاستیەك هەبێ ئـەوە

---
[1] رسائل الكندي الفلسفية ج1ص172.

ئەو ڕاستیە کە ئێمە هەستی پیٚ دەکەین(ان العالم المادی الملموس الذی ننتمی الیـه، هوالحقیقة الوحیدة)[1].

سارتەریش لە(الوجود والعدم)راستی بەمەرجی بوونی ئادەمیزاد دەبەستیتەوە، دەڵیٚ مرۆڤ بی بوونەوەر مانای نیە ئاواش بوونەوەر بیٚ مرۆڤ مانای نیە.لینین نکولی لە (ڕاستی) بەتەواوی نەکردوە بەلاٚم نکولی لە (ڕاستی مەوزوعی) کردوە دەیەویٚ بلیٚ بیٚ مرۆڤ بیٚ زانیاریەکانمان ڕاستیەکی دور لە ئێمە نیە[2]، ئەمانوئیل کانت(1724-1804) ڕاڕابوە لە بارەی ڕاستی لێرە ڕای وەك فیختەیەو دەڵیٚ: (ان حقیقة شيء ذهنی، الحقیقة مجرد استنساخ للواقع) دەقاو دەق بە پێچەوانەی هایدگەر کە دەڵیٚ(راست وناراست)بەدەرە لەزیهنمان، جاریش وایە وەك مارکسی (ان الحقیقة نسبیة ومحدودة بحدود التجربة).

بەو شێوەیە راستی لەڕوانگەی فەیلەسوف وزاناو مەدرەسەکان دۆخی جۆراو جۆری وەرگرتوە وەك میشیل فۆکۆ کردویە بە 14 بەش، هەرچەندە هەندیٚ زانای ئاینیش (راستی)یان دابەش کردوە لەوانە جرجانی لە (تعریفات) بەشێوەی(حقیقة الشیء، حقیقة العقلیة، حقیقةالیقین...) بەلاٚم یەك راستی ناسیوە، عبدالکریم سروش باوەڕی بە فرە ڕاستی هەیە.. بەگشتی مادیەت لەگەڵ (ڕاستی) دۆست نین، بەلاٚم کۆدەنگیەك هەیە کە راستی نیوبژێکی بیٚ لایەنە بۆ ساغ کردنەوەی ڕایە جیاجیاکان، بۆیە ڕاستی لە ڕوانگەی فەلسەفەی ئاینی ڕاستەقینە نەك هەر گرنگ و پیرۆزە بەڵکو پەیڕەویشیتی.

لە بنەچەدا بەهۆی شۆڕشی پیغەمبەران و ڕێبازەکانیان ئاوا ڕاستی بۆتە چەمکێك هیچ عاقڵمەندێك نیە بلیٚ من دژی ڕاستیم، بەڵکو زۆردارترین کەس دەڵێت من لەسەر ڕاستیم، با بزانین ئەو ڕاستیە چیە؟ ڕاستی ئەو واقیعە

[1] مارکس-انجلس مختارات ط-انکلیزیة ص435
[2] فلادیمیر إلتش لینین- مختارات –ط ئینکلیزی مجلد11ص188

ڕاســتەقینەیەیە کــە لــەخودی شــتەکان بــوونی هەیــە، زەوی بــەدەوری خــۆر دەسوڕێتەوە، ئاو لە ئۆکسجین و هایدرۆجین پێکهاتووە، ناوکی ئەتۆم پرۆتۆن ونیوترۆنە، یابان لە ئاسیایە، ئەوانە ڕاستین، چۆن؟ زەوی وسوڕانەوەو خۆر هەرسێکیان ڕاستین ئینجا سیستەمەکەی لێیان پیك دیت راستیە، ئەو راستیەش نەك هەر لە مێشك و زەینی ئێمە بیت، ئەوانە کۆمەڵێك ڕاستین ئێمە پێی بزانین یاخود نا.

لەو بارەیەوە پێ ناسی جۆراو جۆری ومشت و مڕی فەلسەفی زۆر لەسەرە، هەرمەدرەسە بەگوێرەی تێڕوانینی خۆی بۆی چوە: ڕەنگە باشترینیان پێناسی (هیگل)بیت کە دەڵێت (ڕاستی ئەو جووت بونەیە لەنێوان بیری ئێمە و واقیعدا)، بەهەمان شێوە (ئەمانۆیل کانت) دەڵێ(راستی بریتیە لە جووت بوونی بیر-خود-و بابەت)[1] لەپیش ئەوانە جرجانی ووتویەتی:(الحق هو الحکم المطابق للواقع)[2]. لە پیش هەمویان شمس الدین شهرزوری ووتویوتی ص61 رسالە الالهیە , سەبارەت بە دۆزینەوەشی دیسان ڕای جیای لەسەرە، ولیام جیمس وشیلەر وسپینسر دەڵێن (هەڵبژاردنی سروشتی)پێوەرو دۆزەرەوەی ڕاستیە، دیکارت دەڵێ گومان تاکە ڕێیە بۆ دۆزینەوەی (ڕاستی) ئەوەش دووپاتی سەردەمی مدرەسەی یۆنانی کۆنە کە پێی وابوو هەستەکانمان سەلامەت نین وهەڵخەڵەتێنەرن[3] بۆیە راستیەکانی وەك خۆی پێ نادۆزرێتەوە، فەلسەفەی مارکسی بە گشتی وتا ڕادەیەك هیگلیش پێیان وایە دۆزینەوەی راستی لە ڕێگەی دیالکتیکە وەك ستالین دەڵێت:(الدیالکتیك هو فن التوصل الی الحقیقه)[4]

---

[1] المثالیة الألمانیة ص210
[2] ابو الحسن جرجانی-التعریفات -مادة:الحق ص54
[3] جمهوریة افلاطون ص180
[4] ستالین-المادیة التاریخیة والمادیة الدیالکتیکیة ص3

**لەوەسف ونیشانەکانی ڕاستی دیسان کۆمەڵێك ڕا هەیە،** فەلەسەفەی سەرمایەداری دەڵێت ڕاستی بەندە بەبەرژەوەندی ئادەمیزاد، (سیمان) دەڵێت ڕاستی نیسبیە واتە بە گوێرەی شتێك ڕاستە لەچاوشتێکی تر درۆیە، ئەنجلس دەڵێت (لایوجد کالحقیقە نسبیە) ولە شوێنێکی تر دەڵێت:ڕاستی وناڕاست شوینیان بەردەوام دەگۆڕنەوە[1]، (مارکس، بیکون، لوك –مارکسیە بەگشتی) تا رادەیەکیش دیکارت.... هاوبەشی دەکا وەك لە مانیفیستەکەو دەڵێن: (الشیوعیة تلغی الحقائق الأبدیة تلغی الدین والأخلاق..)[2].

بەو شێوەیە مەدەرسەی مارکسیزم باوەڕی بە ڕاستی هەیە بەڵام دەڵێت ئەویش دەگۆڕێت، گەشەدەکات بەپێ ی زەمان و مەکان لەباوەشی دیالیکتیدا..، مارکس لە کتێبی (بۆس الفەلسەفە) وەڵامی (برۆدون) دەداتەوە کە پێی وایە ڕاستی هەیە بەدەر لە مشت ومڕی فکرومێشکی ئێمە[3]، لەوەڵامدا مارکس دەڵێ ڕاستە ئەقلی مرۆڤ (راستی) دروست ناکا بەڵام راستیش تەواو ڕەها نیە دەگۆڕێ وناکۆکی لێ پەیدا دەبێ وئەوەی ئیستا راستە بەیانی ناڕاست دەبێ و.. بەو شێوەیە بزوتنەوەی دیالکتیکی ڕاستی گەشە پێ دەدا[4]، لە بنەچەدا جون لویس ووتی(الحقیقة الکاملة انماهی ترکیب من المتضادات )[5]، لە دوای ئەو هایدگەر ووتی ڕاستی وناڕاستی پێکەوە بون(واقعی مەوزوعی) پیك دەهێنن، تاڕادەیەك نسبیەکان وتەیاری گومان ووجودیەکانیش نزیکن لەمارکسیەت سەبارەت بە راستی و بوونی راستی بە نسبیانە کە لە بنەچەدا بۆ ڕای سەفسەتاییەکان دەگەڕێتەوە، لە هەرە دوای ستیڤن

[1] انجلس- نصوص مختارة ص155
[2] مارکس-انجلس بیان الشیوعی ص65
[3] برودون- تناقضات اقتصادیة اوفلسفة البؤس- ص97
[4] کارل مارکس –بؤس الفلسفة- ص176
[5] جون لویس- مدخل الی الفلسفة ص214

هۆکینگ گەڕاوەتەوە سەر هەمان ڕای(دیڤید هیـۆم) کـە دەڵـێ (یاسـای سروشـتی وراستی تەنها لە قولایی عـەقلمان هەیـەو دەیدۆزینـەوە )[1]، سـتیڤنیش پیشـنیار دەکاو دەڵێ بالە جیاتی راستی (ریالیزم) بەکار بهێنین[2].

لێرە پێویستە هەڵوەستەیەك لەسـەر نیـازی سیاسـی ئـەو بۆچـوونە فەلسـەفیە بکەین، بزانین بۆچی پێ لەسەر گۆڕینی ڕاستی دادەگرن وهەول دەدەن بەچەسـپاویی نەمری و پیرۆزی نەمینیتەوە، ڕەنگە ئەو فـەقیهو سـەلەفیە ئاینیانـەی (کـەدژ بـە فلسەفەن) بڵێت جا گۆڕانی ڕاستی و نەگۆڕینی ڕاستی دەبـێ چ نیـازێکی سیاسـی یان کۆمەڵایەتی یان فکری وباوەڕی لە پشت بێت، نازانی ئەوە بەرەیـەکی ئەوەنـدە گەورەیە مان ونەمانە، ئەگەر راستی ئاوا بێت ئەوا مانای وایە گەردوون وبوونـەوەر لە فەوزادایـەو دەخلیسـکێینە نێـو تیۆرەکـانی (گەشـە) و(ڕێکـەوت) و..، بۆیـە پێویست دەکا تێڕوانێنە بنچینەییەکانی ئاین بۆ ڕاسـتی بدۆزینـەوە (نـەك بنیـات بنێین بەڵکو خۆی هەیە)، بەو شێوەیە دەچینە نێو سیفات وتایبەتمەندیەکانی ڕاستی وەك دنیایەکی سەربەخۆ، لە هەمان کـات ئاویتـە بـە بـوون وبونـەوەر، بـەکورتی هەنگاو بەهەنگاو شێی دەکەینەوە.

## سیفاتەکانی ڕاستی

پیش ئەوەی باسی سیفاتەکانی بکەین پیویستیەکی خیرامان بە لیکجیاکردنەوەی ڕاستی وناڕاست دەبێت ،یان جاروایە لەنێوان زانیاری و ڕاستی دەبێت ،ڕاستی بریتیە لە ڕاستی بوون ،ناڕاست(درۆ)تەنها لەمیشکی ئیمە هەیە لە بوون وواقعا

[1] الفلسفة والفيزياء ج1ص88
[2] دیزاینی مەزن ل80

نیه ،ڕاستی مەوزوعیه ،زانیاری زاتیه بۆیه لەزانیاریا درۆوهەلەی تیدەکەوێ ،نرخی زانیاریش جیایه لەگەل خودی زانیاری ،ئەونرخه بەوه دەپیورێ کەچەندە جووته لەگەل ڕاستی مەوزوعی، هەلەو درۆش بەوه لیکجیا دەکریتەوه کە هەلە رەنگدانەوەی واقیعه نەك ڕاستی ،هەرچی درۆیه نە ڕەنگدانەوەی واقیعه نە ڕاستی ،بەلکو بەرهەمی زاتی پەتیه ،واته بەرهەمی عەقلی خولقینراوه ،کەواته لێرە دەردەکەوێ کە ڕاستی و واقعیش لیك جیان مەرج نیه هەمو واقعیك ڕاستی بن ،بۆنمونه ئەو ڕەنگانەی دەیبینین ڕەش و سپی وسوور ..لە ڕاستیدا ئەو تەنە کە سوور دەردەکەوێ ئەوه تەنها سوری قەبول نیەو دەیداتەوه وسوور دەردەکەوێ ،واته لە واقعا سووره بەلام لە ڕاستیا ناسووره ،هەروەها بینینی رۆژ ئەوەی دەیبینین واقعه راستیەکەی ئەوه هی پیش 8 دەقیقەیه ،لەوەوه زیاتردەچینه نیو سیفاتەکانی

ئەو سیفەتانەی لە خواروو باسی دەکەین ئۆتۆماتیکی سیفاتی یاسای سروشتی وپەیام وگیان و..ئەمره بەگشتی چ گەردوونی چ سروشتی وژیاری بێت :

1- بەر لە هەمو سیفەتێك (ڕاستی) زەوجی نیه، دژی نیه وەك جون لویس وئەنجلس ومارکس و..راستیان خستە نیو دژو ناکۆکی ودیالکتیك یان وەك مارتن هایدگەر دەڵێ ڕاستی وناڕاستی پێکەوه بوونەوەر پیك دەهێنن بەدەر لە زیهنی ئێمە..زۆر خراپ سەرچیخ ڕۆیشتون، سەرچاوەی هەلەی بۆچوونی گشتیان لەوه دێت کە (ڕاستی)یان لە چوارچێوەی مادی هەلسەنگاند کاتێ راستی مادی نیه سەر بە ڕەهەندی دوەمە، پەیوەندی(ڕاستی وناڕستی) دیالکتیکی ودژ نیه (نەفی) ڕاستی (ناڕاست) دەردەچێ بەلأم نەفی (ناڕاست) مەرج نیه (ڕاست)ی بێت وەك ئەنجلس لە کتێبی(انتی دوهرنگ) دەڵێ نەفی

جیاوازی یەکسانیە، نەفی ناڕاست راستیە، لەبەر ئـەوەی دوانـەیی نـین، ئینجـا راستی تاکانەیە بەلاّم ناڕاست فرەو پلـۆرارە، راسـتی لـە واقیعـەو ناڕاسـت لـە عەقلمانە، واتە راستی لەخودی شتەکانەو ناڕاستیش لە زانیاریەکانمانـە، زیـاتر لەوەش خەیالیە، واتە هەریەکە لە ڕەهەندێکـە لـەدوو ڕەهەندەکـەی بوونـەوەر. دوو دنیای لیك جیان لەدوو رەهەندی لیك جیاشن، ئـەوە ئەگـەر خـەیالیش لـە دنیای مادی نزیك بکەینەوە ئەگینا (ناڕاست) هـەر لـە بوونـەوەر نیـە زۆر بـە پێچەوانەی ڕایەکەی هایدگەر، کەواتە نەفی راستی لە بوونەوەر دەردەچێ.

2- لە خالی (1) دەرکەوت کە راستی زەوجی نیە، یان بەکورتیەکەی سەر بە ڕەهەندی یەکەم نیە، بەڵکو ڕاستی نامادیـە، خلـق نیـە ئـەمرە، بەرجەسـتەی ئەمرە، واتە یاساکانی سروشت وپـەیام ونهینـی روح..لـە بـاوەش دەگـرێ، بـە کورتی راستی بریتیە لە تیکڕای ڕەهەندی دوەم لە دوو ڕەهەندەکـەی بوونـەوەر، بەلاّم لە پەیوەندیەکی ئاویتەشـە لەگـەڵ (بـوون، واقیـع، مـادە، خلـق..) وەك پەیوەندی ڕەهەندی دوەم بەیەکەمەوەیە، یەك ڕهەند نـین وەك زۆربـەی مدرسـە فەلسەفیەکان وەك (برۆنۆ) بەتیکەلی لەگەڵ ڕەهەندی یەکەم بۆی چـوون و دەلی (المادة جوهر الحقیقـة) بەلاّم دیکارت دەڵێ (مـادەو روح)[1] لێـرە پێویسـت بـوو بیکاتە رەهەنـدی یەکـەم ودوەم، لـەو بارەیـەوە(ابن عربـی) و قوتابیەکـەی(بن إسحاق القونوی) زۆر بە سەرسوڕهێنەرانە پەیوەنـدی هـەردوو ڕەهەنـدی یەکـەم ودوەم گوزارش دەکەن ئەگەر چی پەیوەندیەکەش کەم وکوڕی هەبێ لەو گوزارشە :(أن الحق هو الوجود المطلق، والفرق بینه وبین الخلق من جهـة التعـیین فـإذا عـین

[1] الفلسفة والفیزیاء ج1ص46

كان خلقاً، وإذا أطلق الوجود كان حقاً)[1].

3-ڕاستی یەکەو تاقانەیە، هەرچی ناڕاست وچەوت وهەلە کۆیە، فرە وەلام وفرە ڕێگەیە، 5x3 تەنها دەکاتە 15، هەرچی وەلامی چەوتە بریتیە لە هەزاران هەزار وەبگرە بێ کۆتایی، هەریەکەلە 20 و16 و100..هەمو وەلامن بەلام وەلامی چەوتن، دوو وەلامی ڕاست نیە، لەسەر ئەو بنچینەش هەرچی بەهەق هاتوە لە قورئان بە(تاك-مفرد) گوزارش کراوە: ﴿اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ أَوْلِيَآؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ..)[2] (ظلمات) کۆیەو(نور)یش تاکە، تیکڕای ئایەتەکانی قورئان ئەو سیفەتەی هەیە (هەق) بە تاك گوزارش دەکا وناهەق بە کۆ، واتە ڕێی هەق ناسك وتاکانەو قوڕسە(..اكثركم للحق كارهون)[3]، ڕێگاو وەلامی ناهەق فراوان وزۆرو ئاسانە، ئیمام علی دەلێ: العدل صورة واحدة، والجور صوركثيرة، لهذا سهل ارتكاب الجوروصعب تحرى العدل)، هیچ جۆرە چارەسەری مام ناوەندی ونیوبژی لە نێوان راست وناراست نیە، چونکە ڕاست لە دنیای نامادیە، کەچی ناڕاست نەلە دنیای واقع ومادیە نەلە دنیای نامادیشە، زیهنیە خەیالیە، تەنها لەفکری ئێمەیە، لەوانەی سەروو کە راستیان وا پۆلین کردبوو گوایە بوونی نیەو خەیالیە ئەوە دەقاودەق (ناڕاستی) بوو، هەرلەوەشەوە دەردەکەوێ ڕاستی وناڕاستی بەیەك ناگەن موتلەقەن،چونکە ڕاستی لە ڕەهەندی دوەمەو ناڕاست ودرۆش لە ڕەهەندی یەکەمە، ناکرێ بلێی مادام دوو وەلام بۆ 5x3 کە بریتین لە 12 و20 ئەوا

---

[1] شيخ الإسلام ابن تيمية - بغية المرتاد في الرد على المتفلسفة والقرامطة والباطنية أهل الإلحاد من القائلين بالحلول والاتحاد ص 410

[2] سورة البقرة - آية 257

[3] زخرف اية78

وەك نیوبژی با16 بیت.

4- هەرپالپشت بە خالی (3) دەردەکەوێ ناتوانرێ بەدیل وهاوتا بۆ ڕاستی دیاری بکرێ ،لیرە لەمانای ئایەتی (ولن تجد لسنة الله تبديلا )،واتە ناتوانرێ بەدیل بۆ یاسای (کێش) یان (یاسای میکانیك) لەو سروشت وبوونەوەرە دابنێین ،بەهەمان شێوە ناشتوانین دەستکاری ڕاستی بکەین ئاواش ناتوانین دەستکاری یاسا بکەین ،یان هەمواری بکەین (هەر ناشکرێ)لەوەوە لە ئایەتی (ولا تجد لسنتنا تحويلا )تێدەگەین ،ئەوە زۆر بەکارهێنانی دەبێت لە وەلامی پرسیارەکانی ستیڤن هۆکنگ کە دەلێ چ دەبوو ئەگەر جۆرە یاسایەکی تر بۆ ئەو گەردوونە هەبوایە ؟ لەهەمان کات وەلامیشە بۆ (کیپلەر) کە پێی وابوو ناوەوە ئاسمان وئەستێرەو هەسارەکان پیویستیان بە فۆرمات هەیە لە ئەنجامی سوڕانەوەو لادان لە یاسا ،نەخێر ئەو یاسایانە وای کردوە هەمو تەنیك(جگە لە ژیان) لەو بوونەوەرە مسەیەر بێت ،یاخی بوون ولادانی تێدانیە ،قەیران لە یاسای سروشتی نابێت .

5- ڕاستی ناکەوێتە سەرچالاکی مرۆڤ وکۆمەڵگە وەك لەسەروو لەلایەن هەندێ مەدرەسەی فەلسەفی بەستبوویانەوە بە مرۆڤ وکۆمەڵگە، ناشکەوێتە سەر زۆرایەتِی وکەمایەتی، ئەگەر هەمو خەڵکی سەر زەوی ووتی 5x3 دەکاتە 16 ویەك کەس ووتی (یان نەیووت)دەکاتە 15 ئەوا کەمایەتیەکە ڕاستە، هەروەك لە پرسی گەردوونی سوڕانی زەوی بە دەوری خۆر هەمو خەڵك وایان زانی خۆر بەدەوری زەوی دەسوڕێ کەچی ڕای کەمایەتیەکان (فیساگۆرس وئەلبیرۆنی وکۆپرنیك وگالیلۆ..) ر است دەرچوو، لە فقهی ئیسلامی (ئیجماع)بە سێیەم سەرچاوە هەژمار دەکرێ، کەچی ئیجماعیش شیاوی هەلەی تیدایە، زانیاری بەبێ ژێرخانی ڕاستی لە زاراوەی ئاینی پێی دەووترێت(ظن) وهاتوە:(وما يتبع اكثرهم الاظنا ان الظن لا يغني من الحق شيئا ان الله عليم

بما يفعلون)[1].

6- راستیەکان یەکتر پاسادان دەکەن ودەبنە پالپشت بۆ یەکتر، یەکتر تەواو دەکەن بۆ راستی گەورەتر، بە پێچەوانەی ناراست ناکۆکن لەگەڵ یەکترو یەکتر (نەسخ)دەکەن...، ڕاستی گەورەتر تەنها لە ڕاستی تر پێك دێت، ڕاستی نەسخ ونەفی ناکرێتەوە لەلایەن ڕاستیەکی تر، واتە یاسایەکی سروشتی ڕاستەقینە بەیاسایەکی تر نەسخ نابیتەوە، پەیامیکی دەست کاری نەکراو –ئایەتیکی قورئان..بە ئایەتیکی تر نەسخ نابێتەوە، تەنانەت قورئان ئینجیلی نەسخ نەکردۆتەوە ئینجیلیش وابۆ کتێبەکانی پیشووی خۆی، بەڵکو قورئان بە(مهیمن)هاتوە واتە ئەو زانیاریانەی پیشووی خۆی وبە فراوان تر هاتوە، لەهەمان کاتداڕاستی وناڕاست نیوبژی ودانوستانیان نیە، ناکرێ بلیی با فەلسەفەیەکی تەوفیقی، یان سیستەمیکی دادگەری پیکهاتوو لە هەمو لایەك پیك بهینین...ئەوانە دەکرێ بۆ ژیانی سادە، بەڵام ناکرێ بۆتەرازووی دادگەری، لەوەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەو بوونەوەرە سەرتاپای هەماهەنگە نەك (ناکۆکی- تناقظ) وەك لەبەشەکانی ڕابوردوو باسمان کرد.

7- ڕاستی بوونێکی سەربەخۆی هەیە لە جم وجۆلی زانیاری ئێمە، زانیاری ئێمە زیاد دەکاو کەم دەکا، هەلەدەکا،.. بەڵام ڕاستی بە چەسپاوی لە شوێنی خۆیتی بە پێی یاساکانی خۆی کاردەکا، ئێمە بەشێکین لە ڕاستی نەك پێچەوانە، هەریەکە لە فیختە وبارکلی وماخ وجودیو میسالی زاتی ونیهلیەکان و وبەشێك لە پراگماتیکیەکان نکولی لە راستی سەربەخۆ دەکەن ودەڵێن راستی تەنها لە بیرو هزری ئێمە هەیە[2]، نەخیر هەمو زانیاری ئێمە

---

[1] سورة یونس - آیة 36

[2] جون لویس- مدخل الی الفلسفة ص6

راست نیە، بەشیکی مەزەندەیەو ساغ نەبوویتوە، بەشێکیشی چەوتە، کەواتە پەیوەندی زانیاری(معرفە)و(ڕاستی) بریتیە لە : زانیاری گەشەو جوولە دەکا راستی چەسپاوە، رۆلی زانیاری دۆزینەوەی ڕاستیە، واتە مرۆڤ ڕاستی دروست ناکا (وەك برجسۆن وەسفی دەکا) بەڵکو دەیدۆزیتەوە، نرخی زانیاری(قیمە المعرفە) بریتیە لەو زانیاریانەی کە (ڕاستی) دۆزیتەوە، کە پێی دەڵێن زانیاری ڕاستەقینە، لەوەوە پیناسی ڕاستەقینەی (ڕاستی) لە ڕوانگەی مرۆڤ ئەوەیە (جووت بوونی زانیاری لەگەڵ واقیعی دروست).

8- ڕاستی پیر نابێ، خۆی نویێ ناکاتەوە چونکە زەمەن لای (راستی) نیە، ڕاستی نەمرە، راستی کۆن ونوێی نیە..ئەوە زانیاری ئێمەیە پیر دەبێ ودەمرێ ونوی دەبێتەوە..، تەنها زانیاری ڕاستەقینەی مرۆڤ –کە لە خالی(2)باس کرا - ئەویش وەك ڕاستی نەمرە، دەبێتە (كلمة الطيبة) وەك ئیبن روشد لە کۆنەوە تیبینی کردبوو، کەواتە بە پێچەوانەی ئەو ڕایەی مارکسیە کەدەڵێ: بیرو زانیاری ئێمە نەمر نین، وابەستە بە قۆناغی مێژوویی خۆیتی.. راستی ئەبەدی نیە[1]، لە شوینیکی تر رۆجی غارودیش بەشداری مارکس دەکاو دەڵێن : ئاینەکانیش دەبن ودەژین ودەمرن [2].

9- ڕاستی وواقیع لیك جیان، مەرج نیە هەمو ئەوانەی دەردەکەون ڕاستەقینە بن، شوبنهاورڕاستەوخۆباس لە پەیوەندی راستی و واقیع ناکا بەلام باس لە ڕاستی وەرگرتن دەکا ئێمە باسەکەیمان لەشیوەی واقیع وڕاستی بەو شیوەیە ڕێکخست: هەر ڕاستیەك کە ئاشکرا دەبێت(بەتایبەتی ئەو ڕاستیانەی ڕەهەندی کۆمەلایەتیان هەیە) یەکەم جار لەگەڵ واقیع ڕێك ناکەوێ دوەم

---

[1] كارل ماركس- بؤس الفلسفة ص166

[2] ماركسية قرن عشرين ص156

قۆناغی بە توندی ڕووبەڕووی دەبنەوە، قۆناغی کۆتایی گونجاندن ودەبێتە بەشیك لە واقیع، هەلبەتە جیاکردنەوەی واقیع وڕاستی لە سروشت ئاسان ترە نەك لەکۆمەڵگە، لەهەموان زەحمەت تر جیاکردنەوەی واقعیی وڕاستی عەقلیە.

10- ڕاستی وناڕاستی دوو دنیای لێك جیان، ڕاستی لە واقع هەیە، هەرچی ناڕاستە تەنها لە بیرو هزری ئێمەیە، ناڕاست لە واقیعدا نیە، بۆیەش درۆ و ناڕاست لەبیر دەچێتەوەو (ڕاستی) تۆمار دەکرێ، هەر ئەوەشە وا دەکا مێژوو ڕاستی تۆمار بکا نەك درۆ، هەرچەندە یەکەم کەس (ئەلبیرۆنی) وتی: مێژوو بەدرۆ بە ئارەزووی دەسەڵاتداران دەنوسرێتەوە.

هەرچی شۆبنهاوەر وسپینوزایە پێیان وایە بیرەکانمان هەرگیز لە واقیع جیانابیتەوە[1]، بەڵام بەو شێوەیە نیە، ئەوەتە (درۆ) یەکێ لەو جیاکاریانەیە، ئەوە بناغەی فەلسەفەی(درۆ) دەردەخا، لەوەوە دەردەکەوێ درۆ تەنها لەلایەن مرۆڤەوە دێت هیچ بەشیکی تری بوونەوەر درۆی تیدا نیەو نایکا، هەر لەوەشەوە عاقلمەندی تەواو لەگەڵ بێ هۆش ئەوەیە عاقلمەند درۆی دەزانی ئەگەر نەیزانی ئەوە عەقڵی نوقستانە.

11- ڕاستی هۆکارو ئەنجامی نیە تا میژوو و تەمەنی هەبێت ،جوله و گەشەی نیە ،ناکرێ لە هۆکاری ڕاستی بپرسێت،بڵێی ئەرێ بۆ 3 جاران 4 دەکاتە 7،هۆی چیە بوویتە 7 ،یان هۆی یاسای کیش چیە ،یاساو ڕاستی هۆی نیە ،بۆیە ئەنجامیشی نیە ،واتە نەگۆڕە ..ئەوەش سیفاتی بنچینەی ڕەهەندی دوەمە.

12- ڕاستی (نەگۆڕ "ثابت"، نەمریشە "خالد") ناکەوێتە سەر زەمان و مەکان

---

[1] المثالية الألمانية ص184

)... وكل امر مستقر )[1]، ئەوەی ڕاست بوو پێش 20 سەدە لە ئێستاش هەر ڕاست بووە، لێرە و لە ئەمریكا و لەسەر مەریخ (3+4=7)، ڕۆژ گەورەترە لە زەوی.. ئەوانە ڕاستی نەگۆڕن، چەمكی (مەیلەو ڕاست)، (ڕاستی بەگوێرەیی)، (تۆزێك ڕاست —حقیقە جزئیە) كە لە (مادیە و دیالیكتیك) و هەندێ مەردەسەی تر هاتوون چەوتن، لێكیش جیا ناكرێتەوە وەك(میشیل فۆكۆ) دەڵێت راستی فەلسەفی وئاینی وزانستی..لیك جیایە، بەڵام(ابن رشد) لە كۆنەوە ووتویەتی راستی ئاینی وفەلسەفی ولایەنەكانی تر دژ بەیەك نین بەڵكو پالپشتن لەسەر بنچینەی یەك ڕاستی شریعەت وفەلسەفەی گەیاندۆتە یەك[2]، هەر لەسەر ئەو بنچینەكندی هەولی داوە فەلسەفەو ئاین بگەیەنیتە یەكتری، رازی دژ بوە[3]. سیدقوتب جیهانی بە دیوێكی تری قورئان وەسف كردوە، ئەوبۆچوون و چەمكانەی پارچە كردنی راستی ونسبی كردنی وبەند كردنی بە زەمانو زەمین.. هەڵەن، زۆربەی ئەو بۆچوونانە هەردوو ڕەهەندی (مادی ونامادی) تیكەل كردوە لەهەموان زەق تر (جون لویس)ە لە وەسفی راستی (الحقیقة الكاملة انماهی تركیب من المتضادات )[4]، ئەوانە لەوە بەهەڵەداچووینە ئەو تێروانین و بۆچوونانەی كە بەرهەمی فكری ئادەمیزادن هەلە و ناتەواوی تێدایە، دوای كە زیاتر ڕاستی دەدۆزریتەوە ئەو بۆچوونانەش دەگۆڕێن، بەناوبانگترین نمونە هەموو مەدرسەكان بەنمونە لەسەر گۆڕانی ڕاستی دەیهێنینەوە لەوانەش مەدرەسەی ماركسیزم دەڵێن " لەپێشاندا وایان دەزانی زەوی ناوەڕاستی گەردوونە هەموو ئاسمان بەدەوی دەسوڕێتەوە، ئەوە

[1] القمر- اية3

[2] ابن رشد - فصل المقال فيما بين الحكمة والشريعةمن الإتصال ص58-

[3] ابو النصر الفارابی الثمرة المرضية فی بعض الرسالات الفارابية- تحقيق:د عادل نبيل ص83

[4] جون لويس- مدخل الى الفلسفة ص214

ڕاســـتیەك بـــوو، ئینجـــا دەركـــەوت كـــە زەوی هەســـارەیەكە بـــەدەوری ڕۆژ دەسوڕێتەوە، بەو شێوەیە ئەو ڕاستیە گۆڕا و لە داهاتووش زیاتر دەگۆڕێـت"، ئەنجلس دەڵێت تەنانەت خوای باوەڕدارانیش گۆڕاوە خوای كۆن هەمو شـتێكی بەدەستەوە بوو گەلایەكی داری بێ ئەو نەدەكەوت كەچی خوای ئیسـتایان زۆر ئاگای لەو ووردە ئیش وكارانە نیە[1]، بەڵام هەر بە تۆزێـك سـەرنجی ویژدانانـە بـۆت دەردەكـەوێ لـەو كـردارەدا لەیەكـەم هـەنگاو (فەرەزیـە) بەهەڵـەیی بناغەكەی دامـەزراوە ئـەوەبوو كـە بـە (زەوی ناوەنـدی دونیایـان)وت ئـەوە ڕاستیەكە، كەی ئەوە ڕاستیە!!، ئێمە وامان زانی ڕاسـتە(واتە زانیـاری ئێمـە هەلە بوو خۆ ڕاستی لە مێشكی ئێمە نیە بەڵكو زانیاری لە مێشكی ئێمەیە، ڕاستی لە شوێنی خۆیەتی لە نێوان زەوی وخۆرە، ئەگینا زەوی هەر بـە دەوری ڕۆژ دەسوڕایەوە و هەروەك ئێستا وابو، گـالیلۆ وتـی مـن لەسـێدارەش بـدەن سوڕانی زەوی بەدەوری خۆر ناگۆڕێت[2]، بەڵام كێشەی ئەو مەدرەسانە ئەوەیـە وادەزانن ڕاستی بە دەست ئادەمیزادە چۆن هەڵیسوڕێنێ وا دەبێت، هەرچـەندە مەدرەسەی ماركسیزمیش تۆماری كـردووە دەڵێـت (ڕاسـتی ناكەوێتـە سـەر جموجۆڵە فكریەكانی ئادەمیزاد) بەڵام لێرە پێچەوانەی ئەو بۆچونەی خۆیـەتی، ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین دەبینین ئەوەی لەو كردارە گۆڕا "ڕاستی" نـەبوو، وەك فەیلەسوفی ئیسلامی (محمد بـاقر صـدر) لـە كتێبـی (فلسـفتنا) دەڵێـت بەڵكو زانیاری ئێمە بوو. ڕاستیش دۆزرایەوە نەك دروستكرا.

---

[1] دیالکتیك الطبیعة ص230

[2] گالیلۆ ئەو بۆچوونە گەردوونانەی لە كتیبی(حوار حول النظامین الرئیسیین للكون: Dialogo sopra i due massimisistemidelmondo -ئەوە عنوانی ئەسلی ئیتالیەكەیە) بلاوكردەوە دەركەوت دۆزینەوەكەی كە بریتیە لە سوڕانی زەوی بەدەوری ڕۆژ نەك پیچەوانە لە گەل عەقیدەی مسیحی بەگشتی وكاتۆلیك بە تایبەتی زۆر ناتەبایە.

جا ئێستا دەگەڕێینەوە سەر ئامانج ونیازی ئەمانە لەو بارەیەوە بزانین زیانی چیە لەسەر ئاین، ڕاستە ئەوە ڕاستەوخۆ هێرش نیە بۆ سەر ئاینی ئیسلام، بەلاَم خەلَکی ژیر دەزانێت ئەوە بڕینەوەی ڕەگ و ڕیشەی ئاینە بە هێمنی بۆ ئەوەی هەر بە پالێك بکەوێت، ئێمە ئەگەر هاتینە سەر ئەو بۆچوونەی کە ڕاستی دەگۆڕێ، واتا یاساکانیش دەگۆڕێن (کە بەشێکن لە ڕاستی)، لەکاتێکدا شەریعەت بەمانای یاسا بنچینەییەکان واتا ئەو یاسایانەی پێش 14 سەدە بۆ کۆمەلێك لە زەمان و زەمینی خۆی هاتە کایەوە و کۆمەلێکی دادگەری پێ دروست بوو ئەوڕۆ ئەو هەلومەرجە گۆڕان و پێویستە ئەو ڕاستی و یاسایانەش بگۆڕێن وەك ئەتاتورك بەو بەلگانە زال بوو لە مشت ومڕی نێو پەرلەمانی تورکیا لە ڕۆژانی 1 و2 و1924/3/3لە نێوان ئەتاتورك وناڕازیەکانی هات، بەوشێوەیە دەبێت ئێمە تەسلیم بەوە بین ئاین وەك یاسا و بەرنامە دەسکردەکانی ئادەمیزاد بین کە وەلاَمی سەردەم و زەمانی زەمینی خۆیەتی، بۆ ئەو سەردەمە دەست نادات، واتا شارستانیەتی ئیسلامیش زیندوو نابێتەوە، هەروەك توبینی دەلێت (هەموو شارستانیەنێك بە سووڕی منالی و هەرەتی گەشەیی و مردن تێدەپەڕێ)، ئەوەیە ئەسلی هەموو تەقەلاکانی مادی دژ بە ئاین...، ئیبن حزم لەکتێبی(الملل والنحل والأهواء) زۆر بەتوندی وەلاَمی ئەوانەی داتەوە کە پێیان وایە هەر پێغەمبەریك تەنهابۆ کاتی خۆیان هاتون، هەروەك ڕاستی نەگۆڕە و ناشمرێت جا چ ڕاستیەکانی سروشت و ئەو بونەوەرە چ ڕاستی و یاساکان، کۆمەلَ و ژیان هەمووی لەسەر یەك ڕاستی مەزنن. بۆیە هەر دەمێك خۆمان بگەڕێینەوە سەر ئەو ڕاستیە (کە نەدەگۆڕێت و نە پیر دەبێت، نەبەسەریش دەچێت) دووبارە کۆمەلَگەیەکی دادپەروەرانە دروست دەکەین، بێجگە لەوەش مەحالَە هەر دابەش بوونە بۆ زۆرداری ز زۆر لێکراوی (ولیس بعد الحق الا الضلاله).

** ** ** ** ** ** ** **

ئیستا لەو دوورەهەندیەی بوونەوەر زەمینەیەکی زۆر خۆشی بۆ ڕەخساندین کە ئاسان لە پەیوەندی نێوان خوداو بوونەوەر بکۆڵینەوە، دەبینین راستەوخۆ نیە، لە ڕێی یاساکانی سروشتە، هاتنی پێغەمبەرانیش بە پەیامەوە وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن راستە خوا دروست کەرە بەڵام دەسەلاتی بەسەر بوونەوەر نەماوە، وازی لێهیناوە، نەخێروەك لەدوای دەردەکەوێ کە هەم لە توانای هەیە هەمودەم چی بکا(کن فیکون) هەم لە بەرنامەویاساکانی سروشت وکۆمەلایەتی شین کراوە کەلەکۆتایدا پەیامی ئەو بێتەدی...لە بڕگەکانی داهاتوو دەردەکەوێ، بەشیکی ترمان بۆ تەرخان کرد، لەبەر گرنگی بابەتەکە دووبەش بەیەك ئەدریس بەشیوەی (A) و(B) دەربڕاوە.

# بەشی شەشەم

# پەیوەندی دروستکەرو دروستکراو

# (B)

## پەیوەندی بوونەوەر و خوا

ئەو پرسیارە هەر پرسیارەکەی سەروە تا ئیستا وەلاّمان نەدایتەوە، پێویستمان بەوەبوو هەردوو رەهەندی بوونەوەر شیٚ بکەینەوە پێکەوەو یەکەیەکەش، وەلاّمی پرسیارەکە ئاسان دەکا بەلاّم پیش ئەوەی ڕاستەوخۆ وەلاّمان دەست کەویٚ بزانین بۆ وەلاّمی ئەو پرسیارە چارەنوسسازەی فەلسەفی چی ووتراوە ؟

ڕای زۆرسەیرو سەمەرە هەیە لەبارەی پەیوەندی خواو سروشت، یان چۆنیەتی بەرێوەبردنی سروشت لەلای خودا، لەکۆنەوە ئەبیقۆر ووتبووی ڕەنگە خوا هەبیٚ بەلاّم بیٚ کار دانیشتوەو هەقی بەسەر بوونەوەر نەماوە، تەنها ئەتۆمی لە پالّیەك ڕێز کردوە ئیتر ئەو بوونەوەرە بە ڕێکەوت وا بەڕێوەدەچیٚ[1]، ئەرستۆو هەندیٚ مەدرەسەی فەلسەفی تر دەلّیٚن ئەو بوونەوەرە لەخودا دەردەچیٚ بەبیٚ ئیرادەو مەبەست بەلّکو سیفەتیەتی وەك چۆن رۆژ تیشك دەدا، ئەو ڕایەی ئەرستۆ تا ڕادەیەك ابن سیناو اخوان الصفاشی پێکاوە، بەلاّم ئیخوان الصفا دەلّیٚن بەبیٚ ئیرادە

[1] موسوعة الفلسفية المختصرة ـ ص22، المثالية الألمانية-شلنج- ص377

نیەو مەبەستی لە پشتە[1]، شۆبنهاور دەڵێ سروشت لەباوەشی خودایە بۆیە خودا (ڕابوردوو وئیستاوداهاتوە)، دوای پشیمان دەبێتەوە دەڵێ ئەو جیهانە هەست پێ ناکرێ ئەگەر لە (موتلەق) بەتەواوی جیا نەبیتەوە[2]، بە پێچەوانەی ئەوانەش، هەیە دەڵێ سروشت خۆی بەشیکە لەخوا، نەستۆریەکان دەڵێن سروشتیش وەك عیسا نیوەی خوایەونیوەی مرۆڤە[3]، یاقوبیەکان دەڵێن (ح.عیسا) خۆی خوا بوە لەدوای لەخاچدانی ومردنی ئەو بونەوەرە سێ ڕۆژ بی خودان وبەڕێوەبەر مایەوە تا خوا زیندووبۆوە[4]، هەیە پێی وایە ڕۆژومانگ وئەستیرە وئاسمان نێوان بوونەوەرو خوایە، هەیە بت وهەیە شیخ وپاپاوحاخامی بە پیوەندی خواو بوونەوەر دەزانی، ئەوانە بەجۆرێك پێیان وایە خوا لە نێو گەردوونەو جاروایە پێیان وابوە لەگەردوون بچوك ترە لە زانایانی نوێ (فرید هۆیل و فرانك تیپلەر وئەسیمۆڤ..) دەڵێن خوا لە گەردوون بچوك ترە[5]، بە پێی بڕوای (تایفەی ئیسماعیلیە) ئاسمانەكان ژمارەیان(10)یە، هەر ئاسمانەك بە ئیمامیك سپێردراوە، ئاسمانی هەرە سەروو پێغەمبەر(محمد) بەرپرسە لێی، ئاسمانی نۆیەم (ئیمامی علی) ودوای حسن و حسین وعلی زین العابدین، محمد الباقر، جعفر الصادق، اسماعیل بن جعفر الصادق، ئاسمانی هەرە نزیکی زەویش (ح.فاطمة) لێی بەرپرسە، ئێزیدیەکان دەڵێن خوای هەرەگەورە ئەو دنیایەی ئێمەی بە ملکە تاوس سپاردوە.

غەنوسیە (مەسیحیەکان)یش پێیان وایە مادەوپیکهاتە زەمینیەکان پیسن

---

[1] رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء رسالة رقم:23 ص30 زیاتر لەو بارەیەوە رسالەی رقم:28 الحکمه فی خلق الله باسی ئەو مەبەستە دەکا.

[2] المثالیة الألمانیة-ص362، ص340

[3] نەستۆری گرۆپێکی مسیحین لایەنگری (نەستۆر)ن لە451ز مردوە دەیوت مسیح نیوەی مرۆڤەو نیوەکەی تری خودایە.

[4] ابن حزم- الملل والنحل والأهواء ج1ص24

[5] بۆل دیفیز — الإقتراب من اللة ص62

ولەدروستکراوی خوانین بەڵکو لەدروست کراوی شەیتانە[1]، لە ئاینی مسیحی (کاهنی گەورە) ئەو نێوانە بوە[2]، بەشیکی تر دەڵێن ئاسمان خوا بەڕێوەی دەباو زەویش مرۆڤ، دیزمیەکان دەڵێن خوا بوونەوەری دروستی کردوەو مرۆڤیش بەڕێوەی دەبا، شۆبنهاوەر وهاوسەردەمیەکانی مشتومڕێکی زۆریان لەو بارەیەوە کرد، مەنهەجی توێژینەوەکەیان ئاوابوو ئاخۆ مادە لەخوا دابڕاوە یان بەشێکە لێی.

هەندێ زانای فیزیایی سەردەم ڕای زۆر سەیریان بۆ دروست بوە هەریەکە لە فرید هۆیل و فرانك تیپلەر وئەسیمۆڤ دەڵێن خوا لە گەردوون بچوك ترە [3]، لەبەشی (فەلسەفەوالدین) دەڵێت نێوانی خواو بوونەوەر ناکۆکی یە نەك تەبایی، فەلسەفەو ئاینی تریش هەیە پێیان وایە نێوان خواو بوونەوەر ڕۆژ ومانگ وئەستیرەو شەیتان وپیاوچاك و..، بەشی هەرە زۆری ئاینیش پێیان وابوە هەر خودا ئەو بونەوەرەی دروست کردوەو هەر بە ئیرادەی ئەویش بەڕێوە دەچی ونکولیان لەوە کردوە لەنێوان خوداو دروست کراوەکانی هیچ هەبێ جگە لە خۆی، بۆیە هەر ڕوداوێك دەگێڕنەوە بۆ خودا.

(ئیخوان سەفا) زانیویەتی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە نێوان خوداو بونەوەر نیە بەو جۆرەیان گوزارش کردوەو ووتویانە نێوان خوداو بونەوەرفریشتەیە هەندی دەم مادیەو هەندی دەم نامادیە[4]، ئاینیەکان کەمتر دانیان بە یاسای سروشتی هینابوو، ئاخۆ ڕۆلی ئەو یاسایانە چیە، کەوتونە کێی دروستکراوی خوایی، یاسای سروشتی یەکێك لەو219 کوفرانە بوو کە لەلە لیستی ڕەشی کنیسە تۆمارکرابوو بە ناوی

---

[1] بۆلدیفیز-الإقتراب من الله-بحپ فی اصل الکون-ت:منیر شریف ص61
[2] کتاب المقدس- جدول وشروح فی کتاب المقدس ص716
[3] بۆلدیفیز —ه س ص62
[4] رسائل اخوان الصفاء.. ص37

(index)[1]، تا ئاستی فەلسەفیش لەوانە دافید هیوم دانی بەیاسا سروشتی وراستی نەدەهینا[2]، لە فقهی ئیسلامیش کەمتر جێی بۆ کراوەتەوە، بە پێی هەندێ توێژینەوە یەکەم جار فیساگۆرس باسی لەیاسای سروشتی کردوە..واتە ئەسلیکی ئاینی هەبوە.

توماس ئەکوینی هەولی داوە لەوانە ئەکادیمیانە تربۆ (ئیرادەی خودا) بچێ و دەڵێ یاسای سروشتی بریتیە لەئیرادەی خودا(القوانین العالم تعبیر لإراده الله)[3]، ڕاستەوخۆتر مەلای گەورە دەڵێ: علمی تەبیعەت علمی خودایە، قالەو قەوالە گشتی هەبایە. (دیکارت) ڕایەکی نزیکی هەیە لەوەی باس دەکەین ودەڵێ:خوا بوونەوەری دروست کرد، دوای بە یاساکانی سروشتی سپارد وخۆی وازی لێهێنا، ئیتر پێویست ناکا ناویشی بهینی سودی نیە[4]،ئەو بۆچوونە زۆر باوە ،سارتەر بە بیّوارِی خۆی و ئایندارِیش جاروایە ئەو ڕایەیان هەبوە ،نیوتن ووتبووی خوا کاری ئەوەبووە ئەو جیهانە وەك سەعات ئیش پێبکاو وازی لیهیناوە ،باسکال بە توندی دژی ئەو بۆچونە بوە ووتبوی خوا لای دیکارت ئەوەبوو کە ئۆکەیەکی بۆ بەکارخستنی گەردوون کردوەو رۆیشتوە، لەهەموان خراتر لاپلاس بو ، لەلای ئاینپەروەرانی کلاسیکی خودا لەو کاتی پیویستە کە نازانی ،بۆئەوەی ئەوەی نەتزانی بلێی خوا دەزانی ،خوا وادەکا ..ناویان ناوە (الە الفجوات)، لێرەوە (سود)بوە بنەمای خۆویستی مرۆڤ بنەمایەکی سیستەمی سەرمایەداری ئیستا

---

[1] لەدوای سەدەی 17 بەدواوە کنیسە ناوەناوە لیستیکی لە کتیبە قەدەغەکراوەکان بلاودەکرایەوە ،تا لەسالی 1966پاپا پۆلسیشەشەمفەرمانی وەستانی دا.

[2] الفلسفه والفیزیاو ج1ص88

[3] الفلسفة والفیزیاء ج1ص86 هەر تۆما ئەکوینیش ووتویەتی: (إنّ القوانین الأزلیة في علم الله تعالی، ونحن نتعرف علیها تارةً عن طریق الوحي، وأخری عن طریق العقل) .

[4] الفیزیاء ووجود الخالق –د جعفر شیخ ادریس ص25

پیك دەهینی، هەرلێرەوەش لە ئەرستۆ نزیك دەبێتــەوە کــەدەڵێ : إنـه یعسـر علـی الإنسان أن یفعل الأفعال الشریفة بلا مادة[1]، سپینوزاش ئـەو پرسـیارە دەکـاودەڵێ ئەو عیبادەتەی خوا چ ئامانجی هەیە ئەگەر سودی نەبێ[2]، (مـذهب المنفعـة ولـذة) لێـرە سـەرهەلدەداو ئـەو واقیعـەی ئیسـتای جیهـان بـە سـەلبی وئیجـابی لـەو سۆنگەفلسفیە هاتوە، دیکارت نەچوو بەلای پەیام کـە بەلگەیـە لـەوەی وازی لـەو بوونەوەرە نەهیناوە و بێ دەسەلات نیە وەك شای بریتانی نیە.

ئەو کۆمەڵە تیۆرەی کە پێ ی وابووە سروشت بێ خاوەنە و خـۆی دروسـتکارە، وەك پرسیارەکەی (سەعید نەورەسی) "ئەرێ سروشت هونــەرە یـان هونەرمەنـد"[3] وەڵامیان (هونەرمەند) بوەو بریتین لە مەدرەسەی مادی، لەهەر سـەردەمێك جـۆرە فەلسەفە و مەدرەسەیەکی دروستکردوە، لەوانە دەهـری لەکۆنــەوە (naturalism) سروشــتیزمەکان، مادیــەتی میکــانیکی، مادیــەی دیــالیکتیکی،.. ئــەوەی زۆر یارمــەتی فەلسەفەی(سروشــتایەتی) دا هــەردوو تیــۆری (پەرەســەندن) و (تیــۆری ڕێکەوت) بوون بە پالپشــتی تیــۆری گــەردوونی وەســتاو، پێیــان وابــوو ڕێکــەوت (صــدفە) و (گەشــە) لــەنێو بونــەوەرێکی هەتاهــەتایی هــەموو جــۆرێکی نــوێ هەڵــدەهێنێ ودەجــولێنێ، لەســەرجەم ئــەو تــەیارە فەلســەفیانەش مەدرەســەی مارکسیزمی لێ پەیدابوو کە زۆر بەقووڵی و ئیقناعکەرانە مەنهــەجێکی فەلســەفی بۆ (پەیدابوون و گەشە) لەهەموو بوارەکــانی ژیــان و بونــەوەر دارشــت، پەیوەنــدی نێوان خواو بوونەوەری بە لادانی خودا لە هاوکێشــەکە دارشــت، ئــەویش بــە هــۆی بەشی فەلسەفی (ناکۆکی) بوو، کە کردیە دووەم یاسای مادیەی دیالیکتیك بــەناوی

---

[1] ابن مسكوية- الفرق بين الخير والسعادة ص3
[2] رسالة فى اللاهوت والسياسة ص197
[3] ئەوە عینوانی کتێبێکی سعید نەورەسیە.

(الوحدة وصراع المتناقضات)[1] كە بەكورتیەكەی دەڵێت: لەناو هەمو سیستەمێك (شتیك) لەناو هەمو دام ودەزگا سروشتی كۆمەلایەتی ئابوری لەناخیدا دوولای ناكۆكی تیدایە، ئەو ناكۆكیە دەبێتە سەرچاوەی جولەو گەشەی چەندایەتی وچۆنایەتی[2].

به پێی یاسای سێیەمی دیالكتیك(قانون التحول من تغیرات الكمیة الى تغیرات الكیفیة) ئەو گەشەیە تا ڕادەیەك چەندایەتیه دوای لە خالیك دەبێتە گەشەی چۆنایەتی وڕەوتی ئەو سیستەمە دەگۆڕێ بەناسنامەوە لە جۆرێكەوە بۆ جۆرێكی تر... بەو شێوەیە لەمادەدا هەمو جۆرە شتێكی جیاجیای سروشتی وبایۆلۆژی وژیاری وچینایەتی..پەیدا دەكا، هەولی داوە وەلامی ئەو پرسیارەش بداتەوە ئاخۆ ئەگەرناكۆكی نەبوو وەك سەرەتای كۆمەڵگە (بێ چین) بوو چۆن ناكۆكی وچینایەتی لێ دروست بوو، ئەنجلس وجۆرج پۆلیتزیر ڕاستەوخۆ تر وەلامیان دایتەوە، ئەنجلس دەڵێ پرۆسەی (نەفی) ئەو ڕۆلە دەبینی كە سێیەم یاسای مادیەی دیالكتیك پێك دەهینێ بەناوی(قانون نفی النفی)، دەڵێ (نفی) یەكسانی جیایی و ناكۆكیە، پۆلیتزیریش لە كتێبەكەی(اصول فەلسەفه الماركسیه) دەڵێ (هناك دائماًقوة متغلبة على قوةولو قليلاً، فينموا التناقض)[3]، كە لە

---

[1] بڕوانه : أ- انجلس – دیالكتیك الطبیعة ص78 ب- بودوستنیك ویاخوت- عرض موجز للمادیة الدیالكتیكیة ص89-112 لینین لەو بارەیەوە لە(ملاحظات الفلسفیة ص263) دەڵێت: دیالكتیك مانای دۆزینەوەی ناكۆكی لە ناخی شتەكانە، لە (ص81-)دەلی سەرچاوەی (گەشە)ش لەململانێی لایەنە ناكۆكەكانی دیت.

[2] ستالین-المادیة الدیالكتیكیة والمادیة التاریخیة ص33

[3] جورج ببولیتزر-اصول فلسفة الماركسیة -درس الخامس ج1ص83- زیاترزانیاری بروانه: 1- ماركس(الرأسمال، بؤس الفلسفة) 2-انجلس(دیالكتیك الطبیعة، اصل العائلة والملكیة الخاصة والدولة)3- ستالین –المادیة الدیالكتیكیة والمادیة التاریخیة 4- ماو تسی تونغ(حول التناقض، حول الممارسة العملیة) 5-بلیخانوف-نظریة صراع الطبقات .

کۆتایی لە فەلسەفەی (ناکۆکی سەرتاسەر)دەخەملی کە پیشوو تر بە ووردی باسمان کرد، ئەوە بەکورتی ڕای فەلسەفەی مارکسی بوو بۆ گەشەو پەیدابوون کە سودی لە (فەلسەفەی پەرەسەندن) و(سیستەمی دیالکتیکی هیگل) و(ئایدیۆلۆژیای فیۆرباخ) و(ئابووری ریکاردۆ) وزۆر لای تر وەرگرتوە. هەولی داوە ئەو تیۆرە بە هیزانە بکاتە بەدیلی پەیوەندی سروشت وخوداو یان هەر پێویست بە خودا نەمینیٚ.. لەسەروو بە درێژی ئەو بۆچونەمان هەلسەنگاند.

ئاساییە وەلامی پرسیارەکەی سەروو(پەیوەندی سروشت وخودا، پەیوەندی بونەوەرو خودا، پەیوەندی دروستکراو بەدروستکەر..) لای مادیەکان دەست ناکەویٚ لەبەر هۆیەکی سادە، ئەوان دان بە خوا ناهێنن تا نێوانی بوونەوەر وخوا دیاری بکەن، بەلاّم لەلای فەلسەفەی میسالی وئاینیش بە ڕوونی دەستمان نەکەوت، یان بەلایەن کەمەوە بە مەنهەجێکی فەلسەفی دیاری کراو وەلاّمان دەست نەکەوت ئاخۆ پەیوەندی خوداو بوونەوەر ڕاستەوخۆیە یان ناڕاستەوخۆیە؟ ئەگەر ڕاستەوخۆ نیە کامەیە نێوانیان؟ وەلاّمەکەی سانا بوە، خودا مادە وبونەوەری دروست کرد، یاساشی بۆ دیاری کرد، بەو یاسایانە کاردەکەن، واتە بە ڕوونی دەردەکەویٚ یاساکانی سروشتی ئەو پەیوەندیەی نێوان خوداو بونەوەرن، یان بە واتای ڕەهەندی ئەوا نێوانی خوداوبونەوەر(مادە-بوون-شت-ئەنجام-خلق..)بریتیە لە ڕاستی(یاسا-هۆ-امر..)، واتە رەهەندی یەکەم خلقەو رەهەندی دوەمیش(امر) نێوانی خواو رەهەندی یەکەمە، هەردووکیشی بۆ خوا دەگەڕێتەوە(الا له الخلق والأمر)، یاسای سروشت وئەمریش نەگۆڕن وەك لە سیفاتەکانی (ڕاستی) باسمان کرد، بۆیە بونەوەر ڕاکیشراو دەبیٚ، مسەیەر دەبیٚ، ئەگەر لەپیش چاوی ئێمە یان بە پێی زانیاری ئێمە وادەرکەویٚ کە بونەوەر بە شتومەکەکانی ناوەخۆییەوە ئیرادەو فرەئیختیاری هەیە ئەوە کەمی زانیاریمانە لە بارەی دۆزینەوەی یاساکان، ئەگینا ئەو فرە ڕێگەو

ئیختیارەش هەر یاسایە، مادام ڕەهەندی دوەم (یاسا)ئاویتەی مادەیە ئەوا ئەگەری عەبەسی لە پیش بوونـەوەر-مـادەو (خلـق) نیـە (..ویتفكـرون في خلـق السـماوات والارض ربنا ما خلقت هذا بـاطلا..)[1]، بیٚ یاسایی وفرە ئەگەری وئازادی بوونـەوەر مانای (**باطل**)ی دەدا بەهەمان شیٚوەش ڕای میسـالیەکان و برکلـی ومـاخ وهیـوٚم ووجودی..بە نکولی لە ڕاستی بونەوەر دیسان مانای (**باطل**)ی دەدا کە قورئـان زۆر بەتوندی وەلاٚمی ئەو جۆرە بۆچونە فەلسەفیانەی داوەتەوە، ئەوەی فرە ئەگـەری لـە پیشە وئیرادەی بەکاردەهیٚنی بۆ گرتنەبەری ڕیٚگا جیاجیاکان ئـەوە ژیانـە، لـە نیـو ژیانیش مرۆڤ، ئەو بەشەیە کە روح بەشداریەکی زیاتر بـە پانتـایی (یاسـا-ئـەمر) دەداو پانتایی مادە-خلق تەسکتر دەبیٚتەوە...کە برِگـەی داهاتومانـەو زیـاتر ڕوون دەبیٚتەوە لە پەیوەندی خودا بە سروشت ومرۆڤەوە.

## پەیوەندی بە سروشت و مرۆڤەوە:

لەبابەتی پیٚشوو زۆر بـەڕوونی سـنوری نیٚـوان (خـالق و مخلـوق) (دروسـتكار و دروستكراو)، (شت و ناشـت)، (موتلـەق و نیسـبی)...لیٚك جیاكرایـەوە، لـەوەوە (دیفیـز) دەلیٚـت: جیـاوازی خـواو بوونـەوەر(خالق ومخلوق)ئەوەیـە یەكـەمیان هەتاهەتاییەو دوەمیان سنوردارە[2]، بەو شیوەیە پەیوەندی خوداو بونەوەرمان پـۆلین کرد، ئیٚستا لەبونەوەرەوە بەرەو سروشت وژیان نزیك دەبینەوە.

پرسـیاری بنچـینەیی و یەكلاكـەرەوە ئەوەیـە چـۆنیەتی حـوكمی خـوا لەسـەر دروستكراو، یان پرسیارەكە بەدیوی ئەكادیمی پەیوەندی سروشت بەخوا، چۆنە؟

سیٚ وەلاٚمی سەرەکی :

---

[1] سورة ال عمران -اية191

[2] بۆل دیفیز – الإقتراب من الله ص63

1- ئینکاری خواو حوکمی سروشت ئەوە فەلسەفەی مادیەکانە باسمان کردوە ودوای باسی پەیوەندیداربەو بەشە دەکەین.

2- خوا دروستکارە بەڵام هەقی بەسەر گەردوون و بونەوەر وسروشت نەماوە، لەوەوە ئەبیقور (242ـ270 پ.ز) دەڵێ لە خوای ناوەشێتەوە حوکم لەو بوونەوەرە بکا و خۆی بچوك بکاتەوە وازی لێهێنایە[1]، دوایش(ئەبیکرات) و(دیزمیەکان) لە فەلسەفەی یۆنانی.. تادەگاتە عەلمانیەتی ئەو سەردەمە کە دەڵێن (خلق) بۆ خوا دەگەڕێتەوە بەڵام(امر) بۆ ئێمەیە، کاروباری ئاسمانی بۆ خواو زەویش بۆ ئێمە، دەیانەوێ بڵێن ئەودنیایەی نزیك لە ئێمە —سروشت وژینگەی ژیان وەك بونەوەر نیە هەمو کارەکانی لەدەست خۆی بێت، کاری دونیا(سروشت) بۆ مرۆڤ بە جیهیشتوە، هەندێ لە ئاینیەکانیش ئەو ڕایەیان هەیە، قەشە (ولیام سامبل)-لەکنیسە کتنبری بەریتانی دەڵێت: (خوا بەتەنها یاساو ئاینی بۆدنیا دانەهیناوە بەڵکو وای کردوە مرۆڤیش بەشداری بکا)[2]، هەرچی (مارتن لوسەر)ە ڕایەکی نزیك لەوەی هەیەو دەڵێ:(ئەندازیارو دروستکەری گەردوون خوایەبەڕێوەبردنەکەنیشی بۆ خەڵکی بەجێهیشتوە)[3]، واتە وەك شای بەریتانیا ئاسا (يملك ولا يحكم)[4]، دەیانەوێ بلێن خوادروستی کردوەو بەڕێوەبردنیشی بۆ ئێمە بەجێهێشتوە، هەرچی هەندێ ئاینی ترەبەجۆریکی تری سەیر تر، ئاینی مهاریشی(کە

[1] موسوعة الفلسفية المختصرة ـ ص22

[2] هە لبزاردن لە نیوان عە لمانی وئیسلامی- نوسقر ص13

[3] شبلي عيسمى - العلمانية ودولة الدينية- ص22

[4](لە ئەسلدا بەشێك لەفەیلەسوفانی یۆنانی بەسەرۆکایەتی (هرکلیت) کە نکوڵیان لەوەکرد ئەو بونەوەرە دروستکراو بێت، بەشی دووەمیشیان بەسەرۆکایەتی(فیساگۆرس) دەیان وت خوا دونیای دروستکردوە و حوکمیشی دەکات، ئەوانە وەك تەوافقی وتیان خوا دروستیان کردوە بەڵام سروشت سەربەخۆیی خۆی وەرگرتووە و حوکمی خۆی دەکات).

بەشیکە لە هندۆسی کۆن) دەڵێن خوا ئەو بوونەوەرەی لەبەر خاتری مهاریتچ دروست کردوەو بوویتە خاوەنی ئـەو جیهانـە نـەك خـودا[1]. ئـاینی ئیزیـدی باوەڕی وایە خوا دەست ناکاتە کارو بـاری سروشـت، دونیـای خـوارەوو، بـە ئیرادەی خۆی ئەو جیهانەی ئێمەی بە خوا(ملکە تـاوس) سـپاردوە نـەك بـە یاسای سروشت[2].

3- پێیان وایە خودا هەم دروست کەرە هـەم حوکمیشـی ڕاسـتەوخۆیە لەسـەر ژیان وبیٚ ژیان وسروشت، ئەوەیان زیاتر ڕای ئاینیـە پەتیەکانـە، نزیکـە لـە سیستەمی سیۆکراتی، ئەوەی ئیستا لە جیهانی نویٚ حوکم دەکـات نـزیکترە لە بەشـی دوەم، دەتـوانین بلـێین فەلسـەفەی عـەلمانی بەگشـتی پشـت بـەو فەلسەفەیە دەبەستێت، وەك بەشێك لە لێك جیاکردنەوەی (حاکم) و (خالق) ئایین بۆ خودا و حوکمیش بۆ ئادەمیزاد، خلق بۆ خودا وئەمر بۆ مـرۆڤ، لـە سروشتیش (خلق) بۆ خوا و بەڕێوەبردنیش بۆ سروشت.

بەپیٚ ی ڕووداوی ڕۆژانە و واقیعێکی بەرجەستە ئەو بۆچوونە فەلسەفیە ڕاسـتتر دەردەکەویٚ لەهەردوو وەلاّمی فەلسەفەی ئیلحادی و فەلسەفەی ئایینی (ئیلاهـی)، بەلاّم ئەگەر زۆر بە قـوڵتر و فەلسـەفیانەیەکی دروسـت بـۆی بچـین، دەبیـنین هـەر سروشت بە عەیار و هاوسەنگیەکی وورد دروست نەکراوە، بەڵکو بەڕێوەبردنەکەشی هەروا ورد و ستاندەرە، کەواتە خودا هەر دروستکار نیە بەڵکو بەڕێوەبەریشە بـەلاّم بەو ڕوانگەیەی بەشی سێیەم نـا، بـەڵکو بـە شـێوازێکی تـری فەلسـەفی وئـاینی ڕاستەقینە، قورئان ناڵیٚ تەنها (خلق) پەیوەندی بە خودا هەیە بەڵکو دەڵێت (الا له الامر و خلـق )، مەبەست لە(امر)یاسا سروشتیەکانە، کەواتـە ئیسـتا هـەمو ئـەو

---

[1] موسوعة الأديان مادة: مهاريشی

[2] ئەنستاس ماری کەرمەلی –کتیبی پیرۆزی ئیزیدیەکان ل63 جلێوە –بەشی یەکەم ئایەتی(6-8)

لێلیانەی بیری دیزمی وپەیوەندی خودا بە بوونەوەر وسروشت ڕوون بۆوە، ڕوون بۆوە کێشەی ستیڤن هـۆکینگ ولاپـلاس وهۆلبـاخ وفیۆرباخ..یـەك کێشـەیە، ئـەنجلس دەڵێت نیوتن یەکەم جار لە دۆزینەوەکانی خوای تێدا بوو، بـەڵام نەیهیشـت نزیـك سیستەمی خۆر بکەوێت[1]، لە ڕاستیدا وانیە نیوتن چـاك تێگەیشـتبوو، خـودا لـە سیستەمی خۆرهەبوو لە ڕێی یاساکانی ئەو سیستەمە.

مـادام ئـادەمیزاد و کۆمەڵگـەش بەشـێکن لـە سروشـت و بونـەوەر، لەگـەڵ زیادەیەك کە ئادەمیزاد زیندەچالاکی و خواستە هەنگاوی هەیە، ئـەوا لەگـەڵ ئـەو یاسایانەش پەیامی (پێغەمبەر و کتێب) بۆ ناردوون، واتە پەیام بـۆ ئـەوە هـاتووە ئادەمیزاد و کۆمەڵگەش مێژوویەکی وەك سروشت و گـەردوون دروسـت بکـا(دوای باسی دەکەین)، کەواتە ئێستا بزانین یاساکانی سروشت چۆن حوکم لەسەر سروشـت دەکەن و چۆن پەیوەندی بە خودا هەیـە؟ ئایـا ڕوداوەکـانی سروشـت و ڕوداوەکـانی کۆمەڵایـەتی جیاوازیـان چـیە؟ ئایـا ڕوداوە کۆمەڵایەتیـەکان موسـەیەرن یـان موخەیـەر؟، ئایـا یاسـاکانی سروشـت (شـریکن) لەگـەڵ خـودا وەك لـە(دیزمی ئەگریکیەکان) واهاتبوو کە یاسای سروشت شریکن لەگەڵ خودا نەك خوازال بـووبێ بەهۆی یاساوە بەسەر سروشـت[2]، یـان پەیوەنـدی نێـوان (خـالق) و (مخلوقـە) وەك بەشێك لە فکری ئیسلامی وای گەلالە کردبوو؟، ئایادەشێ بڵێین لەسەروی سروشـتن و لە خواروی خودایە؟ چونکە وەڵامی ئەو پرسیارە کێشەیەکی فەلسەفی و عەقیـدی چارەسەر دەکا کە (موعتەزیلە)کان بەبێ مەنهەجێکی فەلسەفی دروست گەڵاڵـەیان کرد و لەجیاتی زیادکردنی زانیاری بـوە هـۆی کێشـەی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و مەزهەبی.

---

[1] دیالکتیك الطبیعة ص230

[2] بۆ ڕون بوونەوەی ئەو جۆرە بۆچوونانە بڕوانە: **Timelesseness.. p3 Routledg&Kegan- God and**

هەروەها وەڵامی پرسیارەکانی تریش ئەگەر بەدروستی دەستمان کەوێت، ئەوا وەڵامی پرسیارەکی بنچینەیی ئەو سەردەمەش دەداتەوە کە تاکو ئێستا بویتە کێشە لەپێش زۆربەی زانا و فەقیهو ناودارانی ئاینی ئیسلام، پرسیارەکەش ئەوەیە ئاخۆ ئادەمیزاد خۆی لەڕوداوەکان (بە چاکە و خراپە) بەرپرسیارە (مخەیەرە) یان پێکراوە و لەدەستەخۆی نەبوە (مسەیەرە)؟ وەڵامی قورئان ووەڵامی فقهی تارادەیەك لیك جیایە، تەنانەت دەتوانین فراوانی بکەین بڵێین وەڵامی ئاینی بەگشتی وئاین پەروەران لیك جیایە، لەقورئان وەڵامەکە ڕوونە کە سروشت وبوونەوەر مسەیەرن ومرۆڤیش بە پێی ئینتمای بۆ بوونەوەر مسەیەرە ئەو بەشەشی تایبەتە بە مرۆڤی ئەوە (مخەیەرە)، ئەوەیان تەنها بوە ڕای ئەوانەی بە ڕاستی (راسخون فی العلم) وئەوانەی (حکیم)بوون، تەنانەت ئیمام غزالیٚ کەفەلسەفەی بۆ وەڵامدانەوە خوێند کەچی لۆژیکانە وەڵامی ئەو پرسەی دایتەوەو دەڵیٚ (إن الله حر مخير مطلق التخيير و المادة الجامدة مسيرة منتهى التسيير.. و الإنسان في منزلة بين المنزلتين..)، وەك لەدوای زیاتر باسی دەکەین.

هەرچی وەڵامی ئاینیەکانە بە تایبەتی فقهی ئیسلامی ولەویش زیاتر (ئەوەی پێی دەڵێن سلف)زیاتر باوەڕی وایە کە مرۆڤ مسەیەرە، لە فەرمودەیەکی زۆر بە ناوبانگ:(..وفي الصحيحين أن النبي (ص) قال" :إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً نطفة، ثم يكون علقة مثل ذلك، ثم يكون مضغة مثل ذلك، ثم يرسل إليه الملك فينفخ فيه الروح، ويؤمر بأربع كلمات، يكتب رزقه وأجله وعمله وشقي أو سعيد).

1. ئەوەیان لە ئاینی ڕەت بوە بوویتە کەلتور لە نیو موسوڵمان کە هەرچی ڕوودەدا دەڵێن خوا نوسیویەتی لەوەوەزاراوەی (ئەجەل ونسیب و تەوەکول وبەخت.. وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ..) باوی وەرگرتوە، بەڵام وەك

ژیانی رۆژانە کەس لەسەر ئەو ڕایە نەوەستاوەونەلەسەر (تفسیری بەهەلەی ئەو ئایەتە)نەوەستاون، هەرکەسە بۆ خۆی هەول دەدا یاسای (هۆو ئەنجام) پەیڕەو دەکا،لە ڕاستیدا ئەگەر مرۆڤ مسەیەر بوایە نەپیویستی بە پیغمبەران دەبوو نەبە پەیام وقورئان وئینجیل وتەورات،هەرچی بەووردی سەرنج بداتە ئەو ئایەتە (**اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى فَقُولا لَهُ قَوْلا لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى**..) بەمانای بەلکو ڕاستە ڕێ دەبێ ،ئیحتمالیە مانای وایە لای خوای گەورەش ساغ نەبوویتەوە(وەك خۆی وای ویستوە) بۆیە دەلێ (لعل- بەلکو)،ئەگینا دەیووت مەچوون خێری نیە ،کەچی زۆربەی فقهی ئیسلامی بەلای ئەو ڕاستیە نەچوە ،بەگشتی ئەو ڕایە کاری لەسەر تێکڕای گەشەی عەقڵی وشارستانی وتەکنیکی بە سەلبی کردوە، وای کردوە ئاینیەکان زیاتر گرنگی بە ڕابوردوو بدەن نەك داهاتوو، لەدەقی ئینجیلی هاتوە : فلا تهتموا للغد.لان الغد يهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره[1]. هەمان گەوهەر لەلایەن ئیمامی شافیعی بە شیعر هاتوە:

سهرت أعين ونامت عيون — في أمور تكون أو لا تكون
فادرأ الهم ما استطعت عن النفس — فحملانك الهموم جنون
إن ربا كفاك بالأمس ما كان — سيكفيك في غد ما يكون

لە شیعرێکی تریدا:

وما يك من رزقي فليس يفوتني — ولو كان في قاع البحار العوامق
ففي اي شيء تذهب النفس حسرة — وقد قسم الرحمن رزق الخلائ

[1] كتاب المقدس-العهد الجديد- مت 6: 34

لە بەرامبەریشد نارەزاییەکی زۆر لەو (متنـاقض) هەیە کە مرۆڤ هیچـی لەدەسـتە خۆ نەبێت وسزاش بدریٚ.

خیام دەڵێ:

بۆ هەرچی دەچم لەدەستی خوا ڕیشم
هیچ کاریٚ بەدەست خۆم نیەهەرچی دەیکەم
ئەو پێمی دەکاهیشتا گوناحباریشم[1]

ابوعلامعری بەشیعر دەڵێ:

ما ولاحیاتی فهل لی بعدمیلادی ولاهرمی بإختیاری

ولیم بلاك(1757– 1827) بەشیعر دەڵێت ئاین وا دەکا مرۆڤ متمانەی بە خۆی نەبیٚ وئامادە بیٚ بۆ خۆ بەدەستەوە دان ومل چەماندنەوە بۆ زولم، بەشی زۆری هیزی مادی لە فەلسـەفە، عـەلمانی لـە سیاسـەت، سـەرمایەداری لـە ئـابوری،.. لەو(متناقض) هاتوە، بەشێك بەوەش نەوەستاون تەحەدای خوایان کردوە، ووتویانـە ئەگەر هەموکارێك بەدەست ئـەوە بابێتـە مەیـدان وەك لـە شـیعرەکەی خەلیفـەی موسوڵمانان (ولید بن یزیـد126-88ە) بە گالتەجاڕی بە خواو قورئان لە وەڵامی ئایەتی (واستفتحواوخاب کل جبارعنید) دەداتەوە ودەڵێ:

أتوعد کل جبار عنید      فها اناجبار عنید
فأن لاقیت ربك یوم حشر      فقل: یارب خرقنی الولید[2]

هەر لەوەشەوە تەحەدای (ح.عیسی) کراو پێیان ووت : (..ان کنت ابن الله فقـل ان تصیر هذه الحجارة خبزا)[3]،لەو سەردەمەش هەمان تەحەدا (لۆدفیخ فینگشـتاین) ی نەمساوی دووبارەی کردۆتەوە و دەلیٚ تۆ لەویٚ ومنیش لێرە بێمنەت بە ،ئەگـەر

[1] چوارینەکانی خەیام- و: هەژار موکریانی ل19
[2] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72
[3] کتاب المقدس –العهد الجدید، انجیل متی(مت 4: 3 )

وەك خۆی پۆلینی (مخەیەر ومسەیەر) لە ژێر سایەی بونەوەری دوو ڕەهەند بکەی، لیکی بکەیتەوە مرۆڤو کارەکانی دەکەونە کێی ئەو دوو ڕەهەندە، ئەو (متناقض)ە ئەو پرسیارە تەحەدایانە چارەسەر دەبێ، ئەو کاتی دەردەکەوێ کە کارەکانی مرۆڤ لەکۆتایدا دەکەوێتە ژێر ڕکێفی مەشیئەی خودا وئایەتی ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ.. ﴾، لەبەر ئەوەی :

1-هەردوو رەهەند بۆ مەشیئەی خودا دەگەڕێتەوە

2- عەقڵی مرۆڤوئیرادەکانی بەشیکە لە ئەمری خودا

3-تیکرای شانۆیەکەش دروست کراوی ئەوە.

لەوەوە خەیام نهێنیەکی گرنگی درکاندوە بەڵام نەیزانیوە سەردێرو بۆنەکەی بۆ دیاری بکا، دەڵێ:

خوا داوی ئەناوە داوی ئەو بانادەم دەعبایەکی گرت ناوی نا ئادەم

ڕاوی ئەوە، داوی ئەوە، دانەش هی ئەو دەمخاتەتەلەوگەرەکیەتی خۆشم لادەم

لەو تێڕوانینە هەڵەیەی سەرووی فقهو ئاین پەروەرانی کۆن ونوێ، کۆمەڵێك تیۆری کۆمەڵایەتی مەترسیدار شان بەشانی هاتە کایەوە، زۆریش قۆزترایەوە لەلایەن زاڵمانەوە، گوایە ئەوە بەشی خواییە بۆی نوسیوە ئەگەر لاری هەبێ گوناحباریش دەبێ، ئەوە بۆ مەرامی سیاسی هەندێ خەلیفەی ئەمەوی بەکارهات، دوایی لە ئەوروپاش بە فراوانی بەکارهات، لەوەوە (ئاین تلیاکی گەلانە) هاتە کایەوە، ئینجا تیۆری چینەکان و(ئەفزەلیەت) هاتە کایەوە، تیۆری دابەشی کار بە پێی ئینتمای چینایەتی ونەژادی ونەتەوەیی..هاتەکایەوە، بزوتنەوەکانی شۆڤینی و ڤالانژیسی و تۆرانی ونازی وفاشی وبەعسی..هاتە کایەوە، هەریەکە پاڵپشتی کردبوە سەر ئەسڵێکی فقهی کۆن، ئەو جۆرە تێڕوانینە زۆر بەڕوونی لە

سۆسیۆلۆجیای یۆنانی ڕەنگی داوەتەوە، ئەرستۆ لەکتێبی(رسالە السیاسە- پۆلیتیك) بەندایەتی گێڕاوەتەوە بۆ بڕیارێکی خوایی نەك کۆمەڵایەتی، دەڵێ ئەوانەی عەقلیان کەمە کار بە جەستەیان زیاتر دەکەن، ئەوانەن خوا لە بنەڕەتدا ئیجباری کردوون بۆ بەندایەتی و کڕین و فرۆشتن! لەسەر ئەو بنچینەیە دابەشیەکی ئەزەلی چینایەتی لە کۆمەڵگە دروست دەکا، دەیان ووت هەموو مرۆڤ لە قوڕە، بەڵام چینی ئۆرستوکرات ودەسەڵات قوڕەکەیان لەلای خودا زیادەی تێکراوە و زیوی بوە، هەرچی جوتیارو چینەکانی تری خواروو قوڕەکەیان بە مس وئاسن تێکەڵاوکرابوو، لە بنەچەدا خوا بەشەرەکانی وەك دەمی شانە دروست نەکردوە[1]، فارابی (مدینة الفاضلة)ی لەسەر ئەو بنچینە ڕێکخستوە، بۆ بونەوەر وسروشتیش و (ترتیب الموجودات)ی بە (فضل) ڕیز کردوە[2]، تۆینبی لە (مختصر دراسە التأریخ) دەڵێ کۆمەل وەك لەشی ئادەمیزاد فەرمانبەرو فەرمانپێکراو، ماندوو وحەساوە، گرنگ وناگرنگ، لەپرۆتۆکۆلەکانی زایۆنیش واهاتوە(أنە لا مساواة في الطبيعة، وأن الطبيعة قد خلقت أنماطاً غير متساوية في العقل والشخصية والأخلاق والطاقة)[3]، بەشێك لە فەیلەسوفەکان وەك (دی گۆپینو)[4]، (شامپرلین)، (بەواس)، (فیشەر)(ئەرنست رینان).. وای بۆچووبوون کە توانای ئەقڵی نەتەوەیەك لەگەڵ نەتەوەیەکی تر جیایە، تاڕادەیەك مارکسیەتیش ئەو ڕایەی بە جۆرێکی تر هەیە وەك ستالین بە ڕاشکاوانە تر دەری بڕیوە و دەڵێ ئینتمای چینایەتی پلەی ووشیاری

---

[1] بڕوانە :جمهورية افلاتون ص76 هەروەها بڕوانە:مدخل الى الفلسفة ص64
[2] فارابی – اراء اهل المدينة الفاضلة ص66
[3] بروتوكولات حكماءالصهيون- ترجمة :عباس محمود العقاد ط5 1980 بروتوكول رقم:1.
[4] ئەرسەر دی گۆپینۆ1816- 1882 لەکتێبێکی بە ناوی (مقال عن عدم المساواة بين الاجناس البشريه) دەڵێت توانای بیرکردنەوەی هەموو میلەتیك وەك یەك نیە بۆیە تەنها میلەتی ئاری شایستەی ئەو سەرکردایەتیە، ئیتر ئەو تیۆ ڕوانینە کۆمەڵێك تیۆری سیاسی ڕەگەزایەتی ترسناکی لێ پەیدابوو. یەهوودی وعەرەبی شۆڤینیش تا ڕاددەیەك ئەو پاگندەیە دەکەن.

وزیرەکی دیاری دەکـا، بەشـێك لەیـەهودو عــەرەب دەڵـێن ئێمــە (شـعب اللــە)ی هەڵبژیردراوین زیرەك ترین لــە خــەڵکی تــر، ئەوتیۆرانە(لــە عەولەمــە)ی ئیسـتا ڕەنگی داوەتەوە بەتایبەتی لە ئاماری 1998ی نێونەتــەوەیی دەرکــەوت دوای لــە (کۆنگرەی زەمین)یش لە جوهانســبرك دووپــات کرایــەوە، (خــەڵکی ســەروو)* لــە 20٪ی دانیشتوانی جیهــان پێــك دێــنن کەچــی لــە 86٪ی داهاتــەکان دەخــۆن، (خەڵکی خواروش) لە80٪ دانیشــتوانن کەچــی لــە 14٪ دەخــۆن، لەســەر ئــەو بنچینە محمد باقر الصدر دەڵێ: لە سەرمایەداری بەسەربەستی دەست پێ دەکات بە بەندایەتی هەموو لایەك کۆتایی دێت، کەچی بەندایەتی خودا بە بەندایەتی دەست پێ دەکات بەسەربەستی کۆتایی دێت[1].. ئەوانە واپیشان دەدا کە مرۆڤ چارەنوسی خۆی لەدەست نیە، بەڵکو مۆری ئەزەلی وئەبەدی بــۆ لێــدراوە بــێ ئــەوەی بتــوانی گۆڕانکاری بەسەر بێنێ، زۆر ڕوونە هەمو ئــەو تیۆرانــە پاڵپشــتیان کردۆتــە ســەر (هەڵە تێگەیشتن) لە ئاین، ئــەو بۆچــونە لــە بــوارێکی تەســك نەمایتــەوە بوویتــە واقعێکی مێژوویی، زۆر ئەستەمە بە ئاسانی گــۆڕانی بەســەر بێنــی، بۆیــە دەبــێ هەنگاو بەهــەنگاو بــۆی بچــین...پێش ئــەوەی وەڵامــی ئــەو پرســیارانە بدەینــەوە ڕێکخستنی پرسیارەکان و جۆری داڕشتنەوەی پرسیارەکانی پێویستە.

## وەڵامی پرسیارە هەرەگرنگەکان:

دروست بونی پرسیارو گومان لە بارەی دەسەڵاتی خوا لەو بوونــەوەرە لــە دوولا دێت، لای یەکەمی سادەو بەرچاوە، لەهەر ئەنجام و ڕوداوێکــدا هۆکارەکــەی لــەناو سروشــت خــۆی دەبینرێتــەوە، جاروایــە هۆکــار و ئــیرادەی سروشــت لــە ڕووداو و

* مەبەست لە خەڵکی سەروو ئەمریکاو وولاتانی ئوروبای رۆژئاوا دەگرێتەوە

[1] محمد باقر الصدر -الإنسان والمشكلة الإجتماعية ص86

پێشهاتەکان لە ئیرادەی خوا بەهێزتر دەردەکەوێت، لە کۆنەوەو ئیستاش لای ئـاینی و ڕەشۆکی واباو بوو تائەو سنورەی توانای مرۆڤی بەسەر نەبوایە دەیاندا پاڵ خودا، هۆکاری ڕووداوە دیارەکان دەدرا پاڵ مرۆڤ و نادیارەکـانیش دەدرا پـاڵ خـودا، جـا بەرەبەرە کە توانای مرۆڤ بە هۆی زانست و تکنۆلۆجیـا زیـاد دەبـوو، هۆکارەکـان ئاشکرا دەکران.. وا دەردەکەوت کە توانای خوایی وا لاواز دەبێ توانای مرۆڤی زاڵ دەبوو بەسەر توانای خوایی.

لای دووەمی ئەو پرسیارە ئاڵۆزترە، ئەوەی لە پرس و پێناسی خودا دا ئـەوەمان باسکرد کە ئـەو دژی نیـە، زەوجـی نیـە،.....تاد، کەچـی یاسـاکانی سروشـتیش زەوجی نین ودژی نیە، مادام یاساکانی سروشتی بەشێك بن لە (ڕاسـتی)، سـیفەتی ڕاستیش (کە باسمان کرد) لەهەردوو لای پرسـیارەکە سـیفەتی خـوایی و شـەریکی خودا وەردەگرێ بەلای فەلسەفەدا، بەلای خەڵکی تری زانسـتخواز وبیریار(جاروایـە کەسی ئاسایش) بەدیلی خوایە مـادام ئـەو ئـەکتیڤ تـر دەردەکـەوێ، ئـەو پرسـە بوارێکی مەترسیش وەردەگرێ کـاتێ بنچـینەیەکی ئـایینی پێـدەدرێ، مـادام لـە قورئان دەڵێت ﴿لا تُشْرِكْ بِاللَّـهِ شيئاً﴾ کەواتـە لای ئاینـدارێکی ڕەمـەکی بـەلای کەمی (یاسای سروشتی) شریکە بۆ خوا وەك لە(دیزمی ئەگریکیەکان)واهاتبوو کـە یاسای سروشت شریکن لەگەڵ خودا[1]، لە ئایەتەکە دەڵـێ ﴿لا تُشْرِكْ بِاللَّـهِ شـيئاً﴾ تیبینی (شيئا) بکە، ئێ یاساکانی سروشت وەك لە پیشوو ڕوونمان کـردەوە (شـيئ) نیە، کەواتە ئەبو موسەیلیمانە ئەوا شـریکی خودایـە وچـۆن خـودا دروسـت کـەرە ئاواش یاساکان دروست کەرن، ئەوە بنچـینەی فەلسـەفی (نەکـەرالیزمی ودەهـری وزۆربەی مادیەکان)، کێشەیەکی گەورەبوەو ئیستاش گەورەیە، بەڵام لە فەلسـەفەی دووڕەهەندی (خلـق وئـەمر)کۆتایی بـەو کێشـە گەورەیـە هینـاو وەڵامەکـەی زۆر

---

[1] بڕوانە: God and Timelesseness.. p3 Routledg&Kegan-

ســادەیە، یاســاكان شــریك نــین لەگــەڵ خــودا بــەڵكو ئــەمری خــودان، یــان وەك (هینزپاچلیز) لەكتێبی (دستور الكون) دەڵــێ ئــەو یاســایانەی سروشــت دەســتوری گەردونن [1]، دەتوانین بڵێین دەستوری خواین بۆ بونەوەر جیا لەدەستورەكانی تر ئــەو دەستورە سەرتاسەری ونەگۆڕن بۆ هەتا هەتایە.

لەوەوە كێشەیەكی زۆر گەورەی فیزیای كوانتەمیشمان بۆ چارە دەكا كە ســتیڤن هۆكینگیش بەكاری هیناوە، پرسیارەكە فۆرمات دەكرێتەوەوئالۆزیــەكان زۆر ســادە دەبنەوەو بەو پرسیارە دەكەوینەوە سەر مەنهەج: ئــاخۆ یاســاكانی سروشــت مــادام شت نەبن وشــریكیش نــەبن ئــەدی چــنە؟ وەڵامــان دایــەوە وبــە دەســتوری خــودا كۆتاییمان هینا بۆ زیــاتر وبــۆ وەڵامــی ئــەو كێشــە فەلسـەفیانە پێویســتیمان بــە ڕێكخستنی ئەو پەیوەندیەیە لەنێوان خودا و سروشــتە، لــە ڕاســتیدا لــە قورئــانی پیرۆزدا بە وردی وەڵامی داوەتەوە بەڵام موفەسیرەكان ئەوەندە گرنگیان بەڕەهەنــدی فەلسەفی نێو قورئان نەداوە، كە زۆربەی ئەو كێشە فەلســەفیانەی لــێ دروســتبووە، پاشــان بوویتــە كێشــەی زانســت و ئــەكادیمیا و فكــر و... لەكۆتاییشــدا جیهــانی ئیسلامی تووشی پاشكەوتن هات.

لە قورئاندا باس لەوەدەكا كە حەفت ئاسمانەكەی دروستكرد دەڵێــت ﴿..وَأَوْحَــى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَهَا﴾[2] (امر) بەمانای یاســا و ڕژێــم (وەك لــە پیشــوو باســێكمان كرد)، واتە لەدوای (خلق)ی ئاسمانەكان بەكارێكی تــریش هەڵســا كۆمەڵــە یاســا و ڕژێم و سیستەمی تێ خست، ئەو كارەش هەر ئاسمانــەكان و گــەردوونی نەگرتــەوە بــەڵكو شــۆڕبویەوە بــۆ وردەكــاری هــەموو شــتێك بــەژیان و كۆمەڵگــە و ئادەمیزادیشەوە وەك لە قورئــان دەڵێــت ﴿رَبُّنَــا الَّــذِي أَعْطَــى كُــلَّ شَــيْءٍ خَلْقَــهُ ثُــمَّ

[1] بڕوانە: بۆل دیفیز- الإقتراب من الله- ص98
[2] سورة فصلت ایة12

هَدَى﴾[1].. (هدى) بەمانای ئەوەیە لە ڕێ ی (خلق ) و (امر) ئیمکانی گەشە و گۆڕان و جێ بەجێ کردنی بەرنامە پێدراوی داوەتێ، بەرنامەیەکی ئامانجدار (ئەوە مانای هودایە)، واتە خوا تەنها بە کاری(خلق) هەلنەساوە، بەڵکو بە (امر)یش هەلساوە، واتە یەك پرۆسە نیە دوە، یەکەمیان(خلق) دوەمیان(امر) بە هەردووکیشیان بەرنامەکە تەواو دەکەن و(هدى) دروست دەبێ بۆ هەمو شتێك، لەوەوەش بوونەوەرمان بە دووڕەهەندی پۆلین کرد.

ئێستا هەموو ئەو کێشە و ئالۆزیە فەلسەفیانەی زۆر سادە و سانا کردەوە، دەرکەوت ئەو یاسایانەی حوکم لەسەر بونەوەر و گەردوون و سروشت و ژیان دەکا یاسای خوایین وەك کیپلەروگالیلۆودیکارت ونیوتن.. وای بۆچووبوون، گوزارشە لە ئیرادەی خودا یان وەك توماس ئەکوینی یاسای سروشتی وئیرادەی خودای پیك بەستۆتەوە[2]، بەهەمان شێوە فەیلەسوفی کورد مەلای گەورەش, ئەو تێزە فەلسەفیە دیزمی نیە پێویستی بە پەیام وئاین نەبێت، خودا لێرە بێ دەسەلات نیە وەك یەکەم جار یەهودیەکان ووتیان ئینجا فەلسەفەشی بەدواهات هەروەك لەقورئان ڕوونی کردۆتەوە ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ..﴾[3]، لەو بونەوەرەمرۆڤ تیایدا(بدیل)ی خودا نیە بەڵکو (جینشینی) خودایە، یاساکانی سروشتیش خوایین با ناوی یاسای بۆیل و یاسای کیپلەر و ناوی جیاجیای تری وەرگرتبێ، ئەو ناوانە گەلێ جار ستاندەری عەقلی زانا و فەقیهی ئیسلامی ومەسیحی لە زۆربەی سەردەمەکان تێکداوە' وای کردوە حەساسیەتی هەبێ بەرامبەر یاسای سروشتی وگەلێ جاریش دژایەتی کردوە، لەوەوە یاسای سروشتی لەلایەن کنیسەوە بە کوفر لیست کرابوو، وای زانیوە ئەوەی مرۆڤ دەیدۆزیتەوە بوە

[1] سورة طه اية 50
[2] الفلسفة والفيزياء ج1ص86
[3] سورة المائدة اية64

مــولکی مــرۆڤ وئــەوەی بــزرەو ناشــدۆزرێتەوە مــولّکی خوایــە، بــەو شــێوەیە هەردۆزینەوەیــەکی مــرۆڤ دەبێتــە شکســتی خــودا!، هەردۆزینەوەیــەکی زانســتی وعەقڵی دەبێتە گورز لە ئاین وەك ئەبوعەلامعری وهوایتهیدو ئـەنجلس و وادەبـێ وزانست بدوێ وئاینیش بێ دەنگ بێ.

لەسەر ئەو بنچینەیە (ارنست همنغوای) ووتویەتی: هەرچی بیریار بێت هەردەبێ بێ باوەڕ بێت[1]، ستاندال دەڵێ: هـەمو ئاینـەکان پیـك هـاتوە لـە ترسـێکی زۆرو عەقلێکی کەم، لەوەش زیاتر لیڤی پرۆل دەڵێ: ئـاین لەبێعـەقڵی ونەخوێنـدەواری هاتووە، مارکس دەڵێ بڕوا بە ئاینی تەنها بۆ عەقلیکی لەنگـە[278]، هـەر لـە سـالی 1854 لە ووتاریکی دا دەڵێ: هەر پرۆژەیەك بۆ شکۆمەندی مرۆڤ پێویسـت بـەوە دەکا مولحید بی، هەرچی فیۆرباخە دەڵێ: ئاینداری نامۆییە لەو سروشتە، زانیـاری راست ودروست مولحیدی دەدا، زانیاری لەنگ وئەفسانە ئاینداری دەدا، ئیمانـداری راستەقینە مولحیدیە لەسروشت، مرۆڤیش لەیـەك جیهانـە جیهـانی سروشـت نـەك جیهانی روح... ئەوە زادەی مەنهەجی کلاسـیکی فەلسـەفی ئاینـە، هەرچـی ئـەو مەنهەجە توێژینەوە فەلسەفیەی ئیستای ئێرە ئەوا هەر دۆزینەوەیـەك لـە سروشـت (لەبوارەکانی کیمیا و فیزیا و بایلۆژی..) وەك زانای ئـەمریکی (ماریـا میتچـال) گوتەنی دەبێتە پەخشانێك بەسەر خوای گەورە، یان وەك دیکارت گوتەنی سروشـت دەبێتە مەکتەبەیك، مەنهەجی دروست ئەوەیەجهان وسروشت وتیکرای بونەوەر بـێ سەرو بەرو عەبەسی نیە ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾

---

[1] کۆمەڵێك لەو جۆرە هەڵوێستانەی زاناو فەیلەسوفان لە کتیبی(atheist universe) لەلایەن (دیڤیدمیلیز) نوسراوە پیك هاتوە لە 12 بەش، لەبەشی یەکەما بەلام لاپەرەکە دیاری نەدەکرا چونکە تەرجەمەنەکراوەو بە ئەلەکترۆنی گەلالە کراوە.

[278] کارل مارکس-بؤس الفلسفة ص256.

﴿..وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً﴾[1]، بە یاساو ڕێسا ئامانج و مەبەستی بۆ داڕژراوە.

فیزیاییەکانی سەردەم گەیشتونە ئەو ئەنجامەی ئەگەر قەبارەی ئەلکترۆن ڕێك بەو ئەندازەیە بچوك تر نەبوایە لە پرۆتۆن ئەوا ژیان مەحال دەبوو، لەوەوە، جۆرج کۆڤیر (1769-1832) گوتی هەر لەبچووك ترین تا گەورەترین هەموی مەبەستدارە، پیشو تریش تۆما ئەکوینی ووتبووی هەرچی شت ومەك هەیە لەو گەردونە وادەجولێ وەك ئەوەی ئەرکیکی خۆی جیبەجێ بکا وئامانجیکی چاکتر بپێکی [2]، هیچ ڕووەك وگیانلەبەرێك بە ڕێکەوت و لەخۆڕا نەخولقاوە تا بگۆڕێ بۆ جۆرێکی تر، چونکە بە(گۆڕانی)ئامانجەکە لەدەست دەدا، هەتا پێکهاتەی ئەندامەکانیش، دوایی جوهان مەندەل (1822- 1884) دۆزیەوە کە (گەشەکردن)یش لەخۆرایی و بێ مەبەست نیە وەك (تەتەوریەکان) وای تێگەیشتون، لەسەر ئەو بنچینەیە (بۆخنەر)و(داروین)و(ئەنجلس)زۆر بە توندی بەگژ ئەوە دەچن کە جم وجۆل وسیستەمی سروشت مەبەستدار بیت وئەنجلس دەڵێ (لقد ولت الغائية القديمة دون رجعة)[3]، (ستیڤن واینبرگ)یش دەڵێ چەندە توانای گەردون فراوانتر دەرکەوێ بیرۆکەی ئامانجداری(غائیە) لاواز دەبێ، جاك مۆنۆی بایۆلۆجی زان هەر وای بۆچوە[4].

---

[1] سورة مؤمنون اية115، سورة ال عمران اية 191

[2] بول ديفيز- الإقتراب من الله ص225

[3] ف انجلس-ديالكتيك الطبيعة ص224 دوای هەر لە ص240 زیاتر مەبەستی لە(غائیە) ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ مەبەست خوایە، دوای لەهەر خودی ئەنجلس وهاوڕێکانی مارکس ولینین وبلیخانوف لە باسی گەشەی کۆمەڵگەو شیوازی بەرهەم هینان تیۆری (حتمی تاریخی)جاڕ دەدەن کەمانای (غائیە).

[4] بول ديفيز- الإقتراب من الله ص219

ئێستا لەوەوە پەیوەندی خوا بە بونەوەر و گەردوون و سروشت و ژیان و ئادەمیزادەوە دەرکەوت، پەیوەندی ڕاستەوخۆی نیە، پەیوەندیەکی زۆر تایبەت و بالأیە لە ڕێکخستن و سیستەم، بەدەربڕینی فەلسەفی کلاسیکی گوزارشتە لە پەیوەندی مادی و نامادی، هەروەك پەیوەندی عەقلْ (کە نامادیە) لەگەلْ سروشت (کە مادیە) لەڕێ ی هەستەکانە.

بەهەمان شێوە پەیوەندی خودا بە مادەوە لە ڕێ ی یاساکانی سروشتە، واتە مادە (بەهەموو ناوەڕۆکیەوە) پەیوەندی راستەوخۆی لەگەلْ خودا نیە، لەڕێ ی یاساکانە کە (امرن)ئازاد نین، واتە ڕەهەندی یەکەم لە ڕێی ڕەهەندی دوەم پەیوەندی بە خودا هەیە، ڕەهەندی دوەمیش نە ئازادی بە خۆی داوە نە ئازادیشی بە ڕەهەندی دوەم داوە، هەمو شتێك ئەندازەکیش کراوە ﴿..وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً﴾[1]، لەوەوە مانای ئەوە دەبەخشێت کە سروشت و گەردوون (مخەیەر) نین، مسەیەرن، هەروەك لە قورئانیش هاتووە ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾[2]... ئەوە پەیوەندی بونەوەر (بە سروشت وژیانەوە) بەخودا بوو، پەیوەندی -ئەو دیوەی مرۆڤ کەبەشیکە لەسروشت- بە خوا بوو... هەروا بەردەوامین لە وەلأمی پرسیارەکان بابزانین ئەدی پەیوەندی خودا وئادەمیزاد چۆنە؟ ئیستا بزانین چ تایبەتمەندیەك بە پەیوەندی خوداو ئادەمیزاد هەیە؟ چەندە ئەو تایبەتمەندیە دەبێتە هۆی ئەوەی زەوی ببێتە ناوەندێکی میتافیزیکی بوونەوەر؟.

[1] سورة الفرقان اية 2
[2] سورة فصلت اية 11

# پەیوەندی تایبەتی خوا و مرۆڤ

جموجۆڵ و ویستی ئادەمیزاد بەبەشـێك لـە سروشـت و پـۆلێن کـراوە، لەلایـەن زۆربەی فەیلەسوفانی وەك هۆلّبـاخ و مـارکس و هکسـلی وسـلامە موسـا..دەڵێن بریتیە لەسێ ڕەهەند (گۆشت و خـوێن و ئێسـك )[1]، بەگشـتی بۆشنسـکی دەڵێـت مادیەکان پێیان وایەمرۆڤ بە پیکهاتەوئارەزووچارەنوسی بەشێکە لە سروشـت...[2]، کەچی ئەو تێڕوانینە تەواو ڕاست نیە، کاتی خۆی ئەفلاتون ووتبووی ئادەمیزاد لـە سێ ڕەهەند پێك هاتوە(ئەقل وخۆویستی ڕەواو ئارەزووبازی) نزیك تر بوە لەواقیعی نهێنیەکانی ئادەمیزاد، کەچی هەر نوقستانیشە، زۆربەی ئەوانـە لەزەمینەی(یـەك ڕەهەندی) بۆی چوون، کەچی ئەو بوونەوەرە دووڕەهەندیە، تالە خواروو(جماد) بەرەو سەروو(مرۆڤ) بڕۆیت زیـاتر ڕەهەنـدی دوەم(نامـادی) لێ بـەدی دەکـرێ، هـەروەك دواییش (لینین) دانی بەوەنا کە عەقڵ تەنها ڕوویێکی مادی نیە، زۆر بـەبی دوودلی دانی بەوە نا کە (عقـل) مـادی رووت نیـە، بـەڵکو خاسـیەتی (لامـادی) هەیـە، زانایانی سۆفیەتی پێشوش دووبارەی ئەو ڕایەی کردۆتەوە[3]، هەر (گۆشت و خوێن و ئێسك ) نیە، ڕاستە ئەوانەیە کە یاساکانی سروشتی بەسەردا پەیڕەو دەکرێت، بەڵام بەشی تری تێدایە یاسای تایبەتی خۆی هەیـە، وا دەکـا هەمویاسـاکانی سروشـتی بەسەردا پەیڕەو نەبێ.

لایەنی مادی ئادەمیزاد بەشێکە لە سروشت بـەڵام لایـەنی (نـا مادیەکـە) کـە مەودای جم و جۆڵ و چالاکی عەقلە بەشێك نیە لە سروشت، هـەر بەنمونـە یاسـای

[1] الموسوعة الفلسفية ص291

[2] بوشنسكي - الفلسفة المعاصرة في أوروبا ص69

[3] بۆ زیاتر بڕوانە: مادية الدياليكتيكية-جماعة من اساتذة السوفيتية، تعريب: فؤاد مرعى وبدرالدين السباعى..ص131-141 ئەوانیش لە (دفاتر الفلسفيه)ی (لينين) یان نەقل کردوە.

(کار وکاردانەوە) کە یاسایەکی زۆر گشتگیری سروشتیە، کەچی لەناو جموجۆڵی ئادەمیزاد بەتاك و بە کۆمەڵگە پەیرەو نابێ، بە دیقەت وایە "بۆهەر کارێك لەناو کۆمەڵگە کاردانەوەی هەیە بەڵام مەرج نیە (بڕی کاردانەوە) یەکسان بێ بە بڕی (کار)، مەرجیش نیە لەهەمان کاتدا ئەو کاردانەوەی هەبێ،بەهەمان شێوە ریسایەکی موکومی وەك(**مابني على الباطل فهو باطل**) دیسان ئەوە بۆ زانستەکانی بیرکاری وسروشتی ڕاستە بەلام بۆ کۆمەلگە هەمو دەم ڕاست نیە ،لەسەر ئەو بنچینەیە (6) سیستەم لە جوڵە لە سروشت پۆلین کراوە کە بریتین لە جوڵەکانی (میکانیکی، جیۆلۆجی، فیزیایی، کیمیایی، زیندەکی، بایلۆژی، کۆمەڵایەتی، فیکری)[1]، هەردوو سیستەمی دوایی تایبەتە بە مرۆڤ جیایە لەگەڵ سیستەمەکانی تر، بەڕوونی دەردەکەوێ بەهۆی (جولانی فیکری یان فاکتەری عەقڵی) جولە و کاردانەوە و سیفەتی ناوەکی کۆمەڵگە و ئادەمیزاد جیا دەبێت لەگەڵ سروشت، هەر ئەوەشە جیایی پەیامی ئادەمیزاد لەگەڵ سروشت، بۆیە یاساکانی سروشت بەس نیە بۆ ڕێکخستنی ئەو پەیام و مەبەستەی هاتنی ئادەمیزاد بۆ (بوون).

ئەوەی سەروو جیاکاریەکی فەلسەفی نێوان ئادەمیزاد و سروشتە، لە ڕووی ئایینی جیاکاریەکە ئەوەیە کە سروشت بەهەموو ناوەڕۆکیەوە (ئاو و هەوا و شاخ و دارستان تادەگاتە ئەلیکترۆن) بەمسەیەری هاتوون، بەپێی ئەو یاسا سروشتیانە دەجولێن نەك ئیرادەی خۆیان، جموجۆڵیان بریتیە لە بەرجەستەو خوردکردنەوەی ئەو ئیمکانیەت و بەرنامەیەی بۆیان دانراوە، واتە بۆ (بەرد) نیە ببێتە (چۆلەکە) بۆ ئاسن نیە ببێتە زێر، واتە لە جولەو گۆڕاندایە بەڵام گەشەی (بازدانی ) نیە وەك

---

[1] لەلایەن فەلسەفەی مارکسیەوە دان بەبوونی جولانی فکری داناهینن دەلین تەنها بریتیە لە ڕەنگدانەوەی واقیع.( الفكر ليست سوى انعكاس حركة الواقع وقد انتقلت إلى ذهن الإنسان)– ماركس: رأس المال، الكتاب الأول. ج 1 و ص 29.

لە(تیۆری پەرەسەندن)هاتوە، هەر سیستەمێکی سادەی وەك ئەتۆم تووشی بازدان بێت ئەوا ژیان وبێ ژیان ویران دەکا، هەریەکە ئەو ئەرکە گەردوونی و سروشتیەی خۆی جێ بەجێ دەکا بە هۆی یاسای (هۆ)و (ئەنجام) زیاتر سیستەمی ئۆتۆماتیك پێك دەهێنێت، بەبێ ئیرادەو بەرژەوەندی خۆی، هەرچی ئادەمیزادە ئەوا عەقلی پێ بەخشراوە، ویست و ئیرادەی خۆی هەیە، دەتوانێ لەنێوان کۆمەڵێکی زۆری ئەگەر (ئیختیار) بۆخۆی چی چاکە هەڵیبژێرێ و بیکات..

ئەوەیە فەلسەفەی (انی جاعل فی الأرض خلیفة)، لەوەوە ئادەمیزاد لە باقی گیان لەبەرانی تر جیا دەکاتەوە کە ئەوان گیان لەبەرو هۆشمەندن بەڵام عەقلداری (مکتسب) نین، ناتوانین والە دووپشك بکەین پێوە نەدا ناتوانین والە پلنگ بکەین ببتە قازی نێوان مامز وکەرویشك...ئەوە پەیامیەتی وپەیامی تری ناوێو پێغەمبەرانی ناوێ هەروەك هەندێك لێی بەهەلەداچووینە (وزعم ابن حائط أن في كل خلق من الخلائق أنبياء حتى في الحمر والطير والبراغيث..)[1]، تەنها بۆ ئادەمیزاد پێویستە، لە ئادەمیزاد (جگە لە جوڵە بایلۆژیەکانی نێو لەش) ئۆتۆماتیکی نیە، میکانیکیانە پەیڕەوی (هۆ) و (ئەنجام)ی ناچاری ناکا وەك زۆر لە مەزهەبی ئاینی وفەلسەفی وای بۆچوون، تەنانەت مارکسیەتیش بە شێوەیەك دێتە سەر تیۆری جەبری دەڵێ مرۆڤ دیلی بازاڕو بژێویەکەیەتی بۆیەش حەتمی مێژوویی پەیڕەو دەکا[2]، کەچی وانیە (مخەیەرە) وەك لەدوای زیاتر دەردەکەوێ، کەواتە ئەگەر سروشت بەرنامە و ئیمکانی بۆ داڕێژرابێت کە لەزاراوەی قورئان پێی دەوترێ (هدی) ئەوا بۆ ئادەمیزاد (هدی) کەی قورئانە(بەلای کەم) لە ناو موسوڵمانان، ئینجیلە لەناو (مەسیحی)، تەوراتە لەناو (یەهودی)، دیالیکتیە بەپێی مارکسی،.... هتد.

---

[1] بن طاهر المقدسی –البدء والتاریخ ص150

[2] لە هەموان ڕوون تر لە (ص257 بؤس الفلسفة-کارل مارکس) باس لەو جۆرە جەبریە دەکا.

بۆئەوەی کۆمەڵگە و ئادەمیزاد ئامانجەکانی (هاتن) یان بۆ(بـوون) جـێ بـەجێ بکەن پێویستیان بە بەرنامە هەیە، ئەو بەرنامە بریتیە لە (دادگەری) کەبەهۆیـەوە چاکترین شارستانی بەرپا ببێ، کە (مقاصد)ی هاتنی ئادەمیزاد بەرجەستە دەکا لە (تەعمیری زەوی)، زەمینەی بۆ سازاوە ویاساکانی سروشتیشـی بـۆ کەوتۆتـە کـار، ئینجائازادی لەو مەودا تەسکە پێـدراوە، کەچـی زۆربـەی مـرۆڤ بەوەنـدە ئـازادی و(مخەیەریە)لە خۆ بایی دەبێ وزاناوفەیلەسوفی گەورە مرۆڤ دەگەیەننە ئاستی خالق وخاوەنی بوونەوەر، بۆیە لە قورئان بەبیری دەهینیتەوە ودەڵێ ﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾[1]، بـەبیری دەهینیتـەوە ئـەوەی مـرۆڤ دەیکـا بـە (خلق)ی بەرهەمی دەزانی وەك مارکس ناوی ناوە (خلقی قیمە) ئەوە وانیە جوتیـار تەنها هەندێ ئیشی سوکی کردوە ئەوی تر هەزاران هەزار یاسا بـۆ ئـەو گەشـەیەی (زراعی) پیگەیشتنی بەکارە کەبەدەرە لە دەسەلاتی مرۆڤ، ئاواش کـاری تکنیکـی وئەلکترۆنی وپزیشکی وکۆمەلأیەت وتادەگاتە زاوزێو جنسیەوە.

ئەوە فەلسەفەی پەیام و قورئانە، لەو مەودا ئازادیەو ئەگـەرەی لـە پیشـیەتی تەنها بە عەقڵ نایەتەدی لە هەلبژاردنی چاکترین ڕێگەی سـتاندەری ژیـان، مـادام عەقڵ زۆر لە ژێر کاریگەری خۆویستی مرۆڤە ئەوا ڕاسـتی و دادگـەری لای مـرۆڤ شیوەی جیاجیاو ناکۆك وەردەگـرێ، بۆیـە پـەیامی پێویسـتە، واتـە ئەگـەر خـودا (امر)ەکانی لە سروشت لە ڕێ ی یاسا سروشتیەکان نێردرابێ، ئەوا بۆ ئادەمیزاد لە ڕێ ی پەیامە، کەواتە چۆن پەیوەنـدی لـەنێوان سروشـت و بونـەوەر لەگـەڵ خـودا ڕاستەوخۆ نەبوو لەڕێ ی یاسـاکانی سروشـت بـوو، ئـەوا پەیوەنـدی ئـادەمیزاد و کۆمەڵگــەش (بەگشــتیەکەی) ڕاســتەوخۆ نیــە لەگــەڵ خودابەڵکولــە ڕێ ی پەیامەکانیەتی، کە ڕۆڵی یاسا سروشتیەکان دەبیـنن لـەنێو کۆمەڵگـە، لـەبیرمان

[1] سورة الواقعة/63-64

نەچێ ئەو بەشەی مرۆڤایەتی (لایـەنی جەستەییەکەی)بەشـێکە لـە سروشـت ئـەوا یاساکانی سروشتی بەسەر پەیڕەو دەبێ، بەشەکەی تـری عـەقلانی —نامـادی ئـەوا بەیاسای تایبەتی جیا لە سروشت کاردەکا کە بریتیە لـە پـەیام، مـادام پـەیامیش بەشێك بێت لە ئەمری خودا ئەوا لە هەردو باردا پێوەندی مرۆڤ وخـودا ڕاسـتەوخۆ نیە بەڵکو لە ڕێی (ئەمرە- ڕاستی).

بەڵام لەلایەکی تر مرۆڤ ڕووح لەبەریشە کە ئەویش بەشێکە لە (ئەمر-یاسـا) وا پێدەچی بە روح وعەقڵ مەنزومەیەکی نامادی ئالۆزتر پێـك بهێـنن لـە پەیوەنـدی تایبەتی خوداو مرۆڤ، کاتی لەگەڵ سروشت هەلس وکـەوت دەکـا ئـەوە پەیوەنـدی خوداو مرۆڤ لە ڕێی یاسای سروشتیە، کاتێ پەیوەندیەکان زات وخودایە ئـەوە ڕۆلی روح دێتە گۆڕێ، ئەگەر رۆحانیەت زال بوو بەسەر جەستەو بەسەر خلق ئـەوە زیـاتر پەیوەندی خوداو مرۆڤ ڕاستەوخۆ تر دەبێ، نێوبژی ناوێ، بێجگە لە پەیام هەڵگران کەسی تر (پێوەند)ی نێوان خواو ئادەمیزاد نیە(نە پاپا ونـە شـێخ ونـە ئـەولیا نـە رۆژومانگ وئەستێرە نە بت وگۆڕ ونـە ئیمپراتـۆر..)وەك هەنـدێ برایـانی شـیعەو سونەش لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی دەکەن، هەندێ ئاینی تریش وای پەیڕەو دەکەن و لە ئەنجاما سیستەمی سیۆکراتی دێنێتە بەرهەم، ئەوەی دەمـێنێ لـەنێوان خـوداو مـرۆڤ، تـەنها یاسـاکانی سروشـت و پـەیام و روحانیەتـە. دەبـا بـزانین رۆڵـی پێغەمبەرەکان و پەیامەکانیان دەکەوێتە کێ ی پەیوەندی خودا لەگـەڵ سروشـت و ئادەمیزاد؟ ئـەوە موعجیزەیە؟چـەندە ڕاسـتە تاکـە پەیوەنـدی خـوداو ئـادەمیزاد پێغەمبەرانن؟ ئەگەر وایە بۆ بـەردەوام پێغەمبـەران نایەن؟کەواتـە دەتـوانین بلـێین یاسای سروشتی وپێغەمبەران وعەقڵی مرۆڤ ئەو پەیوەندیەن؟ ئایـا دەتـوانین بڵـێین (موعجیزە) بریتیە لەدەرچوون لەیاساکانی سروشت و پەیوەندیەکە لە ناڕاسـتەوخۆ بەخوداوە دەبێتە ڕاستەوخۆ؟ بـۆوەلامی ئـەو پرسـیارە فەلسـەفیە چارەنوسسـازانە پێویستیمان بەوە هەیـە زۆر بـە کـورتی سیسـتەمی گەشـەکردن لـە کۆمەڵگـە و

سیستەمی گەشە (جولە) لەسروشت لێـك بکەینــەوە تیایداپەیوەنـدی بــە پــەیام و پێغەمبەرانیش بدۆزینەوە، لەبەر گرنگی بەشێکی سەربە خۆشی بۆ دیاری بکەین.

# بەشی حەفتەم

# سیستەمی گەشەی کۆمەڵگە

## جوڵانی مادە یان پەرەسەندن

پیشوتر جوڵانی مادەمان باس کردوە، ئیستا بابزانین ئەو جولەیە گۆڕانە؟ گەشەیە؟ یان هەر جولەیەکی سادەیە؟یان هەمو ئەوانەیەبەڵام بۆ هەرسیستەمێکی جوڵان شێوەیەك وەردەگری؟یاخود بە ووردتر بە پێی ئەو هەڕەمەی بوونەوەر وینەمان کرد جوله شێوازی ئەوانە وەردەگری؟وەڵامی هەموئەوانەلە پیشمانە.

بەرەی فەلسەفی مادی بەدرێژایی مێژوو هەوڵی داوە بیسەلمێنێ کە ئەو شتومەکە جیاجیایانەی بونەوەر بە ئادەمیزادیشەوە بەرهەمی چالاکی مادە خۆیەتی وەك لاپلاس وهولباخ وهکسلی شۆبنهاوەروئەنجلس.. دەڵێن (بێ پەنابردنە بەر "خوا")، ئەوانە خاوەنی تیۆرێکن بەناوی تیۆری "پەرەسەندن" کە باوەشی لە تیۆری "داروین" فراوانترە، ئەوانەی سەرووو وداروین ولامارك وسپینسەر و.. دەڵێن " مادە لەتەمەنی ئەزەلی و ومانی هەتا هەتایە لەگۆڕانکاری دایە لەدۆخێکەوە بۆ دۆخێك گەشەدەکات لەخوارەوە بەرەو سەروو، هەروەك فەلسەفەی هیگل و مارکسیزم جوڵانەوەی گەڕاندەوە بۆ ناکۆکی ناوخۆیی(بە پێی یاسای ململانێ)، دوای بەدوو یاسای تری فەلسەفی (خۆیان ناوە یاسا) (یاسای کەلەکردنی گۆڕانکاریەکانی چەندایەتی بۆ چونایەتی) و (یاسای نەفی ئەلنەفی) جووڵەکە دەبێتە گەشە، نمونەی گۆڕانی ئاو لەدۆخی شلی بۆ دۆخی هەڵمی هێناوەتەوە، یان وەك (ماوتسی تۆنگ) نمونەی گەشەی هیلکەی بۆ جوجکە

هێناوەتەوە، ویستویەتی بەونمونەو یاسا دیالکتیکیانە تەفسیری هەموو پۆلە جیاجیاکانی سروشتی و ژیان بکات بۆ یەك ئەسل، کە گوایە شتومەکەکان لە(خواروو، لەسەرەتایی، لەسادەوە) پەرەدەسێنێ بەرەو(سەروو، بالاّ، ئالۆز) کە ئەو ڕایە لە سەردەمی ئەرستۆوە هەبوە تا ئەو ساتەش، بەو شێوەیە هەوڵیان داوە بیسەلمێنن کە گوایە دەشێت ئەو گەردوونە کە لەسەرەتادا تەنها مادەی (هایدرۆجین) بوە بەرە بەرە پەرەی سەندووە و توخمەکانی تری لێ پێکهاتووە، هەر توخمێك ئەلیکترۆنێکی لەوی تر زیاترە وەك لە خشتەکەی (مەندەلیف-موزلی) ڕێز کراوە، ئینجا سروشت و ژیانیش هەر بەو گۆڕانکاری و پەرەسەندنە پەیدابوون.

هەرچەندە لە ڕووی زانستی کۆتایی بەو بانگێشە هێنا کە تەمەنی گەردون ئەزەلی و ئەبەدی بێت، لە ڕاستیدا هەموو بۆچونەکانی فەلسەفی لەسەر ئەو بنچینەیە تێك ڕووخاوە، لەبواری فەلسەفیش هەر شکستی هێناوە، هەر لە نمونەکەی خۆیان کوا گۆڕانی ئاو لەدۆخی شلی بۆ هەڵمی پەرەسەندنە؟ خۆ هەر ئاوە؟ بەچ پێوەرێك (دۆخی گازی) لە (دۆخی شلە) پێشکەوتو وگەشەسەندووترە؟ نمونەی گەشەی هیلکە بۆ جوجکەش ئەوە (بڕگەیەکە) وادەردەکەوێ گەشە بێت، ئەگینا تەواوی پرۆسەکە بریتیە لە (هیلکە-جوجکە-مریشك) واتە بازنەییە کوا گەشەکەی، ئینجا تاکە نمونەیەك نیە نەلە ژیانداران ونە لەسروشتدا تا بیسەلمێنن کە لەجۆرێکەوە بۆ جۆرێکی گەشەی کردبێت، ئینجا بەدەیان نمونە و بگرە هەزارانیش بە ڕوونی پیشانی دەدا کە یاساکانی دیالکتیك یاسا نین، ڕای زانا و فەیلەسوفانی ئاینی بەدرێژی وەلاّمی ئەو بۆچوونە فلسفیانەیان داوەتە، ئەوانە پێیان وایەئەو گۆڕانکاریانە پرۆسەی گەشە پێك ناهێنن بەڵکو بریتیە لە جولەیەکی بازنەیی، لە ڕاستیشدا جولاّنەوەی مادەبەگشتی دوو بەشە لە جولاّنەوەکانی (میکانیکی وجیۆلۆجی وفیزیایی وکیمیایی وبایۆلۆجی) جیایەلەگەڵ (کۆمەلاّیەتی و فکری)، یان بەشێوەیەکی تر بێجگە لە جولاّنەوەی پێشکەوتنی کۆمەڵ ئەوی تر

هەمووی جوڵانەوەی بازنەییە، هەتا ئەو نمونەیەی (مادیەی دیالیکتیك) کە هێناویەتیەوە بەنیوەچلی داویەتی، ئەگینا دەورەکە لە رەقی (سەهۆڵ)- شل- هەڵم- رەق...، واتا بازنەییە نەك گەشەو پەرەسەندن، لەکۆنەوە ئەگریکیەکان ومدرسە فلسفیەکانی تر هەستیان بەوە کردوە کە ئەو جۆرە جووڵەیە (گەشە)نیە، ئیبن خەلدوونیش بەبازنەیی وچوار قۆناغیشی بۆ دیاری کردوە، تەنانەت(دیڤید هیۆم وشبینگلەر) دان بەگەشەی کۆمەڵگەش ناهێنن دەڵێن جولەیەکی بازنەیی دووبارەیە، دوای لەسەردەمی ڕابوونی فەلسەفی ئەوروپا ووتیان گەشەو هەلکشانە نەك بازنەیی لەوانە عەقلانیەکانی فرنسا (کوندرسیە، دیدرو، کلود هیلفشیس، جان جاك روسو، وفولتیر..)کە بەرهەمەکانیان کاریگەر بوو لەسەرشۆڕشی فرنسا، فیکۆ یەکەم فەیلەسوف بوو ئەو جۆرە جولەو گەشەیەی بە (سپرینگی) لە خوارەوە بۆ سەروو وەسف کرد، شۆبنهاوەر دەڵێ سروشت مادەیە، مادەش تەنها ئەو کاتە مانای دەبێ کە گەشە بکاو بەرهەمی هەبێ بۆیە سروشت بە تیکڕایی لەگەشەی بێ ووچانە[1]، ئەنجلس بەڕەهایی تر دەڵێ:(ئەو گەشەیەی بەهۆی پرۆسەی(نفی النفی) دێتە دی ئەوەگەشەیەکی کراوەیی پێشکەوتوو دەبیت[2]، هەمو ئەوانە لە فەلسەفەی هیگل لە ریسایەکی فەلسەفی موکوم کۆکراوە بە ناوی جولەی دیالکتیکی (بوون —دژ-پیکهاتەکی بالاتر) [3] یان (الشیئ، ضده، مرکب الأعلی- **Theses -untiTheses- synTheses**)[4]، کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیەلەوجولە بازنەییە ئاو نابێتە نەوت یان ئاسن ببێتە زێر،.. ئەگەر بەسەرنج سەیری جوڵانەوەکانی تری سروشتی نەك هەر سوڕانی ئەلیکترۆن بە دەوری ناوك و زەوی

---

[1] المثالیة الألمانیة ص255

[2] فریدریك انجلس- انتی دوهرینك- ص162-163

[3] جون لویز- مدخل الی الفلسفة- دار الحقیقة بیروت، ترجمة: انور عبدالله، ط2 ص194

[4] مدخل الی الفلسفة ص193.

بەدەوری خۆر، هەر هەمووی بازنەیین وەك لە پیشــوو تــر کــەمێکمان بــاس کــرد: (مریشك- هێلکە-جوجکە- مریشك)، (رووەك- تــۆو- شــتڵ- ڕووەك)، (مــرۆڤ-تۆو-کۆرپەلە-مندال-مرۆڤ ).. هەر هەمووی بەو شێوەیە واتە تۆوی پاقلــە نابێتــە هەنار، هێلکەی مریشکیش نابێتە کاوڕ ومراوی، بەڵام ئەوە مانای ئــەوە نیــە ئــەو شتومەکەی لە سروشت هەیە کار لە ئەوی تر ناکات وەك جــیمس وبراترانــد راســل دەڵێن: (ئەو جیهانە پارچە پارچەو بێ سەروبەرەو بێ هەماهەنگە نەك وەك مەکینە بێت)[1]، بە پێچەوانەوەهەر هەمووی لەپەیوەندین لەگەڵ ئەوی تر و مانای گــەردوون تەواو دەکەن، لەوەوە (دیراك) دەڵێت پەیوەنــدی بوونــەوەر هــەموی بیرکاریانەیــە[2]، پیشــوتریش تۆمــاس ئــەکوینی و نیــوتن وتیــان هــەر بەشــەی ســەعاتە گەورەکــە پێکدەهێنن، یان وەك وەسفی سیر جیمس مەکینەیەکی گەورەیە، ئەوەی لــەگۆڕانی پێشکەوتن و پەرەسەندن دایە لایەنی کۆمەڵایەتیــە کــە بــەهۆی بــوونی (هۆشــی ) دەتوانێ سلبــی و ئیجابی (چاکە و خراپــە) ی خــۆی لەیــەکتر جیابکاتــەوە و پــەرە دەسێنێ کە لەدوایی باسی دەکەین.

لەبارەی جولە و گۆڕان لەنێو سروشت و کۆمەڵگــە مشــتومڕێکی فەلســەفی زۆر فراوانی لەسەرە، بەشێك پێیان وابوو کۆمەڵگە لە جولەیە و سروشــتیش وەســتاوە، ئەو بەشە پێیان دەڵێن (فەلسەفەی ستاتیکی) بەشێکیش پێیــان وابــووە هــەمووی دەجــوڵێ بــەڵام بــەبێ مەبەســت ئەوانــە زیــاتر فەلســەفەی وجــودین، فەلســەفەی مارکسیزم پێی وایە مادە و جولە یەك شتن،.. لەگــەڵ زۆرلای تــر، ئێســتا لەلایــەن هەموو مەدرەسەکانی فەلسەفە دان بەوە دەنێن کە هــەموو شــتێك لــە جوڵەدایــە، هەتا فەلسەفەی ئیسلامیش کەزۆرجار تۆمەتبار دەکرێ بەوەی گوایە (ستاتیکیانە)

---

[1] مدخل الى الفلسفة ص283

[2] There is agod how the worlds most notorious atheist changed his mining p - A.fluo

باوەڕی بەوە نیە سروشت لەجوڵە دایە، کەچی لە قورئان ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾[1] یان ﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ فەیلەسوفانی ئیسلامی ابن رشد وابن سیناو فارابی وسیف الدین ئامیدی وصدرالدین شیرازی..بەشی زۆری کتێبەکانیان بۆ جولەو گۆڕان تەرخان کردوە.

لەبارەی ئەو پرسیارەی ئاخۆ هەموو جولەیەك یەك رۆڵ دەبینێ دیسان وەڵامی جیاجیا هەیە، زۆربەی ڕای فەلسەفەی مادیەکان، لای مارکسیەکان بەو شێوەیە کۆبویتەوە "هەموو جیاوازیەك لەناخی شتەکان ناکۆکی دروست دەکات، ئەوەش دەبێتە هۆی جوڵە، جوڵەش گۆڕان دروست دەکات، گۆڕانیش لە چەندایەتی وەردەچەرخێ بۆ گۆڕانی چونایەتی و گەشەکردن [2]، کەواتە لە ڕوانگەی فەلسەفی مادی هەموو جۆلەیەك گەشەکردنە، بەوەش سیستەمی سروشت و یاساکان وجۆرەکان تا دەگاتە ژیان و ئادەمیزاد هەموی بە هۆی پرۆسەی جولەو گەشەی دیالکتیکی لەنەبوونەوە پەیدابوون بە عەقڵی ئادەمیزادیشەوە.

بەڵام بەسەرنجێکی قووڵی فەلسەفی دەردەکەوێ کە هەموو جوڵەیەك گۆڕان و گەشەکردن نیە، لەبەر گرنگی هەڵوەستەیەکی پێویستە، لە سروشت و کۆمەڵگە و ژیاندا، جوڵەکان 6 پۆلن: (میکانیکی- جیۆلۆجی- فیزیایی- کیمیایی- بایلۆجی- کۆمەڵایەتی- فکری)، ئەگەر بەوردی لەو پۆلانەی جوڵانەوە وردبینەوە، دەبینین سێ پۆلی یەکەم تایبەتە بە سروشت، پۆلی چوارەم زیاتر بە زیندەکی و پۆلی پێنجەم و شەشەم بە ئادەمیزاد، دەبێ ئاگادار بێن پۆلی یەکەم لە سیستەمی دووەم ئیشدەکات، هەردووکیان لە پۆلی سێیەم، تا دەگاتە پێنجەم، بەڵام

---

[1] سورة النمل اية88

[2] بڕوانە: دیالیکتیك طبیعة- انتی دوهرنك- انجلیس، بؤس الفلسفة، ایدیؤلؤجیة الألمانیة- مارکس، دفتاتر فلسفیة-لینین، في تناقض ماوتس تۆنك، لە هەموان زیاتر کتێبی (اصول فلسفة الماركسية -درس الخامس ج1ص83- )ی جورج پۆلیتزەر باسی کردوە.

پێچەوانەی ڕاست نیە، واتە پۆلی پێنجەم لە چوارەم و چوارەم لە سێ یەم ئیش ناکات، واتە جولەکان لە سادەوە بەرەو ئاڵۆزی دەست پێدەکات، بەڵام مەرج نیە مادام لەسادەوە بەرەو ئاڵۆزی چوو ئەوە گەشەکردن بێت وەك (سپینسر) بانگەشەی بۆ دەکا و دەڵێت گەشەکردن بریتیە لە سادەیی بۆ ئاڵۆزی، لەڕاستیدا لە سروشت نە (ناکۆکی- التناقض) هەیە نەگەشەکردن، بەڵکو هەماهەنگی هەیە، کۆمەڵێك ناکۆکی دیاریکراوە لەلایەن فەلسەفەی مارکسی وەك ململانێ ی : سارد و گەرم، سالب و موجەب، وەستان و جولە، مردن و ژیان، کۆمەڵگە و سروشت[1]، ئەوجۆرە ناکۆکیانە مەرجەکانی (التناقض)ی دیالیکتیکی نایەنێتە دی، وەك فەلسەفەی مارکسی مەرجی بۆدانـاوە، واهاتووە کە ناکۆکی دیالیکتیکی بەدوو مەرج دێتەدی: 1- هەر لایەی ناکۆکی مەرجن بۆ مانی ئەوی دی 2-جێ ی خۆیان بگۆڕنەوە[2]، بەومەرجانە مەحاڵە (نەك لە سروشت) لەناو کۆمەڵگە ویان لەنێو سیستەمێکی بوونەوەر ناکۆکی بدۆزێتەوە، ئەو دوو مەرجە (یەکەمیان) مەرجی ناکۆکی نیە مەرجی (سیستەمی الضدین-زوج)ە لە فەلسەفەدا کە لە پێشوو باسمان کرد، کەواتە بابزانین ڕاستی جولە و گۆڕان و گەشە چۆنە لە بوونەوەر؟ لە سروشتدا جولە و گۆڕان هەیە، بەڵام گەشەکردن نیە، جولەکراوەکان (پۆلی یەکەم تا چوارەم کراوەن) تا ڕادەیەك ئەگەری زۆری لەپێشە و بێ ئامانج دەردەکەون بە پێی کاریگەری دەرەکی ئامانج ومەودای جوولەیان بۆ دیاری دەکرێ، بەڵام لەوی بەسەروو سیستەمی جولە لە سروشت بەگشتی بازنەییە، جار وایە وەك گەشەکردن دەردەکەون بۆبەشێك لەتەمەنی، بەڵام لە کۆتاییدا سیستەمی بازنەیی پێك

[1] بڕوانە : أ- انجلس – ديالكتيك الطبيعة ص78 ب- بودوستنيك وياخوت- عرض موجز للمادية الديالكتيكية ص89-112 (هەریەکەلە: انتى دوهرنك، حول تناقض، مادية الدياليكتية، اصول فلسفة الماركسية،... لەهەمو ئەوانە یاسای دوەمی مادیەی دیالکتیکی پێك هیناوە بەناوی(قانون وحدة وصراع المتناقظات.

[2] بەوردی ئەو دوو مەرجە لە "في التناقظ"ي ماوتس تۆنك" هاتووە

دەهێنێت، بەو جۆرە جولەیە نە ئاو دەبێتە جیوە، نە ئاسن دەبێتە زێر، نە مریشكیش دەبێتە كۆتر، نە مەیمونیش دەبێتە مرۆڤ، وەك لامارك مەزندەی كردو ئەنجلس كتێبێكی بەناوی (دور العمل فی تحول القرد الی الانسان)[1] هەیە پشتی بەو جۆرە جوڵە بەستووە و بەگەشەكردنی وەسف كردووە.

## سیستەمی سروشت و سیستەمی گەشەی كۆمەڵگە:

لەو كورتە توێژینەوەیە بۆمان دەردەكەوێ كە سیستەمی سروشت و سیستەمی گەشەی كۆمەڵ زۆر لەیەك جیایە، یەكێ لە هەڵە هەرە گەورەكانی فەلسەفەی مادیەكان ئەوەیە كە جوڵە و گەشەی كۆمەڵگە و مرۆڤیان بەبەشێك لە سروشت پۆلێن كردووە، لەكاتێكدا تەواو لەیەكتر جیان، دەسەلاتی بە سروشت نەبەخشیوە بەڵكو لەڕێی یاسای سروشتیەوە ئازادی لە سروشت زۆر تەسك كردۆتەوەوئەركی بۆ داناوە بێ ماف، بەڵام بەرپرسیارەتی دوای لەسەر نیە، ئەوەی كۆمەڵگە (دەسەڵات و ئیرادە)ی لەگەڵە، بۆیەش بەرپرسیارەتی لە ئەستۆیە، هەر ئەوەش مانای (انـي جاعل في الارض خليفة)یە، واتە خودا خۆی ویستویەتی بەشێك لەدەسەڵات بداتە دەست ئادەمیزاد بۆ فەترەیەكی زەمەنی بێ ئەوەی هیچ لەدەسەلاتی خۆی كەم بیتەوە، ئەگەر ئەو دەسەڵاتەی بۆ هەتا هەتایە پێ ببەخشیایە ئەوا دەگەیشتە پلەی (شريك)، بەڵام هەم بۆ تەمەنی ئادەمیزاد و هەم بۆ تەمەنی كۆمەڵگە دیاریكراوە، لەهەمان كاتدا دەسەڵاتە پێدراوەكەش دیاریكراوە بۆیە وەسفی (بەندە-عبد) ی بۆ دەسازێ نەك (شريك)، لێرەوە لەگەڵ بیری دیزم و باقی عەلمانی میان ڕەویش لیك جیا دەبێتەوە كەوا دەزانن دەسەلاتی مرۆڤ زۆرە تا ڕادەی شریكی وئەو دەسەلاتەی

[1] ئەو عنوانە لە بنەچەدا لە (فريدريك انجلس-ديالكتيك الطبيعة —دور العمل فی تحول القردالی انسان ص194-208) هاتوە، دوای كرایتە كوراسەیەكی سەربەخۆ.

خواش بە مرۆڤی داوە لەدەسەلاتی خوای کـەم کردۆتـەوە، هـەر لێـرەوەش بناغـە فەلسەفیەکانی هاتنی پێغەمبەران بۆ کۆمەڵگە ڕوون دەبێتەوەکە زۆر پەیوەندیـدارە بە فاکتەرەکانی گەشە، کەبریتین لە فاکتەری دەرەکی وناوەکی.

## فاکتەری دەرەکی وگەشەی کۆمەڵگە:

لەتوێژینەوەکانی پێشوو بۆمان دەرکەوت کـە گەشـە و پێشـکەوتنی کۆمەڵگـە سیستەمێکی تایبەت بەخۆ دەگرێ، مەبەستی بەرپاکردنی شارستانی و سیسـتەمی ژیانی دادگەریە، لـەو پێنـاوەدا دەسـتکەوتی زانسـتی و تەکنـەلۆژی و فیکـری و فەرهەنگی و یاسایی و سیاسـی... بەدەسـت دەهـێنێ، لێـرەدا نهینـی هـەرەدوای پیشکەوتن وگەشـەی کۆمەڵگـە دەکەوێتـە نێـوان عـەقڵ وشارسـتانی، لێـرەوەش شێوەیەك لە دیالکتیکی نێوان بزوتنەوەی عەقڵی وواقیعـی شارسـتانی تەکانـدەری گەورەی گەشەو پیشکەوتنە، بەڵام دیسان کاریگەری یەکەم دیارە عەقڵـە، دووبـارە کێشـەیەکی فەلسـەفی ڕووبـەڕوو دەبێتـەوە ئـاخۆ ئاسـتی گەشـەی تـەکنۆلۆژیاو شارستانی گوزارشێکی ڕاستەوخۆی ئـەمپێری گەشـەی کۆمەڵگەیـە؟ وەڵام لـەلای زۆربەی هەرە زۆری فەیلەسوف وزاناکان ئامادەیە، دەڵێن بـەلی، بـەڵام ئەگـەر بـە ووردتـر سـەرنج بـدەی بـە پرسـیارێکی تـر ئاخۆپیشـکەوتن وگەشـەی کۆمەڵگـە تەنهامانای تەکنۆلۆژی ودەولەمەندی وخۆشگوزەرانیە؟ئەدی مرۆڤایـەتی، بـەزەیی، هاریکاری، خۆنەویستی..؟ لەوەوە بەشێك لە فەیلەسوفان ڕای جیایان بـۆ دروسـت دەبێ، لەهەموان ڕاشکاوانەتر شپینگلەر(1880-1936) لە کتێبی(إضـمحلال الغرب) دەڵێت: "مەرج نیە مێژوو بریتی بێت لـە گەشـە وەك ڤـۆلتێر دەڵـێ، یـان بەرەو ئاشتی بێت وەك کانت دەڵێ، یان ئازادی روح بیت وەك هیگـل دەیلـێ، یـان بەرەو شـیوعیەت بیـت وەك مـارکس دەڵـێ.. بـەڵکو مێـژوو بریتیـە لـە سـوڕی بازنەیی"، ئەو وەك ئیبن خەلـدوون وتـۆینبی بـاوەڕی بـە تیـۆری(دورة الحضـارات)

هەیە، دەڵێ هەمو شارستانیەکان بە چەند قۆناغیکی(سەرهەڵدان-گەشە-بوهاری-پیری-مردن) دەڕۆن[1]، بەکورتی دەیەوێ بڵێ (ئێمەش لەگەلی دەڵێین) مێژووی کۆمەڵگەو گەشەی تکنۆلۆژیا لێك جیایە، ئەوەی (ڤیکۆ) ووتی گەشەی سپرینگی بەرەو سەروو ئەوە وەسفی گەشەی شارستانی و تەکنۆلۆژیە نەك گەشەی خودی کۆمەڵگە، گەشەی کۆمەڵگە زیاتر گەشەو پتەوی ڕەوشتی مرۆڤ بەتاك کۆ دەگرێتەوە، مانای وایە مەرج نیە کۆمەڵگەی ئاشی ئاگری لەکۆمەڵگەی ئاشی هەوایی پێشکەوتووتر بێت وەك مارکس بانگێشەی بۆ کرد، مەرج نیە کۆمەڵگەی کۆمپیوتەری ئێستا یان کۆمەڵگەی ئەمەوی لەکۆمەڵگەی مەدینە پێشکەوتووتر بێت، یان بە دیویکی تر گەشەی کۆمەڵگەو مێژوو وزەمەن لە پەیوەندیەکی سێگۆشەی هاوڕێژە نین، پێشکەوتنی کۆمەڵگە زیاتر وێچووی کیرفی(ئیمان-باوەڕ) زیاد دەکاو کەم دەکا، هەرچی کیرڤی زانیاری وشارستانی وتەکنۆلۆژیایە کەم کردنی نیە لەگەڵ زەمەن ومێژوو ڕاستەوانە هاوڕێژەن، کەواتە بەو تیۆرە نوێیە دەتوانین ڕوو بچینە نێو کاریگەری عامیلی دەرەکی وپێشکەوتنی کۆمەڵگە، هەر لەوێش زۆر بە ئاسانی کۆمەڵێك کێشەی تری فەلسەفیمان بۆ چارەسەردەکا.

لە ڕێسای یەکەمی (چوار ڕێساکەی گەشەکردن)، بۆمان دەرکەوت کە هەموو سیستەمێکی گەشەکردن لەسەرەتادا زیاتر پێویستی بە فاکتەری دەرەکیە، ئەوەش ڕێك بناغەی فەلسەفی هاتنی پەیام و پەیامبەران بەرجەستەدەکات وەك فاکتەری دەرەکی بۆکۆمەڵگە، تەنانەت ئەگەر لە زانستە مێژووی و ئایینیەکانیش هەواڵی هاتنی پێغەمبەرانمان بۆ نەهاتبوایە، ئەوا بەپێی ئەو چوار ڕێسایە پێغەمبەران و پەیام وەك فاکتەری دەرەکی بۆ گەشەی کۆمەڵگە حەتمی بوو، هەر لەسەر بنچینەی ئەو ڕێسا فەلسەفیە دەبێت لەسەرەتادا پێغەمبەران بە ژمارەیەکی زیاتر هاتبن،

[1] توینبی منهج التاریخ وفلسفة التاریخ-محی الدین اسماعیل ط2 1986 ص70-

هەر بە پێی ئەو ڕێسایانە دەبێ هەموو شارستانیەکانی سەرەتایی ئایینی یان درێژکراوەی ئایینی بن، بەرەبەرە کەم ببنەوە بەپێی ڕەوتی گەشەی کۆمەڵگە، تا فاکتەرە ناوەکیەکانی گەشەی کۆمەڵگە زیاد دەکا و دەکەوێتە سەر پێ ی خۆی و ئینجا پێویستی بە پێغەمبەران نامێنێ وەك (مجدد)، بەڵام هەر بەپێ ی ڕێسای دووەم گەشەی کۆمەڵگە پێویستی بە فاکتەری دەرەکی هەر دەمێنێ، کەواتا ئەگەر پێویستی بە پێغەمبەران نەمێنێ ئەوا پێویستی بە (پەیامەکانیان) هەیە.

سێ گۆشەیەکی پەیوەندی لەنێوان گەشەی کۆمەڵگە و مەبەست و ئامانجیان- مقاصد- و پەیام بەسانایی لەو زەمینە فەلسەفیە دەدۆزرێتەوە[1]، هەروەك چۆن لەنێو تەن و شت و مەك و سیستەمەکان یاساکان دەدۆزرێتەوە، ئاواش لەنێو لایەنەکانی سیستەمی گەشەی کۆمەڵگە چارەسەری دادپەروەرانەی هەڵگرتووە، بە دیقەتێکی وورد دەبینین لە جەوهەردا هەمان پەیامە کە لە پێغەمبەران هێناویانە ئەگەر لەزەمان و زەمین و ڕووکەشیشدا بە جیاجیا دەرکەون.

ماوە ئەوەش بڵێین ڕێسایەکی گرنگ هەیە فەرمان لەسەر پەیوەندی نێوان گۆڕانی توندو گۆڕانی هێواش دەکا ،ئەویش ئەوەیە: تا تێکڕای کاریگەری عەقلانی زاڵ تر بێت بەسەر کۆمەلگە لە جیاتی کاریگەری هێزی ماسولکە ئەوا گۆڕانەکان مەودای زیاتری هێواش وەردەگرن،پێچەوانەشی بە پێچەوانە،کەواتە لایەك لە مانای گەشەی کۆمەلگە ئەوەیە کە گۆڕانە توندەکان کەم دەبنەوە ،کەواتە لە قۆناغەکانی گەشەی کۆمەلگە شۆڕش وڕاپەڕین ومەرج نیە بەشیوەی کلاسیکی بمێنێ ، شۆرشی مەدەنی جێی دەگرێتەوە ،کە مەرج نیە پیویستی بە یاخی بوون وچەکداری بێت.

[1] مەندل ئاشکرای کرد کەگەشەش لە کۆتایدا قاوغی یاسای وەردەگرێ.

## فاکتەری دەرەکی وبزوێنەری گەشە :

لە ڕاستیدا ئەوەی گەشەدەکا کۆمەڵگەیە، هەموو لایەك کۆکن لەسەر گەشە و پێشکەوتنی بەڵام دیسان لەسەر (بزوێنەر- ماکینە)ی گەشەکەی ڕێك نین وەك لەو نمونانەی خوارەوە دەردەکەوێ:

1- مارکسیەکان: پێیان وایە ڤاکتەری ئابووری (بزوێنەر)ەو خۆی لە (ململانێی چینایەتی) دەنوێنێ.
2- نەفسانیەکان: دەڵێن (هەست بە نوقستانی دەروونی) ڤاکتەری گەشەی کۆمەڵە.
3- جوگرافی ناسەکان: ڤاکتەری جوگرافی و ژینگە.
4- دوهرنگ: چەوسانەوە.
5- هیگل : سەلبیات، (دیالیکتیك).
6- کارلیل: ژیرەکان سەرچاوەی گەشەن.
7- توینبی : التحدی والاستجابە.
8- فرۆید : جنس.
9- ابن خلدون : ئاین و پەیوەستی خوێنی.
10- شۆبنهاوەر: ئازادی خوای میژوە
11- نەتەوەگەریەکان: ململانێی نەتەوەیی.
12- سەرمایەداری ئێستا و (هندیگتۆن): ململانێی شارستانیەکان.

... لەگەڵ زۆر وردەبۆچوونی تریش.وادەردەکەوێ دیسان مانای گەشەی کۆمەڵگە وەك یەك نەبێت بەشێك پێیان وایە ئەوە گەشەی کۆمەڵگە نیە، وەك لە ڕایەکانی شبینگلەرو ابن خلدوون و تۆینبی وزۆری تر.

هەریەك لەو بۆچونانە بۆ کۆمەڵگە لەنێو جەستەی ئادەمیزادیش جێکەوتی هەیە، مارکس پێی وایە (گەدە) بزوێنەری مرۆڤە، فرۆید پێی وایە (حەزی جنسی)، کارلیل (ماسولکە)، ناشیۆنالیزمەکان (زمان)... هیگل (دیالیکتیکی فکری)...، لەو جۆرە تیڕوانینە فەلسەفیە پێناسی مرۆڤ نزیك لە ئاژەل هاتوە، ئەرستۆدەڵێ مرۆڤ ئاژەلیکی سیاسی زماندارە، مارکس وەریگێڕاوەدەڵێ ئاژەلێکی ئابووریە- اغلی راسمال، دورکایم دەلی مرۆڤ ئاژەلێکی مێگەلیە..ئەو وەسفە یەك ڕەهەندی (مادی)ە، گەدە و کۆئەندامی جنس و زمان و ماسولکە.. لە ئاژەڵیش هەیە کەچی کوا گەشەی کۆمەڵایەتیان نیە، لەوەوە ئەو وەسفانەی ئەرستۆومارکس و دورکایم شکست دەهینێ، چونکە دەکرێ بلیین جەستەی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی ئاژەل، لەجەستەی هەردوولاشیان پرۆسە کیمیایی وفیزیایی و میکانیکیەکان دەگەڕێتەوە بۆ سروشت، بەلام وەك هۆشمەند دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگە، کەواتا لە ئادەمیزاد و کۆمەڵگە(سەربارو ئیزافەیەکی تر) لە چالاکی گەدەو جنس وغەریزە.. هەیە، هەڵبەتە ئەوەش"عەقڵە"، کەواتا عەقلێ بزوێنەری بنچینەیی گەشەی کۆمەڵایەتیە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە هەریەکە لە فاکتەری ئابوری و جنسی و خۆویستی و.. هتد، ڕۆڵیان نەبێ، وەك هیگل لەو بۆچونەی وای بۆچوەو دەڵێ: هەمو ڕووداوە مێژووییەکان تەنها عەقلێ دروستی کردوون[1]، بەڵکو هەریەکە لەقۆناغی خۆی ڕۆڵی هەیە بەڵام عەقڵە ڕێکخەری ئەو فاکتەرانە، کەواتە لەکۆتاییدا پاڵنەری بنچینەییەکەی عەقڵە، گەشەی عەقلێش کراوەیە، بریتیە لەکۆی جووڵە و گەشەی سروشت و بە فاکتەرێکی سەرباریەوە، لێرەدا پێویستیمان بە گەڕانەوەیە بۆ ئاستەکانی جوڵە بە دیزاینێکی تر، بە پێی رۆلی فاکتەری

[1] المثالية الألمانية ص131

دەرەکی، دەبینین لە یەکەمەوە (جولەی میکانیکی) تا شەشەم(عەقڵ) چەند ڕێسا و یاسایەك هەیە حوکمی لەسەر دەکات بەکورتی پوختی ئەوانەی خوارەوەیە:

1- فاکتەری دەرەکی لەیەکەمەوە زۆر چڕە بەرە بەرە تا بەرەو سەروو دووەم و سێیەم.... تا حەوتەم، بڕۆین ڕۆڵی فاکتەری دەرەکی کەم دەبێتەوە، فاکتەری ناوەکی لیّ ی بەهێز دەبێت.

2- ڕۆڵ و گرنگی هەردوو فاکتەری دەرەکی و ناوەکی دەگۆڕێ بەڵام هەموو دەم لەپایەی (پێویست- عامل الضروري) ناکەون.

3- سیستەمی گەشەکرد (مۆنۆتۆکیە- اطراد) واتە لەگەڵ زەمەن زیاد دەکات.

4- گەشەی عەقڵ کراوەیە، لەخواروو بەرەو سەروو، لە پانتاییەکەوە بەرەو پانتاییەکی فراوان، لەنەزانینەوە بەرەو زانین، ئەوەش لە کۆتایدا ئەو ماکینەیەی گەشەی کۆمەڵگە دروست دەکا.

هەرچواررێسا بۆ عەقڵ دەبنە زەمینەی کاریگەری بەسەر گەشەی کۆمەڵگە، بەهەردوو ئاڕاستە، بە ئاراستەیەك کۆمەڵگە لەسەرەتای تەمەنی (عەقڵ- منداڵی) کۆمەڵگە (وەك فاکتەری دەرەکی بۆ ئەو عەقڵە) کاریگەری زۆری دەبێت تا ڕادەی لاسایی کردنەوە، بەرە بەرە ئەو عەقڵە دەبزوێ تا دەگاتە ئاستێك عەقڵ خۆی کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە دروست دەکات، ئەو پرۆسەیە بەردەوام لەگەڵ نەوەکانی تریش دووبارە دەبێتەوەو کۆی بزوتنەوەی گەشە دروست دەکا، لەهەمان کاتدا کۆی جولە و کارلێککردنی بەنۆرەی عەقڵ و کۆمەڵگە ئەو داینەمیکیەتەی گەشەی کۆمەڵگە دروست دەکات، بۆیە گەشەی کۆمەڵگەش هەمان خەسڵەت و یاسای گەشەی عەقڵ وەردەگرێ، لەکۆتاییدا گەشەی هەردووکیان ملکەچی یاسا و مەبەست دەبێت، لەوەوە پێویستمان بە زانیاری گەشەی عەقڵ وکاریگەریەکانی بەسەر گەشەی کۆمەڵگە هەیە، زیاتر ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەو گەشەیە

ئامانجدارە، ئینجا مەبەستە بنچینەییەکەمان زیاتر ڕوون دەبێتەوە کە فەلسەفەی هاتنی پێغەمبەرانە.

## فاکتەری دەرەکی وگەشەی عەقڵ :

هەلبەتە لەم گەردونە هەموو شتێك دەجووڵێ[1]، بەڵام مەرج نیە گۆڕانی لەگەڵ بێ، بەشێکیش لەگەڵ جولە دەگۆڕێت بەڵام مەرج نیە گەشەی لەگەڵ بێ، ئەو بەشەی لەگەڵ گۆڕان گەشە دەکا مەرج نیە گەشەکەی کراوە بێت، بەڵکو بازنەییە، گەشەی عەقڵی یەکێکە لە گەشە دەگمەنەکانی ئەو گەردوونە بازنەیی نیە بەڵکو کراوەیە، چۆنایەتیە کەمتر چەندایەتی لەگەڵە، هەموو جولانێکیش بە (جولەی فکریشەوە) بە هەردوو فاکتەری ناوەکی و دەرەکی دروست دەبێ، بەجۆرێك لەسەرەتادا فاکتەری دەرەکی بنچینەیی ترە دوایی بەرەبەرلەگەڵ رەوتی گەشەی عەقڵی فاکتەری ناوەکی بنچینایەتیەکە لە فاکتەری دەرەکی دەسێنێ، فاکتەری دەرەکی ئەو پرۆسەیە بریتیە لە بینین و بیستن و پێکەوتن و... واتە ئەو تەفاعولەی نێوان عەقڵ و واقیعی مادی بەهۆی هەستەکانەوە دەکرێ، ئەوانە دەروازەی فاکتەری دەرەکی پێك دەهێنن، بۆیە عەقڵ لە سەرەتادا تەنها نوسخەیەکە لە بینین دوای کەمێك ئنجا دەبێتە بینین و بیستن.. بەو شێوەیە، لێرە وەسفەکەی مارکسی وهەندێ تەیاری فەلسەفی ڕاستە کەدەڵێن (الفکر مجرد انعکاس الواقع) تادوو سالی ئەو وەسفە ڕاستە نەك بۆ تێکڕای پرۆسەی عەقڵی وفکری، تا قۆناغێکی دیاریکراو رەنگە بگاتە سێ ساڵی ئنجا جولەی عەقڵی لە ناوەکیش دەست پێ دەکاو دەتوانێ بەحاستەم شتێك لەپشت دیاردەکانیش لێك بدەیەوە بە ئەزموون، ئنجا دوای

---

[1] تیبینی ئەوە بکە دەلیین هەمو شتێك دەجولێ واتە یاساو ڕاستی و پەیام ناگریتەوە چونکە ئەوانە شت نین، مەخلوق نین، مادە نین..بەلکو ئەمرن.

دەکەوێتە سەر بەرهەمی عەقڵی، واتە عەقڵ لەژێر ئینتدابی واقیع(فاکتەری دەرەکی) دەردەچێ، لە ژێر کاریگەری (بە تەنهایی)دایك و باوك و خێزان و دەوروبەر و ژینگە دەردەچێ، (یاخی دەبێ) و خۆشی بەرهەمی عەقڵی دەبێ، واتە لە (مسەیەر)ی دەردەچێ بۆ مخەیەری.. تا ئەو قۆناغە ئێمە ئیشمان بەو لێکدانەوە نیە، زیاتر لە قۆناغی جوڵەی عەقڵی دەوەستین لە سێ ساڵ بەسەرەوە کە یەکەم نیشانەی ئەو قۆناغە ئەوەیە منداڵ دیاردەی (درۆ) بەکاردەهێنێ، ئەوە نیشانەی سەلامەتی عەقڵیەتی، ئەگینا چەندە درەنگ درۆ بکا ئەوە (تخلف عقلی)یە، واتا توانای بەکارهێنانی عەقڵی نیە، هەردەبێ 24 سەعات لەژێر ڕێنمایی دایك و باوك بێ، ئەگەر عەقڵ سەلامەت بێ لە قۆناغی درۆ خەونیش دەست پێ دەکا کە لە پیشوتر (بەشی سێیەم-فاکتەری دەرەکی وخەونمان باس کرد)، رەنگە لەو کورتە رونکردنەوەیە بۆمان دەرکەوێ کە تەمەن یەك دوو ساڵی خەون نابینێ، هەروەها باقی گیانلەبەر و زیندەوەران خەون نابینن، مادام جوڵەو گەشەی عەقڵی زۆر سنورداره واتە خەون تایبەتە بە مرۆڤایەتی و لە قۆناغێکی گەشەی دیاریکراو ڕا دەست پێدەکا، هەمو ئەوانە نیشانەی دەست پێکردنی کارلێکی نێوان عەقلو واقیع دەردەخا، بزانین ئاخۆ ئەو کارلێکە چۆنە؟کامیان عامیلی دەرەکیەو کامیان ناوەکیە؟ ماکینەی گەشە لەو نێوانە چۆن دروست دەبێ؟..لە بڕگەی داهاتوو(پەیوەندی نێوان عەقڵ وجەستەو و واقیع) وەڵامەکانمان دەست دەکەوێ.

## عەقڵ و جەستە :

کێشەیەکی زۆرهەیە ئاخۆ جەستەو عەقڵ دووڕەهەندن یان یەك، هنری بنسن لە کتێبی(العقل والجسم) لێکی کردیتەوە بێ ئەوەی خانەی ڕەهەندەکانیان بۆ دیاری بکا، بەشی هەرە زۆر روح وعەقڵ وجەستەیان پێ مادەیە، لەووەوە مرۆڤ بە سێ ڕەهەندی (گۆشت وهیسك وخوێن) وبەشێك لە سروشت پۆلین کرا وەك لە پیشوو

باسمان کرد، ووردتر لەو ڕایانەی پیشوو لەو بارەیەوە زانای ئەمریکی (سیرل) دەڵێ پێویستە لە چوارچێوەی بایۆلۆجی وجەستەیی لە عەقڵ بگەین ودەردەکەوێ کە بەشێکە لە چالاکی جەستە، هوبز دەڵێ: هیچ جیاوازیەك لە نێوان بیرمان مادەی بیرلێکراوە نیە [1] ئەنجلس دەڵێ: ئەوەی حوکم لەسەر عەقڵ وواقیع وجەستە دەکا یەك یاسان[2]، ..بۆخنەر دەڵێ هۆش لەبەرهەمی چالاکی مادی مێشکە، کۆتاییەکەی مادیەی دیالکتیك عەقڵی بەبەشێك لە مادە-مێشك-پۆلین کرد بەوەی هۆش ڕێکخستەمادیەکەی زۆر باڵایە[3]، ئەوەی زیاتر ئەو ڕایەی توندوتۆل دەکرد کاردانەوەی هەندێ ڕای وا کە لەخزمەتی سیاسی دەسەلاتداران بوە، وەك نمونە(اخوان الصفا) لە بەشی(مثنویة الإنسان) دەڵێت: مرۆڤ پێك هاتوە لەدوودژی (جەستەیی مادی) و(دەروونی ڕووحانی) یەکەمیان بۆ دنیا کاردەکا ودوەمیش بۆ دواڕۆژ هاتوە[4]، ئەوەببوە تەنزیر بۆ پاپاو ئیمپراتۆر: هەروەك مرۆڤ لەدوولای مادی و روحی پێك هاتوە دەبێ دەسەڵاتیش لەو دوولایە پیك بیت، ئاین وپاپا بۆ روحی ودوا ڕۆژ مرۆڤ ودەولەت وئیمپراتۆریش بۆ جەستەو دنیا..، ئەوەیان دوای بوە بنچینەی سیستەمی عەلمانی ، دوایش هەر لەلایەن مادیەکان دان بەوە هێنرا کە مرۆڤ وەك بوونەوەر دوو ڕەهەندیە، مادی ونامادی تەنانەت هەردوو فەیلەسوفی مادی(سپینوزاولینین) خۆشیان گومانیان هەبوو لەوەی عەقڵی ئادەمیزاد پرۆسەیەکی مادی ڕووت بێت، وتیان ئەوەی بڵێت تەنها مادەیە دیارە هۆشی نیە[5]، ئەو ڕاستیە بوویتە بەشێك لە توێژینەوەی ئەکادیمی، ئیستا زۆر بەدەگمەن ماون

---

[1] جون لویس- مدخل الى الفلسفة ص61
[2] ف انجلس-دیالکتیك الطبیعة ص310
[3] عرض موجز للمادیة الدیالکتیکیة ص55
[4] رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء- رسالة رقم:30ص112-113
[5] عرض موجز للمادیة الیالکتیکیة ص63

بڕواننە مرۆڤ وەك یەك ڕەهەند، گەڕاونەوە سەر ڕای کۆن لە ئینجیلی برنابا باسی پەیوەندی نێوان عەقڵ وهەست وجەستە دەکا:(فبعد ان خلق الله الانسان هكذا وضع فيه نورا يسمي العقل ليوحد الجسد والحس والنفس)[1]، دیسان لە بارەی ئەو(پەیوەندی وڕێزبەندی نێوان عەقڵ وجەستە)ی کەبەو جۆرە لە ئینجیل هاتوە ڕای جیا هەیە، مادیەکان پێیان وایە نزیك ترین ئەندامی جەستە لە عەقڵ مێشکە، بەڵام ئاخۆ مێشك لانەی مادی عەقڵە؟ یان بەسادەتر ئایا مێشك عەقڵ دەدا؟ئایا مێشك یەکەم ویستگەی فاکتەری دەرەکی بۆ عەقڵ پێك دەهێنێ؟ کاتێ باس لە عەقڵ دەکەین یەکسەر دەست بۆ سەرمان دەبەین وەك ئاماژەیەك بەوەی کە عەقڵ زادەی مێشك بێت، هەرچەندە ئەنجلس و مارکس بەتوندی رەدی ئەو فەیلەسوفانە دەدەنەوە کە دەڵێن چۆن پەنکریاس ئەنزیم دەدات ئاواش مێشك عەقڵ دەدات، کەچی ئەنجلس لەلایەکی تر دەڵێت(ان الدماغ هو عضو التفكير)[2]، (جان ستون) لە کتێبی (هل لوجودنا من معنى) پێچەوانەی ئەنجلس دەڵێ مێشکمان عەقڵ بەرهەم ناهێنێ بەڵکو وەك ڕادیۆ دەیداتەوە، لەلایەکی تر فەلسەفەی ئاینی بە پشت بەستن بەهەندێ دەق دەڵێ عەقڵ بەندە بە دڵ، ئیمام قورتبی لە (الجامع الأحكام القرأن) دەڵێ: (أضاف العقل إلى القلب لأنه محله كما أن السمع محله الأذن )، بۆیە ئەوان بۆ بیرکردنەوە دەست بۆ سنگیان دەبەن، لەهەردووباردا وەڵامی تەواو نابینرێ، چونکە چ دڵ چ مێشك خانەی دەمرێ وزیندوو دەبێ، یان جاروایە دڵ بە هۆی نەخۆشی دەگۆڕدرێ کەچی عەقڵ ناگۆڕێ، ئەوانەی دەشڵێن مێشك تاکە بەرپرسە لە هۆش وعەقڵ ئەوا بە ڕوونی هەڵەی ئەوەش دەردەکەوێ کاتێ دەبینین بە هەزاران جۆرەکرم وبەکتریاوفایرۆس نەك

---

[1] انجيل برنابا - لفصل 123 – اية7.

[2] مارکس-انجلس مختارات، ط ئنكليزى ص214 هەروەها ویل دیورانت لە (قصە الفەلسەفە) باسی کردوون.

مێشکیان نیە هەر کۆئەندامی دەماریشیان نیـە کەچـی هـۆش وعـەقلیان هەیـە، کەواتە عـەقڵ لە شوێنیکی دیاری کراوی جەسـتە نیـە بـەڵام مانـای ئـەوەش نیـە لەهەمو شوێنیك بێت، ئەگەر وابیت جاروایە کەسێك دەستو قاچی نامێنی عـەقڵی کەم ناکا.. ئەدی لە کێیە؟، بە ئەندازەی کێشە فەلسەفیە گەورەکەی بوون ونـەبوون ئالۆزە، ئیمامی علی ئاوای ووتوە (الروح حیاە البدن، والعقل حیاە الروح)[1]، واتـە روح جەستە ئامادە دەکا بۆ زیندە چالاکی، عەقلیش دەجولینی بۆ ئامانج، کەواتە روح رۆلی یاسای سروشتی دەبینی لە سیستەمی زیندەکی وعەقلیش هـەمان ڕۆلـە بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتی، هنری بنسن کە زۆر پسپۆرە لە پەیوەنـدی جەسـتە بـە عەقڵ بەو شیوەی بۆ نەچوەو نەیتوانیوە جەستەو روح وعەقڵ ئاوا ڕیز بکا، هـەوڵی داوە ڕاستەوخۆ پەیوەندی عەقڵ وجەستە بدۆزیتەوە لە ئەنجامدا گەیشتە ئەوڕایـەی کە عەقڵ پێشەنگی جەستە نیە هەردوولا وەك یەك گرنگن و لیێکیش جیـان[2]، ئـەو پرسە ئەوەندە ئاسان نیەو لە ئاستی زانیاری ئەو سەردەمە هێشتا نیە، لە پێشەکی مادیەی دیالکتیك هاتوە پەیوەندی عەقڵ وواقیع وپەیوەندی روح وسروشت کێشەی هەرە بنچینەی فەلسەفە بوە، تەنها توانیویەتی نیمچـە وەڵامێـك وابداتـەوەو بڵـێ عـەقڵ بـاڵاترین ڕێکخسـتنی بوونـە، هیگلـیش دەڵـێ : بـیر لەسـەرووی هـەمو بوونێکە[3]، دیکارت دەڵێ : (جەستە ماکینەیەکە بریتیـە لـە کۆمەڵـە ماسـولکەو دەماروخوین کارو ئەرکی ناوەستێ ئەگەر عەقلیشـی وەسـتا)[4]، ئـاوا نیـە ئەگـەر عەقڵی نەمێنێ ژیانی دەمێنێ بەڵام ئیرادەی نامێنێ بە مرۆڤ هەژمار ناکرێ وبگرە بەگیانداریش هەژمار ناکرێ. هەرچی ڕای ئاینیە لەوەی ئیمام علی و لێرەوە دەبـێ

---

[1] علی ابن طالب-الف کلمة المختارة-دار الأندلس، ط21980 ص100
[2] هنری بنسن-العقل والجسم ت:د محمد جابرعلی ص21-25
[3] المثالیة الألمانیة ص123
[4] ه بنسن-العقل والجسم ص24

ووردتر لەزاراوەی(قلب) لە قورئان بكۆڵینەوە كەجیایە لەگەڵ (فوئاد)ی ئـەو پارچـە گۆشتەی لە سینگمانە، لە 11شوێنی قورئان ناوی (فوئاد) هاتوە، بەڵام لـە چـوار سورەت (نحل واسرا ومؤمنون وملك) لەگەڵ چاووگوێ (سمع وبصر) پێكەوە هـاتون، واتە زیاتر لەگەڵ هەست ریزی كردون نەك عەقل، لە قورئان باسی (قلب) لە بەرەی پیشـەوەی ئـادەمیزاد دەكـا ﴿لا تَعْمَـى الْأَبْصَـارُ وَلَكِـنْ تَعْمَـى الْقُلُـوبُ الَّتِـي فِـي الصُّـدُورِ﴾[1]، كەواتە لێرەش جۆرێك لە دیاری كردنی شوێنی عەقڵ كـردوە، كەواتـە لە كوێیە؟ لەڕاسـتیدا نزیـك تـرین ئەنـدامی مـادی لـە عـەقڵ مێشـك نیـە وەك فەلسەفەی مادی وای تێگەیشتوە، دڵی گۆشتینەكەش نیە، هەروەك چۆن پیشوو تر بەشێكی زۆر لە زاناو فەیلەسوفانی ئیسلام ونائیسلام واتیگەیشتبوون نزیـك تـرین (مەخلوق-سروشت) مانگ وئەستیرەیە لە خودا، ئـاواش لێـرە مادیـەكان بەهەڵـە چووینە لە نزیك ترین واقیع(بوون) لە عەقل، دەتوانین بلـێین پەیوەنـدی عـەقڵ بـە واقیع و جەستەوەك پەیوەندی خوا بەسروشتە ڕاستەوخۆ نیە، بەڵكو ئەو پەیوەندیـە لەڕێی هەستەكانە، ئەگەر هەستەكان نەمینێ بەتایبەتی لەسەرەتا گەشەی عـەقڵی هەر نابێ و مرۆڤی لێ دەرناچێ، جا ئێستا كەمێك ئەو كێشە ئاڵۆزەمان بـۆ سـانا دەكا، مادام هەستەكان(بینین، بیستن، تام، بـۆن، پیكـەوتن) بەهـەمو جەسـتەمان بلاوە كەواتە عەقڵمان تەنها زادەی مێشـكمان نیـە، لەهـەمو جەسـتەمانە، بـەڵام دەبینین لەو هەستانە بینین وبیستن بنچـینەیی تـرە بۆیـە عەقلیشـمان هەلدەكشـێ زیاتر بۆلای مێشك ودەمارەسەرەكیەكانی پەیوەستن، فارابی دەڵێ (قلب) لەسەرووی دەماغە بەڵام پێـی وایـە هـەردووكیان سـەركردایەتی هـەمو بەشـەكانی جەسـتە دەكەن[2]، (باسكال) پێی وایەمێشك ودل پێكەوە سیستەمی عەقڵ پیك دەهێنن بـە

---

[1] القران الكريم- سورة الحج 46

[2] فارابی – اراء اهل الدينة الفاضلة ص92

جۆرێك زانیاریە عەقلیەكان دەتوانرێ بسەلمینرێ، هەرچی زانیاریە دل ودەرونیەكانـە ئەوا وەك باوەڕتەسلیمی بە، دەیـەوێ بڵـێ زانیاریـە عەقڵیـەكان زانسـتن زانیاریـە دڵیەكانیش ئـاینن، بەگشـتی وادێتـە پـێش چـاو سیسـتەمی مێشـك لەسـەرووی سیستەمی هەست بێـت، ئـەویش لەسـەرووی سیسـتەمی هـەرس بێـت، ئـەویش لەسەرووی سیستەمی زاوزێ، ئەویش لەسەرووی سیستەمی سوڕی خـوێن، ئـەویش لەسەرووی سیستەمی ماسولكە..واتە مێشك لەسەرووی هـەمو ئەوانـەو عەرشـی عەقڵیش لەسەر مێشك وعەقڵیش لەسەر عـەرش بێـت، ئـاوا نیـە، عـەقڵ پـۆلین دەكرێ لە چوارچێوەی (ئەمر، یاسا، روح) نەك(خلق وجەستەومادە)، بۆیە عەقڵ لە سەرووی رووحە، رووحیش لەسەرووی جەستەیەو لەگەلیشی ئاویتەیە، بـەڵام بڕینـی پەنجەیەك روح دەرناچی كەچی بە بڕینی مل ڕوح دەردەچێ، كەواتـە ئیسـتا یەكـەم پێویستمان بەوەیەبزانین روح لە كێیە —كە كێشەی بنچینەی فەلسەفە بوەو ڕوونیش نەبوویتەوە- ئینجا دەتوانین توێژینەوەی شوینی عەقڵ بكەین ڕەنگە ئەو كاتی ساغ بیتەوە هەر پرسیارەكەشمان هەلەیە، ئـەوەی دەتـوانین بیڵـێین ئەوەیـە لـە كـێ روح هەبیت هەستیش هەیە بەڵام مەرج نیە عەقڵ هـەبێ، واتـە لەجەسـتە دا پانتـایی بوونی روح فراوانترە لە عەقل، بۆیەش گەلێ جار مرۆڤ لە هۆش خۆی دەچـی بـەڵام روحی ماوە، كەواتـە ئایـادەتوانین بلـێین مـرۆڤ لـە بونـەوەر وسروشـت بـەوە جیـا دەكرێتەوە كەسێ رەهەندە(جەستە وروح وعەقل)؟ نەخێر هەردوو ڕەهەندە بریتیە لە روح وجەستە، جیاوازیەكەی لەگەڵ سروشت ئەوەیە پلەیەكی تری لە(ئـەمر-یاسـا-هۆ) پێدراوە، كە بریتیە لەروح كە بەشێكە لە ئەمر(الروح من امر ربی)، رەهەندی زیاد نەبوە بەڵام پانتایی نامادی(ئەمر) زیاد بوە، لـەو زیـادەش عـەقڵی لێ پەیـدا بوە، واتە عـەقڵ مادی ونامادیە بەڵام نامادیەكەی زیاترە بۆیـەش گەشـەی عـەقڵ زیاتر چۆنایەتیە كەمی چەندایەتیە، ئەوەش دووبارەی ڕێكی ڕێزبـوونی 6جۆرەكـەی جوڵانەوە لە سروشت، بە تایبەتی 3 جوڵانەوەكەی زیندەكی كەلەخواروو بۆ سـەروو

بەرەبەرە گۆڕانی چۆنایەتی زیاد دەکا چەندایەتی کەم دەکا، لەوەوە عەقڵ پایەی هەرە سەرەوە لەو ڕێز بەندیە وەردەگرێ، کە زیاترین گۆڕانی چۆنایەتی بەخۆوە دەبینی لەو بوونەوەرە، ئەو بالاییەشی لە هەردوولای مادی ونامادی مێژووییانەی بۆ ڕەخساوە، مادیەکە زیاتر لەلای لاربوونەوەی ماسولکەی جەستە بۆ لای مێشك ولاربوونەوەی هەست بۆ لای هۆش کەبە هەردوو لار بوونەوەی مێژووی ئەو بالاّییەی عەقڵیان پێك هێناوە، مرۆڤ جیا لە ئاژەل دەتوانێ لە قۆناغی پێگەیشتن بیربکاتەوە بێ هەست و واقیع، هەرچی ئاژەڵە بیرکردنەوەی پەتی نیە، پرۆسەکە تەنها لە واقعەوە بۆ هەست ولەوێشەوە بۆ مێشك وعەقڵی بێ ئەوەی لە (بیری- زاکرەی)بە پۆلینی تۆمار بکرێ، بۆیە لەنێو ڕەوە ئاژەل پرۆسەی پێشکەوتنی مێژوویی دروست نابێ، ناتوانین بڵێن پلنگی ئێستا لە پلنگی سەردەمی نیاندرتال عاقڵ ترن، لەوەوە دەردەکەوێ نێوانی مرۆڤ وگیانلەبەران تەنها ئەڵقەیەکی بزر نیە وەك لامارك وداروین و ڕێبازەکەیان جارِیاندا، بەڵکو دەیان ئەڵقەو بگرە ئەڵقەی چۆنایەتیشیان لە نێوانە، لێرەوە پۆلین وڕێزبەندیەکی تری سیستەمی لە نێو گیانداران دروست دەبێ بە پێی بارودۆخی ماسولکەو مێشك لەلایەك وهەست و هۆش لەلایەکی تر، کێشە ئەوەیە ئەو ئامارە وورده نەکراوە لە نێو هەموو گیانداران کە بە ملیۆنانە ئاخۆ ئەوانی ووزەی ماسولکەی لار بویتەوە بەلای ووزەی (مێشکی گشتی) بە مانافسیۆلۆجیەکەی ماسولکە دەسەڵاتی وەك ئیرادەی دەرەکی دادەبەزێ بۆ ئیرادەی ناوەکی ودەکەویتە ژێر فەرمانی عەقڵ (جاران پێیان دەوت —عقل باطنی)، هەروەها ووزەی هەستی زیاتر بەلای هۆشی لار بوویتەوە.. ئەوانە عاقڵ ترن؟ ئەوەی ڕوونە ئەوگیاندارانەی(بە مرۆڤیشەوە) ووزەی ماسولکەی زیاتر لە ووزەی (مێشکی گشتی)بەکاربهینێ دڕندە ترە، ئەوانەی چەقی قورسایی بڕیاڕ لە ووزەی هەست زیاترە نەك لەووزەی هۆش دیسان دڕندەترن، پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ ئەو دوو پرۆسەیەی لار بوونەوەی ووزەی ماسولکە بۆ ووزەی مێشك و

لار بوونـەوەی ووزەی هەسـت بـۆ ووزەی هـۆش پەیوەنـدیان بەیەکـەوە هەیـە؟ لـە مێـژووی کۆمەڵگـە هەنـدێ زانیاریمـان دەسـت دەکـەوێ، لـە سـەرەتای مێـژووی کۆمەڵگەی سروشـتی (بـەدەر لـە پـەیام) ووزەی ماسـولکە زیـاتر یەکلاکـەرەوەی کێشەکان بوو بۆیـە رۆلی تـاك زۆر گـرنگ بـوو، لـەوەوە کاریگـەری تـاك بەسـەر جولانەوەی مێژوو بە پێـی تیـۆری (کارلیـل) وزۆری تـر یەکلاکەرەوەیـە، ئـەوەش قۆناغە بەپێی ڕێساکان لەسەرەتا کە ماسولکە رۆڵی گرنگی هەبوە ئـەوا پاڵـەوانی سەربازی رۆڵی گرنگی لە یەکلاکردنەوەی ڕووداوو جولانەوەی مێـژوو هـەبوە، دوای سەربازی –سیاسی..، جولەی مێژوو لە ژێر کاریگەری ماسولکە زۆر سسـت دەبـێ و گۆڕانکاریەکان لەشێوەی ئاسۆیی مێژووی دەبێ نەك ستونی مێـژوو، واتـا بـەرەو پێشچوون زۆر سستە، بـەڵکو گۆڕانکاریـەکی میکـانیکی و جـێ گـۆڕکی دەبـێ، گۆڕانکاری ڕووکەش نەك جەوهـەری، بـەزۆریش گۆڕانکاریـەکان بەشـەڕ و شـۆڕ و هێزی بازوو دەبێ، هەرچی ئیسـتایە کـە لـە کاریگـەری دەرەکـی بـەرەو نـاوەکی ولەکاریگەری ماسولکەو جەستەیی بەرەو عـەقڵی ئـەوا ڕۆڵـی تـاك بـەو شـیوەیە نەماوەو ئینجا کاریگەریەکەشی لەڕێی عەقلیە، واتە رۆلی زاناو سیاسی ومیللـەت لێك نزیك بوە کەم تر پاڵەوانە سەربازیەکان ئەو رۆڵەیان ماوە،، واتە دەتوانین بڵـێین مێژووی کۆمەڵگـە بریتیـە لـە مێـژووی وەرچـەرخانی ووزەی ماسـولکە و ووزەی هەست بۆ ووزەی عەقل، یان لار بوونەوەی ووزەی جەستە بەلای ووزەی عـەقڵ.

## عەقل و واقیع:

زۆر ڕای جیـاو پێچـەوانە لـەبارەی پەیوەنـدی واقیـع وعـەقل، مادەوعـەقل، جەستەوعەقل..هەیە، شوبنهاوەر وهەندێ میسـالی تـر دەڵـێن مەحالـە فاکتـەری

دەرەکی کارێکی وای لەدروست کردن وگەشەی عەقڵ هەبێ[1]، ئەوا بە پێچەوانەوە کۆمەڵێك تەیارو فەیلەسوفی تر لەهەموان توندتر ومارکسیەت پێناسی عەقڵ بەوە دەکا کە بریتیە لە ڕەنگدانەوەی واقیع وبەس، لە ئەسلدا یەکەم جار جون دیوی ووتی فکر ڕەنگدانەوەی واقیعە، توما ئەکوینی دەڵێ هەرچی لە زیهنمان هەبێ پیشتر لە هەستمان هەبوە[2]، سپینوزا دەڵێت بیرەکانمان هەرگیز لە واقیع جیانابیتەوە[3]، مانای وایە عەقڵی ئێمە بەرهەمی خۆی نیەو بەمانایەکی تر هەر دەکا ڕەنگدانەوەی واقیع بەڵام واقعێکی نزیك، بۆشنسکی ڕایەکانی کۆکردۆتەوە دەڵێ زۆربەی فەیلەسوفان ڕایان وایە کە واقع وفاکتەری دەرەکی عەقڵ دیاری دەکا[4]، ئەنجلس هۆو هۆکاری گۆڕان ناگێڕیتەوە بۆ عەقڵ خۆی بەڵکو بۆ بازاڕو ئابووری[5]، مارکس پێی وابوو بوونی کۆمەڵایەتییەکەت جۆری عەقڵ و بیرکردنەوەت دیاری دەکات نەك پێچەوانە، لەکۆتایدا (الفكر مجرد انعكاس الواقع) بوە هەڵوێستی فەلسەفی تەواوی مارکسیەت[6]، واتە عەقڵ تەنها فۆتۆکۆپی واقیعە، لەوەوە مارکسیەت دان بە جولەی فکرو عەقڵ ناهێنێ کەلە 6پۆلەکەی جولان باسمان کرد، لای مارکسیەت 6 نیە بەڵکو 5ەو جولەی عەقلو فکر بریتیە لە ڕەنگدانەوەی جولەی واقیع،...بەڵام ئەوتێڕوانینانە ڕووبەڕوی پرسیاری سەختی بێ وەڵام دەبێتەوە، لەوانە: فکر جولەو گەشەی سەربەخۆی هەیە تەنها ڕەنگدانەوەی واقع نیە وەك مارکسیەکان وای بۆ چووبون، ئەگەر وابوایە جیاوازی نێوان مرۆڤ

---

[1] المثالية الألمانية ص227
[2] مدخل الى الفلسفة ص94
[3] المثالية الألمانية ص184
[4] بوشنسكي -الفلسفة المعاصرة في أوروبا ص26
[5] انجلس- انتی دوهرنك ص321 دەقە عەرەبیەکەی: (ان اسباب الأخيرة لسائر التبدلات ليس فی ادمغة البشر بل فی السوق والإقتصاد).
[6] **الفكر ليست سوى انعكاس حركة الواقع ..ماركس– رأس المال، الكتاب الأول. ج 1 ص 29.**

وئاژەل نەدەبوو لە پیشکەوتن، چۆن بەپێش واقع دەکەوت و داهێنـانی دەکـرد، زۆر بەشی فەلسەفە و بیرکاری و چیرۆکەکانی خەیالی و زۆر شتی تر بوونی واقعـی نیـە کەچی لەفکر هەیە، بۆ تەنها ئەو واقیعەی کەوتنی سێو وای لە عەقڵی نیوتن کـرد ئەو یاسایانەی کیش بدۆزیتەوە، بۆ واقیعی (دووبـارە بـووی)ڕۆژ سـوران بـەدەوری زەوی وای لە (کۆپەرنیك 1473-1543ز) نەکرد وەك خـەڵکی تـر نـەڵێن زەوی ناوەند نیە[1]، ئەگەر عەقڵ تەنها ڕەنگدانـەوەی واقیـع بێـت ئـەوا جیـاوازی نێـوان عەقڵی بەشەرو ئاژەل چیە، چۆن لە واقعێکـی دیـاری کـراو عــەقڵی جیاجیـا دەدا داهێنەرو زاناو نەفام لە چ دێت، نـەیتوانیوە بـە ڕوانگـە فەلسـەفیەکەی جیـاوازی نێوان عەقڵی ئادەمیزاد و عــەقڵی ئاژەڵـەکان بقـەبلێنێ و هەنـدێ جـار یەکسـانی کردووە، کە سەرچاوەیەکی بنەڕەتیە لە زۆربەی چەوتیەکانی مارکسـیزم. لەلایـەکی تر خۆ واقیع ڕاستیە(نسبیەن)، ئەگەر عەقڵ تەنها رەنگدانـەوەی واقیـع بـێ، ئـەی درۆ لە کوێـوە دێ؟، لـە بـارەی جولـەی عــەقلیش بۆچـونەکە تووشـی بەربەسـتی یەکجاری دەبێ بێ دەرچوون، چونکە لای هەمو لایەك روونـە کـە جوڵـەی عــەقڵی ئەوەندە خێرایەو جوڵەی واقیعیش زۆر هێواشە، ئـەو مەبدەئـەی مـارکس (بـوونی کۆمەڵایەتییەکەت هۆشمەندیەکەت دیاری دەکات، نەك پێچەوانە)، نەخێر بەهەردوو سەری ڕاستە و هێشتا فاکتەری تریش هەیە لـەو پرۆسـە ئـاڵۆزە بەشـدارەوەك لـە بڕگەی داهاتوو باسی دەکەین، پێناس وناسنامەی مروۆ و تەبیعەتەکانی وئاڕستەی عەقڵی گوایە لە سەرو کەللەی نیە بەڵکو لە بازاڕەکەیەتی، نەخێر زیاتر لـە سـەرو کەللەیەتی لەگەڵ کۆمەڵێك هۆکاری ئاڵۆزی ترە بە بازاڕیشەوە، بەڵام گومان لەوەدا نیە کە واقیع فاکتەری دەرەکی جوڵەی عەقڵ پێك دەهێنێ، بەتایبەت لـە قۆنـاغی سەرەتایی جوڵەدا، واتە لە سەرەتای گەشەی عەقڵی تـەنها عــەقڵ دەتوانـێ وێنـە

[1] ئەودۆزینەوەیە لە کتیبی( دوران اجرام السماویە-کوبریکوس) هەیە .

بینراوەکان تەسەور بکا، ناتوانێ خۆی لەو وێنانە وێنەیەکی نوێی نەبینراو تەسەور بکا. کاتێ توانی تەسەور بکا، ئەوە پێگەیشتنی عەقڵە، لەکاتی زۆر گەشەکردنی عەقڵ دەتوانێ عەقڵ خۆبەخۆ و بێ پەنابردنە بەر واقیع و دابڕان لە هەستەکان خۆی پارچەکانی واقیع تێك بێخێ و دۆزینەوەی نوێ بکا، ئەوە بنچینەی گەشەی شارستانی و تەکنۆلۆجیاشە...، ئەوانە بە ڕوونی جولەو گەشەی عەقڵ پیشان دەدەن، ڕەنگە لەسەرەتای گەشەی عەقڵ زۆرتر لە ژێرکاریگەری فاکتەری دەرەکی (واقیع) بێت، ڕاستە لە سەرەتادا فکر دیلی واقع و دەوروبەریەتی، بەڵام دوایی دەبێتە پێشڕەو و بزوێنەری هەمان واقیع، لەوەوە ئەو پۆلە فەیلەسوف و مەدرەسەیە (گشتاندوویانە) بۆ هەمو قۆناغەکان، بڕیاڕیان داوە کە فاکتەری دەرەکی گەشەی عەقڵی دیاری دەکاو نکولیان لە فاکتەری ناوەکی کردوە، کەچی میسالیەکانیش کە بینیویانە ئەوەتە عەقڵ واقیع دەگۆڕی نکولیان لە فاکتەری دەرەکی کردوە، لەکاتێکا ئەوەی میسالی لەکۆتایی تەمەنی عەقڵ کەمێك ڕاستەو ئەوەی مارکسیش لەسەرەتای تەمەنی کەمێك ڕاستەو هەردوولاش بەهەڵە داچووینە کە یەك فاکتەریان کردۆتە بنچینە بۆ هەمو قۆناغەکان، بەڵکو دەگۆڕێن، گەشەی عەقڵیش وەك لە (ڕێساکانی گەشەکردن) دیاریمان کرد لەسەرەتادا فاکتەری دەرەکی (کە دەکاتە واقیع-ژینگەی کۆمەڵایەتی) بەکارە دوای بەرەبەرە فاکتەری ناوەکی ئەو ڕۆڵە گرنگە لە فاکتەری دەرەکی وەردەگرێ وجولەو گەشەی ڕاستەقینەی عەقڵ (بەداهێنان وبەرپا کردنی شارستانیشەوە)لەو قۆناغە دەست پێ دەکا، بەڵام فاکتەری ناوەکی ئینقلاب لەسەر فاکتەری دەرەکی ناکا هەردوو فاکتەر لەتێکڕای تەمەنی گەشەی عەقڵ وەك فاکتەری(پێویست) دەمێننەوە، لێرەدا بەومانایە شۆبنهاوەر وسپینوزا ڕاست دەکەن کە دەڵێن بیرەکانمان هەرگیز لە واقیع

جیانابیتەوە[1]، لێرەوە وا خەریکە بگەینە دۆزینەوەی ماکینەی گەشەی کۆمەڵگە کە لە عەقڵ سەرچاوە دەگرێ بۆ بڕگەی داهاتوو.

## ماکینەی گەشە

ئەوەی لە قورئان هاتوە کە لەسەرەتای مندالی عەقل چی تێدا نیە (**والله اخرجكم من بطون امهاتكم لا تعلمون شيئا وجعل لكم السمع والابصار والافئدة لعلكم تشكرون** )

،زانیاری میراتی لەگەل خۆی نەهێناوە ،تەنها ئەوەنەبێت کە بەردەوامی ژیانی (نائیرادی لەسەرە) جاروایە پێی ووتراوە(**عقل الباطنی**) وەك كارە فیسیۆلۆجیەكان وغەریزەی خواردن و ..،بەلام ئامادەی وەرگرتنی تیدایە ،(جۆن لۆك)یش وەك قورئان دەلێ میشكی مندال وەك پەڕی سپی وایە بۆشە هیچی تیدا نیە .

ئێستا جوان روون بۆوە کە گەشەی عەقڵی وەك سیستەمی گەشەی تر نیە، بەڵکو کراوەیە، بەو مانایەی لەگەڵ گەشەی خێرایی وەرگرتنی زیاتر دەکا نەك تەسك بوونەوە وەك ئیمامی علی دەڵێ: (كل وعاءيضيق بما جعل فيه الا وعاء العلم، فأنه يتسع)[2]، دەردەکەوێ خۆی ماکینەو بزوینەری گەشەیە، لەهەمان کاتیشدا بێ فاکتەری دەرەکی وواقیعی کۆمەڵایەتی عەقڵی گەشەناکات، پەیوەندیەکانی عەقڵ و واقیعی دەرەوەی لە ڕێی هەستەکانە، واتە هەمو جەستە بۆ عەقڵ بریتیە لە زەمینەی ئەو پەیوەندیە، ئیستا گەیشتین بە وەڵامی ئەو پرسیارە گرنگەی سەرچاوەی گەشەی کۆمەڵگەش، کە پانتاییەکی زۆری لە مێژووی فەلسەفە داگیرکردوەو وەڵامی یەکلاکەرەوە نەدرابۆوە، کۆمەڵێ فاکتەر کرابوە ئەو

---

[1] المثالية الألمانية ص184

[2] على ابن ابى طالب- الف كلمة المختارة ص38

سەرچاوەیە، زۆر بەکەمی بەلای عەقلْ داچووینە تەنانەت کۆمەڵێك فەیلەسوف و تەیار هەر دان بە جولەو گەشەی عەقلْ ناهینن وەك لە پێشوو باسمان کردن، چجای فاکتەری (دروستکەری گەشە) بێت، لەو فاکتەرانەی کراونە سەرچاوەی گەشە هەندێکیان ناوەکی بەشێکیان دەرەکی، لەوانە: فاکتەری ئابوری(هیزی بەرهەم هینەر)، جنسی، زمان، خوێن، ئازایەتی، مل ملانیی شارستانی، خۆ دەرخستن، سلبیات..، هەریەکە لەوانەش لەکات وساتی خۆی رۆڵی گرنگی هەیە، بەڵام ئێمە بەدوای سەرچاوەین، ئاوا بە گشتی ڕوون نابیتەوە کامیان لەو فاکتەرانە (تەولیدی) بزوێنەرن؟ کامیان ماکینەکەی گەشە دروست دەکا؟ هەرچەندە فەلسەفەی مادی هەوڵی داوە کۆیان کاتەوە لەو ڕیسایە(إن الحاجة المادية هي التي دفعت الإنسان للتطور) دیسان هەر ڕوون نیەو حوکمیکی گشتیە، ئەو کاتە ڕوون تر دەبێتەوە کە (جێکەوت) لە ناو جەستەی مرۆڤ بۆ ئەو فاکتەرانە دەدۆزینەوە، واتە شوینی کاریگەریەکانیان لەناو جەستەی مرۆڤ، کەبریتیە لە: گەدەو ئامرازی جنسی وخوین و بازوو ودل و مێشك..، وەك لەپێشوو شتێکمان لێ باس کرد ئاژەڵیش گەدەو جنس وخوین وبازوو دلْ وجەستەی هەیە، ئەوەی نیەتی ئەو ئاستەعەقڵەی نیە، لەوەوە ناسنامەکان لە تێکەڵی ڕزگار دەکرین، هەر لەوەشەوە بە ئاسانی رۆلی مێشك وعەقلْ وەك یەکلاکەرەوە دەردەکەوێ، ڕێك بە پێچەوانەی ئەنجلس نزیك لە ڕای هیگل سەرچاوەکە لە سەرو کەللە دەست پێ دەکا، واتە ئەو پرۆسەی مارکسی کردوویەتی (کە دەڵێ دیالکتیکی هیگلمان لەسەر وەرگێڕا بۆ سەر پێی خۆی)[1] ئەوە سەر پێ نەبوو، ئیستا دەبێ جارێکی تر وەریگێڕینەوە، تا ڕادەیەك هیگل و برۆدۆن باشتری بۆ چوینە هەرچەندە ئەوەی ئەوانیش بە دیالکتیکیانە بۆی چووینە و

[1] ( وإذا بجدلية هيجل ترفع رأسها فتقف على رجليها بعد أن كانت تقف على رأسها) انجلز– لودفيج فورباخ ونهاية فلسفة الألمانية– ص 33 – 34 هەروەها: مارکس- رأسمال –ت:محمد عيتانى، مكتبة المعارف –بيروت ج1ص23

مارکسیش زۆر بە توندی وەڵامی داینەوە[1]، زانیاری ڕاستەقینە(داهێنان) لای (ئەدموند هۆسرل- خاوەنی ڕاڕەوی فینۆمینۆلۆجیا) بە پەیوەندی دیالکتیکی نێوان واقیع وعەقڵ دێتە دی، سیرل زیادەیەکی مەترسیدار لەو بۆچوونە دەکا دەڵێ ئەو زانیارییە راستەقینە هەتا سەری نیە دەگۆڕێ دەبنە زانیاری چەوت، لە ڕاستیدا گەرای گەشە لە عەقڵ دەست پێدەکا ئینجا بە کاریگەری جیاجیا دەپەڕێتەوە بۆ فاکتەرەکانی تری ئابوری وجنسی وکۆمەڵایەتی وسیاسی ویاسایی و شارستانی و...، پرۆسەی تەولیدی گەشە لە بەدەست هینانی زانیاری نوێ لە عەقڵ دەست پێ دەکا،..چۆن؟ لەسەرەتادا عەقڵ تەنها دەبێتە میراتگری زانیاریەکانی دەوروبەری، ئەوە قۆناغی لاساییە قۆناغی کاریگەری بەهێزی فاکتەری دەرەکیە، قۆناغی گرنگی هەستە (کە تەجریبیەکان گشتاندوویانە بە هەڵەیی)، لەو قۆناغە تاڕادەیەکی زۆر (عەقڵ ڕەنگدانەوەی واقیعە وەك مارکسی ومادیەکان وای بۆچووبوون)، یان وەك بلیخانۆف وەسفی مرۆڤ وەك مادیەکانی فرنسا دەکاو دەڵێ: مرۆڤ بەهەمو هەست ونەست وعەقڵ وخواستەکانی زادەی ژینگە کۆمەڵایەتیەکەیتی[2]، دورکایمووردتری دەکاتەوە دەڵێ عەقڵی مرۆڤ دیلی دەستە جەمعی کۆمەڵە، ئەو وەسفانە هەڵە دەردەچێ کاتێ بۆ هەمو تەمەنی عەقڵی مرۆڤ دەیگشتێنن، بۆ هەمو تەمەنی عەقڵی مرۆڤ نیە بۆ تەمەنی سەرەتایەتی، بەڵام عەقڵ بەوە ناوەستێ، بە پێی ڕیساکانی گەشە خۆی لە ژێر ئینتدابی فاکتەری دەرەکی (ژینگەی خیزان-ژینگەی دەوروبەر-واقیع - هەست) رزگار دەکاودەگاتە قۆناغی ئازادی بیرکردنەوەو داهێنان، لەو بارەیەوە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر کراوە ئاخۆ عەقڵی مرۆڤ بەبێ کاریگەری (هەست- دەوروبەر-فاکتەری دەرەکی) کارو داهێنان بکاو زانیاری نوێ لە زانیاریەکانی دەوروبەری زیاد بکا، لە ڕووی

[1] کارل مارکس-بؤس الفلسفة ص163-
[2] ج بليخانؤف- تطور نظرة الواحدية الى التاريخ ص127

ئەكادیمیـــەوە پـــیش فەلســـەفە وەڵام درایتـــەوە لەلایـــەن زانایـــان پێیـــان دەووتـــرێ (کۆنسترەکەکان) کە بریتین لە(تچیلمان وڤـاریلا وماتۆریلانـا) لەگـەڵ پرۆفیسـۆری ئەلمانی (گێرهارد رۆس) ووتویانە عەقڵ دەتوانێ زانیاری پەیـدا بکـا بـەبێ هەسـت وکاریگەری واقیعی دەرەکی، لەکۆنەوە ئەو جۆرە زانیاریەی بـەو شـێوەیە دێتـەدی پێی ووتراوە (زانیاری حەدەسـی)، ماوتسـی تـۆنگ دان بـەوە دەنـێ کـە زانیـاری حەدەسی هەیە بەڵام هەستەکان پەیدای دەکەن نەك عەقڵ خۆی،..زۆر جۆرە ڕای تر هەیە، هەڵەی بنچینەی بیرو بۆچوونی فەلسەفەی مادی لەو ڕایەی ئەنجلس دێت کـە دەڵێ (هیچ شتیك لە مێشكمان نابیت ئەگەر لە واقعـدا بـوونی نـەبیت)[1] ئـاوابێ هەرگیز داهێنان و گەشەی نوێ نایەتەدی، لەڕاستیدا عەقڵ لە قۆناغی پیگەیشتنی و چالاكی فاكتەری ناوەكی دەتوانی لە جیاتی ئەو ئیعتمادە زۆرەی سەر (هەسـت و واقیع وفاكتەری دەرەكی) عەقڵ خۆی بجولێنێ، بەوەی عـەقڵ (زاكـیرە-بـیر)ی بـۆ دروست دەبـێ، لەوسـاتانەی عـەقڵ پەتیانە(نسـبیەن) بیردەكاتـەوە بـێ فاكتـەری دەركی(هەست و واقیع) ئەوا (زاكیرە —بیر) ئەو ڕۆڵە دەبینی، ئەو زانیاریانـەی لـە زاكیرە تۆمار كراوە دەبێتە مادەی بیركردنەوە و(بەدیلی هەسـت و واقیـع) ئـالێرەدا داهێنان دەخولقێ، جا ئەو داهێنانە هەر زانیاری پەتیە یان زانیاریەكی پراكتیكیـە یان داهێنانیكی تەكنیكیە، بەو جۆرە ئەگەر ئـەو پانتایـە زانیاریـەی مـیرات(A) بیت، ئەوا ئەو داهێنانە($a_1$)، داهێنانی یەكێكی تـر بـە هـەمان شـێوەی پیشـوو با($a_2$)..بێـت، هەریەكـە لـە $a_1$ و$a_2$ ..پانتـایی (A) زیـاد دەكـا دەبێتـە(B)، جارێكی تر ئەوپانتاییەی (B) لە جیاتی پانتایی(A) دەبێتە زانیـاری مـیرات بـۆ عەقلەكانی بەردەست و هەمان پرۆسەی پیشوی بەسەردادێتەوەو لایەكی ماكینـەی گەشەی زیاد بوونی زانیاری دروست دەبێت، لایەكی تریشی بـە هـۆی زمـان وئـال

---

[1] انجلس- دیالكتیك الطبیعة ص311

وگۆڕی زانیاری ڕاستەوخۆ تەواو دەکا، لەهەردوکیشیانەوە ڕەنگ دەداتەوە سەر مەیدانەکانی کۆمەڵایەتی وسیاسی وشارستانی وتەکنۆلۆژی و..تاد، لە کۆتایدا ئامرازو تەکنۆلۆجیادروست دەبێ بۆ کۆنترۆلی سروشت، بەتەواوی لە پۆلەکانی تری گیان لەبەر جیا دەبێتەوە، هەمو ئەوانەش جارێکی تر کار لە عەقلە نوێیەکان دەکەنەوە بە تیکرا جولانی مێژوو دروست دەکەن، **ئەوەیە ماکینەی گەشە.**

ئەو گەشەیەش هەروا کویرانەو بێ ئامانج نابێ وەك هەندێ فەیلەسوف وتەیاری فەلسەفی وای تیگەیشتون، برگسۆن دەڵێ گەشەی سروشت کویرانەو بێ ئامانجە[1]، برگسۆن باس لە گەشەی سروشت دەکا، رەنگە راست بکا چونکە سروشت گۆڕانی تیدایە بەلام گەشەی تیدا نیە، دافید هیۆم زیاتر نزیك دەبێتەوەو دەڵێ: جم وجۆلی عەقلی وکۆمەڵایەتی ناکەویتە مەبەستو یاسای کۆمەڵایەتی[2]، شۆبنهاوەر پێی وایە ئەگەرئیرادەش هەبێ هەر کوێرانەیە، سەرجەم (وجودیەکان) باوەڕیان وایە کە کاری مرۆڤ چالاکی عەقلێ وگەشەی کۆمەڵگە بە یاساو مەبەست نیە، بەڵکو ڕەمەکی وکویرانەیە، بەشێکیش ئەگەر دان بە مەبەست بهینن ئەوا نایدەنە پال عەقل، فەیلەسوفانی ئەلمانی فیۆرباخ(1804-1872) ومۆلیشنگ(1822-1893) بۆخنر(1824-1899) وکارل فۆجت(1817-1895)لە پیش هەمویان پێیان وابوو عەقلێ گرنگ نیە بەڵکو حەتمی زالە[3]، کە لەدوای (حتمیەی تاریخی) شیوعیەت و حەتمیەی سەرمایەداری(هندگتۆن)ی لیهاتە دی، لەڕاستیدا وانیە، ئەو جم و جۆل و گەشەیە ئامانجدارەو ڕێڕەوێکی یاسایی وەردەگرێ..چۆن؟ دەبێ بۆی بگەڕێینەوە سەرچاوە، لە گەشەی عەقلێ بیدۆزینەوە ئاخۆ لە کێ لەگەشەی ڕەمەکی وەردەچەرخێ بۆ گەشەی مەبەستدار، ڕێك لەوە دەبێتە مەبەستدار کاتێ عەقلێ

---

[1] مدخل الى الفلسفة ص262
[2] الفلسفة والفيزياء ج1ص88
[3] بوشنسكي- الفلسفة المعاصرة في أوروبا ص29 وص50

دەتوانێ ئیجابی لەسەلبی لیك جیا بکاتەوە، چاك لـەخراپ، سـپی لـە ڕەش، زۆر لەکەم، جـوان لەناشـرین،...جیا بکاتـەوە، بـە جۆرێـك گەشـە بـە ئیجـابی دەداو سەلبیش تەسـك دەکاتـەوە، لـەوەوە پرۆسـەکە پیشـکەوتن وەردەگـری و گەشـەی کۆمەڵگە ئامانجدار دەردەچێ، دەشبیتە هۆی گەشـەی کۆمـەڵگـە لـە خـوارەوە بـۆ سەروو.

هەر لێرەوەش مانای ڕۆلی فاکتـەری نـاوەکی دەردەخـا کەبەرەبـەرە ئـەو ڕۆڵـە گرنگە لە فاکتەری دەرەوە دەستێنێتەوە، واچاکەبەو بۆنـەوە هەڵوەسـتەیەك لەسـەر هەردوو مەدرەسەی مـادی ومیسـالی بکـەین دژ بەیـەك بـوون لـەبارەی گەشـەی عەقڵی، فەلسەفەی مادی نکوڵی لـە ڕۆڵـی نـاوەخۆو ئیمکانیـەتی عـەقڵ دەکـرد ئاواش فەلسەفەی میسالی نکوڵی لە کاریگەری واقع بەسـەر عـەقڵ دەکـا کەچـی هەردوولا بە هەڵەدا چووینە، هەریەکە لە قۆناغێك بۆچوونەکەیان ڕاستە، بۆچـوونی مادییەکان تەنها بۆ قۆناغی عـەقڵی سـەرەتایی نزیکـە لـە ڕاسـتی، بـۆ قۆنـاغی پیگەیشتوو نابیت، بە هەمان شیوە بۆچـوونی میسـالی بـۆ قۆنـاغی پیگەیشـتوو نزیکە لە ڕاستی نەك سەرەتایی، ئەوەی زیاتر کێشـەیە کـۆی بۆچـوونی هـەردوولا یەکتر تەواو ناکاو وەڵامی تەواوی پرسی گەشـەی عـەقڵی پـێ نادرێتـەوە، چـونکە فاکتـەرەکانی دەرەوەو نـاوەوە بـە هەماهـەنگی یـەکتر (نـەك بـە ئینقلابـی) کاریگەریـەکانیان ئـالو گـۆڕ دەکـەن، گەشـەو داهێنـانی عـەقلیش لـە قۆنـاغی پیگەیشتوو دەست پێ دەکـا نـەك لەسـەرەتایی، بـەپێی فەلسـەفەی مـادی بوایـە هەرگیز گەشـە وپیشـکەوتن نـەدەبوو نـە بزوتنـەوەی مێـژووش مانـای دەماونـە پێویستیشمان بە پەیام وپەیامهێنەریش دەبوو، ئـەوکاتی ڕاسـت دەردەچـوو مـرۆڤ بەشیك دەبوو لەسروشت بە (مسەیەریشەوە).

لەوەوە زیاتر ڕوون بۆوە کە سەرچـاوەی بـەرپاکردنی شارسـتانی عەقلـە ئینجـا فاکتـەرەکانی تـریش بەشـداری دەکـەن ،بـەلام هـەمو عـەقلیك نیـە عەقلـە

ئەکتیڤەکانن،عــەقل وەك یــەك بەهــەموان دراوە بــەلام بەشــی هــەرە زۆری باشــی بــەکارناهێنیێ ،بۆیــە کتیبــە ئاسمانیــەکان زۆر داوای بــەکارهینانی عــەقلی دەکــا ،ئەوانەی بەکاری دەهێنن کەمایەتین ،لەوەوە ئەفلاتون گەیشتۆتە جۆرە بۆچــونیکی تــر ودەلێــت: شــاوئیمپراتۆرەکان عــەقلیان زالــە بەســەر ئارەزوەکانیــان ،هەرچــی هاوولاتیە ئەوا پیچەوانە ئارەزووی زالە بەسەر عەقلی ،ئەوەیان تــەواو ڕاســت نیــە ،ئەگــەر وابێــت شــاو ئیمپراتۆرەکــان بــە مــیرات عــەقلیان بــۆ بــەجیماوە ،کــە وانیە،هەرلەوەشەوە جۆرە (سلم الترتيب)یك دروست دەبــێ لــە نێــوان بــەکارهینانی عــەقل وبــازو جیــاوازە لەگــەل دیزاینیکــی تــری (ســلم الترتیــب)ی ئیمــەلیرە دەیکێشین،ئەویش ئەوەیە ،لە ڕاستیدا بۆ هەمو کاریکی بەرهەمدار 3 لا بەشــدارن (عەقل —بازوو-ئامراز) ،سیگۆشەی (سلم الترتيب)ەکە لــەوە ریکــدەخرێ ،چــەندە زیاتر عەقل بــەکاردەهێنرێ ،ئەوەنــدە زیــاتر شارســتانی بــەرپا دەبێــت و گەشــەی کۆمەلایــەتی ڕوودەدا،عــەقلیش بەرجەســتەی ماکینــە بــوونی خــۆی دەکا،ئینجــا ئامرازو بازوو،هــەر بەوشــێوەش کۆمەلگــە دابــەش دەبێــت لــەنێوان زانــاو نــەزان ،وباقیەکەی تریش بە گویرەی بەکارهینانی عەقل وبازوو دابەش دەبن لەو نێوانە .

# عەقڵ وڕاستی.. فەلسەفەی پەیام

ئیستا وا گەیشتینە لیواری وەڵامی پرسە گرنگەکان لەو بابەتە، ڕوون بۆوە چەندە مرۆڤ (مخەیرە) و دروستکەری کردەوەکانیەتی بە هۆی عەقڵی، ئەوەش لە دوای تەفاعولی لەگەڵ کۆمەڵێك فاکتەری کۆمەڵایەتی وسیاسی وئابوری وجنسی ودەرونی و.. بزوتنەوەی مێژوو دروست دەکا، واتە لەکۆتایدا دروستکەری مێژوو مرۆڤ خۆیەتی نەك ئابوری وجنس وژینگە و..ئەگەر چی هەریەکە لەوانەش رۆلی خۆی هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە مرۆڤ بە ئازادی مێژوو دروست دەکا کەچی لە تێکڕادا جۆرێك لە یاساو قاوغداری بۆ گەشەی مێژوو دروست دەبێ وەك (مەندل) هەستی پیکرد، لە چوارچێوەی ئەو دوو ڕێسایەی گۆڕانی فاکتەری دەرەکی وناوەکی بۆ سیستەمی گەشەکردن، زۆر بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوێ کەسەرەتای گەشەی عەقڵی ولەویشەوە گەشەی کۆمەلگا پێویستی بە فاکتەری دەرەکی زۆر بە خەستی هەیە، لەوەوە زەمینەی فەلسەفی وعەقڵی بۆ هاتنی پبغمبەران دروست دەبێ، هەرلێرەوەش عەقڵ وفەلسەفەو پەیام پیك دەگەن وڕاستیە گەورەکە ئاشکرا دەکەن، پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی عەقڵ بەو گەورەییە وەسف کرا کەچی ناتوانێ بەتەنها رۆلی پەیام وپەیامبەران ببینی ؟ واتە نابتە تاکە (حوجە)، وەك ئیمامی علی دەڵێ: (ان لله على الناس حجّتَيْنْ: حجةً ظاهرةً وحجةً باطنةً، فأما الظاهرة فالرسول والأنبياء، وأما الباطنة فالعقول)[1] لەسەدەی پینجەمی کۆچیەوە پەیوەندی عەقڵ ونەقل وا دارڕژراوە: لله عز و جل الى خلقه رسولان : أحدهما : من الباطن وهو العقل , والثاني : من الظاهر وهو الرسول , ولا سبيل لاحد الى الانتفاع بالرسول

[1] ئەوە لە هەندی شوین بە فەرمودە هاتوە، بەلام زیاتردراوەتە پال ئیمام علی، هەرچی (اصول الكافي ج1ص16) دایتیە پال ئیمام جعفر الصادق و لە ریزی انبیا (ائمە)شی زیاد کراوە.

الظاهر ما لم يتقدمه الانتفاع بالباطن, فالباطن يعرف صحة دعوى الظاهر ولولاه لما كانت تلزم الحجة بقوله , و لهذا احال الله من يشكك في وحدانيته وصحة نبوة انبيائه على العقل , فأمره ان يفزع اليه في معرفة صحتها , فالعقل قائد والدين مدد , ولو لم يكن العقل لم يكن الدين باقيا ولو لم يكن الدين لاصبح العقل حائرا و اجتماعهما كما قال تعالى: نورعلى نور، ئەشاعیرەکانیش شیوەیەکی وایان ووتوە: "رسولان أحدهما : من الباطن و هو العقل , والثاني: من الظاهروهوالرسول، کەواتە هەردووکیان پێویستن، بەپێچەوانەی ڕایەکی ئەهلی شیعە کە وا هاتوە :(يا آدم إني أمرت أن أخيرك واحدة من ثلاث فاخترها ودع اثنتين. فقال له آدم يا جبرائيل ما الثلاث ؟ فقال : العقل والحياة والدين. فقال آدم إني اخترت العقل. فقال جبريل للحياة والدين : انصرفا ودعاه. فقالا : يا جبريل إنا أمرنا أن نكون مع العقل حيث كان )[1]، سەرەڕای هەمو ئەو وەسفانەش وادیارە عەقڵ بە ئاسانی ناتوانی زانیاریە ڕاستیەکان بدۆزیتە، پێویستی بە پەیام دەبێت چونکە لە ژیر کاریگەری ڕای دەستەجەمعی وتەسك بینی وسەرچیخی و هەمەلایەن نەبین و زۆر لای تری وەك:

1- هەریەکە لە ئیبن روشد وئیبن سینا ورازی بە جۆریك وسعیدنەوڕەسی ولەدوایشدا سید قوتب بوونەوەریان بە (قرأن المنظور) وقورئانیشیان بە (كون المقروء) وەسف کردوە، واتە لە دۆزینەوەکانی بونەوەر دەتوانی ئەوەی لە قورئان هاتوە بەرەبەرە بیدۆزیەوە، ئەوەیان ڕاستە بەڵام بەو تەمەنە کورتەی مرۆڤ وعەقڵ وبەو هەمو گەورەییەی بونەوەر ناتوانرێ ئاوا گەردوون بخوێنیەوەو بە (پەیڕەو)کردنیشی ڕابگەی، پەیامی خودا لە کتێبیکی بچوك لەبەردەستدایە دەتوانی تێی بگەی وپەیڕەویشی بکەی.

---

[1] اصول الكافي ج1 ص 58

2- عەقلّ دەتوانیّ ڕاستەوخۆ لە واقیع بگا بەلاّم بە درەنگەوە دەتوانیّ ڕاستی بدۆزیتەوە، دوای دۆزینەوەشی ڕاستی وبەرژەوەندی لیّ تیکەل دەبیّ، ناتوانیّ بێلایەنانە بیّت لە حوکم وهەلّوێست وبۆچوندا.

3-لەبەر ئەوەی خۆ ویستی زۆر کاریگەرە بەسەر عەقلّ ناتوانین عەقلّ وەك ئامرازی جیاکردنەوەی هەق وناهەق هەژمار بکەین4-لە پیشوش باسمان کرد دەروازەکانی زانیاری وەرگرتن لەلایەن عەقلەوە دەروازەی سەلامەت نین، هەندی جارهەلّخەلەتینەرن، زۆر بە ئاسانی ولەلایەن هەمو کەسیکی ئاسایی ڕاستیەکان نادۆزرینەوە.

5- سنورداری عەقلّ بۆ تیگەیشتن لە پرسە قوول وچارەنوسسازەکان... بە کورتی زانایان پیّیان وایە عەقلّ تیّکەڵیەکە لە ڕوح ومادە بۆیە ناتوانیّ ڕۆلی پەیام ببینی، بۆ هەمو ئەوانەو بۆ ئەوەی پیوەریّك لەسەرووی عەقلە خۆویستیاویەکان ڕاستی مەوزوعی بپاریزی پیّویست بە پەیامە.

لیّرەوە پیّویست بەوە دەکا بزانین واقیع وڕاستی لیّك جیان، واقیع ئەودیمەنەیە کە بە هەستەکان ویّنەی لە عەقلّ دروست دەکریّ، کاتیّ گولیّکی سور وجوان دەبینین وادەردەکەویّ ناسنامەی ئەو گولە سوورە کەچی ناسنامەی ڕەنگی ئەو گولە شتیّکی ترە، ئەو گولە تەنها ڕەنگی سور وەرناگریّ ودەیداتەوە بەو شیوەیەناسنامەی راستەقینە بە عەقلّی ئاسایی (بەهۆی هەستەوە) بە شپرزەی دیاری کرا، زۆربەی فەیلەسوفان ڕایان وایە کە هەستەکان هەلّخەلەتینەرن ڕاستیەکان بەسەلامەتی ناگوازریتەوە بۆ میّشك، لەوانەی پیّچەوانەن جون دیوی دەلی زیهنمان واقع بە راستی وەردەگریّ[1] واتە هەست هەلّخەلەتاندنی تیدا نیەو واقع و ڕاستی جووت دەبن، کەچی ساغ بوویتەوە هەستەکان هەمو دەم بەسەلامەتی ویّنەکان

[1] جون لویس- مدخل الی الفلسفة ص278

ناتوانن بۆ مێشك نەقل بكەن، لەوەوە ئەو واقیعەی لای عەقڵ دروست دەبێ جووت نابێ لەگەڵ ڕاستی، ئەو جووت نەبوونەش دەكەویتە سەر ئاستی عەقل، ئەو عەقلانەی زیاتر لە ژێر كاریگەری هەستن ئەوا لای ئەوان واقیع وڕاستی لیك دوور ترە، ئەو پۆلە عەقلە زیاتر زانیاریەكانیان (زەناویە)، كەواتە نابتە هەلە ئەگەر بلێین هەر عەقلیك هەرمرۆڤیك واقعیكی كۆمەلایەتی ومێژوویی و سروشتی جیا دەبینی لەگەڵ یەكیكی تر، لەوەوە دەردەكەوێ فرە واقیع هەیە بەلام یەك ڕاستی هەیە، یەكێ لەرۆلەكانی پەیام وپەیامبەران ئەوە دەبێ ئەو خەلەلەی نێوان عەقڵ وڕاستی چاك بكاتەوە، پیغەمبەرانن بەتەنهاعەقڵ ونەقلیان پێكەوە هەلگرتوەو هیچ جۆرە ناكۆكیەكی عەقڵی ونەقلیان نیە، كەواتە عەقڵی دروست و پەیامی ڕاستەقینە تیك ناگیرێن، پەیوەندی نێوان عەقڵ ونەقل دیالكتیكی نیە وەك هەندیك وای بۆچون، فهد عبدالقادر الهتار لە توێژینەوەیەكی ئەكادیمی ئیسلامی زانكۆی سەنعا بەناوی(جدليه العقل والنقل فى الفكر الإسلامى)، لەو سەردیرەو ناوەرۆكی زۆر خراپ بە هەلەداچوە، نێوانی عەقڵ ونەقل(جەدەلی) نیە، بەڵكو دەق (نەقل) چەسپاوەو بەشیكە لە ڕەهەندی دوەمی بونەوەر، ناگۆڕێت ئەوەی دەگۆڕێ عەقلە، ئەگەر وا ڕێكەوت عەقڵ ناكۆك بێت لەگەڵ دەقی دەستكاری نەكراو، ئەوا عەقلە لە دەقەكە نەگەیشتوە، ئەگەر عەقڵ دژ بەدەق بیت ئەوا ئەو عەقلە دژی عەقڵی تریشە پیش ئەوەی دژ بە دەق بێت، بزوتنەوەی عەقڵ بەرەو ڕاستیە بەرەو تەبابیە لەگەڵ دەق، نەك پێچەوانە..بۆیە پەیوەندیان جەدەلی نیە، بەشیك چارەی ئەو كێشەیان بە زال كردنی عەقڵ داوە، هەندیكمان لەوانە پیشوو تر باس كرد ئەهلی كەلام و ئیمام رازی وئیمام محمد عبده تا ڕادەیەك بەو ئاڕستەیە چوینە، ئیمام ابن تیمیە لە كتێبی(درء التعارض..) باشتری بۆچوەو دەڵێ پیش ئەوەی لای عەقڵ بگرین یان نەقل جارێ لەپیشدا بزانین (تعارض) لە نێوان عەقڵی دروست ونەقلی (صريح) هەیە؟ دەڵێ نەخیر، لەو سەردەمەی گەشەی عەقڵ و فەلسەفە ئەو

(تعارضة) یەکجار زۆر کەم بوویتــەوە، چــونکە گەشــەی عــەقڵ وفەلســەفە بــەرەو هینانەدی ڕاستی وپەیام دەدا.

لە سەروو تر گەیشتینە ئەو ئەنجامە ڕوونــە کــە بــە هــۆی (ئامانجــداری کــاری عەقڵی) بزوتنەوەی مێژوو و کۆمەڵگــە گەشــەیەکی پیشــکەوتنانە وەردەگــرێ لــە خوارووڕا بەرەو سەروو، ئەو گەشەیەش هەر ســێ ڕێســای گەشــەی بەســەر پــەیڕەو دەبێ، بۆ کۆمەڵگە ئاوا خورد دەبێتەوە:

1- لەسەرەتای گەشەی مێــژوویی کۆمەڵگــە فاکتــەرەکانی دەرەکی(سروشــت، ژینگە، دەوروبەر، نەریت، ڕابووردوو، بنەمالەیی، ئابوری سروشتی، جــنس، کۆمەڵایەتی..باقی کاریگەریە ستونیەکانی بەدەر لە کۆمەڵگە) زۆر زال بوو بەسەر چالاکی تاك وکۆ، تاکیش دیلی کۆمەڵگەی بچوك بوو.

2- لەو قۆناغە جولەی مێژوو زۆر هیواش وسست دەبێ، بەرەبەرە خــێرا دەبــێ لەگەڵ چالاك بوونی فاکتەرە ناوەکیەکانی.

3- بەرەرە کاری کۆمەڵگە لە کاری ماسولکەی سادە وەردەچــەرخێ بــۆ کــاری عەقڵی و وەرچەرخانی کۆمەڵگە لە ژێر کاریگەری فاکتــەرە ســتونیەکان بــۆ ئاسۆییەکان.

4- پەیوەندی جارانی کۆمەڵ(لەسەردەمی ماسولکە)لەگەڵ سروشت راســتەوخۆ بوو، بەڵام لــە دوای گەشەو(ســەردەمی عــەقل) ئــەو پەیوەندیــە ڕاســتەوخۆ نامینیت، ئامێر و ئامراز(تکنۆلۆجیا)دەکەویتە نێوانیان، لە ئەنجامدا زیــاتر کۆنترۆڵی سروشت دەکا، ئەوەش مانــای ســیفەتی بــوونی مــرۆڤ بە(خلیفــە) لەسەر زەوی، تەنها سەر زەوی، ویچووی پەیوەندی یەزدان بە بوونــەوەرە کــە ڕاستەوخۆ نیە، بەڵکو لەڕێی (ئامرازی)یاساکانی سروشتە(کە لە قورئان بــە زاراوەی ـــامر-گوزارشی کردوە)، ئاواش مانای(خلیفە)ایەتی مــرۆڤ ئەوەیــە کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ سروشت کارنەکا بەڵکو لە ڕێــی ئــامراز، لەگــەڵ زیــاد

بوونی ئامراز زیاتر کۆنترۆلی سروشت دەکاو ڕەت دەبێ لە هەمو پۆلەکانی ژیان، بەڵام هەرگیز ناگاتە کۆنترۆلی تەواوکە تەنها لەتوانای خودایە، ڕێك ئەوسنورە بریتیە لەمەداو مەودای شارستانی مرۆڤ کە پەیامی مرۆڤە لە بونەوەر.

5- لە هەمو بارەکان رۆڵی فاکتەرەدەرەکی وناوەکی لە پلەی پێویست کەم تر نابیتەوە.

لەو ریسایانەی سەروو (گەشەی مێژوویی کۆمەڵگە) چەند ڕاستیەکی گرنگ وەك ئەنجام دەدەنەدەست :

1- لە چوارچیوەی پێویستی گەشەی کۆمەڵگە وکردنەوەی عەقڵی تاك وکۆ پێویستی بە فاکتەری دەرەکی پەیام و پەیامبەری وا هەبوە کە هەم مرۆڤ بن و هەم پێغەمبەریش، واتە ئەو فاکتەرە دەرەکی بێت وەك پێغەمبەر ناوەکیش بێت وەك مرۆڤ ڕەهەندی یەکەم بن وەك مرۆڤ و ڕەهەندی دوەم بن وەك پێغەمبەر، ئەوەش وادەخوازێ یەکەم کەس لەسەر ئەو زەویە هەم مرۆڤ بیت هەم پێغەمبەر.

2- ئەو پەیامە لەسەرەتا بە ژمارەیەکی زۆری پێغەمبەران پێویستە وەك فاکتەری دەرەکی، بەرەبەرە لەگەڵ کەم بوونەوەی ئیعتمادی گەشەی کۆمەڵگە لەسەر فاکتەری دەرەکی ئەوا ژمارەی پێغەمبەرەکان بەرەبەرە کەم دەبێتەوە.

3- گەشەی کۆمەڵگە دەگاتە ئاستێك کە فاکتەرە ناوەکیەکان گەیشتونە ئەو قۆناغەی کە خود ڕەو بن، پێویستی بە هاتنی پێغەمبەران کەم دەبێتەوە، سنوورێك بۆ هاتنی پێغەمبەران لە قۆناغێکی گەشەسەندووی کۆمەڵگە دێت.

ئەو زانیاری وشریعەتانەی پێغەمبەرەکانی سەرەتای جیایە لەوەی کە لەدوا

قۆناغی گەشەی کۆمەڵگە دێت، لـەوەوە هیگـڵ بەهەڵەداچـوو کـە ووتـی هـاتنی پێیغمبەران وئاینی جوداجودا گوزارشە لە گەشەی بیروڕا لە سەردەمی جیـا[1]، دوای ئەویش فەلسەفەی مارکسی هەمان هەڵەی کرد کە ئـاینی لەگـەڵ فکروفەلسـەفەو زانست ونەریت ڕێز کرد لە (سەرخان) ووتی ژێرخانی ئەوانە ئابوریەو هەر گۆڕانێـك لەو ژێرخانە گۆڕان بەدوای خۆی دەهێنێ لەسەر خان (زانست، ئابووری، سیاسـەت، فەرهەنگ، ئایین)، نەخێر گۆڕانی ئاین پەیوەستە بە قۆناغەکانی کۆمەڵگە، کـەواتا هاتنی دوا پێغەمبەر دەبێ کۆمەڵگە گەشتبێتە قۆناغێکی عەولـەمی سـەرەتایی، هەڵبەتە لەسەردەمی (ح.عیسی) نەگەیشتبویٚ، بۆیە دەبێ پێغەمبـەری تـر بێـت، لەو ساتە مێژووییە تەنها پێویسـت بـە دوا پـەیام وپێغەمبـەر دەمێنـێ، ئـەوەش بنچینەی مانای(خاتم الأنبياء)ە وزەمینەی فەلسەفی ئـاینی ئیسـلامە، بـەڵام لـە هەمو بارەکـان چـۆن پێویسـتی بـە فاکتـەری دەرەکـی دەمێنـێ ئـاواش گەشـەی کۆمەڵگە پێویستی بـە پـەیام دەمینـێ، چـونکە لـە ڕووی واقعیشـەوە (گەشـەی عەقلیش) پێویستی بە فاکتەری دەرەکی هەیە بۆیە حوکمی عەقڵ بە تەنها ناتوانێ ڕابەرایەتی و پیشڕەوایەتی گەشەی کۆمەڵگە بکـا، بۆیـە پـەیامی ئـاینی ئیسـلام بەکار دەبێ تا کۆتایی گەشەی کۆمەڵگە، ئەوزانیاریانەی سەرووپاڵپشت بە زانیاری مێژوو نیە، بەڵکو پاڵپشت بە ڕیساکانی گەشەکردنە کە لە پیشوو تۆمارمان کـرد، (نور على النور) کە زانیاری مێـژووش هـەروادەڵێ، واتـە بەڵگـەی هـاتنی پـەیام وپەیامبەران هەر لە ڕێی زانستی مێژوو وخودی پەیامەکان قەتیس نابێت، ئـەوەتا لە ڕێی یاساکانی فەلسەفە هەمان ڕاستی دەدۆزرێتەوە.

لەو پەیوەندیەی عەقڵ وپەیام ئەگەر بە ئەندازەی خۆی ڕێك نـەخرێ ئـەوا یـان گومان دروست دەکا یان دووچـاری پـەڕەگری دەبـێ، وەك لـە سیسـتەمی مـەزنی

[1] مارکسية القرن العشرين ص153

دووڕەهەندی کەمێکمان باس کرد، کە ڕۆلی عەقڵ ومرۆڤ کارلەسەر ڕەهەندی یەکەم (مادە-خلق-..) دەکاو بەهۆی ڕەهەندی دوەم(یاسا-پەیام-هۆ..)، ڕێکخستنی پەیوەندی عەقڵ ونەقل ئالێرەیەکاری عەقڵ گۆڕینی رەهەندی دوەم نیە وناشگۆڕێ، تەنها کاری ئەو گۆڕینی ڕەهەندی یەکەمە، ئەوانەی پێیان وایە ئەو سنورەنیە لەنێوان (عەقڵ ویاساو پەیام-نقل) ئەوا سیستەمی عەلمانی لێ دروست دەبێ کەبناغەکەی لەگومان لەڕاستی ڕەهەندی دوەمە، کە لەبڕگەی داهاتوو باسی دەکەین.

## عەقڵ وگومان

فلسفەی گومان زۆر کۆنە ،هەندیك دەیگێڕنەوە بۆ سەفسەتیەکان وسەردەمی یۆنان ،بەلام زۆر لەپیش ئەوانە هەبوە ،بەتایبەتی گومان لە ڕاستی پیغمبەرەکان ،باس لەپیرهۆی راویژکاری ئەسکەندەری مەقدۆنی دەکرێکە بەناوبانگ بوە لە جەنە گوماناویەکانی،دوای دیکارت دێت،دوای16گومانەکەی (دیڤید هیۆم)دێت لەبارەی خوداو سروشت ومرۆڤ .

گومانی سەلبی لە ئاستی بیری فەلسەفی هەتا لەسەر ئاستی ژیانی ڕۆژانە ناگاتە دلنیایی لە هیچ ڕوویەکەوە، نەشیانتوانیوە بگەنە ئاستی پەیڕەوی وپیادەیی، سەرچاوەی گومانی ئادەمیزاد بەرامبەر خودا وئاین لەوە دێت خودا بەرجەستە نیە، هەست پێکراو نیە بەشێوەی ڕاستەوخۆ، ئەنجامەکانی دەماودەست نیە، بۆیە کەمێك لە (خۆبایی) عەقڵ بەرەو گومان دەچێت، بۆیە بە پێچەوانەی بیری مارکسی وهمنگوایی ئەبوعەلامعری وهوایتهید و ئەنجلس و ستاندال..کە دەڵێن ئایندارى عەقلیکی لەنگ ودواکەوتوویی دەوێ..وانیەلە ڕاستیدا پێچەوانەی راستە ئەگەر ئاین بەکەلتور نەمابوایە ئەوە خەڵکی ڕەشۆکی وعەقلە بێهیزەکان

مولحید دەبوون نەك ئایندار چونکە عەقڵی سەرەتایی وادەبینی ئەو سروشتە بە یاسا دەڕواو ئاسەواری خوای پێ نادۆزریتەوە، زانست وپرۆسەیەکی عەقڵی باشی دەوێ کە ئاسەوارەکانی خوا لەو بوونەوەرە ببینیتەوەو باوەڕدار بێت، کەواتە مولحیدی وبێ باوەڕی لە عەقڵی لەنگ وناکامل سەر هەلدەدا، لەو ڕەگ وڕیشە عەقلیە ڕاڕەوی گومان(مذهب الشك)یان دروست کردوە، بەشێکیش مەزهەبی (نازانم)ی سەلبی..، لە مێژووی فەلسەفە دەگوترێ یەکەم مەدرەسەی گومانی بیرۆنیە (365 – 275 پ ز) لە یونان دروست بوە[1]، دوای جارێکی تر لە سەدەی 16 هاتەوە کایەوە، بەشێکیش پێیان وایە گومان لای هەمو بیریاریك هەیە هەتا لای پێغەمبەرەکان هەبووە کە خۆی لە پرسیارەکەی (ح.ئیبراهیم) گوزارش دەکا ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾[2]، اخوان الصفا دەڵێن (مؤمن ومسلم) لەوەی لیك جیان موسلیم گومانی ماوە[3]، بەشە ئیجابیەکەی لەچوارچێوەی (تیۆری مەعریفە) گومان پانتاییەکی بەهێز لە بزوێنەری زانیاری دروست دەکات، وادەکات زیاتر لە بابەت و زانیاریەکانیش قووڵببێنەوە و لە کۆتاییدا پرۆسەیەکی ئیجابی دروست دەکات (بەتایبەتی ئەو گومانانەی بەنیازی دڵنیایی بەرپادەکرێت)، بەشیکە لە پالنەر بۆ قوول بوونەوەو توێژینەوەی زیاتر،بۆیە لای باوەڕداریش جۆرە پرۆگرامیك بوە دەووترێ ئیمامی غەزالی زیاتر خاوەنی الشك اساس اليقين)بوە ،ئینجا گەیشتۆتە دیکارت،ئەویش لە کارەزانستیەکانیشی تەنها بەبێ گومان بۆ بیرکاری چوەو ووتویەتی ئەکزیۆمەکانی دیارن وئەوپرۆسانەی سەروی ئەوانەش بریتین لەهەنگاوی

---

[1] د.عدنان على رضا النحوى- المسلمون بين العلمانية وحقوق الأنيسان الوضعية، ط 1 1997م، دارالنحوى للنشر-رياض ص 31- 32

[2] سورة البقرة-اية260

[3] من رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء رسالة رقم:3ص375

سەلمینەری دیار، لەوانی ترگومانی هەبوە، لەبواری فەلسەفی لەبیرکردنەوە دەستی پێ کردوە، ووتویەتی مادام وامن بیردەکەمەوە کەواتە هەم، فیختەش وەك دیکارت بە(خۆم)دەستی پێ کردوە، عادەتەن ئەو جۆرە پرۆسەیە لە گومانەوە بەرەو دلنیای مسۆگەری(یەقینی) دەڕوات، هەروەك زۆربەی کارەکانی دیکارت وابوە، بەگشتی ڕەوتی فەلسەفی هەرتاکیك لەو جیهانە بەچەند قۆناغیك تێدەپەڕێ، لەسەرەتای بیری فەلسەفی جۆرە یاخیەك بەخۆ دەبینی لە نەریتە چەسپاوەکانی ئاینی وکەلتوری دەوروبەری، دوای گومان لە زۆربەی پیرۆزیونەریتەکانیان دەکا، دوای زیاتر گەشەی بیری گومانەکانی دەبێتە (یقین)، ئەو قۆناغەی یقین تەمەنی کورتەوزۆر دیاردەی شازلەو یقینە لە سروشت و کۆمەڵگەکەی دەبینی وادەکا گومانی لیبکاتەوە، دوای قوول بوونەوەی فەلسەفی زیاتر ئەو گومانەی دەبێتەوە یقین، ئەو جارە یەقینەکەی وەك کۆمەڵگە نیە بەڵکو پالپشتکراوە بە زانست وفەلسەفەو عەقلانی، یان وەك ڕایەکەی ئاینشتاین ئاینێکی چاوساغ، ئەگەر ئەو پرۆسانە بە هاوکێشە گوزارش بکەین دەبینین قۆناغەکانی بیری فەلسەفی تاك لەتەمەنی خۆی بەو قۆناغە تیدەپەڕێ :

1-یاخی 2-گومان 3-یەقین لەو گومانە

4-گومان لەو یەقینە نوێیە 5- یەقینێکی تر...*

دەکرێ مرۆڤ بەو قۆناغانە نەڕوا یەکسەر باوەڕ وەرگرێ بە یەقینی بەلام زۆربەی ئەو پۆلە بەشەریە لەوانە دەبێت کە ناتوانێ مەبەستی ئاین جیبەجێ بکا کەبریتیە لە بەرپاکردنی شارستانی ،زۆربەی جار بەرەو (عابد)یك دەچی کە دنیا تەرك دەکا،لەکونجیکی ئەشکەوت زیکری خودا دەکا ،کەچی عابدی ڕاستەقینە ئەوەیە

* تەنها لەو پرۆسانە کەمێك لە تیۆرەکەی (هیگل و ئەنجلس) نزیك دەبینەوە کە ناونرا (سێ کوچکەی هیگل) و هەنگاوی تریش (نفی النفی).

چـەندە بەرهـەمی عـەقلی وتكنیكـی وشارسـتانیت بـەرپا كـردوه ،چـەندە ئـەو بەرهەمەشت بە دادگەریانە بۆ كۆمەلگە بەرجەستە كردوه .

لەو پینج قۆناغەی سەروو ،قۆناغی یەكەم هەمو جـۆرە بزوتنەوەیـەكی عـەقڵی دەگریتەوە، هەر تەنها زانیاری پەیدابكەی ئەو دیاردە ڕوودەدا، زانیـاری فەلسـەفی سەرەتا گومان دروست دەكا، لەو قۆناغە عەقڵ ونەقل تەبا نابن، لـەوەوە زانایـەك ووتویەتی فەلسەفە دەریایەكە پێچەوانەی دەریایەكانی تر لە لیوارەكانی دەخنكێـی نەك لە ناوەندو قوولاییەكەی، فرنسیس بیكۆن(فەیلەسوفی ئینگلیزی سـەدەی 16) زیاتر ڕوونی كردۆتەوەو دەڵێ كەمێك لە فەلسەفەلەخوات دووردەخاتەوە، زۆریەكەی لەخوات نزیك دەكاتەوە، لەوەوە (یوحناسكوت -سەدەی 9) دەڵێ: دەمـەوی فێـرە زانست و فەلسەفە بم تا باوەڕم بـەهێز بێـت[1]، لـە قورئـانیش زۆر داوای زانسـت و زانیاریو حیكمەی كردوە، داوای بیركردنەوە لە بوونەوەر وئاسمان وزەوی..كردوە تـا باوەڕ بـە هێـز بیـت، بەوانەعقیـدە بـە هیـز دەبێ(ئیمـان وئیسـلام) (ئـەعرابی و زانا)..بەوە جیادەكریتەوە، وەك ئیبن روشد ولەرسالەكانی ئیخوان سفاش واهاتوە:

كۆمەڵگە سێ بەشە:

1- ڕەمەكیەكە تەنها نویژو رۆژی وئەركە سەرەتاییەكانیان پێ دەكرێ.

2-ناوەندیەكان هەندی تیگەیشتنی ئاینی پێ دەكرێ.

3-تایبەتیەكان ئەوانە(راسخون فی العلم)ن دەگەنە هـەمو ئاسـتێكی زانسـتی وفەلسەفی[2].

لێرە مانای ئایەتی ﴿وَاعْبُـدْ رَبَّـكَ حَتَّـى يَأْتِيَـكَ الْـيَقِينُ﴾[3]دەردەكـەوێ كـەماناو مەبەستی چیە، هیچ كەس یەقینی تەواوی نایەت هەتا نەگاتە قۆناغی پینج (لە 5

[1] مدخل الى الفلسفة ص84
[2] من رسائل اخوان الصفاء..رقم:37 ص124
[3] سورة الحجر-اية99

قۆناغەکەی سەروو)کە لەزانست وفەلسەفەو فکرو ئاین تەواو تواپیتەوە،، ئەو کاتی دەگاتە نزیك پلەی پێغەمبەرایەتی، لە مخیری وەردەچەرخیٚ بۆ مسیری وجبری، بەو مەنهەجە عقیدەیەی دەخویندریٚ وبینیومانە ناگەیە ئەو پلەیە، بۆیە (عیبادەت) بەردەوامە، هەرچی پابەند بەو مەنهەجەش نەبیٚ ئەواهەربە یقین ناگات، کەواتە دەتوانین بلێین فەیلەسوف وڕەوشەنبیرە مولحیدەکان لە لیوار خنکاون زۆریان لە فەلسەفە نەزانیوە تەنها گەیشتونە قۆناغی دوو وسیٚ، لەڕاستیدا ئەوانەعەقلیان گەورە بوە ئێمە ناتوانین ڕەخنەیان لیبگرین بەو عەقلە بچووکەی خۆمان، بەلاّم ئەوان ئەو عەقلە گەورەیان بە مەنهەج وپالپشت بەپەیام نەبوە کەڕێی دوورت بۆ نزیك دەکاتەوەومەنهەجێکی دروستت بۆدیاری دەکا، لەوەوە لە لیوارەکان خنکاون زۆربەشیان کەوتونە بەردەستی دەسەلاتیکی زۆردار بەکاری هیناون، لەو ڕێسایەناتوانین بلیین بەتەواوی کارل مارکس وفریدریك ئەنجلسی دەگریتەوە، بەلاّم مارکسیەکانی دوای خۆیان دەگریتەوە.

ئەو قۆناغانەی سەروو بۆ ڕەوت وتەمەنی فەلسەفی تاك بەسەر تەمەنی کۆمەڵگەش پیادەدەبیٚ، هەروەك ئادەمیزاد لەو سەردەمەدا بەقۆناغەکانی (یاخی -گومان-یەقین لەو گومانە-گومان لەو یەقینە نوێیە- یەقینێکی تر )، مێژووی گەشەی فەلسەفەوزانستیش هەر بەو قۆناغانەدا ڕۆیشت، لەسەرەتادا ئاین وزانیاری لەڕێی پەیامەوە هاتوە، لەگەڵ دورکەوتنەوەی کۆمەڵگە لە سەرچاوەی پەیام بە خیرایی دەهاتنەوەسەر نەریتی کۆمەلاّیەتی وکۆمەڵگەیەکی ستونی کۆتداری وادروست دەبوو زۆر بە زەحمەت گۆڕانی قەبوول بوو، بۆیە ئەو قۆناغەی سەرەتای زۆر دورودرێژبوو، ئایین ونەریت وکەلتوریان نارێك بوو لەگەڵ فەلسەفەوزانست، بۆیە زانست لەسەردەمی (تنویر) و شۆڕشی پیشەشازی فکری.. گومانی لەو واقیعە ئاینیە کرد کە باڵی کێشابوو بەسەر جیهان، بەهاتنی قوتابخانەکانی مارکسیزم —داورین- فرۆید- زانستی سەردەم گەیشتە (یقین مولحید)، ئینجا

دوایی فیزیاوزانستە سروشتیەکان پێش هەموو زانستەکان گومانی لـەو (یەقینـە ) کردووە، ئێستا قۆناغی زانست لە گواستنەوەیە لە (گومان لەیەقین مولحیـدی) بـۆ (یقین ئیمان)، بەشێکی زۆر لە زاناو فەیلەسـوفان کـەزادەی قۆنـاغی سـێیەمن لـە قۆناغەکانی (گومان) کۆمەڵێك تیۆری فەلسەفی وزانستیان لـەبارەی قۆناغـەکانی کۆمەڵگە بەهەلەیی دارشت، هەندیکی لیٚ هەلدەبژێرین:

مارکسیەت: درندایەتی-بەندایەتی- دەرەبەگی- سەرمایەداری- سۆشیالیسـتی زانستی- شیوعیەت(ئاین نامینی).

-ئۆگست کۆنت: لاهوتی- میتافیزیکی- زانست[1]

-فریزەر: جادوو- ئایین- زانست

ابن خلدون: بداوە- خێڵەکی- دەوڵەت.

تۆینبی: هاتنەکایەوە- گەشە- دارووخان- پارچە پارچە بوون- وێران

تەتەوریەکان: درندانەیەتی- خێڵەکی- ئیمبراتۆریەتی- پادشایەتی- کۆماری.

کورندیسە: قۆناغی سروشتی-بەخیوکردن-کشـت وکـال-یـەکخوایی مسـیحی-پیشەسازی-کۆتایی مێژوو دەبینین زۆربەیان ئەو قۆناغانە لە ئاینی بەرەو بیٚ ئاینی دیزاین کردوە، ئاین وزانست وفەلسەفەیان بـە پێچـەوانەی یـەکتر دانـاوە، دەکـریٚ هەندیٚ ئاین وابن بەڵام گشتی نیە، شۆرشی عەقڵی لە ئەوروپا دژبە دەقی مسیحی بووعەلمانیەتی دروستکرد، لـەجیهانی ئیسـلامی شۆرشـی عـەقڵی دژ بـە هەنـدیٚ لایەنی فقهـە نـەك دەق بۆیـە عەلمانیـەت لاوازدەکـاورابوونی دروسـت کـرد، هـەر لەوەشەوە وەڵامی پرسیارێکی زۆر سەختمان بۆ سانا دەکاوکـە بۆچـی لەسـەردەمی پێغەمبەرانی کۆن دەعـوەو کەسـب ئەوەنـدە قـورس بـوو کەچـی ئیسـتا سـانایە، جـاروابوە پێغەمبـەریك بـە سـال کەسـیکی پـیٚ ئیقنـاع نـەکراوە کەچـی ئیسـتا

---

[1] مارکسیة قرن عشرین ص144

بزوتنەوەیەکی دەعەوی دروست ساڵانە هەزاران کەس ئیقناع دەکا..هۆیەکەی ئـەوە نیە داعی ئیستا عاقڵ تـرو دانـا تـربن لـە پێغەمبـەران بـەڵکو عەقڵـەکانی ئـەو سەردەمە لە قۆناغی سێیەم بەسەرروویەوە، ئاسۆی فەلسەفەی ئـاینی بـەرەو گەشـە دروست کردوە، ئەو دیاردانەی خوارەوەش بەڵگەن:

1- لەو سەردەمەی ئێستادا پرسی گومان لـەخوادا زۆر لاواز بـووە، دەتـوانین بڵێین لەحاڵی حازردا دام و دەزگا و دەوڵەت و کۆمەڵگە نەماوە دڵنیا نەبێت لەبوونی خودا، بەتایبەتی لەدوای ڕووخانی مەدرەسەی شیوعیەت لـەکۆتایی سەدەی (20). زۆربەی ڕەهای وڵاتانی جیهـان لـە دەسـتورەکانیان ئایینـە خواییەکانیان بەفەرمی تۆمـار کـردووە، هەنـدێکی بـە نمونـە وەردەگـرین : دەستوری یونان: لـە هـەردوومادەی (1)و(47)، دانمـارك: مادەکـانی (1، 2)، نـەرویج: مـادە(12)، سـوید: مـادە(4)، کولومبیـا: مـادە(54)، کورسیکا: مادە(66)، سلفادور: مادە(12)، اسبانیا: مـادە(6)، برتغـال: مادە(24)، بارکوای: مادە(3)، أرجنتین: مادە(2)..، زیاتر لەوەش هەندی وولات ئاین وەك مەرجی دەستوری بۆ شاو سەرۆکی وولاتـی دیـاری کـراوە، لەوانە: مادە(4) لە دەسـتوری سـویدی، مـادە(9) ئیسـبانیا[1]...تەنانـەت توکفیل بـە پێچـەوانەی هـوبزو سـپینوزا و..دەڵێ:بـۆ ئـەوەی دەولـەتێکی مودیرن وئاسودە دروست بکەین دەبێ لەگەڵ ئاین ئاشتی بکەنەوە[2]

2- بەشێکی زۆر لـەزانایان ووردتـر لـە کـۆنگرەی (هـەزارەی سـێیەم کەلـە ئەمریکا گرێدرا) ناویان لەو سەدەیە ناوە سەدەی ئایینی.

[1] أ.د. وهبة الزحيلي- فقه الإسلامي وأدلته- ط4 / 2004م، دار الفكر المعاصر- ج8 ص6356-6358

[2] د محمد ناصر- اختاروا إحدى السبيلين الدين او لادينية ص50 (محمد ناسر سەرۆك وەزیرانی ئەندونیسیا بوو)

3- هەندێ ڕاپرسی گرنگ هەڵدەبژێرین، مەوسوعەی بریتانی لە 2001بڵاوی کردەوە کە لەجیهان ڕێژەی2.5 ٪ بە ڕاشکاوانە دەڵێن مولحیدین، ڕاپرسیەکی تری(bbc) لە 2004 لە 10 وولاتی کرد دەرکەوت لە17٪ بێ باوەڕن، ڕاپرسیەکی تری 2005 دەرکەوت زۆرترین گومانـاوی لە فرنسایە دەگاتە19٪، فاینانشیال تایمز لەساڵی2006 بۆی دەرکەوت سوید لەپێش هەمو جیهانە ڕێژەی باوەڕی تەنها15٪یە باقیەکەی تر مولحید نینە تیکەڵن لە گومان ونازانم ومولحیدی.

4- تەنانەت ئەو زاناو فەیلەسوفانەی کەزۆر مولحید بووینە دوو دل بووینە دەبینین هەڵوێستی تریشیان هەبوە لەسەر بوونی خودا: سبنسر خاوەنی تیۆری گەشە دەڵێ: ئەوەی نازانرێ لەو سروشتە هێزێکە لەهەموان پێویست ترە، بێ ئەو وەڵامی فەلسەفیمان نابێت، داروین دەڵێ هیچ لیکدانەوەیەکم بۆ ئەو هەمو بەکتریاومیکرۆبە نیە کە بەجیهان بلاوبووینەوە جگە لەوەی بڵێم ئەوە خوا بلاوی کردوونەوە لە پیناو بەردەوامی ژیان[1].

5- لینین کەزۆر دژ بە ئاین بوو لە توێژینەوەیەکی بە ناوی(الاشتراكیه والدین- 1905 ) دەڵێ نابێ بیری مولحیدی بخریتە بەرنامەی حزبی بلشفی...، روزا لوکسمبورج لە1905 لە نوسینێکی بەناوی(الكنیسه والاشتراكیه)دەڵێ سۆشیالیستە نوێیەکانمان زۆر لە پیاوە ئاینیەکان دلسۆزترن بۆ بنەما ڕەسەنەکانی مسیحی. مکسیم رۆدنسن ئەندامی (م س) حزبی شیوعی فرنسی کتێبێکی بەناوی (الماركسیه والإسلام) نوسی تیایدا باسی نمونەیەکی زۆری ویك چووی ئاینی ئیسلام ودادگەری شیوعیەت کردبوو وداوای کردبوو ئەوسەروەریانەی ئیسلام بۆ بلاوکردنەوەی شیوعیەت

[1] ئەوانە لە (تاریخ فەلسەفە الحیاە) وەرگیراوە.

بەکاربهینن، موریس توریز (سکرتێری حزبی شیوعی فرنسا) لە26تشرینی یەکەم1937 لە گەڵاڵەیەکیدا بە ناوی (الشیوعیون والکاثولیك) دەڵێ هەردوولای مارکسی و مسیحی پەریشانی دەربازی کۆمەڵایەتین بەرەو ژیانیکی ئاسودەی یەکجاری، هەمان ڕاش لەلایەن ئەنجلسەوە لە نوسینێکی بەناوی (نقاط الإلتماس بین تاریخ المسیحیة البدائیة والحرکة العمالیة) دووبارەکراوەتەوە.

6- روجی غارودی وئەنجلس ولینین وزۆری تر پێیان وایە کتێبەکانی پێغەمبەرەکان بریتین لە زانیاری وپیداویستی سەردەمی خۆیان، ڕەنگە بۆ ئەو سەردەم شۆڕشگێر بووبن، وەك ئەنجلس وڕۆجیەغارودی دەڵێن شۆڕشی تۆماس منزیر شۆڕشیکی جوتیارانەی کرد داوای کرد چۆن هەمومان لەبەردەم خودا یەکسانین، پێویستە لەسەر دونیاش یەکسان بین بەرامبەر یاساو داهات[1]، مارکس وئەنجلس لە مانیفیستی شیوعی دەڵێن سەرکەوتنی ئاینی مەسیحی لەکاتی خۆی سەرکەوتن بوو بۆ مێژووش[2]، عبداللە ئۆجەلان سەرۆکی پارتی کریکارانی کوردستان هەمان وەسفی لایەنەکانی وێك چووی ئیسلام ومارکسیەت دەکاو ئیسلام بەشۆڕشگێڕ وەسف دەکا لەسەردەمی خۆی ودەڵێ شۆڕشێکی فیودالی بوە[3]، ئەنجلز زۆر لە مارکس و لینین دژ بە ئاین تر بوو کەچی لەهەندێ توێژینەوەی باسی لایەنە وێکچوەکانی ئاینی وشیوعیەتی کردوەودەڵێ: هەردوولا بزوتنەوەی میلی بوە دژبەزۆرداری، هەردوولا داوای ئازادیان کردوە دژی بەندایەتی بوون،

---

[1] مارکسیە قرن عشرین ص147 وص150 ئەنجلس لە کتێبی (ثورة الفلاحین) باسی هەمان شۆڕشی کردوە.

2 مارکس– انجلس، بیان الشیوعی ص64

[3] عبداللە ئۆجەلان – هەلبژاردە ل21

ئەنجلز دەڵێ جیاوازیەکەیان ئەوەبوە ئاین دەڵێ خۆتان هەلگرن بۆ بەهەشت، سۆشیالیست دەڵێ نەخێر ئێمە لەسەر ئەو دنیایە بەهەشت دروست دەکەین[1]، هەمان ئەو پەرەگرافە مام جلال لە ووتاری گەڕانەوەی ئالای شۆڕش بۆ ناو (ی ن ك) دووبارەی کردەوە، هەر وەلامێکی کورت نەك لەناو ئاینی ئیسلام کە ئەو شریعەتەی بۆ دنیا هاتوە با دروشمی شۆڕشی ئاینی تۆماس مونزیر بۆ رزکاری جوتیاران لە 1513بریتی بوولە: وامەزانن تەنها ئاسودەیی بۆ رۆژی دواییە بەلکو ئاینەکەمان ئەو بەهەشتە بۆ دنیا دەهێنی[2]..ئەوە وەلامی ئەوانەیە کە پێیان وایە ئاین بۆ دنیا نەهاتوە، ئاین و شەریعەت وپەیام بۆ ئەو دنیایەیە، دنیاو قیامەت دژی یەك نین بەلکو دادگەری دنیا زامنی قیامەتیشە، زاراوەی(ترك الدنیا) هیچ بنەمایەکی ئاینی ڕەسەنی نیە کە بوە هۆی دوور خستنەوەی ئاین و خودا لە توێژینەوە زانستیەکان.

** ** ** ** ** ** ** **

بەو شێوەیە باوەڕ بە خوا بەرەو ساغ بوونەوەیەکی خێرا ڕۆیشت، گومانی ئاسمانی لاواز بوو هاتە سەر زەوی، بوونی گومان کەوتە سەر پێغەمبەران، لەناو میللەتانی جیهان سێ ئایینی سەرەکی هەیە(جاروایە ئیبراهیمیان پێ دەڵێن)، میللەتی هەرسێکیان باوەڕیان بە (ح.عیسا) و (ح.موسا) هەیە، یەهودی و مەسیحی لەنێوخۆیاندا هاریکاریەکی گرنگیان ئەنجامدا، بەوەی تەورات و ئینجیلیان لەیەك سیستەم کۆکردەوە، تەوراتیان ناونا (عەهدی قەدیم) و ئینجیلیش (عەهدی جەدید)، هەولیان داوە لەگەڵ زۆربەی ئاین وڕێبازەکانی تر تەبایی بکەن ولەهەمان کاتدا تەبشیریش دەکەن. لەوکاتە زانایانی مسوڵمان نەیان

1 ئەو زانیاریانە لە(مایکل لوفي- الماركسية والدين - ترجمة : بشير السباعي ) وەرگیراوە.
2 ماركسية قرن عشرين ص150

توانیوه ئاوا سیستەمێك لەنێو مەزهەبەكانی ئیسلام ڕێكخەن (بەتایبەتی لەنێوان سوننە و شیعە)كە یەك كتێبیشیان هەیە، تاڕادەیەكی زۆر هەڵوێست وفتوای توندیان بەرامبەر یەكترو بەرامبەر ئاین وڕێبازەكانی تر هەیە، كەم تریش فقهی ئیسلامی توانیویەتی لەگەڵ زانستی سەردەم ئاشنابن، بۆیە دەبینین ڕێك كۆمەڵگەی ئیسلامی دواكەوتووترینن لە جیهان، تا ئەو ڕادە لەیەك وولاتیش دیزاینەكەی وایە موسوڵمانەكان لە خەڵكی تر دواكەوتو ترن، ئەوان سامانی ژێر زەمین دەفرۆشن وپێی دەژین كەچی خەڵكی تر ئەو سامانەی هەلگرتوە و تكنۆلۆژیاو بەرهەمی زانستی بەجیهانی ئیسلامی دەفرۆشنەوە.

بەوهۆیەوە زیاتر فشاری گومان كەوتۆتە سەر پێغەمبەری مسوڵمانان كە لەبنەچەدا پێغەمبەری هەموو جیهانە، گومانەكەش لە ڕووی فەلسەفی و زانستی لە تۆڕێك پرسیار كۆدەبێتەوە سەبارەت بە قورئان و زانیاریەكانی سەردەم، بۆیە بەشێكی تایبەت بەو گومانە دەخەینە بڕگەی داهاتوو.

## گومان لە پێغەمبەرایەتی محمد(ص)

ئایا پێغەمبەر (موحەمەد) نێردراوی خودایە ؟ یان جادوكەریك بوە؟ ئەگەر پێغەمبەر نەبوە كوا دوا پێغەمبەر كەلە ئاینەكانی تریش باس كراوە؟ چەندە راستە قورئان بریتیە لە كۆی زانیاری فەلسەفی وزانستی وئاینی سەردەمی خۆی؟..
ئەوانەو كۆمەڵێك پرسیاری تری گومانی هەن بەكورتی چارەسەری كێشەیەكی گرنگی تر دەكەین، ئەگەر گومان لە (محمد) ڕەوێنرایەوە ئەوا ئۆتۆماتیكیانە لەسەر باقی پێغەمبەرەكانی تر دەڕەوێتەوە، چونكە ئاینی محمد نكولی ونەسخی ئاینەكانی پیشوی نیە بەڵكو تەواوكەریەتی.

لەسەدەی (21) و سەردەمی عەولەمە گۆڕانێكی مەزن لە فكری بەشەریەت هاتەكایەوە، كۆتایی بە تیۆرەكانی پەرەسەندن لە بایلۆجی و سروشت هێنا،

ئەندازەی جینەکان (هندسە الجینات) جێـی گرتـەوە، لەسـەر ئاسـتی گـەردوونیش کۆتایی بە تیۆری گەردوون چەسپاو(کون الساکن) هات و گەردوونی (الکون المتسع) یان تیۆری (بیگ بانگ) جیٚ ی گرتەوە..، بەو شێوەیە گۆڕانکاری لە لقەکانی تـری زانست لە کیمیا و فیزیا و مێژووتا دەگاتە بیرکاری کۆتایی بەو بەشە هات کـە لـە قازانجی فەلسەفەی ماددی بوو (جگە لە بەشێك لە فیزیای کوانتـەم نـەبێت)، ئـەو وەرچەرخانە زانستیە کارێکی قوڵی کردە سەر فەلسـەفە و کۆتـایی بـە فەلسـەفەی مارکسـی هێنـا کـە میراتگـری فەلسـەفەکانی مـاددی یۆنـانی کـۆن تـا دەگاتـە فەلسەفەی تایلەر و فریـزەر فیوربـاخ و داروین و لامـارك و مورگـان و جـیمس و ریکاردۆ و... بوو، ئەوەش بە دەوری خۆی کاریگەری کردە سەر ئایدۆلۆژیا و دامـو دەزگای سیاسی، بەشێوەیەك ئێستا هیچ دامودەزگایەکی سیاسی فەرمی لە جیهان نەماوە باوەڕی بە خوا نەبێت، مشت ومڕ لەسەر خودا کەم بۆوە ئیستا مشت ومـڕ لەبارەی پیعمبەرایەتی، کۆمەڵێك ئایینی فەرمی لەسەر ئەو بنچینەیە لە دەستوری وڵاتان تۆمار کراوە، کەواتا قۆناغی داهاتوو پرسـیاری فەلسـەفی و مـەنتقی نـەما لەبارەی خوابەڵکو لـەبارەی خـەلقی خوایـە، لـەبارەی ئاینـەکانی خوایـە لـەبارەی پێغەمبەرەکانە، واتا پرسیاری مرۆڤی نویٚ هەر لە بەرازیلەوە تا دەگاتە ژاپـۆن لـە بارەی سـیٚ ئاینـە سـەرەکیەکەو پێغەمبەرەکانیانـە، زیـاتر ئـەو پرسـیارە ڕوو لـە پێغەمبەری ئیسلام دەکریٚ، جاریٚ با بزانین بەڵگەی پێچەوانە چیە؟

## بەڵگەکانی دژ بە محمد:

1- لەلای ئاینیان نەخویندەواری محمد کراوەتە بەلگە بۆ پێغەمبەرایـەتی ئـەو هـەمو زانیاریـە.. کەچـی وەڵامـی فەلسـەفەی مولحیـدی ئەوەیـە دەڵـێن ئەبوعەلای معەری چـاوی نـەبوە گـەورەترین داهـاتی هونـەری وفەلسـەفی وفکری هەبوە، تەها حسین و زۆر نمونەی تری وا هەیە.

2- لەکۆنــەوە ئــەو تیبینیــە هەیــەو دەڵــێن بــۆ پێغەمبــەران لــە ناوچــە پێشــکەوتوەکانی وەك ئــەورووپا نــەهاتوە بــۆ تــەنها لــە ناوچــە عەشــایەرو دواکــەوتوەکان هــاتوون، (امــام عبــدالفتاح امــام) لــە پێشــەکی کتێبــی (المعتقدات الدينية لدى الشعوب) بـە ووتەیـەکی (فـارنکتون) دەسـت پـێ دەکاو دەڵێ: من أن فكر إذا ظهر في الغرب كان فيلسوفا وإذا ظهر في الشرق كان نبياً!. هیگلیش ڕایەکی نزیك لەوە هەیەو دەڵێ (الأديان المختلفة ليست إلا مراتب مختلفة من نموا فكر البشري)[1].

3- لەلایەن توێژەرو ڕۆژهەلاّتناسێکی زۆر محمد بە پێغەمبەر نـاوزەد نـەکراوە بەڵکو بە وەسفی(عەبقەری، پالەوان، زۆرزان، گەورەترین نەخشەکیش وپـلان داڕێژ..) کراوە، مەبەستیان ئەوەیـە بلـێن بـەو زۆر زانیـەی خـۆی قورئـانی بەناوی خوا نوسیوەو سەرکەوتووبوە، بەهەمان شیوە بـۆ (ح.مسـیح) جـۆرج حنا وەسفی زانایی وفەلسەفی بۆ داتاشـیە دەڵـێ بـەلاّم بـۆ ئیقنـاع کردنـی خەڵکی ئەوزانیاریانەی دەدا پاڵ خودا[2].

دەڵێن (ح.محمد) لەسـەر دەسـتی کۆمـەڵێك زانـای ئاینـەکانی تـر وانـەی وەرگرتوە، ناوی ورقة بن نؤفل، وعبيدالله بـن جحـش وعثمـان بـن الحويرث، وزيد بن عمرو بن نفيل..دێت.

4- سودی لە فەلسەفەی هندی وچینی ومیسری ویۆنانی وەرگرتوە، بۆ پـەیرەو کردنیش سودی لەشارستانی فـارس وەرگرتـوە تـا ڕادەیـەك ڕۆژهەلاّتناسـی ئینگلیزی(جیب) لە کتێبەکەی(المذهب المحمدی) ئەو باسانەی زیـاتر کـردوە، جورج حنا دەڵێ پێغەمبەرایەتی ح.مسـیحیش دوای ئـەوەی هـات کـە بـە

---

[1] ماركسية القرن العشرين ص153
[2] قصة الإنسان ص26

نهێنی سەردانی هندی کردبوو لەوێ فێر بوو [1].نیلسون بایك لەكتێبی(الله واللازمانیه) وجۆن ئۆدینیل له کتێبی (الثالوث المقدس والزمانیة ) دەڵێن (لازمانی) فەلسەفەی ئەفلاتونی کەوتە نیو ئینجیل [2].

5- دەشڵێن ئاینی محمد لەسەرەتادا تەنها بۆ شاری مەکە بوو، بۆ عەرەب بوو، دوای کەسەرکەوت ئینجا بوە جیهانی، لە عەشایریەوە بوە نەتەوەیی و دوایش بوە کۆسمۆپۆلۆتی [3].

6- رۆژهەلات ناسی ئەلمانی(گیرمی هۆرت) له کتێبیکی بەناوی(محمد) دەڵێت لەسەرەتادا محمد نەیوت من نوێنەری ئاینێکی نوێی خوایی دەکەم، بەڵکو تێکۆشاوە لە پێناو چاکسازی کۆمەلایەتی و نەهێشتنی جیاوازی هەژارو دەوڵەمەندو هەندێ بنەمای تری سۆشیالیستی، دوای بیری دوارۆژ هاتە کایەوە بۆ فشار لەسەر نەیارانی، لەو بارەیەوە د.جورج حنا دەڵێ پێغەمبەرەکان سۆشیالیستی بووینە پیش ئەوەی سۆشیالیستی بیتە کایەوە [4]، لە باش ترین دۆخیاندا مدرسە فلسفیەکان هەولیان داوە ئەو پەیامەی پێغەمبەران بەند بکەن بەسەردەمی خۆیان، (هیگل، مارکس، ئەنجلس، رۆجیی غارودی..) بە قوولی باسی ئاوایان کردوە پیش ڕۆژهەلاتناسەکان [5].

7- بەشێکیش وای بۆ دەچن کە ئەوەی محمد شۆڕشە نەك پەیام، دەڵێن محمد توانی لەو شۆڕشە هەندی نەریتی شایەکانی ئەو سەردەم بگۆری بەڵام نەیتوانی ئارەزووبازیەکانی بەرامبەر ئافرەت بگۆڕێو کۆمەڵێك ژنی هەبوەو

---

[1] قصة الإنسان ص63

[2] بول- دیفیز- الإقتراب من الله ص54

[3] عباس محمود عقاد-مایقال عن الإسلام ص57

[4] قصة الإنسان ص65

[5] بڕوانە: مارکس– انجلس بیان الشیوعی ص 64 ،هەروەها: مارکسیة قرن عشرین ص150...

سیســـتەمی کــەنیزەش لــەدوای خــۆی لــە خەلیفــەکانی لــە شــایەکۆنەکان ڕەتیدابوو، دووبارە دەڵێن بەلگەی ئــەوەی شۆڕشــە نــەك پــەیام لــەو کــاتی موسوڵمانان چونە پێش ئەگەر پەیام بوایە ئەوە بــەردەوام دەبــوون لــە پــێش کەوتن بەڵام چونکە شۆڕش بــوو حوکمەکــەی کــورت خایــەن بــوون وئێســتا موسوڵمان دواکەوتوترین میلەتی جیهانن.

8- لەبارەی قورئانیش هەولیان داوە کۆمەڵێك هەلە بدۆزنەوەگۆســتاف لۆبــۆن لـــەکتێبی (حضـــارة العـــرب) دەڵـــێ قورئـــان ناگاتـــە ئاســـتی کتێبـــی هندۆســیەکانیش، جۆلــد ســەهیر لــە کتێبــی(المذاهب الإســلامیة) بلاشــیر لە(معضلة محمد) بەهەمان شێوە(الموسوعة الکاثولیکیة) و نیکلســۆن وزۆری تر.. دەڵێن محمد سودی لە تەورات وئینجیل وزەبوور هەندێ(نصوص القدیمە) و زانستەکانی ئەوسەردەم بەتایبەتی یۆنانی وەرگرتوە.

9- ســپینوزا و روجــی غــارودی وئــەنجلس ولیــنین پێیــان وایــە کتێبــی پێغەمبەرەکان بریتین لە زانیاری وپێداویستی سەردەمی خۆیــان، رەنگــە بــۆ ئەو سەردەم ئیجابی بووبن، شۆڕشگێر بووبن، وەك ئــەنجلس ورۆجیــەغارودی نمونەی دروشمی شۆڕشی تۆماس منزیر دەهینەوە[1]، سپینوزا زۆربەی گومانی لەوە دروست بوە دەڵێ کتێبــی پێغەمبــەرەکان بــریتین لــە وەلامــی کێشــەو زانیاریەکانی سەردەمی خۆیان ئەوەش نیشانەیەکی بەشــەریە نــەك خــوایی[2] هێگلیش هەروا دەڵێ بــوونی ئــاینی جیاجیــا گوزارشــە لــە گەشــەی بــیری ئادەمیزاد[3]، لەکۆنەوە ئەو پرسە بە جۆریکی تر گوزارش دەکراو دەیــان ووت

[1] مارکسیة القرن العشرین ص147 وص150 ئەنجلس لە کتیبی (ثورة الفلاحین) باسی هەمان شۆرشی کردوە.

[2] رسالة فی اللاهوت والسیاسة ص145 وص168

[3] مارکسیة القرن العشرین ص153

پێغەمبەرەکان بۆ ئیستا نەهاتون ولەوەوە ابن حزم لە (الملل والنحل)وەڵامی داینەوە وبەشێکی بە ناوی(الرد علی من زعم أن الأنبیاء لیسوا أنبیاء الیوم) تەرخان کردوە، بەکورتی دەیانەوێ بڵێن ئەگەر ئەو ئاینانەش بۆ سەردەمی خۆی توخمی ئیجابی تیدا بێت ئەوە بۆ ئەو سەردەمەی ئیستا ناشێ، ئەوە گەورەترین مادەو پاساوی کمال ئەتاتورك بوو لە مشت ومڕی نێو پەرلەمانی تورکیای رۆژانی 1و2 و3ی ئاداری 1924 کە بوە هۆی هەلوەشاندنەوەی خەلافەت لەو پەرلەمانە، تا ئیستاش ئەو تەنزیرەی بەسەرچوونی ئاین گەورەترین زەخیرەی مانەوەی سیستەمی عەلمانیەتە، لەو ڕوەوە بەشیك لە بیریارانی ئیسلامی (زیاتر ڕیفۆرمخواز یان مودیرینخوازانیان پیێ دەوترێ- نصر حامد ابو زید، محمد ارکون، حیدرحیدر، محمد عابد الجابری..) ئەو بۆچونەیان هەیە، دەڵێن ئەوناووشوینانەی لە قورئان هاتوە بە ڕوونی دەریدەخا کە ئەو قورئانە لە ئەوروپا بوایە جۆرە دارشتنیکی تری تیدا بوو، ئەوە گەورە بیریاری ئیسلامی عبدالکریم سروش زۆر بە سەرسامیەوە ئەو ڕایەی (فضل الرحمن) دەگوازیتەوە کە دەڵێ: پەیامی پێغەمبەر بە ئاشکرا بارودۆخ وئاستی زانیاری ئەو کاتی یەسەرەوە دیارە[1]، دەڵێن ئایەتەکانیش پڕە لە ڕووداوو ناوی ئەو سەردەم..

بەکورتی ئەوە بەلگەکانی ئەوانەیە دەڵێن قورئان پەیام نیەو محمدیش پیامبەر نیە، بەڵکو محمدلەزیرەکی خۆی وای دەرخستوەولیشی سەرکەوتو بوە.

[1] عبدالکریم سروش-ئاین لەسەردەمی مودیرنێتەدا ل192

# لەگومانەوە بۆ دڵنیایی

## یەکەم : بەڵگەی فەلسەفیی وزانستیی:

هەڵبەتە لە بەشەکانی پیشوو کار ئاسانیمان بۆ دەکات کە پێویستیمان بە گەشتێکی فەلسەفی قوڵ نەبێت بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو بۆچوونانەی دژ بە محمد، بەڵکو زیاتر ئەو پانتاییە فەلسەفیە پێویستە کە لەگەڵ زانستی نوێ تێکەڵ بوە، دووەم پێویستمان بە (کتاب المنیر) ئەو کتێبە ئاسمانیانەی ڕاستەقینەن (بێ دەسکاری)، بەڵگەی گەلێ زۆر دژ بە (محەمەد) پێشکەش کراوە بەشی زۆری وەلامی پێویستی درایتەوە، ئێمە ناچین بەلای ئەو وەلامە کلاسیکیانەی زاناو نوسەرانی پیشوو پێی هەلساون، لێرەزیاتر بەلای ڕەهەندی فەلسەفی ئەوبۆچونانە دەچین زۆر بەکورتی، بەو شیوەیەی خوارەوە:

1- محەمەد خوێندەواری نەبووە، تەها حسین وئەبوعەلای معەڕیش نەخوینەوار وبێ چاو بووینە، بەڵام ئەوەی محمد هیناویەتی لە باسی تەواوی لایەنەکانی زانست و فەلسەفە و سیاسیەت و مێژوو و کیمیا و فیزیا و ژیانناسی...هتد کردووە، زۆربەی زانا و فەیلەسوفەکان تەنها توانیویانە لە یەك لایەن پسپۆر بن ئینجا هەڵەشیان کردووە، براتراند راسل دەڵێ ئەگەر فەلسەفەی کۆن زۆر بەووردی هەلسەنگینین یەك ڕستەی دروستی تیدا نامێنێ، بۆیە ئەو بەراوردە زانستی نیەو زۆر لاوازە.

1- ئەو جۆرە زانست و زانیاریانەی لەو سەردەمی کە لەنێو فارس و هند و چین و یۆنانی هەبوو لە وڵاتی جەزیرەی عەرەبی هەر نەبووە.

2- لــــەبارەی ئـــــەوەی ئاینەکـــــەی لەســــــەرەتادا لۆکــــالی بـــــووبێ ڕۆژهەڵاتناس(سۆندەریز) دەڵێ ئەگەر لۆکالی وتایبەت بە عرب ومەکە بوایە ئەوا نامەی بۆهەرقەل وکیسراو شای حەبەشە نەدەنوسی[1].

3- سەرەڕای ئەوانەی سەرووش پێویستە هەڵوەستەیەك لەسەر لقێکی گرنگی زانســتی ئــەو ســەردەمە بکــەین کــە بنچــینە بــوو بــۆ تێــڕوانینی فکــری ڕەوشەنبیری ئەو سەردەمە لە تەواوی جیهان، ئەویش بریتیــە لــە تێــڕوانینی ئەو سەردەمە بۆ گەردون، ئــەو تێڕوانینــەش بنیــات نــراوە لەســەر هــەردوو سەرچاوەی گەورەی (مەجەستی) کــە لەلایــەن (بتلیمــۆس) نووســرابوویەوە، هەروەها (حــول الســماوات-یــان-السـماء والعــالم) کــە لەلایــەن (ئەرســتۆ) نووسرابوەوە، کتێبی تریش هەبوون بەڵام پڕ بوو لە (خرافیات)، هەرچــەندە ئەوانەی (بتلیمۆس) و (ئەرســتۆ)ش ئەفســانە(خرافیات)ی تێــدابوو، کتێبــە ئاسمانیەکانیش دەست کاریکراو هەبوو ڕەسەنەکان نــەمابوو[2]، بــەڵام بەهــەر حاڵ ئێمە هەلوەستە لەسەرئاستی هــەرە بــەرزی تێکــڕای ڕەوشــەنبیری ئــەو کاتی مرۆڤ دەکەین، کەواتە بە بــەراوردێك لــەنێوان زانســتی بەشــەری ئــەو سەردەم و زانستەکانی قورئان لەبارەی گەردوون بەو خشتەکە بکەین.

| زانستی بەشەری لەبارەی گەردوون لەو سەردەمە | زانستی قورئان.. |
|---|---|
| 1- پێیان وابوو پێکاتەی زەوی لەگەڵ ئاسمان جیایە | لەقورئان پێی وایە یەك پێکهاتەن. |
| 2- پێیان وابوو زەوی لە (زەڕە) | 2- لە قورئان باس لە ئاسمان و زەوی |

[1] عباس محمود عقاد-مایقال عن الإسلام ص57
[2] بۆ سەربردەی دەستکاری ئەو کتیبانە بروانە: سپینوزا-رسالە فی اللاهوت والسیاسە بکە.

| پێکهاتوە ئاسمانیش لە (لامادی). | دەکا کە لە زەڕە پێکهاتووە. |
|---|---|
| 3- وایان دەزانی ئاسمان ڕووتەختە و ئەستێرەی پێوە لکاوە. | 3- لە قورئان بەوشێوەیە باسی ناکات. |
| 4- پێیان وابوو لە ئەسلدا ئاسمان و زەوی لێك جیایە | 4- قورئان دەڵێت (زەوی و ئاسمان) یەك پارچە بووە، (أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا) |
| 5- نەیان دەزانی زەوی و ئاسمان لە ئەسلدا لە دۆخی ڕەقی نەبوونە | 5- لە قورئان (.. وهی دخان) |
| 6- ئەستێرە و هەسارەیان پێ لێك نەکراوە. | 6- لەقورئان لێك جیاکرایتەوە |

فەلسەفەی کۆن زۆر بە توندی داکۆکیان لەوە دەکرد کەمادەی ئاسمان جیایە لەگەڵ مادەی زەوی، ئەوەی ئاسمان لە ناوناچێ، یاساو ڕێساوپیکهاتنی ئاسمان لەگەڵ زەوی لیك جیایە، بۆیە فەیلەسووفە ئاینیەکانی وەك ئیبن روشد وئیبن سیناش تەسلیم بەو بۆچوونە بە هیزە ببون لەبەر کۆدەنگی زانست وفەلسەفەی ئەو سەردەم،، کەچی لە قورئان بە پێچەوانەی ئەو بۆچونە دەڵێ:

1-ئاسمان وزەوی یەکن و هەردوولایان لە ئەتۆم پیکهاتون : ﴿.. لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ..﴾

2- لەبارەی یەکێتی یاسای ئاسمان وزەوی هاتوە: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاء وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ..﴾[1].

[1] القران الكريم- سورة سبأ اية3، سورة الروم اية25

3- لەبارەی کارنامەی ئاسمانیش وەك زەمین بە سیستەمی(هۆو ئەنجام) هـاتوە: ﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاء ثُمَّ لِيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ مَا يَغِيظُ﴾[1].

لەهەموان گرنگ تر هیچ زانستێکی بەشەری وئاینی باسی ئـەوەی تیدانیـە کـە ئاسمان وزەوی یەك پارچە بووینـە ئینجـا لیـك کراینـەوە، لـە قورئـان بـە ڕوونـی ئەستیرەی بە ڕووناکی دەر ناوزەد کردوەو هەسارەو مانگیشی بـە ڕوونـاکی دەرەوە وەسف کردوە، کەچی زانستی ئەو سـەردەم وکتێبـە بـەناو ئاسمانیـەکانیش تیکـەل وپیکەلیان کردبوو، جاریش وایـە ڕیـك پێچـەوانە وەك ئـەو ئایەتـەی ئینجیـل بـە پێچەوانەی هیناوە (فان نجوم السموات وجبابرتها لا تبرز نورها. تظلم الشمس عنـد طلوعهـا والقمـر لا يلمـع بضـوءها)[2]، یـان وەك لـەو ئایەتـەی موسـەیلەمەش پێچەوانەی کردۆتەوە (والشمس وضحاها, في ضوءها ومجلاهـا. والليـل إذا عـدّاها, يطلبهـا ليغشـاها ,أدركهـا حتـى أتاها,واطفـأ نورهـا فمحاهـا) نـە نـورەو نەدەشکوژیتەوە.

لەگەڵ زۆر بـەراوردی تـر، بـوار نیـە ئـەگینا بـەراوردی ئاسـتی زانسـتی ئـەو سەردەمی لە ڕوەکانی کۆمـەڵناسی و ئابووری و مێژووی و کیمیایی و فیزیایی و تا دەگاتە یاسایی و فەرهەنگی... بەوشێوەیە بوو، قورئـان خۆشـی لـەو کـاتی داوای لیکردوون کە با بەراوردو زانیاری لەسەر کتێبـە کـۆن وئاسمانیـەکان بکـەن، داوای خویندنەوەی لیکردوون نەك بزر کردن وشـاردنەوەیان:(فـان كنـت في شـك مما انزلنـا اليك فاسال الذين يقرؤون الكتاب من قبلك لقد جاءك الحق مـن ربـك فـلا تكـونن من الممترين)[3].

---

[1] سورة الحج - - آية 15
[2] كتاب المقدس، عهد الجديد(اش 13: 10)
[3] سورة يونس اية94

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە ئاخۆ ئەگەر قورئان لە جەزیرە دانەبەزیبوایەو لە سوید دابەزیبایە جۆرە ئایەت ورووداوی تری تێدا دەبوو؟ ئەوەی جورئەتی بەو گومان و تیڕوانینە داوە پرسی نەسخ و(اسباب النزول)[1]ە کە بەو شێوەیە نیەو جارێکی تر دارشتنەوەی دەوێتەوە وەك نوسەری گەورەی کورد (عبدالکريم فتاح) لە کتێبی (میزان)بۆی چوە، نەخێر..، ئەوە نیە قورئان ناوی وەك (اسكندر ذو القرنين) تیدایە، ناوی یەئجوج ومەئجوجی تیدایە باس لە ڕوداو دەکات دوور لە جزیرە..، لە ڕاستیدا قورئان بۆ تەواوی کۆمەڵگەو بۆ هەمو سەردەمەکانیش هاتوە، بەڵام کە باسی ئەو ڕووداوانەی جزیرەی کردبێ ئەوا ئەو جۆرە ڕووداوانەن کە ڕەهەندی ئاسۆیی وستونی زەمەنی ومەکانی جیهانی تیدایە.

## دووەم : بەڵگەی کتێبە ئاسمانیەکان

کتێبی پیرۆز لە جیهاندا گەلێ زۆرن، لەوانە : ڤیدا، ئاڤێستا، کۆنفۆشیۆسی، مانۆ، زەبور، تەورات، ئینجیل..تا دەگاتە (نصوص قديمه)ی میسری وسۆمەری..، لەبەر دەسکاری سروش و بیری مرۆڤ تێکەڵ کراوە زۆر بەزەحمەت لێك جیادەکرێتەوە، ئەوەی شارەزای ئەو کتێبانە بێت بە سانایی بۆی دەردەکەوێ کە زیاتر وەسفی خودایە بە لەنگی، یان وردتر پەخشانە بەسەر خودا بە پێی (وزن

[1] نمونەیەك لە بەستنەوەی قورئان بە ڕووداوەسادەکانی جزیرە وەرگرین، ئایەتی (والسماء والطارق... النجم الثاقب) وەرگرین لەکتیبی (ابی الحسن علی الواحدی النیسابوری –اسباب النزول- ص250) دەڵێ ئەو ئایەتە تایبەت بە (ابی طالب) هاتە خوارێ کە پیغمبەر(ρ) نان وماستی بۆ هینا لەو کاتە ئەستیرەیەك لە ئاسمان کەوتە خوارەوە کەوتە ناو ماستەکەو بوە ئاگر!! گۆتی ئەوە چیە ووتیان ئەوە توانای خوایەو ئەو ئایەتە بەو بۆنەیەوە هاتە خوارەوە..لەکاتیکا لەو سەردەمە هەمومان دەزانین هەر ئەستیرەیەك لەو ئاسمانە زیاتر لە ملیۆن جار لە زەوی گەورەترەو ئایەتی (والسماء والطارق..) گەورەترین ئایەتی گەردوونیە زانستی ئەو سەردەمە زۆری ماوە لە رەهەندەکانی بگا.

وقافیە)، جار وایە لەبەر زۆر خۆشەویستی خودا بەهەڵـە وەسـفیان کـردوە، ڕەنگـە زۆربەمان ئینجیل وتەورات ومەزمورمان لا هەبێ خویندنەوەی ئاسـانە زانیـاری و هەواڵی گەردوونی وسروشتی وای تیـدا نیـە قورئـان سـودی لێ وەرگرتبـێ، بـەڵام هەموشیان کتێبی ئاسمانین دەبێ یەکتر پاسادان وبە هێـز بکـەن نـابێ نـاکۆك بـن، هەرچی (نصوص قدیمە)ی سـۆمەری وبـابلی و میسـری.. ئـەوا (ڤـالیس پدگ)لـە کتێبی (اوزیوس وعقیدة البعث المصریة) دەڵێ ئاینەکانی ابراهیم وموسـی وعیسـی و محمد هەمان وەسفی خودایە کەلەو (نصـوص)انە هـاتون، کەچـی بـە سـەرنجیکی خێراش بەو (نصوص)انە وانیە، دەردەکەوێ تـەنها (ترتیلـەو پەخشـانە) ڕووبـەڕوو لەگەڵ خودا نهێنی ودەنگ وباسی سروشت وبوونەوەری تیدا نیە، تەنانـەت ئـەوەی بەسـەر خـوداش دەگـۆترێ زۆر لەنگـە، هەنـدیکی لێ هەڵدەبـژێرین: لـە (نصوص)میسریەکان لە هەمان کتێب باسی خودا دەکـا دەڵـێ: تـۆ خـۆت خۆتـت دروست کردوەو دەتوانی دروستی بکەیتەوە، پیر دەبی بەڵام خۆت گەنج دەکەیـەوە، لە کتێبی (ریتچارد-نصوص الشرق القدیم) هاتوە وەك دەقـی خـۆی: (بطـل الألهـة ایها الأب نانا، صاحب الملك الکامل، بطل الألهة انت، انت المولود الذی انجب نفسـه بنفسه..). ناکرێ ئەوانە سروش بن بەڵام ڕەنگە ڕەچەلەکەی سروش بیت بەو دەسـت وئەو دەست وای بەسەر هاتوە، ئەگەر وەك خۆی بمابوایە ئەوا ئـەو کتێبانـە تیکـڕا وەك (سیفاتی ڕاستی) هەمو یەکتریان تەواو دەکردو مـژدەی هـاتنی پـاش خۆیـان دەدا، ئەگینا بە ڕوونی لە زۆربەی ئەو کتێبانە نـاوی پێغەمبـەر (ρ) هـاتووە، لـە ئینجیلی برنابا کەوا مەزەندە دەکرێ سەلامەت ترین کـۆپی ئینجیـل بێـت، لـەوێ گفتوگۆیەکی نێوان قەشەیەك و (ح. عیسا) بەو جۆرە پێشبینی هـاتنی پێغەمبـەر (محەمەد) کراوە، لە بەشی(97): (فقال حینئذٍ یسـوع : " إن کلامکـم لا یعـزیني لأنه یأتي ظلام حیث ترجون النور ولکن تعزیتي هي في مجيء الرسـول الـذي سـیبید کل رأي کاذب فيّ وسیمتدّ دینه ویعمّ العالم بأسره لأنه هکذا وعـد الله أبانـا إبـراهیم

وأن ما يعزيني هو أن لا نهاية لدينه لأن الله سيحفظه صحيحاً " أجاب الكاهن : " أيأتي رسل آخرون بعد مجيء رسول الله ؟ فأجاب يسوع : "لا يأتي بعده أنبياء صادقون مرسلون من الله، ولكن يأتي عدد غفير من الأنبياء الكذبة وهو ما يحزنني لأن الشيطان سيثيرهم بحكم الله العادل فيتسترون بدعوى إنجيلي).
لەبەشی(95) ئایەتەکانی 3-5 لەبارەی پێغەمبەری دوای خۆی قەشەیەك لێی دەپرسی و (ح.مسیح)یش وەڵامی دەداتەوە (..انه مكتوب في كتاب موسى أن الهنا سيرسل لنا مسيّا الذي سيأتي ليخبرنا بما يريد الله وسيأتي للعالم برحمة الله، لذلك أرجوك أن تقول لنا الحق هل أنت مسيّا الله {تعني رسول الله} الذي ننتظره؟ أجاب يسوع : حقاً أن الله وعد هكذا ولكني لست هو لأنه خلق قبلي وسيأتي بعدي )[1].

کەواتا هەردوو تەوەری سەروو کۆدەکەینەوە لەو پرسیارانە وەڵامیشە بۆ بوونی (محەمەد) وەك دوا پێغەمبەری خوا:

پرسیاری یەکەم: ئەگەر یەك خوا نەبوا ئەوا بۆچی هەموو پێغەمبەرەکان لەلایەن یەك خوا نێردراون، ئەگەر خوای تر هەبووایە ئەوا دەبوایە پێغەمبەرێکی بناردبوایە کەواتا کێشەی (فرە خوایی) مان نیە.

پرسیاری دووەم: ئەگەر (ح.عیسی) دوا پێغەمبەر نەبووبێ وەك هەموو ئایینەکان دانی پێ دەهێنن، و دانیش بە (محەمەد) ناهێندرێ وەك دوا پێغەمبەر لە دوای (ح.عیسی) ئەی پۆچی تا ئێستا پێغەمبەرێکی تر نەهاتووە ئەوە 2000 ساڵی خایاند کەچی لەو سەردەمی لەدوای 500 ساڵ پێغەمبەرێك دەهات، لە ئینجیل واهاتوە:(اننى ذاهب الى ربكم لكى يرسل لكن فارقليط الذى سيأتى

[1] انجيل برنابا- فصل95 اية(3-5).

**الیکم بالتأویل..)**بەپێی (فتح الله گولەن) مەبەست لە (**فارقلیط**)لیکجیاکـەرەوەی هەقوناهەقە[1] .

کەواتە محەمەد دوا پێغەمبەری خوایە و بۆیەش تا ئێستا گەورەترین کاریگـەری لەسەر کۆمەڵگە بە پلەی یەکەم هەیە.

❊❊ ❊❊ ❊❊

کۆتایی بە وەڵامی پرسـیارە فەلسـەفیە سـتراتیژیەکان هـات، لـە خـوداوە بـۆ بونەوەر، لەوێشـەوە بـۆ کۆمەڵگـەو هـاتنی ئـایین و پێغەمبـەران، ئێسـتا نۆیـەی پرسیاری ئایینە دژ بە مولحیدان و دەپەڕینەوە بۆ بەشێکی سەربەخۆ.

---

[1] فتح اللة كولةن– محمد ج1ص69

# بەشی هەشتەم

# هەڵوەستەیەکی فەلسەفی لەگەڵ دیزاینی مەزن

دیزاینی مەزن ناونیشانی کتێبێکی زانستیە لەلایەن هەریەك لە (ستیڤن هۆوکینگ) و (لیونارد ملۆدینۆ) نوسراوە، زانای گەورەی فیزیای کوانتەمن، ستیڤن باوەڕی بە فەلسەفە نیە و هەر لە سەرەتای کتێبەکە دەڵێت فەلسەفە مردووە، بۆیە ئەرکی وەڵامی پرسیارە فەلسەفیەکانیش دەخاتە سەر زانست بەتایبەتی کوانتەم، کەچی ئەو کێشەیەی لەو کتێبە دروستی کردووە پرسە فەلسەفیەکانە، هەوڵی داوە تاکتیکی (فەلسەفە مردووە) و دیکتاتۆریەتێکی زانستیش بەکاربهێنێ، وەڵامی پرسیارە گەردوونی و فەلسەفیەکان لەسەر خۆی تاپۆ بکات، ئەوە لەو کاتەیە ڕابوونی فەلسەفە لە جیهانی نوێ وا بەرێوەیەو بۆ یەکەم جارە (یۆنیسکۆ لە بڕیارێکی لە 29-7-2005) ڕۆژی 3ی مانگی 11ی هەمو سالیکی کردە ڕۆژی جیهانی فەلسەفە[1].

بە پێچەوانەوە زۆربەی زانایان وزانایانی فیزیایی بە تایبەتی بۆ هەر دۆزینەوەیەکی زانستی لە پیشدا بیرۆکەیەکی فەلسەفیان لە بارەی هەبوە وەك ئاینشتاین وهایزنبرگ بە ڕوون تر دەڵێن توێژینەوەی زانستی لەسەر بنچینەی بیری فەلسەفی دەکرێ، (لانگیڤان) دەڵێ تیگەیشتن لە فەلسەفە تیگەیشتنیکی قوولت لە فیزیای نوێ پیدەدا، (ڤایتسیگر)دەڵێ مەحالە بێ فەلسەفە بتوانی لە فیزیای

[1] المؤتمر العام-يونسكو دورة:33باريس، 2005م القرار:171م ت-15 -.

نویێ بگەیت[1]، زیاتر لەوەش (فریتگـۆڤ کاپرا)لـەکتێبی(الطاویـة الفیزیائیـة) دەڵـێ فیزیای نوێ ویچووی بیرورِای فەلسەفەی رۆژهەڵاتی کۆنە[2]...زۆری تـریش، چـەندە خۆش بوو بۆ خۆشی لەسەرەتاوە کتێبێکـی فەلسـەفی لـەبارەی (خـوا و گـەردوون) بنوسیایە، رِایـە فەلسـەفیەکانی تێـدا بـاس بکردایـە، زۆر ئاسـایی بـوو، ئـایینی راستەقینە ئازادی بێ باوەرِی پێداوە.

ئەو لە پێشووتر لە کتێبی (موجز تاریخ الزمن) وەك باوەرِدار دەردەکەوێ بـەڵام لە دیزانی مەزن بە پێچەوانەوە، هێشتا ستیڤن بەتەواوی لەنێوان (بـوون و نـەبوون، دروستکەر و دروستکراو، هونـەر و هونەرمەنـد، بـاوەرِودار و بـێ بـاوەرِ..) سـاغ نەبویتەوە، مەرج نیە زانای گەورە فەیلەسوفیکی گەورەش بێت وەك ئەنتۆنی فلـوو دەڵێ زۆربەی زانا گەورەکان هـەژارن لـە فەلسـەفە[3]، سـەرەرِای هـەموو ئەوانـەش ستیڤن مافی خۆیەتی و تاوان نیە ئادەمیزاد باوەرِی نەبێ، بەڵام دیکتاتۆر نەبێ لـە دیالۆگ و باوەرِی بەوە هەبێ وەڵامی پرسیارە نەمرەکانی ئـادەمیزاد میراتـی یـەك لقی زانستی یان فەلسەفی نیە، لەسەر ئەو بنچـینە دیموکراسـیە هەڵسـەنگاندنێکی فەلسەفی بۆ کتێبەکەی (دیزاینی مەزن) دەکەین.

## ستیڤن چۆن لە ئایین گەیشتووە

کێشەی ئەو زانایە و کتێبەکەشی دووبـارە بوونـەوەی زۆربـەی رِایـە فەلسـەفیە کلاسـیکیەکانە لـەبارەی ئـایین و خـودا، ئـەو وەك کۆنـە فەیلەسـوفە مادیـەکان واتێگەیشتووە ئایین لەلایەن مرۆڤـەوە لـە ئـەنجامی نـەزانین و زاڵ نـەبوون بەسـەر

---

[1] الفلسفة والفیزیاء ج1ص27

[2] بۆل دیفیز- الإقتراب من الله – ص98

[3] There is agod how the worlds most notorious atheist 91 A.fluo - changed his mining p

سروشت هاتووە، وای بۆچووە ئـاین لـە تـرس و تارمـایی و نەخۆشـی و بورکـان و خۆرگیران هاتووە، بۆ ئەو زانیاریەشی بەتەواوی نەهاتۆتە سەر دەقی بـاوەڕپێکراوی ئاین، زیاتر ئەو کتێب و دەقە ئایینیانـەی بـەکارهێناوە کـە گومـانی دەسـتکاری کردنیان لێ دەکرێ یان ئەفسانەیین.

ڕاستە ئەوانە هەندێ جار ڕای ئایینی ئیسلامیش بەکاردەهێنن بەڵام زیـاتر ڕای فیقهی ئیسلامی بەکاردەهێنن نەك دەق، هەموو لایـەك دەزانـین بەشـێکی زۆر لـە ڕای فەقیهە ئیسلامیەکان سەبارەت بە یاساکانی سروشت پەیوەندی بە ئیرادەی خوا و یاساکانی (هۆ و ئەنجام) زۆر لاوازە، غزالی وەك دافید هیۆم رەئی ئـەوەبوو هـۆو ئەنجام نیە، بەڵکو بە پێی زنجیرەی زەمەنی وادیتـە بەرچـاو، هـەروەها بەشـیك لـە فیزیای کوانتەم لەوانە(هایزنبرك) یەکـەم جـار لەسـالی 1927 نوسـی ئەگـەر لـە (ئێستا) بگەین بە ووردی (داهاتوو) بە ئاسانی دەزانین، ئەو ووتـی کێشـە ئەوەیـە ئێستا نازانین چیە هۆی دیارنیە،.. کەواتە کوانتەمیـەکان پـێش ئـەوەی کێشـەیان لەگەڵ ئاین هەبێ کێشەیان لەگەڵ زانست وفەلسەفە و لەگەڵ (هۆو ئەنجام) و(یاسای سروشتی) هەبوە وەك هەندێ زاناو فەقیهی ئاینی، بـۆ تـەنها ئـەو لەنگیـە تـەنها لەسەر ئـاین هـەژمار دەکـرێ، تەنانـەت(واینبرگ) لـە کتێبـی( DREAMS OF FINAL THEORY ) دەڵێت ئاینیەکان وایان دەزانی رۆژو ئەستیرە مادەی نـەمرن ولە خوا نزیکن، ئیستا دەرمان خست بریتین لە تۆپەلە گازو کـیش ویاسـا چـی لـە بەردێکی سەر ئەو زەویە زیاتر نیەوئەستیرەکانیش نەبوونە گەورەیی خوا[1].

کەچی ئەوە ئاین نەبوو ئاوای دەوت بەڵکو فەلسەفەی یۆنانی نزیك لە پەیڕەوانی ئەرستۆ ئاوایان دەووت..لەگەڵ زۆر نمونەی تر، لەسەر ئـەو بنچـینەیە سـتیڤن وەك زانا و فەیلەسوفانی (فریـزەر، تـایلۆر، هۆڵبـاخ، لاپـلاس، فیوربـاخ، ئـەنجلیس..)

---

[1] الفیزیاء ووجود الخالق ص31

واتێگەیشتووە تا زانست پێشبکەوێت ئەوا ئایین و فەلسەفەی میسالی وبوونی خوا لاواز دەبێ، بەو پێیەی کەسانێك دڵسۆزانە (گوایە) دیفاع لە ئایین دەکەن، بەناوی ئیمام و فەقیهو زانای ئایینی گوزارشتێکی فەلسەفی- ئایینی یان داوە لەبارەی پرسی فەلسەفی زۆر گرنگ و لێشی سەرکەوتوو نەبوینە، بۆتە مەیدانێکی خۆشی ئەو فەیلەسوفانە بە ستیڤن هۆوکینگیشەوە.

لەوبارەیەوە غەزالی دەڵێت : (إن انتشار الكفر في العالم يحمل نصف أوزاره متدينون)، دیفید میلزیش لە کتێبی ( atheise univers ) دەڵێ کتێبی پیرۆز کارگەی بێ باوەڕیە بۆ زانایان، یەکی تر دەڵێ کنیسە ببوە ناوەندی بەرپاکردنی مولحیدی[1].

ریتشارد داوکینز دەڵێ: خوا لە (عهد القديم) وادەردەکەوێ بکوژوقین لەدلو خۆویستی بێ بەزەیی و رەگەزپەرست بێت، فریدریك نیتشەدەڵێ : لە مسیحییدا ئاین وئەخلاق هیچ پەیوەندیەکیان بەواقع نیە دژی ڕاستیشە، مارك توین: ئاین ئەوەیە باوەڕت هەبێ بە زانینێك کەدژی ڕاستیە.. بەشێکی زۆر بە ناوی ئایین قسەیان کردووە پسپۆر نەبووینە لەو بوارە، بواری ئەوان (فیقهی ئەحوالی شەخسی) بووە، کۆمەڵێك زانا و فەیلەسوفی گەورەی مەسیحی وئیسلامی لەو بارەیەوە هەبوونە، بەڵام لەلایەن ئەو ئیمام و فەقیهانە لەخانەی ئیسلام دەرکراون، بۆیە بەرەی عەقلی و فەلسەفی ئایینی زۆر لاواز بووە بەرامبەر هەر هێرشێك.

لەسەر ئەو بنچینەیە بۆ ئەو زانا و فەیلەسوفە مادیانە وا دەرکەوتووە کە کۆڕاییەك لەنێو ئایینەکان هەیە کە دان بە یاساکانی سروشت و (هۆکار)ی مادی ناهێنن، لە ڕاستیشدا واهەست دەکرێ زۆربەی پیاوانی ئایینی دڵتەنگن بە زاراوەکانی وەك :(یاسای سروشتی) و (هۆکاری مادی) و دەستکەوتی زانستی....،

---

[1] الفيزياء والوجود الخالق ص25

بۆیە ئێستاش هەر شکستێکی زانستی دەبێتە مادەیەکی خۆشی گوتاری هەینی مامۆستایانی ئاینی، زیاتر لەوەش وەختێك ناو لەزانست و فەلسەفە و تەواوی مەعریفە نرابوو (عیلمی شەیتان)، هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش (یاسای سروشتی) یەکێك لە حەرامەکانی پیاوانی ئایینی مەسیحی بوو، کەچی یاسای سروشتی و(اسباب) بە ڕاستەوخۆیی باس کراوە، بە تایبەتی لە قورئان، هەرچی یاسای سروشتیشە بە (امر) هاتووە.

لەنێوان ئەو ئیمام و فەقیهە ئیسلامیانە و فەیلەسوفانی وەك فارابی و ئیبن روشد و ئیبن سینا و سیف الدین ئامەدی دیالۆگی لێك تێگەیشتن نەکراوە، بە پێچەوانەوە بەتهافت الفلسفە(1095 ز)ی غەزالی، التهافت التهافت ابن رشد (1180ز) وەڵامی یەکتریان داوەتەوە، ڕەنگە عاملێکی دەرونی (خۆویستی) ڕێگربووبێ هەروەك ئیستاش ڕێگرە، ئەویش ئەوەیە وەك هۆوکینگ چۆن لێرە دەیەوێ زانست و فەلسەفە قۆرخ بکات لە (فیزیای کوانتەم) کە خۆی لێ ی شارەزایە، ئاواش بەشێکی زۆر لە فەقیهە گەورەکان زانستی ئایینیان لە فیقهی ئەحوال شەخسی قەتیس کردووە کە خۆیان لێ ی شارەزان، ویستویانە بڵێن ئەوەندە ئاینە لەوەی بەدەر لەوەی کە ئێمە لێی نازانین ئەوە ئاین نیە، ڕەنگە فەیلەسوف وحەکیمانی ئیسلامیش بابەتی فقهیان بە هەند وەرنەگرتبێ، دیالۆگیان نەکردوە، ئەوەش وای کرد دان بە گرنگی فەلسەفە و فیقە و تەفسیر و مێژوو.... هەریەکە لە شوێنی خۆی نەنرێ، نەکرانە پاڵپشت بۆیەکتر، لەبەرامبەردا بویری بەستیڤن وپیشینەکانی دا کە تیۆری وا گەلالە بکەن.

## دیزاینی مەزن چی دەڵێت:

بەکورتی دیزاینی مەزن (بیری ستیڤن هۆوکینگ)لەدەوری کۆمەڵێك پرسیاری نەمری فەلسەفی دەسوڕێتەوەکە پیشوو تر گەلالە کراوە زۆربەی لە (گومانەکانی ژ:4)ی دیڤید هیۆم هاتون، بۆ ئێمە هەین؟ ئەگەر گەردون و سروشت بەو شێوەیە نەبوایە ئێمە دەبووین؟ کێ ئەو دیزاینەی داناوە؟ئایائەو دیزاینە پێویستی بە دیزاینەر هەیە؟ بۆ ئەو هاوکیشانە کاردەکەن ئی تر کار ناکا.. لەگەڵ کۆمەڵێك پرسیاری تر، دەڵێ وەڵامی هەمو پرسیارە زانستی وفەلسەفی وفکری و..لەهەناوی زانست وەرگرە بێ پەنا بردن بۆ خودا[1]، ستیڤن و (لیونارد ملۆدینۆ) ناوی نەبردوون ئەگینا لە بنەچەدا لایبنتز وهوایتهید ویلەر.. خاوەنی ئەو پرسیارانەن، لەهەموان نزیك تر لەو پرسیارانە (دیڤیز) هەڵوەستەیەکی زۆری لەسەر هەمان ئەو پرسیارانەی ستیڤن کردوە پیش ئەو، لایبنتز وەڵامیشی دایتەوەو دەڵێ: ئەو جیهانەی ئێمە خوا وای هەلبژاردوە تا گونجاوترین بیت بۆ بەردەوامی بوون وژیان[2]، هەندێ فەیلەسوفی تر وەڵامیان وایە: لە ئەسلدا خوا بۆیە بوە تا ئێمە ببین[3]،نیوتن بەوورد تر بۆی چوەو دەلێ ناتوانین هیچ هۆکاریك لەو سروشتە بدۆزینەوە ببتە بنچینەی یاساکانی سروشت مەگەم تەسلیم بەوە بین کە یەکی زۆر عاقل ئەوەی دانابێت،ئەوەش رێك لەگەل ئەو تیۆرەی (خلق وئەمر)ی ئیرە ریکە کە پیشووتر ووتمان (ئەمر) ویاساکان هۆکاریان نیە ،لیرەدا هەمو تیۆرەکانی ستیگن وهاوتاکانی تەرتو ویران دەبێت ، ئینجاپیشوو تریش وەلامان دایەوە،ئایەتەکانی **(ولا تجد لسنتنا تحويلا)** (.. **ولن تجد لسنة الله تبديلا** )وەلامیەتی ، ستیڤن لە هەوەل

---

[1] دیزاینی مەزن ل251

[2] مدخل الى الفلسفة ص128

[3] المثالية الألمانية ص364

بڕیاری ئەوە دەدا فەلسەفە مردووە وناتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە، لەناو زانستیش پێ ی وایە تەنها فیزیا و لەناو فیزیاش تەنها لقی (کوانتەم) دەتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە، پالپشتی کردۆتە سەر ئەکزیۆمێکی هەلە و دەڵێ دەتوانین یاساکانی بایۆلۆجیا دابەزێنینە خواروو تر بۆسیستەمی کیمیاوفیزیاو..[1]، ڕاستە ڕەهەندێك لەیاساکانی فیزیایی وکیمیایی وبایۆلۆجی لە یاسای میکانیکی پیك هاتوە. بەڵام پێچەوانەی ڕاست نیە، ناتوانرێ یاسای میکانیکی بەسەر بایۆلۆجیا وکۆمەل پەیڕەو بکرێ.

لەسەرەتای کتێبەکە باسێکی مێژووی فەلسەفە و زانستی کردووە، هەوڵی داوە بۆ وەڵامی (هەبوونی خودا) وەك تیۆرەکەی (فریزەر، لاپلاس، ئەنجلس..) دەقی ئەفسانەش بهێنێتەوە، لەو ڕوانگەوە گوایە لەسەرەتا زانستی ئەفسانە و فرە خوایی هەبووە، هەندێ خوا قوربانی و بەرتیلیان پیدەدرا و بۆ رەزامەندیان وتووڕە نەبوون کارەسات نەبوون، هەندێ تێڕوانینی تر خوایەکی تەمبەل و پەککەوتوو پیشان دەدرا، دوایی بەرە بەرە لەگەڵ گەشەی زانست جێ ی (فکرەی خوا بوون) لەمێشکی مرۆڤی نوێ تەسك بوویتەوە، لەجیاتی ئەو یاسای سروشت و (زنجیرەی هۆکار و ئەنجام) دەدۆزرانەوە، تا ئەو ڕادەیە ئینقیلابی زانستی و فەلسەفی لەسەر (ناوەندیەتی زەوی و ئادەمیزد)یش لەگەردوون کرا، دەرکەوت ئێمە تاکە گەردوون نین بەڵکو ($10^{500}$) جۆرە گەردوونی جیا هەیە، هەروەها هەسارەکەشمان تاکە هەسارە نیە کە ژیانی لێ خولقا بێت، بەڵکو لەوهەموو گەردوونە بەهەزاران هەسارەی تری وەك زەوی خاوەن شارستانیە، لەبارەی پرسیاری ئاخۆ کێ ئەو گەردوونەی دروست کردووە، کە پێ ی وابووە ئەو پرسیارە بۆسەیەك بووە هیچ زانا و فەیلەسوفێك لێ ی دەرباز نەبووە، ئەو بۆیەکەمجارە لێ ی دەردەچێ، ئەو دەڵێ لە

[1] فیزیاء العقل البشری والعالم من منظورین – فصل6 اعتراضات ستیفن.. ص191

بنەچەدا فکرەی (گەردوونی وەستاو) یان (قدم العالم- ازلـی و ابـدی) لەسـەردەمی تالیس وئەنکسامیندەر وئەرستۆ و پتلیمۆس لەکتێبی (مەجەستی) هاتوە، ئەوا بۆ ئەوە بوو ڕوو بە ڕووی ئەو پرسیارە نەبنەوە ئاخۆ کێ گەردوونی دروست کردووە.

ستیڤن پرسیارە کلاسیکیەکە دوبـارە دەکاتـەوە دەڵـێ ئەگـەر خـوا گـەردوونی دروست کردبێت ئەی کێ خـوای دروسـت کـردووە؟ بـەڕای خـۆی چارەسـەری ئـەو پرسیارەی کردووە، بۆیەکـەم جاریشـە چـارەی پرسـی (خلـق)ی کـردووە، وەڵامـی فەلسەفی پەیدابوونی (مادده) لە (هیچ)ەوەی دایتەوە، ئەو دەڵێ لەسەرەتادا مادە و هیچ شتێك نەبووە، تەنها (کێشێك)ی ئەوەندە کەم لـە نزیـك سـفر هـەبووە، ئـەوە بویتە هۆی خولقاندنی مادە و لەوێوە بەتیۆرەکەی (big bang)ی دەبەستێتەوە، بەو شێوەیە ئەو دەڵێ تەواو فیزیای کوانتەم کۆتایی بەجەدەلی هەزاران ساڵەی بوون و نەبوونی خودا هێنا.

ئێستا دەرکەوت کە چۆن بۆ بەڕێوەچوونی گەردوون پێویسـتمان بـە خـودا نیـە، ئاواش بۆ دروسـت بـوونی گـەردوون پێویسـتمان پـێ نـابێ، وەك ڕایـە کۆنەکـەی (ئەناخسیمەندەر) گۆتەنی تەرازووی چاکە و خراپە و(ڕاستی) و پاداشت و سزا نیـە بۆ ئادەمیزاد، بەڵکو وەك (دەهریەکان) دەڵێن لەمادە دەبن و دەشبنەوە مادە، ئیتر (ڕاستی) و (بەها) و چاکە و خراپە نسبین چەسپاو نین، بۆیەش یەك مێژوومان نیـە بەڵکو کۆمەڵێك مێژوومان هەیە، ناتوانرێ نە حیساب لەگەڵ گـەردوون و سروشـت بکەی نە لەگەڵ ئادەمیزاد.

## پەیدابوونی گەردوون بێ خودا:

لەپێشدا دەبێ ئـەوە ڕوون بکەینـەوە کـە پرسـی (پەیـدابوون) ئـەرکی زانسـت وفەلسەفە و ئایین و تەواوی مەعریفی ئادەمیزادە، جا ئەگەر تەنها ئـەرکی زانسـت نەبێ چۆن وا بچووك دەکرێتەوە پرسی (خلق) و پەیدابوونی گەردوون لە هیچەوە بـۆ

(بوون) تایبەت بکرێت بە فیزیای کوانتەم، ئەوا لە ماوەیەکی تـر و لەگەشـەکردنی زیاتری فیزیای نویٚ ئەو بۆچوونە دەبێتە گاڵتەجاڕی.

هەڵبەتە مشت و مڕێکی زانستی و فەلسەفی و ئاینی یەکجار زۆر کراوە لەسەر (پەیدابوون) زانیاریەکی زۆر لەبارەی نهێنیـەکانی (بـوون) و (گـەردوون) بەدەسـت هاتووە، بەڵام (لەبارەی نێوان بوون ونەبوون)ەوە لەبارەی سەرهەڵدانی (بوون)ەوە تـا ئەو ساتە زیاترنەوتراوە لەوەی ئایین دەیڵیٚ، ئەوەیە کە ئایین دەڵێت (خوا) دروسـتی کردووە، کۆتایی بە هەزاران پرسیار دێت، تەنها یەك پرسیار قووت دەکەنەوە دەڵێن ئەدی کیٚ خوای دروست کردووە؟ ئەوەشی ژێرخـانی لـۆژیکی پرسـیارەکە ناتـەواوە هەروەك لەبەشی ($3$)بەدواوە وەڵامی ئەو پرسیارە درایتەوە.

هەرچی دیزاینی مەزنە هەوڵی داوە وەڵامێکی بەدیل بداتەوە و دوو ئـەکزیۆمی پیشەکی داناوە، دەڵیٚ گەردوون لـە (کـێش) دروسـت بـووە لـە نێـوان کۆمـەڵێك گەردوونی تر، لە هەردووکان بوویتە هۆی پەیدا بوونی مادە، واتا کێشی لـەجیاتی خوا دانـاوە، هـەمان تەقەلاکـەی ئـەبیکۆرە کـە ووتـی لەسـەرەتا ئـەتۆم هـەبوەو بوونەوەری لیٚ دروست بوو، ستیڤنیش دەڵیٚ کیش هەبوە، کەچی (کیش) یاسایەکی خواییە وپێویستی بە مادەو بارستایی هەیە.

لەنگیە گەورەکە لەوە دێت بە مەنهەجی زەوجیانەبۆ فەلسەفەی (شت) نەچـوە، بۆ بوونەوەریش بەیەك ڕەهەندی بۆی چوە، وای داناوە دەکـریٚ (شـت) لـە (ناشـت) بخولقیٚ بە فەرەزیەك دیسان هەمان کێشەی ئەو مەنهەجەی هەیە دەڵیٚ:لەو کاتە کە کـیش و ووزەیـەك لـە فـەزا هەیـە ئەوەندەکەمـە نزیـك سـفرە،..یەکەم جـار زانا(ئۆستفالد) ووتی پیش بوون لەو بوونەوەرە ووزە هەبوە ، ستیڤن ئەو زانیاریەی لەوی وەرگرتوەو بـە جـۆریکی تـر بـەکاری هینـاوە، دیسـان لـە پـال ئـەو هـەمو گەردوونەی پێویست بوە بۆ پەیـدا بـوونی گـەردوونی ئێمـە پێویسـتی بـە تیـۆری (ڕێکەوت-صدفە)بوویتەوە، (مالکوم لونجیر) لـە پیشـەکی کتێبـی(فیزیـاء العقـل

البشری والعالم من منظورین) دەڵێ بوونەوەر زۆر بە ووردی وستاندەر دروست بوە نەبواری هیشتۆتەوە بۆ ڕێکەوت نە بۆ بێسەروبەری(قصور حراری)[1]، ئەو(کیش)ە ئەوەندە سادەو کۆتایی نیە زانیاریەکانی تری لەسەر بنیات بنێی، ئالۆزی هەرە گەورە لە دوای ئەو(کیش)ە چیە؟

نیوتن دەلی بەهۆی (کێش)هەمو سروشتم لیك دایەوە بەڵام خۆم لە (کێش) نەگەیشتم[2]، کیش وەك یاسا بەتەنها ئەوە ڕەهەندی دووەمە ،بەتەنها یەك یاسا نیە کۆمەلیکی زۆرن پێکەوە،ئەگەر وەك بوون بەرجەستەی کیش بکەین (واتە لە هەردوو ڕەهەند) لەنگیەکە زیاتر دەردەکەوێ، با(کیش)ەکە چەند بچوك بێت هەر شت حیسابەوزەوجیە-خلقە، لەلایەکی تریشەوە (کێش) هەرگیزا و هەرگیز بەتەنها نیە، کێش لەپەیوەندیەکی ڕاستەوانەیە لەگەڵ بارستە، (ه ڕاستەوانە ب)، واتا لەپێشدا بارستە هەیە ئینجا کێش دەبێت، با هەرچەندە (کێشەکە) کەمیش بێت مادام (بیرکاریانە) (کێش > سفر) هەتا زۆر بچوك بێت هەر بارستەیەکی لە پشتە، بارستەش گەوهەری مادەیە کەواتە تیۆرەکەی ستیڤن هۆوکینگ هەر مادەی بە مادەی لێك دایتەوە نەیتوانیوە لە چوارچێوەی (فەلسەفی دەهری) یان (naturalism) دەرچێت، هەر هەولە کۆنەکەی فەلسەفەی مادی ودیدی یەك ڕەهەندیە بۆ بوونەوەر، نەیتوانیوە داکانەی (بوون) بە دوو ڕەهەندی بدۆزیتەوە، ستیڤن هۆکینگ ویستویەتی خۆی لە ئەسلی تیۆرەکە لابدا کەلەلایەن(نظریة الأوتار-11بعد)دەڵێ ئەو کێشە لە نێوان گەردونە تەریبەکان دروست دەبن و دەبتە هۆی بەرپا بوونی(تەقینەوە گەورەکە-بینگ بانگ) ودروست بوونی گەردوونی ئێمە، بۆیەش تەقەلای هۆکینگ شکستی هێناوە کە بتوانێ بزانێ لەپێش ( big

[1] روجر بنروز، ابنرشیمونی، نانسی کارترایت، ستیفن هوکینغ- فیزیاء العقل البشری والعالم من منظورین ص13

[2] ف انجلس-دیالکتیك الطبیعة ص37

bang) چ هەبووە، زەمان و زەمینی نێوان بوون و نەبوون دیاری بکات، لە ڕاستیدا زەمان لەو کاتە دەست پێدەکا کە شتومەکەکانی بونەوەر دەستیان کردووە بە بەرجەستەکردنی بەرنامەکانیان لە ئیمکانەوە بۆ واقیع، لە ئەرکەوە بۆ جێ بەجێ کردن، زەمان بەدەر لەمادەی (بەرنامەپێدراو) مانای نابێت کە بەهەردوو لا یاساکانی سروشت پێك دەهێنن، کێشیش بەشێکی بچوکە لە یاساکانی سروشت، واتە پرسیاری بنچینەیی (بوون) لەلایەن ستیڤین وەلام نەدراوە تەنها ژمارەیەکی نوێ ی لە (فەرەزیە) زیادکرد، لە سەرکەوتوو ترین دۆخیداستیڤن تەنها وەك لاپلاس ودیکارت چۆنیەتی ئیدارەی یاسای سروشتی بەسەر گەردوون دۆزیەوە، ئەوە چۆنیەتی بەڕێوە چوونە، ئەوەی ستیڤن چۆنیەتی دەست پێکردنی خلقە، کە قورئان خۆی داوای کردوە (قل سیروا فی الأرض فأنظرواکیف بدا الخلق —سورة العنکبوت ایة 20) بریا سەرکەوتو بوایە خزمەتیکی گەورەی زانست وتەفسیری قورئانە.

ئەوەی لە دێزاینی مەزن خزمەتێکی گەورە بە فەلسەفەی مادی پێشکەش کردووە کارێکی ترە، ئەویش بریتیە لە دۆزینەوەی ($10^{500}$) جۆرە گەردوون، لە ڕاستیدا جاران تەنها ڕای ئایینی بوو کە چەندین ئاسمان و گەردوون هەیە، لە قورئان باس لە (7) ئاسمان دەکات (الم تروا کیف خلق الله سبع سماوات طباقا)[1]، لە ئینجیلی بەرنابا باس لە (9) ئاسمان دەکات (الحق أقول لك ان السموات تسع موضوعة بینها السیارات)[2]، لە قورئان باس لەوەش دەکا لەهەر ئاسمانێك جۆرە یاسا و ڕێسایەکی جوداتر لەوەی تر بەڕێوەدەچێ، بەلأم زۆر بە زەحمەت بۆ ئێمەی

---

[1] سورة نوح ایة15

[2] انجیل برنابا- فصل78 ایة 6 واپیدەچی ئینجیلی برنابا هەریەکە لە (کرسی) و(عرش) ی بە خولگە هەژمار کردبێ وبە 9 ئاسمانی گوزارش کردبێ، چونکە لەبارەی گەردوون اخوان الصفا نەخشەیەکی گەردوونی کردبوو بریتی بوو لەناوەندەکەی زەوی دوەم فەلەك مانگ سییەم عەتارد، تا دەگەیشتە فەلەکی 7زوحەل بوو، فەلەکی هەشت کرسی بوو فەلەکی 9 عەرش بوو لەسەر ئەویش خوایە.

بەشەر بتوانین چۆنیەتی بەڕێوەچونی گەردوون بە (یاسای سروشتیەکەی) جیا لــەوەی خۆمان پیێ تەسەور بکریێ، بۆیە زۆر بەکەمی و دەگمەنی لە تەفسیرەکان ئەو ئایەتە بەو شێوە زانستی و فەلسەفیە شرۆڤە کـراوە، کێشــەی گـەورەی فەلسـەفی ئـایینی ئەوەیە تا زانایەك دۆزینەوەیەك دەکا ئینجا جورئـەت دەکـەن هەڵوێسـتی ئـایینی لەبارەی ئاشکرا بکەن، خۆیان پیێ ی هەڵناستن، لەوەشـەوە تـا لـە 1954 (هیـو إیفیرت) و(ویلەر) ووتیان فرە گەردوون(**Multiverse**)هەیەو باسیان لە گـەردوونێکی تری تەریب بە گەردوونی خۆمانی کرد، ویلەر وتی یاسـا و ڕێسـای ئـەو گـەردوون لەگەڵ ئەوەی خۆمان زۆر جودایە[1]، ئینجا ئاینیەکان ووتیان ئەوەتە لـە قورئـانیش هەیە، کەواتە ئەوەی ستیڤین هۆوکینگ دەیڵێ فرەگەردوون هەیە تازە نیە، جگە لە سەرچاوەی ئاینی ودوای ویلەر وئیفریت لەکۆنیش (لایبنیتز) لەسـەردەمی نـاپلیۆن ووتی زۆر تر لە جیهانیـك هەیـە[2]، دوای هوایتهیـد لەسـەرەتای سـەدەی بیسـتەم هەمان تیڕوانینـی گەلالـە کـرد وووتـی: واپێدەچـێ چـەند جـۆرە گـەردوونێك بـە سیستەمی جیا لـەو گەردوونـەی خۆمـان هـەبێ[3]، (راسـل)یش بەهـەمان شـێوە، هـــەبوونی $10^{500}$گـــەردونی بچـــوك و گـــەورە تەمـــەن کـــورت و تەمـــەن درێژ، .خزمەتێکی وا بە فەلسەفەی مادی ناکا وەك سـتیڤن دەڵـێ چـۆن زانسـتی سروشتی توانی ئەو چاکەی ئیدارەی گەردوونی لەلایەن خوابەسەر بەشەر لاببا، چۆن داروین چاکەی دروست کردنی مرۆڤیشی بۆ خـوا نەهیشـت، ئـەوا (فرەگـەردوونی) چاکەی خوا بۆ دروست کردنی گـەردوون وبونـەوەر نەهیشـت وکۆتـایی هـات[4]...، چەوتی ئەو بانگیشە گەورەیەی ستیڤن لێرەوە دێت ئاخۆ دیکارت یاسـای سروشـی

---

[1] دوای لە (نظربة الأوتار) کە لەلایەن فیزیازانی یابانی- میشیو کاکو دۆزرایەوە بە (11 ڕەهەند) پشتگیری لە فرە گەردوونی کرد.

[2] مدخل الی الفلسفة ص128

[3] مدخل الی الفلسفة ص303

[4] دیزاینی مەزن ل244-246

دۆزیەوە یان دروستی کرد، نیوتن یاسای کیشی دۆزیەوە یان دروستی کـرد، ئـاواش بۆ داروین وستڤن و..، هەردوو لا چاکەیە ئەوەی دەیدۆزیتەوەو ئـەوەی دروستیشـی کردوە، بەڵام کامیان چاکەکەی گەورەترەو کام کاریش گەورە ترە؟ لـەو ڕوەوە وەڵام وخزمەتیکی پیێ نیەو قەلۆشە، بـەڵام تیۆرەکـەی سـتیڤن خزمـەتیکی تـر دەکاکـە لەسەروو بەلێنماندا باسی بکەین لێرە باسی دەکەین :

جاران لەسەردەمی تیـڕوانینی گـەردوونی وەسـتاو کـە لەبنچـینەدابەڕێکی لـە کتـێبی (مەجەسـتی) هـاتووە، کەتیایـدا گـەردوون و بونـەوەر تەمـەنی نیـە و هەتاهەتاییە، بیێ سنورە لە زەمان و زەمینی، ئاسۆیی وستونیانە هەر هەبووە هـەر دەمێنیێ و سنور و لێواریشی نیە، ئەو تیێڕوانینە بوە هۆی سـەرهەڵدانی شـەبەنگی فراوانی تیۆری پەرەسەندن، سەرجەم مەدرەسە فەلسەفیەکانی مـادی پشـتیان بـەو شەبەنگە و گەردوونی وەستاو بەست، بەڵام لەدوای جیێگرتنەوەی (گەردونی کشـاو) یان (bin bang) کە تیایدا دەرکەوت ئەو گەردوونە تەمـەن و ئەجـەلی هەیـە، بوار بۆ تیۆر و ئەگەری سەرهەڵدانی ژیان لەبیێ ژیان نـامێنیێ، بەوشـێوەیە تـەواوی تیۆری پەرەسەندن لە مەدرەسەی یۆنانی کۆن تا دەگاتـە مەدرەسـەی (مۆرگـان) و (لامارك) و (داروین) تێك ڕوخا، یەکسـەر فەلسـەفە و تیـڕوانینی ئـایین لـەبارەی (بـوون) (پەیـدابوون)، (ڕاسـتی و سیسـتەم)، (مێـژوو وچـارەنووس )... هاتـەوە مەیدان.

بەڵام مدرسەی مادی دەستەوەستان نەوەستان بیرۆکەی(گەردوونی هـەژان-کـون المتذبذب)یان هێنا کایەوە گوایە دوای ئـەوەی گـەردوون دەگەڕێتـەوە جـارێکی تـر دەتەقیتەوەو بوونەوەر هەر دەمینیێ و کۆتایی نیە، بەلام ئـەوەش سـەرکەوتونەبوو، لێرەدا جارێکی تر ستیڤین هۆکینگ دەتوانیێ هەناسەیەك وەبـەر جەسـتەی (تیـۆری پەرەسەندن) بەجۆرێکی تر بداتەوە ،کە بریتیە لـە تیـۆری (دەرفـەت) لـەو هـەمو ئەگـەرەی $10^{500}$ گـەردوون دەشـیێ ژیـان بـە (ڕێکـەوت) و ئەگـەرێکی دەگمـەن

سەرهەڵبدا، بێ پەنا بردنە بەر خودا، یان بەلای کەمەوە توانای فکری ئایینی و فەلسەفەی باوەڕدار نامێنێ بوونی دەستی خودا لەدروستبوونی گەردون یەکلابکاتەوە، چونکە بانگێشەی ($10^{500}$) جۆرە گەردوون بنچینەیەکی وای زانستی و عەقلی نیە، تا گفتوگۆی لەسەر بکەین تیۆریکە ناچارین بەجێ ی دەهێڵین بۆزیاتر گەشەی زانستی، چونکە مێژووی فەلسەفەی مادی هەر وا هاتووە وەك ئاینی نیە، بەشەکانی بە ئاسۆیی و ستونی هەماهەنگ بن لەگەڵ یەکتر، بەڵکو ناتەبان تا ڕادەی دژ بەیەك و پەرتەوازە، لە سەفسەتای دەستی پێکردووە.

لە ڕاستیدا ستیڤن دەیەوێ خۆی وزانستەکەی دوا پەیامی حوکم بێت لە زانست وفەلسەفە وئاین، دەیەوێ بڵێ لەکۆنەوەئەرستۆو یۆنانیەکان کاری زەویان بە یاساو(هۆو ئەنجام)دۆزیەوە و خوایان لەکاری زەوی دوورخستەوە بۆ ئاسمان،دیکارت وهۆلیاخ ونیوتن یاسای سروشتیان دۆزیەوە خوایان لە ڕووداوەکانی ئاسمانیش خانەنشین کرد، داروین وتیۆری پەرەسەندن خوایان لە دروست کردنی مرۆڤیش دوور خستەوە.. خودا تەنها (خلقی) لەدەست مابوو ئەوا (لەو تیۆرەی سیڤن)ئەویشمان لیستاندەوەو ئەو بوونەوەرە بێ خودا بوەو واش دەمێنێتەوە.

کەچی بە پیچەوانەوە ئەو تیۆرە زانستی وفلسفیانەیە یەکەیەکە کەوتن ودەکەون، هەردوای فەلسەفەی یۆنانی مادی پێ ی وابوە زەوی ناوەندی گەردوونە مادەی زەوی و ئاسمانی لێك جیابۆوە، فەلسەفەی مارکسی بنچینەکەی (لانهائیة العالم و وحدتە) بوە، لەکاتێکدا فەلسەفەی (دیزاینی مەزن) هاتۆتە سەر فرەگەردوونی بۆیەش ناوی جیا جیای وەك سەفسەتایی، مادی، دەهری، تەبیعی، میکانیکی دیالیکتیکی تەتەوری...هەلدەگرێ.

براتراند راسل دەڵێ ئەگەر زۆر بە ووردی زانست وزانیاریەکانی ئەرستۆ لە قەپان بدەین یەك ڕستەی ساغی لەو سەردەمە لێ دەرناچێ، دلنیام پاش ماوەیەکی کورت هەمان حوکم لەسەر بۆچونە فەلسەفیەکانی ستیڤن دەدرێت، ئەو جۆرە

فەلسەفەیەی ئیستاش ڕەنگە ناوی (فەلسەفەی پارتی زانی) پێ بوترێ باشە، لەوەی دەشکێ پەنا دەباتە شوێنێکی تر، لە زانستەوە بۆ فەلسەفە، جاروایە دەشلێ فەلسەفە هەر نەماوە.. و بەزەحمەت (جەدەلیەتەکەی) کۆتایی دێت.

## ڕاستی و فرە ئەگەروفرە مێژوو:

**ڕاستی وفرە مێژوو:** باس کردن لەفرە مێژوو چ بۆ شتومەکەکان یەکە یەکە، یان بۆ گەردوون یان بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگە وهەرچی سیستەم و یاسا و ڕاستی هەیە سەراوژێری دەکاتەوە، مانایەك نامێنێت لەسەر دونیا و لەژێر دونیا بۆ دەست نیشان کردنی "ئیجابی و سلبی" و " چاکە و خراپە" و "سزا و پاداشت"، مانای وایە رژێم و سیستەم و یاسای کۆمەڵایەتی و شارستانی یاخی بوونە، ئەوە بەشێکە لە فەلسەفەی عەبەسی، کە زۆربەی ئەو تەیارە فەلسەفیانە دەگرێتەوە باوەڕیان بە (ڕاستی) چەسپاو نیە، لەو کتێبە(دیزاینی مەزن) لەبەشی (3) ڕا بە (حەقیقەت چیە) و لەبەشی (4) (مێژووە ئەلتەرناتیڤەکان) باسی دەکا، کە دوای دەگاتە ئەوەی ئینقیلاب لەسەر (حەقیقەت) بکا و لەجیاتی ئەو (ریالیزمی وابەستە) بەکاربهێنێ، دوای دەڵێ (یاساکانی سروشت ئەگەری گۆڕانی هەیە)، دوای دەگاتە ئەنجامێکی ترسناك و بڕیاردەدا ($10^{500}$) فەزا هەبێت، ئەو سەرەنجامەی لە فرە ئەگەر وفرە مێژوو وفرە ئەنجام بۆ دروست بوو، لە بنەچەدا (فەینمان ) بۆچوونی وابوو کە سیستەمەکان و گەردوونیش یەك مێژووی نیە.

ستیڤن لەبارەی(فەلسەفەی ڕاستی) وەك زۆربەی فەیلەسوفەکانی مادی وەسفی ڕاستی کردووە کە مارکسیەت کۆی کردیتەوە دەڵێت "هیچ شتێك وەك ڕاستی و ئەخلاق نیسبی نین"، ستیڤن لە زەردەماسیەکەی ناو شوشە ئاوەکە دەست پێدەکا دوایی وەك مارکسیەت نمونەکەی تیروانینی گەردوونی لە کۆنەوە بە نمونە هێناوەتەوە و پێ ی وایە جاران حەقیقەت لای کۆمەڵگە ئەوەبوە کە زەوی ناوەندی

گەردوونــە و ڕۆژ و مــانگ و ئەســتێرەکان بــەدەوری دەســوڕێن، لــەدوای لەســەر دەستی(کۆپەرنیکۆس و گالیلۆ و کیپلەر) ئــەو ڕاســتیەگۆڕا[1]، لیێــرەدا ســتیڤن وەك مارکسیەت لەوە بەهەڵەداچووینە کە (راستی) و (زانیــاری مــرۆڤ) تێکــەڵ کــراوە، فاینمانیش کە دەڵێ گەردوون مێژووی سەربەخۆی نیە مانای راستی سەربەخۆ نیــە زانیاری مرۆڤ گۆڕاوە.

ئەوکاتە مانای گۆڕانی ڕاستی دەبەخشێ ئەگــەر لــەو فــەترە بــە ڕاســتی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە بە دەوری زەوی ســوڕاببنەوە و دوای لەســەردەمی کۆپــەرنیکۆس وەرگەڕابێت ئەو جارە زەوی سوڕابێتەوە..، ئاوا نیە، راستی چەسپاوە و بــەدەرە لــە جم وجۆڵ و ئاستی زانیاری ئێمە، پەیوەندی زانیــاری مــرۆڤ بــە (راســتی ) ئەوەیــە ئێمە ڕۆڵی (مکتشف) دەبینین نەك دروســتکردنی راســتی (وەك برجســۆن بەهەڵــە وادەڵێ) "قیمە المعرفە"ش هەر بەوە دەپیورێ چەندە ڕاستی دۆزیوەتەوە لەوێ ئارام و چەسپاو دەبێ، ئەگینا زانیاری لە جولە دەبێ هەتا لەگەڵ راســتی جــووت دەبــێ، دەشێ بلێین مادام (هرکلیت) وای زانیە تیرەی مانگ (یەك پێ یە) ئــەوە ئــەوکاتی ڕاست بووە بەڵام ئێستا گەورە بووە بۆ نزیکەی(4000) کلم، یان وەك ســتیڤن لــە (ل74) دەڵێت دوو (ڕاستی) جیاواز لەلای ئێمە و زەردە ماســی دروســت دەبێــت، بــەڵام ڕاســتیەکەی ئەوەیــە (ڕاســتی) جیــاوازە لــە ڕەئــی ئێمــە و ڕەئــی زەردە ماسیەکەش. ئێمە بۆ ساغکردنەوەی فرەمێژوو بۆ گەردوون و هەر شت و مــەکێکی تر پێویستمان بە هێنانەوە بیری (ســیفەتەکانی ڕاســتی- لەبەشــی پێنجــەمی ئــەو توێژینەوە ) یە.

لێــرەوە پێویســتیمان بــەوە هەیــە کــە بــزانین (ڕاســتی) فرەنیــە، یەکانیــە، تاقانەیە،...(حقیقە جزئیە) (حقیقە تقریبیە)...نیە، یەك راستی هەیــە نــەك فــرە،

[1] دیزاینی مەزن-ل34، ل73، ل80،

واتە 3×4 دەکاتە 12، ئەوە وەڵامی ڕاستیە بە ستونی وئاسۆیی، لە ئیستاو بۆ هەتاهەتاییێ وبۆ سەر مانگ وئەستێرە هەر ئەو ڕاستیەیە، وەڵامی ناڕاستیش فرەیە، ئەگەر لای زەردەماسی 15دەرچوو لای مرۆڤیکی تر 20 دەرچوو ئەوە مانای فرە ڕاستی وفرە مێژوو نیە، ئەوە فرە وەڵامی هەلەیە، بەڵام وەڵامی ڕاست تەنها (12) یە، لە قورئانیش راستیەکان بەتاك مفرد هاتووە، هەڵەکانیش بە کۆ (جمع) هاتوون. هیچ نێوبژیەك لەنێوان ڕاستی و ناراست نیە، ئەگەر دوو وەڵامی جیا یان زیاتر بۆ 3×4 هات زەردە ماسی وتی 15ئەویتر وتی 20وەك (ناوەندی دارگرتن) بڵێت با نێوبژێتان بۆ بکەم نە (15) ی تۆ و نە (20)ی ئەوی تر با (17و نیو) بێت و ئەوە ڕاستیە، نەخێر! ڕاستی هیچ نێوبژی و سەودایەکی قبوڵ نیە، تاکانەیە و سیفەتی (unieqe)و (alone) ی هەیە، چەسپاویشە ناگۆڕێ، ڕەنگە دیکارت لەهەمووان بەڕوونتر وەسفی (یاساکانی سروشت)ی کردبێت وەك بەشیك لە( ڕاستی)ی و بەنەگۆڕکردبێ، بەکۆی ڕووداوەکانی هەر تەنێك، هەر سیستەمێك، هەر تاکێك، یان تێکڕای کۆمەڵگە و یان رۆژ و مانگ و ئەستێرە و تێکڕای گەردوون یەك ڕاستی تۆماردەکاو یەك مێژوو هەڵدەگرێ ،وەك زیاتر لە بڕگەکانی تر دەردەکەوێ.

**فرە ئەگەرو یەك ئەنجامی ڕاستی:** دەکرێ لەپێش ڕوودان چەند ئەگەر (ئیحتیمال) بۆهەر یەکێك لەوانەی سەروو هەبێ، ئاواش بۆ ڕێڕەو هەڵسوکەوتی ئەلیکترۆن تا دەگاتە ئەستێرە و مانگ، ستیڤن هۆکینگ دەڵێت هەروەك چۆن بۆ تەنۆلکەکان یەك ئەگەر و مێژوو نیە، ئاواش کۆمەڵێك مێژوو بۆ گەردوون هەیە ئەگەری زۆری لەپێشە[1]، ئاوانیە لەدوای ڕوودان ئەوا یەك (ئەگەر) دێتەدی، لەیەك کاتدا چەند ئەگەرێك نایەتەدی، لەدوای ڕوودان یەك ڕاستی دێتە دی و یەك

[1] دیزاینی مەزن-ل127

مێژووش تۆماردەکات، بۆهەر شتێك دەشێ فـرە ئەگـەری لـەپێش بێـت، لـەدوای ڕوودان یەك ئەگەریان دێتەدی دەبێتە یەك مێـژوو، دیسـان دەشـێ زانیـاری ئێمـە ڕاستی ئەو مێژووە نەدۆزێتەوە و فرەخوێندنەوەی بۆ ئەو مێژووە هەبێ، دەشێ فـرە ئەگەر پیش ڕوودان هەبێ بەڵام هەرگێز ناشێ فرە ئەنجامی ڕاستی و فرە مێـژوو بـۆ ڕابردوو هەبێ، دەشێ بۆ یەك ڕووداو فرە ڕیوایەت هەبێ بەڵام هەر یەکیان ڕاسـتە، دەشێ هەر ڕیوایەتێك بەشێکی ڕاستی ڕووداوەکە هـەلگرتبێت بـەڵام هـەر دیسـان لەکۆی پارچە ڕاستیە ڕیواتەکان یەك ڕاستی مەوزوعی لێ دەردەچێ، هـەر بۆیـەش فرە مێژوو لە فرە واقیع دروست نابێ یەك مێژوو دروست دەبێ، واقیع وڕووداوەکان دەم ودەندوکیان زۆرە بەڵام یەك گەدەو هەرسـیان هەیـە...، لـە پـیش ڕوودان دوو ڕەهەندی وکۆمەڵایەتی وسروشتی وگەردوونی هەیـە لـەپاش ڕوودان دەچـیتە یـەك ڕەهەنـدی و رەهەنـدی دوەم(کـە ڕاسـتیە)، واتـە ڕەهەنـدی (خلـق-مـادة-شـيء) وەردەچـەرخێ بـۆ ڕەهەنـدی دوەم، کەواتـە مێـژوو بریتیـە لـەو وەرچـەرخانە، ناسنامەکان تیکەل دەبن، لە مێژوودا مادی ونامـادی نـامینێ، ژیـان وبـێ گیـان نامینێ، نەبات وجەماد نامینی..هەموی تیکەل دەبێ لە مێژوەك کـە بـە تـوخمی زەمان ومەکان وچۆنیەتی ڕووداوەکە دەناسرێتەوە.

لە ڕاسـتیدا ئـەو فرەییـەی ڕیوایـەت و ئەگـەر ومێژوو..زاتیـە وئەنجامەکـەش مەوزوعیە، سەرچاوەی فرەئەگەری بۆ ڕوودانی هـەر سیسـتەمێك (جیۆلـۆجی یـان فیزیایی یان کۆمەڵایەتی) لە کەمی زانیاری ئێمە دێت، تا زانیاری ئێمە کەم بێـت ئەگەری زۆر دەبێت، ئەگینا لە بنەچەدا ئەو هەموو ئەگـەرە لـەپێش هـیچ شـتێك نیە(جگە لە پۆلەکانی ژیان)، بەڵکو یاسایەك ملکەچی کردووە و ڕێ ی پێگرتـووە، بەڵام ئێمەین هێشتا زانیاریمان کەمە ئەو یاسایانەمان نەدۆزیتـەوە، بۆیـە ئەگـەری زۆری دەبێ تا ڕادەی ڕێکەوت، هەروەك ستیڤن لە نمونەی تەنۆلکەکان لـە a بـەرەو b لە (لا206) دەڵێ هاوزەمان ڕێچکەی بێ کۆتایی هەیە بەرەو b.

با نمونەیەکی سادەتر وەرگرین: ئەگەر ئۆتۆمبێلێك لەهەولێر بجولێ ئەو ئەگەرانەی لەپێش دەبێ بەپێ ی لێك دانەوەی کەسێکی ڕەمەکی دەرەوەی ئۆتۆمبێلەکە: هەموو شارەکانی کوردستان+ ولاٌتانی دەرەوە+ بەغدا و شارەکانی عێراق+...بەلاٌم ئەگەر تەنها زانیاری ئەوەمان هەبوو ئەو شوفێرە (پاسەپۆرتی نیە) ئەوە ئەگەرەکان زۆر کورت دەبنەوە تەنها بۆ شارەکانی کوردستان، خۆ ئەگەر زانیاریمان هەر زیادی کرد ئەوا ئەگەرەکان کەم دەبنەوە تا دەزانین ئەوە دەچنە شەقلاوە بۆ سەیران و کە بەڕێ کەوتن دێتەدی و تەنها یەك ڕێرەو و یەك ئەگەر دێتەدی، ئەو ئەگەرانە یەکسان نین بۆ کەسە ڕەمەکیەکەو کەسێکی نزیك شوفێرەکەو خودی شوفیرەکە، کەواتە تا لە شوفێرەکە نزیك بینەوە ئەگەرەکان کەم دەبنەوە.

بە واتایەکی تر تا زانیاریمان زیاد بکا ئەگەر کەمتر دەبێتەوەو پێچەوانەی بە پێچەوانەوە، لە ڕاستیدا ئەو نمونەزۆر کێشەمان بۆ چارەسەر دەکا ئەگەر بیگشتێنین، لەپیشدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پیش بینی بۆ ئەو ڕووداوە سروشتی و کۆمەلاٌیەتیانەش ملکەچی یاسایە نەك ڕەمەکی، ملکەچی یاسای (زنجیرەی هۆو ئەنجامە)، لە بوونەوەر هیچ ڕووداوو ئەگەرێك بێ (هۆ) نیە تەنانەت سیستەمی ئۆتۆماتیکیش هۆدارەتەنها ئەوەیە ئەو ئەنجامەی لە هۆی پیشوو بەرپادەبێ جارێکی تر دەبێتە هۆ بۆ ئەنجامێکی پیشە خۆی.

کەواتە هەمو شتێك بەند کراوە بە هۆ، عەبەسی نیە، لە بنەچەدا مادیەی دیالکتیك ومادیەی میکانیکی هەریەکە بە جۆریك لێی بە هەلەداچووینە، بەلاٌم هەردووکیان لەگەلٌ فەلسەفەی میسالی وشوبنهاوەریش واتیگەیشتون ڕووداوی ڕیکەوتی ئەو ڕووداوانەن کەتەنها بە هۆکاری دەرەکی بەرپا دەبن وهۆکاری ناوەکی بەشدار نیە بۆیە پیش بینی ناکرێ وناخریتە چوارچێوەی یاسای سروشت، ماکس بلانك توند تر چوویتە ناو ئەو بابەتەو دەلٌێ ڕووداوی رێکەوت پیشێلی یاسای

(سببیه)، لەوبارەیەوە هۆلباخ جوانتری بۆچوە ودەڵـێ(لـیس المکـان للمصـادفة فـی سلسلة الأسباب والنتائج، فالمصادفة تدل علی جهلنا ذاتیابالأسباب الطبیعیة )[1].

لەلایەکی ترو بەپێچەوانەی ئەوانەفەلسەفەی مـادی میکـانیکی و ودیمـوکریتس وەك مەزهەبی جەبری دەڵێن هەمو ڕووداویك جەبریە هۆی دەرەکی نیـە، سـپینۆزا لەهــەموان تونــد تردەڵــێ(لایوجـد فـی الطبیعـة شـیء صـدفی انمـا یحـددوجودکل شیءوعمله بالخضوع لضرورة الطبیعة الإلهیة)[2] دەڵێ سودفە نیە فرە ئەگـەری نیـە، ئەوەش ڕەت بوونە لەکاردانــەوە بــەڵام مــادی میکــانیکی (وەك هۆلبــاخ) دەڵــێن سودفەو فرە ئەگەری لەکەمی زانیاریمان دێت، ئەوە زۆر ڕاستە وەك لەنمونەی سەروو کەمی زانیاریمان وادەکا پیشبینیمان بۆ ڕووداویك ئەوەندە کەم بیت بیخەینە خانەی (ڕێکەوت- صدفە)، وەك نمونە بیرکاریەکەی پیشووزیاتر شیَ کەینەوە:

ئەگەر بینیمان تەنیك بەو شیوەیە بەسەر ئەو ژمارانــە پـازدەدا (0، 2، 24، 256...) زەحمەتە بزانین لە پێنجەم ژمارە چیە و وادەزانین بە ڕێکـەوت دەکەوێتـە سەر ژمارەیەکی تر، بەڵام ئەگەر هـۆی ئـەو ئەنجامــەمان دۆزیــەوە، یاسـایەکەمان دۆزیەوە کە بریتیــە لەیاســای ($n^n$- n ) هۆکـاری ئـەو ئەنجامانەیـە، زۆر ئاسـان دەبیَ، ئەوا چاوەڕوانی ڕیکەوت(سودفە) ناکەین بەڵکو دەزانین لە بازی پینجەمیـدا دەکەوێتە سەر ژمارەی(3125) باقی ژمارەکانی داهاتوشی.

کەواتە نەزانینمان لە بارەی هۆی ئەو ئەنجامەو یاسـاکەیە ئەگـەری زۆری هێنـا ئارایەوە تا ڕادەی ڕێکەوت، ئەگینا بە هۆی یاساو سیسـتەمی(هۆو ئـەنجام) پـیش بینی گەورە کراوەو دوایش دۆزرایتەوە لەهەموان گرنگ تر دۆزینەوەی ئـەو هــەمو توخمەی لە خشتەکەی مەندەلیف دۆزرایەوە، بــەو شـیوەیەش زانـای ئـەلمانی(گالا) هەسارەی نپتۆنی بە هۆی (پەیوەندی حسـابی-2n) نیّـوان هەسـارەکان دۆزیــەوە،

[1] الفلسفة والفیزیاء ج1ص104
[2] الفلسفة والفیزیاء ج1ص119

لەوەوە ستیڤن هۆکینگ وهاوڕێکانی لەوقەبلاندنە گەورەیەی گەردون فرە مێژوو بەهەڵەداچووینە، هەرئەو ئەلکترۆنەی(لە نمونەی ستیڤن و هاوتاکانی لە فیزیای کوانتەم)گوایە لە(a) بەرەو(b) هەزاران ئەگەر و ڕێڕەویان لەپیشە دوای دەبینین یەك ڕێڕەوی گرتوە، بابزانین جیاوازی ئەو ڕێڕەوە چیە لەگەڵ ڕێڕەوەکانی تر؟پرسیاری هەرە گرنگی ئەو بەشەیە، هەر لەو پرسیارەش وەڵامی پرسیارەکانی ستیڤن وئەو بەشەی (فیزیای کوانتەم) دەست دەکەویٚ کە دەڵێن ئەگەر لە جیاتی ئەو یاسایا سروشتیانە یاسای تر هەبوایە چ ڕووی دەدا، وەڵامی ئەوەو پێشوتریش زۆر قورسە بەدیویێك بەڵام زۆرئاسانە ئەگەر پشت بە لۆژیکێکی پەیامی ببەستی، جیاوازی ئەو ڕێڕەوەی ئەلکترۆنەکە گرتیە بەر ئەوەیە: ئەوە ڕێڕەوەو ئەگەرە هەرە گونجاوەکەی گرتۆتە بەرکە دەبێتە هۆی جێبەجیٚ کردنی ئەرکی سەرشانی ئەلکترۆن کە بۆی دانراوە بۆ پاراستنی سیستەمی ئەو بونەوەرە، کەواتە لە بنەچەدا هەر ئەو ڕێڕەوەشی لەپێش بووە نەك چەندین ڕێڕەوی تر، بەڵام کەمی زانیاریمان وا پیشان دەدات کە ئەو هەموو ئەگەرەی لەپێش بێت، ئەوە بۆ هەمو بەشەکانی بونەوەر ئاوایە، لێرەدا ئەگەر (هۆ) لەو هەنگاوە دەربکەین دەبیٚ دان بەوە دابنێین کە ئەلکترۆن عاقلەو ڕوح لەبەرەو زانستی لە مرۆڤیش زیاترە بەوەی لە یەك هەزاری چرکە دەزانی لەنێو ئەو هەمو ڕێرەوەی لەپێشیەتی کامەی گونجاو هەلبژێریٚ بۆ ئەوەی گەردوون تێك نەچیٚ! ئەوە مەحالە..

<u>تیبینی</u> : ئەو توێژینەوەو سەرەنجامە وەڵامێکی تری (بەشی سێیەم: ناکۆکی سەرتاسەری - بوون ونەبوون لەیەك کاتدا)ە، لەوێش باس لە فرەئەگەری و بیٚ یاسایی بونەوەر دەکا، لێرەوە فەلسەفەی نوێی فیزیای کوانتەم و فەلسەفە کلاسیکیەکان دەگەنەوە یەك.

## یەك ڕاستی ویەك مێژوو:

کەواتە ئیستا وەڵامی پرسیارەکەی سەروو ئاخۆ ئەو بوونەوەرە فرە ئەگەر پەیڕەو دەکاو فرە مێژوو ئەنجام دەهێنێ ؟ نەخێر، بونەوەرو گەردون لەسەر (ئیحتمال وئەگەر) بۆ یەك چرکەش ناژی، بە سیستەمی(زار)ناڕوا، دەبێتە فەوزاو بێ سەروبەری وعەبەسی ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً﴾[1] ﴿..وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً﴾[2] ﴿..وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ﴾[3]، کەواتە هەر ئەوەیە هەموی لە بچوکتر تاکەشکەشان مل کەچی یاساو هۆو ئەنجامە لە چوارچیوەی یاسای سروشتی، ئەوە نیە هەندێك ملکەچی یاسا بن وهەندێکیش یاخی، یان هەندێکیان بە پێی یاسای گەردوونی ئێمە ئیش بکەن وبەشێکیش بۆ گەردوونی تر، لە بنەچەدا هەر دۆزەرەوەی فرەگەردوون(هیۆ ئیفریت) ووتی ئەو ئەگەرەی لە نێو ئەگەرەکانی بوونەوەری ئێمە دێتەدی، ڕەنگە ئەگەرەکانی تریش(کە لێرە نەهاتە دی) هاتبنە دی لە گەردوونێکی تر، بەو پێیە هەموئەگەرەکان دێتەدی بەڵام هەریەکە لەگەردوونێك، ئەگەر بە (گریمانە) ئەوە بە لۆژیکیش بزانین ئەوا بۆ بوونەوەری ئێمە فرە مێژوو دروست نابیت، بەڵکو بۆ هەر گەردوونێك یەك مێژوو هەیە جیا لەگەردوونەکەی تر، کەواتە چەند ئەگەر بۆ ڕووداویکی کوانتەمی ئەوەندە گەردوونە هەیە، لەوەوە پالپشتێکی هۆکینگ دەبێ بۆ هەبوونی $10^{500}$ جۆرە گەردوون، کە بناغەیەکی (فەرەزی زۆر لاوازە)، وەك ئەوە وایە کاتێ ئێمە ناتوانین رەگی هاوکێشەی ($x^2+1$) بدۆزینەوە ئەوا ئەو نرخە —کە دەکاتە رەگی ($-1$) لە گەردوونێکی تر

---

[1] المؤمنون : 115
[2] آل عمران : 191
[3] ص : 27

هەبێ، واتە گەردوونەکانی تر بریتین لە مەنفی ویاخی ونامەعقولەکانی گەردوونی ئێمە.

لەسەر ئەو بنچینە فرەمێژوو بۆ هیچ شتێك لەو گەردوونە نیە، بەڵکو مێژووش بەشێکە لە (راستی) و سیفەتی تاقانەی هەیە، بونەوەر لەسەر ئەو هەقە دروست بوە،پرۆسەی میژوو بریتیە لە وەرچەرخانی ئیحتمالات بۆ راستی ،واتە لە رەهەندی یەکەمەوە بۆ دوەم،زەمەنیش رێك ئەو رۆلەی نێوان وەرچەرخانی رەهەندی یەکەم بۆ دوەم دەبینی (لە ئیحتمالەوە بۆ یەکانەی راستی)،هەر لەو سۆنگەوە دەتوانین جیاوازی لە نێوان میژووی گەردوون و سروشت و کۆمەلگە بکەین،لەیەکەم ودوەما میژووی ڕودانی یاسایە،مسەیەرە،یەك ئیحتمال ویەك ئەنجامی هەیە ،لە سێیەمە کۆمەلیك ئیختیاری لەپیشە وکۆمەلیك ئیحتمال هەلدەگرێ بەلام کە رویدا یەکیانە نەك هەمو بۆیە یەك ئەنجامی دەبێت نەك فرە، لەوەوە زیاتر دەردەکەوێ ئەو بونەوەرە بێ سەروبەرنیە وەك لەبەشی سێیەم(ناکۆکی سەرتاسەری) بینیمان، هەر ئەوەشە وای کردووە ئێمەو سیستەم و ڕژێم هەبێ، دادگا و لێپێچینەوە هەبێ، بەوەوە توانیومانە یاساکانی سروشت بدۆزینەوە، بەوەوە ڕۆکێتەکان بەرەو ئاسمان بەڕێکەوتوونە، هەر بەوەشە تەرازوی چاکە و خێر لەدوا ڕۆژ یەخەگیرمان دەبێتەوە، هەر ئەوەشە وایکردووە سیستەمی گەردوون سروشت و ژیان هەماهەنگ بن، هەمووی بە بەرنامە و یاسا و ڕێساکان کاردەکەن، ئەوەنیە وەك لە (لا263 دیزاینی مەزن)واهاتووە (دروستبوونی خۆبەخۆ هۆکارە بۆ ئەوەی هەندێك شت لەبری هیچ هەبن) یان (m-theory) برێك چارەسەری هەیە کە ڕێگە دەدات بۆ بوونی ژمارەیەکی زۆر فەزا ناوخۆییە جیاوازەکان، ڕەنگە پێشبینی ($10^{500}$) گەردوونی جیاواز دەکات (لە لا185).

# تێکڕای دیزاینی مەزن:

ئەو کتێبە بە بەرگێکی زانستی پەتی دەستی پێکردووە و بڕیاری مەرگی فەلسەفەی داوە[1]، کەچی لە جیاتی فەلسەفە کۆمەڵێك هەڵوێستی لەناکاوی لە کەلێنی شرۆڤەی زانستی داوە، هەر لەهەمان لاپەڕە دەشڵێ ئەو پرسیارانە مولکی فەلسەفەن، لە (ل188) مەبەستی کتێبەکەی بە پرسیاری (بۆچی گەردوون هاتووە؟ بۆ بەوشێوەیە؟.. ئەوانە پرسیاری فەلسەفین. ئەو کارانەشی بەپێ ی پرۆگرامێکی فەلسەفی وورد دانەڕشتووە، بەڵکو ناوە ناوە و لەو شوێنانەی بناغەیەکی زانستی بۆ داناون و یەکسەر کردوویە بە هەڵوێستی فەلسەفی، بەشێك پێیان وایە ستیڤن زانایەکی گەورەیە بەڵام فەیلەسوفێکی بچوکە، وەك لە لا21 دان بەوە دەنێ کە ئەو کاتێکی زۆر تەرخان ناکا بۆ دۆزینەوەی خودا، بەپێی توانا هەڵوەستەیەك لەسەر بۆچوونە فەلسەفیەکانی دەکەین بەگوێرەی زنجیرەی لاپەڕەکان، تەنها وەڵامی ئەو بۆچوونانەی دەدەینەوە کە لەناخی فیزیای کوانتەم هەڵقوڵاوە، ئەوانەی کلاسیکیشن تەنها خاوەنە ڕەسەنەکەی بۆ دەدۆزینەوە:

- لە لا38 باس لەوە دەکا ئەو بونەوەرە دەکرێ دروست بێ لەهیچەوە بێ ئەوەی پێویستمان بە خوا و (خالق) و دروستکارێك هەبێ بەدەر لە سروشت، ئەوە هەمان ڕای کۆنی (دەهریەکان) و (naturalism)، ڕای کۆنی هرکلیتیشە کە ووتبووی(بوونەوەر یەکەوکەسیش دروستی نەکردوە، هەرواش دەمێنێتەوە، بەرێك وپێکی دەگۆڕێ)[2]، لەدواییش دەقی ئەو گوفتەیە لەلایەن فریدریك ئەنجلیس هاتوە " دەتوانین لەو گەردوونە بگەین چۆن دروست بوە و چۆن کار دەکا بێ ئەوەی پێویستیمان بە خودا (یان هەر زیادەکی نامۆ هەبێت)"، لاپلاس و هۆلباخ وزۆری

---

[1] دیزاینی مەزن- ل32،
[2] ملاحظات فلسفية- ط روسية ص318

تر وەك لینین ووتویانە: هەرچی هەیە بریتیە لـە مـادەی جـولاو[1]، لـەدوای هـەمو ئەوانە تازە ستیڤن ئەوەی دووبارە كردۆتەوە، دوایی لەدرێژەی ئەو ڕەئیەی لەهەمان لاپـەڕەدا دەگاتـە هـەمان ڕای بـەناوبانگی (فیوربـاخ) كـە دەڵێـت بچـوكی وبـێ دەسەڵاتیمان لەچاو سروشت خوامان دروست كـردووە، واتـە خـوا ئێمـەی دروسـت نەكردووە بەڵكو ئێمە خوامان دروست كردووە، ستیڤن بەهەمان شێوە دەگاتـە ئـەو بۆچونە فەلسەفیە و دەڵێت (... ئێمە زۆر بچوك و كەم بایەخین، ئەمەیە لەهەسـتی ئێمەی مرۆڤدا خوای دروستكار چێ دەكات)[2].

- لە لا44-45 باس لەوە دەكا بیرۆكەی خودا لەوە دەهات كە زانیـاری مـرۆڤ لەبارەی نهێنیەكانی سروشـت و هۆكارەكـانی خـۆرگیران و بـاران و تۆفـان و زەوی لەرزە و گڕكانەكان نەبوو، بۆیە هەر دیاردەك خوایەكیان بـۆ داتاشـی، ئـەو پـێ ی وایە دوای ئەوەی نهێنیەكانی گەردوون و یاساكانی سروشت دۆزرانەوە پێویست بەو خوایانە نەما. هەڵبەتە ئەمە ڕای كۆمەڵێك زانای پێش سـەدەی (18)ەیـە لەوانـە (فریزەر، تایلەر، فیورباخ، لاپلاس، هۆڵبـاخ،..) ڕاسـتە ئـەو فـرە خواییـە لـەلای هەندێ میللەت هەبووە، بەڵام شان بەشانی ئەو فرە خواییە تـاك خـوایش هـەبووە، وەك ولیەم شمیدیش بەدرێژی باسی كردووە[3].

ئینجا پەیامە ئاسمانیەكان باسی (ئەسباب) و (یاسای سروشتی) كردووە، ئەوەتا فەیلەسوفەكانی ئـایینی وەك (ئـیبن روشـد) بەدرێـژی باسـی سروشـت و هۆكـار و سیسـتەمی كـردووە، هەرخۆشـی (سـتیڤن) باسـی لـە فەیلەسـوف (تـالیس) ی میلتۆسەوە كردوە لەسـەدەی (6-پ.ز) كـە وتویـەتی دەتـوانین بـەهۆی هۆكـار و یاسای سروشتی لە سروشت بگەین، یەكەم كەسیشە پێش بینی خۆرگیرانی كردووە،

---

[1] لینین –مؤلفات ص162

[2] دیزاینی مەزن –ل38

[3] بروانة : علم الأجتماع ص418

فیساگۆرسیش دامەزرێنەری فیزیا و ماتماتیك و زانستی سروشتەو یەكەم زاناشە كە دیاردەكانی سروشتی لە چوارچیوەی یاسای سروشتی ڕاڤە كرد، ئەوانەش مەدرەسەی فەلسەفی ئایینی یۆنانی حیسابن.

ڕەنگە دیكارت (1596- 1650) یەكەم فەیلەسوف بیت كە یاساكانی سروشتی بە یاسا ڕێكخست و لەهەمان كات باوەڕداربوە، ئی دی هەردوو لای (نەزانی و زانین)، (نەفامی و ڕوناكی)، (فرەخوایی و یەك خوایی)، (بێ باوەڕی و باوەڕداری)، (فەلسەفەی مادی وفەلسەفەی خوایی) شان بەشانی یەكتر هاتوون، نەك قۆناغی ئەفسانە و ڕابردوو و فرەخوایی بێت، دوای بەرەو عەقلانیەت ئینجا بوبێتە تاك خوایی و لەسەردەمی زانستیش لەتاك خواییەوە بوبێتە یاسای سروشتی و دۆزینەوەی هۆكار وەك ستیڤن وای بۆچوە، هەر لەو كاتە كە دیمكریتیس فەلسەفەی ئەتۆمی داڕشت ووتی پێویستمان بە خوا نەما، لەو كاتە فیساگۆرس و تالیس و ئەرستۆ لێكدانەوەی سروشتیان دەكرد ئەوا بەشێكی تری فەیلەسوفان دژ بەو تەقەلا فەلسەفیانە بووینە، لەوانە (ئیپكۆروس 341-270 پ ز) ڕێچكەی خۆدانەدەستی(بەتەمای خودا) داوە، هەر لەوكاتەش كە ئێستا ستیڤن دەڵێت ئەو بونەوەرە مادیە و دێت و دەڕوا سزا و پاداشت لەدوایدا نیە، ئەوا هەمان وتە بەپیت و خاڵەوە لەلایەن (ئەناخسماندەر) و (هركلیت) لەسەدەی (5 پ ز) " ووتویانە: هەموومان لەمادەوە هاتووین دەشبینەوە مادە سزا و پاداشت نیە".

-لە لا206 باس لەوەدەكا كە (دەستپێكی گەردوونیش بەپێ ی یاساكانی زانست بوە نەك پێویستی بەجوڵاندن بوبێت بەهۆی هەندیك یەزدانەوە).. لێرەدا تەواوی كێشە فەلسەفی و مەعریفی و سایكۆلۆژیەكانی ستیڤن دەردەكەوێ، ئەو واتێدەگا چۆن ئاسەواری وەستا بە دیواردروستكردن دیارە، دەبێ دروست كردنی گەردوونیش ئەوا دەست و پەنجەو ئامرازەكانی خوای پێوە دیاربێت، گرفتی ئەو لە پەیوەندی نێوان (خالق و مەخلوقە) كە لەبەشی پێنجەم باسمان كرد، ئەو پەیوەندیە

لەڕێ ی (یاساکانی سروشتە کە بەشێکە لـە ڕاسـتی)، ناڕاسـتەوخۆیە، بـە (امـر-یاساکان) گەردوونی دروست کردووە.

-لە لا207 دێتـەوە سـەر شـەبەنگە تیـۆرەکی زۆر سـواو دەڵێـت (گـەردوون دەتوانێت خۆ بەخۆ بەهەموو ڕێگە مومکینەکان دەست پێ بکات کـە زۆرترینیـان دەبەسترێتەوە بـە گەردوونـەکانی تـرەوە).وەك لـەخوارەوە زیـاتر دەردەکـەوێ ئـەو بۆچونەی چەندەلاوازو یەك ڕەهەندیە، هەر11ڕەهەندیەکەی لە باش تـرین دۆخیـدا نوینەرایەتی یەك ڕەهەند دەکا کە ڕەهەندی مادیە، سروشت و گەردوون خـۆ بـەخۆ ناتوانێت بەرنامەیەکی وا ڕێك و پێك بۆخۆی دابـنێ یاسـاکانی ئەوەنـدە ورد بێـت خۆی (مسەیەر) و (ملکەچ) بکا بۆ ئەوەی ئەرکی تێکـڕای لـەپێناو (ئەوئامانجـەی ئیستا لە بوونەوەر هاتتەدی) دارِژرابێت، ئەو بۆچونە لەکۆنەوە لەسێ تیۆر هـاتووە: 1-تیۆری (التوالد-الذاتي) 2- تیۆری پەرەسەندن 3- تیۆری بازدان و ڕێکەوت... لەڕاستیدا هەر سێ تیۆر لەو سەردەمە پۆچـەڵکراینەوە لـە زانسـتیش ناخوێنـدرێن تەنها لەمێژوی زانست دەخوێندرێن، تیـۆری (توالـد الـذاتي) لەلایـەن (باسـتۆر) و (ئۆپارین) بە ئەزموون پۆچەڵکرایەوە و ئێستا ژیـانی رۆژانـەمان لەسـەر خـواردنی (قوتووە) کەلە پوچەڵی ئەو تیۆرە هاتووە، هەروەك تیۆری پەرەسەندن و ڕێکەوتیش لەگەڵ دۆزینەوەی (BIG BANG) کۆتایی هات، کە ئەویش زۆری بەکارهێنان هەیە، بۆهەموشیان ئێستا (ئەندازەی جینەکان) دەخوێندرێ و بـە وردی دەرکـەوت ئەوەی بەرپرسە لـە گۆڕانکـاری بـایلۆجی نـە (توالـد الـذاتي) ە نـە (پەرەسـەندن، ڕێکەوت) بەڵکو شوێنی جین لەناو کرۆمۆسۆم ئەو بەرپرسیاریەتەی هەیە.

لـە ل241 بـە دواوە جـارێکی تـر گەڕاوەتـەوە سـەر تیـۆرە کلاسـیکیەکانی (گەردوونی بێ ئامانج —عـەبەسـی) کەچـی رۆژبـەرۆژ وهەماهـەنگی هەمولەگـەڵ هەمو ئەو تیۆرەی عـەبەسی توورِ دەدا، چۆن دەتوانی پەیوەندی نێوان چـینی ئـۆزۆن وبەردەوامی ژیان لەسەر زەوی لیك بداتەوە ئەوە چۆن عـەبەسیە.

لێرەوە وەڵامی پرسیارێکی گرنگ هەیە، فرانك کلوز دەڵێ ئەگەر مەبەست لە دروست کردنی بوونەوەر تەنها ئادەمیزاد بێت ئەوادروست کردنی سیستەمی خۆرو مانگ ئەو هەسارانەی دەوری بەس بوو، پێویستی نەدەکرد ئەو هەمو گەردوون ومەجەڕەو (ئەستێرە ڕەش وسپی) وزۆری تر نەدەکرد، تا زانست زۆر نەبوو ئەو پرسیارە لەسەر زەویش دەکرا دەیان ووت چ سودیك لە دروست کردنی بەکتریاو ماسی ودڕندە هەیە؟ دەیان ووت مادام مارو دوپشك بۆ کوشتن دروست کراون ئەدی بۆ دروست کراون؟

هەمو ئەوانە لەگەڵ گەشەی زانست ساغ بۆوە کە هەریەکەی کاری خۆی هەیە لە ڕووی بایۆلۆجی وزیندەکی وهاوسەنگی سروشتی وژینگەو زۆر لای تر، دوای ووتیان تەنها سروشتی دەوروبەری زەوی بەسە بۆ ژیان..دوای دەرکەوت ئەو دۆخە سروشتیەی (زەمین) پێویستی بە رۆژ ومانگ وهەسارەو ئەستێرەو تەواوی گەردوون هەیە، لەوەوە زەمین ناسنامەیەکی میتافیزیکیشی هەلگرتوە، بوویتە مەلبەندی مەبەستەکانی گەردوون، کەواتە زەمین هەم ناسنامەی میتافیزیکی وهەم ناوەندیەتی مەبەستیشی هەلگرتوە لەو زەمینە چەند نیشانەیەکی خوایی گەردوونی لێ بەدی دەکرێ کە هەمویان ڕەهەندی گەردوونی و بونەوەریان هەلگرتوە:

1- پەیدابوون(خلق)وبەردەوامی، هەر ئەوە گرنگ نیە یەکەم شانەی زیندوو گرنگ تر لەوە ئەی چۆن بژی، خواردن ئاو هەوا...هەزاران هەزاران پێویستی تر، لەدوای هەمو ئەوانەو بە ئەندازەی ئەوەی ووتمان پێویستی بە (نێرو مێیە) بۆ ئەوەی ژیان بەردەوام بێت وەك تەمەن ووەك مێژوو.

2- زەوجی وتواناو سنور(زوجی وقدر).

3- کە لەپیشوو باسمان کرد-یاساو بەرنامە(هدی).

4- هەماهەنگی سەرتاسەری (نەك ناکۆکی)

5-ئامانج...

هەمو ئەوانە ئاسەواری خوایین لەو بوونەوەرەو لەویشەوە بۆ (زەمین)...، کەواتە ئیستا هەمو شتیك بە یاسایە یان بە عەبەسە؟ وەك خۆشی(سیڤن هۆکینگ) لە ل249-252 هاتۆتەسەر ئەو ڕاستیە، هەرچی بۆی بچیت ئاوایە.

لەکۆتای‌یدا لە ل263 دەگاتە ئەو ئەنجامە ودەڵێ سروشت بە خۆی کاری خۆی دەکا پێویست ناکا ئێمە سوپاسگوزاری خوایەك بین ولێی بپاڕێینەوە کە کاری چاکمان بۆ بکا...، بەو شێوەیە دەگاتەوە هەمان بیٚ باوەڕی کۆن وسادە کەبەرامبەر پێغەمبەرەکان وەستان، یان وەك دەهریەکان وبالی بیٚ باوەڕی فەلسەفەی یۆنانی کۆن، خوا پەکی لەسەر ئەو سوپاسە نەکەوتوەو ئازادی کردووی ئاواش بلێی، کەچی بوونەوەریش بە یاساکانی خوا بەڕێوە دەچیٚ چ دژی بیت یان لایەنگری.

# بەشی کۆتایی

# فەلسەفەی ئیلحاد و زیانی نیشتیمانیی

لەوەی سەروو بە سانایی تیگەیشتین کە فەلسەفەی مولحیدی زیانێکی زۆری بۆ سیستەمی کۆمەڵگە بە تاك وکۆوە هەیە، بۆ شارستانی وفەرهەنگی وتەواوی هاریکاری مرۆڤایەتی..، ئیستا بزانین ئەو زیانەبەرەو لای بنەما نیشتمانی وپەیوەندیەکانی تاك لەگەڵ یەکترو بە نیشتمانەوە چۆن دەبێ؟ئینتمای لاوازدەکا؟چەندە بەرژەوەندی تایبەت دەخاتە سەرووی نیشتمان؟ ئەو پرۆسەیە چەندە زیانەکانی گەورە تر دەبن ئەگەر ئەو وولاتە لە قۆناغی گواستنەوەی (وەك رزگاری- نیشتمانی) بێت؟

لەکۆنەوە ئیمپراتۆرەکان مونەزیر و ڕاوێژکاری زانایان هەبووە بۆ هەڵسوڕانی ئیدارەی وڵات، بەشێکیش لە فەیلەسوف و کۆمەڵناس و جوگرافیناسی گەورەش بۆ (فتوحات) تەرخان کرابوو، ئەرکی ئەوانە ئەوە بووە ڕێنماییدەر بۆ وڵاتانی نوێ و چۆنیەتی زاڵبوونی بەسەر میللەتانی داگیرکراو، کۆن ترین و ڕوونترین بەڵگەنامە لەو بارەیەوە ئاڵوگۆڕی نامەی نێوان ئەسکەندەر و ئەرستۆ بوە لەبارەی خاکی عەجەم، دوو نامە وەڵام هەڵدەبژێرین:

نامەی ئەسکەندەر: أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة، وأنه رأي لهم هيآت وخلقا، لو كان عرف حقيقتها، لما غزاهم، وأنّه إنّما ملكهم بحسن الاتفاق والبخت، وأنّه لا يأمن - إن ظعن عنهم - وثوبهم، ولا تسكن نفسه إلّا ببوارهم.

وەڵامی ئەرستۆ: « فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّـد أمثـال هـؤلاء الرجـال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب، فصاروا أعداءك وأعـداء عقبك بالطبع، لأنّك تكون قد وترت القوم، وكثرت الأحقاد على أرض الـروم مـنهم وممن بعدهم، وإخراجك إياهم في عسكرك مخاطرة بنفسـك وأصـحابك. ولكنـى أشـير عليك برأى هو أبلغ لك في كلّ ما تريد من القتـل، وهـو أن تسـتدعى أولاد الملـوك منهم، ومن يستصلح للملـك ويترشـح لـه، فتقلّـدهم البلـدان، ويتـوليهم الولايـات، ليصير كل واحد منهم ملكا برأسه، فتتفرّق كلمتهم، ويجتمعوا على الطاعة لك، ولا يؤدّى بعضهم إلى بعض طاعة، ولا يتّفقوا على أمر واحد، ولا تجتمع كلمتهم. »[1]

ابن خلدون ئەو نامەیەی ئاوا شیّ كردۆتەوە (..وتخطى إلى فارس فملـك بلادهـا، وهدم مدينة الملك بها وسبى أهلها، وأشار عليه معلمه ارسـطو بـأن يجعـل الملـك في أسافلهم لتتفرق كلمتهم)[2].

وەڵامنامەی دووەمی ئەرستۆ (فهمت كتابك، وما وصفت به أصحابك. فأمّا مـا ذكرت من بعد هممهم فإنّ الوفاء من بعد الهمة. وأمّـا مـا ذكـرت مـن شـجاعتهم ونقص عقولهم عنها، فمن كانت هـذه حالـه، فرفّهـه في معيشـته، واخصصـه بحسـان النسـاء. فإنّ رفاهة العيش توهى العزم، وتحبّب السلامة، وتباعد مـن ركـوب الخطـأ والغرر. وليكن خلقك حسنا تخلص لك النيات، ولا تتناول مـن لذيـذ العـيش مـا لا يمكن أوساط إخوتك مثله، فليس مع الاستيثار محبة، ولا مع المواساة بغضة. واعلـم أنّ المملوك إذا اشترى لا يسأل عن مال مولاه وإنّما يسأل عنه خلقه).[3] بەو شـێوەیە یەكـەم بنـەمای (زانسـتی داگیركـاری وزانسـتی فـرق تسـد) و لەبەرامبەریشـدا

[1] دەقی ئەو نامانە لە كتێبی ابن مسكويه(تجارب الأمم ج1 ص23) وەرگیراوە.
[2] تاريخ ابن خلدون ج2ص222
[3] تجارب الأمم ج1 ص23

بنەماکانی (زانستی مافی چارەنوس) لێرە دیت، هەر لەو هەڵمەتەی ئەسکەندەر ولەپیناو لاوازکردنی بەرگری میلەتان بۆ داگیرکاریەکەی ئەوا دوو قوتابی فیساگۆرسی هێنابوو لەگەڵ خۆی، بەناوی (مەرزنۆس) و(ڤلانۆس) فەلسەفەو باوەڕی هیلنیستیان لە ناوچە داگیرکراوەکان بلاودەکردەوە[1]، لەو سەردەمەش هەمان پلان پیادەکراوە (فرانتز فانون)دەڵێت : بەپیی ئەزموونمان بۆ داگیرکاری ئەواڕووبەڕووبونەوەمان لەگەڵ تەبشیری بۆ وولاتانی داگیرکراولەلایەن داگیرکەرەوە وەك قەلاچۆی میش ومەگەز پێویستە[2].

بەگشتی فاکتەرەکانی ئایین و ئەخلاق و ئایدۆلۆژیا بەشێکە لەتەواوکەری کەسییێتی، ئەوەش وادەکا کەسێکی لەرزۆك وراڕاو کرێگرتە نەبێ، بەبەرگری بێت بەتایبەتی بەرامبەر داگیرکاری، لەسەر ئاستی کۆمەڵگەش ئەو فاکتەرانە (بەدروستی) دەبێتە هۆی تەبایی و (ضبط اجتماعي) و هاریکاری و لێبوردەیی و بەزەیی و وەفا و خۆنەویسی بلاودەبێتەوە، بەگشتی ڕێگرە لە زاڵبوونی بەرژەوەندی تایبەتی بەسەر بەرژەوەندی گشتی، کە فاکتەری هەرە بنچینەیی دروستبوونی چەمکانی وەك کۆمەڵگە و نەتەوە و حیزب و تاقم ودەزگایە، ئەوەش دەروازەی یەکەمی پێشکەوتن وداهێنانە لەلایەك ولەلایەکی تریش بۆ خۆشەویستی میلەت و وولات و هێزی بەرگری، بەپێچەوانەوە ئیلحادی کەسی شەڕانی و خۆویست دروست دەکات، کۆمەڵگەیەکی پر لە تاوان دروست دەکا، کۆمەڵە یاسایەك هەیە لە فەرهەنگ و ئەنسکلۆپیدیەکان بەناوی (قوانین اجتماعیة الکونیة- Univarsal social law) هاتووە وەك دەقی خۆی (ژمارەی تاوان لە کۆمەڵگەیەك زیاد

---

[1] - ابي الفتح الشهرستاني- الملل والنحل – تحققت محمد عبدالقادر الفضل، بيروت، طبعة الأولى ج3 ص79 – ويل ديورانت لة(قصة الحضارة – ج13 )دەلێ لە 529ز باسی لە رۆیشتنی زۆریك لە فەیلەسوفان کراوە بۆ ئەو شوینانە.

[2] فرانتز فانون- معذبو الأرض، ت :جمال اتاسی ص17

دەکات ئەگەر ئایین ڕۆڵێکی پەراوێزی هەبێت) [1]، لەکۆمەڵگەی ئاوادا یاسا و پۆلیس و حکومەت زۆر ماندووە، چونکە کۆمەڵگە و تاکەکانی یارمەتیدەری بەرجەستەی یاسا و دەستور نابن، بۆیە ئێستا زۆربەی وڵاتانی جیهان هەر ئایینێکی ناتەواویشیان هەبووبێ گەشەیان پێ داوە، لەدەستوریان تۆماریان کردوە وەك ئایینی فەرمی وڵات، ماوتسی تۆنگی سەرۆکی پیشووی چین لەدانیشتنێکی لەگەڵ هەندێ زانای ئاینی ئەفریقی بەسەرۆکایەتی (مالك بن نبی) ووتبووی من هیچ ئاینیکی بە هیزم لە وولات نەبوو بۆیە کۆنفۆشیۆسیم زیندووکردەوە بۆ ئەوەی میلەتەکەم توندو تۆل بکاو بەرگری دەرەکی وناوەکی بۆ دروست بیت[2].

ئەزمونی مێژووییەکانیش بەهاوار پێمان دەڵێن ئەوانەی وولات فرۆشن ئاین و مەبادیئو ئایدیۆلۆژیان نیەو نەبوە، (ولید بن یزید)یەکێك لە خەلیفەکانی ئەمەویەو باوەڕی بەخوداو قورئان وزیندووبوونەوە نەبوە [3]، چی بەسەر نیشتمان هێناوە؟ خوراسانی فرۆشتە (نصر بن سیار)، ولایەتیکی تری بە(یوسف بن عمر )بە والی و کارمەندەوە فرۆشت، ئیتحادیەکانی عوسمانی(لەدوای 1908) وعەرەبی کەنداو فەلەستینیان فرۆشتە یەهودیەکان بە دوو سینی لیرەی زیڕ[4]، لیبیایان فرۆشتە ئیتالیا بە دوو بەلەمی سەربازی [5]، ڕووباری دیجلەیان فرۆشتە ئینکلیز بە 250000لیرە[6]، شیخەکانی کەنداو مووچەی مانگانەیان بە زیڕ هەبوو

---

[1] موسوعة العلم الاجتماع ل506. هەروەها بروانە: مەوسوعەی جودی ل255
[2] مەوسوعەی جودی ل81
[3] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72-73
[4] - اليهود والدولة العثمانية.. ص229
[5] يقول جوليتي- رئيس الحكومة الإيطالية عام1911م عن حكومة الإتحاديين: لقد طلبوا منا اذا كانت ايطاليا مستعدة للتنازل لصالح تركيا كتعويض لها عن ضياع ليبيا، عن سفينتين من أحسن سفن اسطولها.(الباحث- الإسلام والعلمانية واثرهما على نشأة الدولة العراقية الحديثة ص79)
[6] عباس العزاوي- العراق بين الأحتلالين-.. ج8- ص186

لەبەرامبەر فرۆشتنی وولات.

گۆڤـاری(شـؤون خارجیـة) لـە لنـدن دەردەچـوو لـە کـانونی دوەمـی 1927ز زانیاریەکی ووردی بەناوی (امـراء العـرب وداوتنـغ بسـکریت) نـاوی هەریەکـە لـە ئەمیرە عەرەبەکان وموچەی سالانەی ئاشکراکرد بەوشێوەیە :

1- ابــن الســعود 100.000 جنیــە، 2- الملــك حســین- شــریف مکــة- 100.000 جنیــە، 3- فهــد الهــذال 140.000 ربیــة، الســید الأدریســي 12.000لیَرة..[1].

ئەو دۆخە بۆ کۆمەڵگەیەکی بێ دەوڵەت و یاسا بەتایبەتی بۆ ئـەو میللەتانـەی لە فەترەی گواستنەوەن یان لەفـەترەی ڕزگـاری نیشـتیمانین (کـە دەوڵـەتیان نیـە) یەکجار زۆرتر پێویستیان بە ئایین و ئەخلاق و ئایـدۆلۆژیا هەیـە، بۆئـەوەی بـەدیل بێت بۆ حکومـەت و یاسـا و پـۆلیس و زینـدانی بتـوانی پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی وژێرخانەکەی بپارێزی، ئەو فاکتەرانە لەو قۆناغە دەبنـە ڕێگـری هـەرە گـەورە تـا خۆویستی و خۆفرۆشی و گەندەڵی و..... دروست نـەبێ، لـەو قۆناغـە کۆمەڵگـە پێویستی بە هاریکاری و تەبایی و ئۆقرە و گیانی بەرگری هەیە، ئەوەش بە ڕوونـی لــە ئامۆژگاریــە بەناوبانگــەکانی میکــاڤیلی(1469-1547)بــۆ دەســەلاتدارە داگیرکەرەکان دەردەکەوێ کە لەیەکێکیان دەڵێ: بۆ ئەوەی (ئەمیر) زال بیت بەسـەر میلەت پێویسـتە میلەتەکـە دوورخاتـەوە لـە ئـەخلاق وئـایین[2]، زۆر بـە زەحمـەت نمونەیەکمان دەست دەکەوێ میللەتێك لەژێر داگیرکاری ڕزگاریان بووبێ ئەگەریەکێ لەو سێ فاکتەرە (ئایین، ئەخلاق، ئایدۆلۆژیا)ی نەبووبێ، یان هەرسێك پێکەوە.

[1] عبدالرزاق الحسنی - تأریخ الوزارات العراقیة -دارالشؤون الثقافة العامة –بغداد 1988م ج1ص92 هەروەها د.علی الوردی – لمحات.. ج5 ص37 هەروەها (الإسلام والعلمانیة واثرهما علی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة ص79

[2] نیقولا مکیافیلی – الأمیر-تعلیق:موسولینی-ترجمة:خیری حمادی ص150

کاتێ ئەمیریکا لە (شاری ناکازاکی)دا وەزیری بەرگری یابان لە وەڵامی پرسیاری ئاخۆ ئەگەر ئێوە چەکی ئەتۆمیتان هەبوایە لە ئەمریکاتان دەداوە؟ لە وەڵامدا وتی" ئەگەر چەکی ئەتۆمیمان هەبوایە پێویستی نەبوو بەکاری بهێنین لەبەر ئەوەی ئەمریکا نەیدەتوانی لێمان بدا، جا لێرەشدا ئەگەر میللەتێك (ئایین و ئەخلاق و ئایدۆلۆژیا)ی پتەوی هەبووبێ، هەر لە ئەسلدا داگیر ناکرێ، ناچێتە چوارچێوەی نەخشەی داگیرکەران.

لە چوار چێوەی پرۆژەی(ارض بلا شعب لشعب بلا ارض) کە لەکۆنگرەی لندن 1840 درایە بارمستونی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا بەدوای وولاتیك گەڕان بۆ یەهودیەکان، سێ شوینیان بینیەوە (ئەمریکای لاتینی، هەندێ ناوچەی ئەفریقا کینیا لەوانە، هاتنە خوارووی بەغدا بۆ ناوچەی ئۆر)کە میلەتیان لێ لاوازە.

لە پرۆتۆکۆلەکانی یەهود ڕوون تر باس کراوە لە پرۆتۆکۆلی(11) دەڵێ تا بتوانین زال بین بەسەریانا دەبێ (ان الأمين -غير اليهود- كقطيع من الغنم، وأننا الذئاب، فهل تعلمون ما تفعل الغنم حينما تنفذ الذئاب إلى الحظيرة؟ انها لتغمض عيونها عن كل شيء) لە برۆتۆکۆلی10 باس لە تیك شکاندنی ژیرخانی خیزانی دەکا (فسوف ندمر الحياة الأسرية بين الأمين، تفسد أهميتها التربوية)[1]، هەولی داوە جۆری سیاسەتەکە میکافیلیانە بێت وەك لە پرۆتۆکۆلی یەکەمی باسی دەکا بۆ ئەوەی پەیوەندی زانستی سیاسیش بە میلەت لاواز بکاو داگیرکاریەکەی بە ئاسانی بچەسپێ، مەبەستی نیشتیمانی بێ میللەت ئەوە نەبوو دەوڵەتێکی یەهودی لە پانتاییەکی جوگرافی بێ دانیشتوان دروست بکات، بەڵکو مەبەستی دانیشتوانێکی بێ (مەبدەئی) و (سیستەم) و (ئایین) و قەتیس بەستوو لەژێر کاریگەری فاکتەرە ستونیە کۆمەڵایەتیەکانە، لاوازی میلەت مانای لاوازی ژیرخان نەك کەمی

[1] بروتوكولات حكماءالصهيون- ترجمة :عباس محمود العقاد ط5 1980بروتوكول رقم:(10، 11).
[1] مدخل الى الفلسفة ص47، 49

ژمارەیــان. لەمێژووشــدا تــا ئــەو ســاتە زۆر بەدەگمــەن بینیومانــە میللــەتێك پەیوەندیەکانی نێوان میللەت و نیشتیمان و دەسەڵاتی سیاســی بــاڵای هــەبووبێ و داگیرکرابێ، میللەتێکی مەدەنی (ئومە) داگیرکرابێ، شەڕی نێوان دوو ئیمپراتۆر و جەنگی جیهانیەکان لەسەر ئەو جــۆرە میللەتــە بــوە کــە لاوازن وەك چــۆن دڕنــدە نیچیری نەخۆش وگەوج یان ساوا هەلدەبژێرن، هەردەم داگیرکار چاوی بڕیوەتە خاکی ئەو میللەتانەی پێنەگەیشتوون، وەك لە کۆنگرەکانی سایکس پیکــۆ وســان ڕیمــۆ.. ڕوون تر دەردەکەوێ. دابەشــی ئینتــدابی ســاڵی 1920 بــەپێی مــادەی (22)ی عوسبەتولئومەم بۆ پلەکانی (a،b،c) باشترین بەڵگەیە.

ئیمپراتۆر و داگیرکەران لە کۆنەوە پێش ئەوەی بــەرەو هــەر وڵاتێــك بهاتبانایــە بانگی جوگرافی ناسی و کۆمەڵناسی و زانا و فەیلەسوفانیان دەکرد، یان هەر لەگەڵ لەشکرەکان بەڕێ دەکەوتن تاهەم سروشتی خاکەکە بــزانن (بەمەبەســتی عســکری) سروشــتی میلەتەکەش(بەمەبەســتی سیاســی)، بۆیــە ئاســاییە ڕای ئــەو جــۆرە فەیلەسوف و زانایانەی مونەزیری داگیرکەر زیاتر بەلای ئیلحادیــەوە بــووبێ، هــەر بەنموونە لە مێژوودا یەکەم زانــا کــە هــەوڵی جیاکردنــەوەی ئــایین و سیاســەتی داوە سینکا(4-65م) فەیلەسوفی مولحیدی ڕۆم بووە[1]، بەهەمان شێوە فەیلەسوفی یۆنانی کۆن (هرکلیت) هەم مولحید بــوە هــەم دژبــە بنــەمای ئــازادی و دیموکراســی بــوە، ئەوانــەی دژی بنــەمای ئــایینی و دیموکراســی و میلــەت بووینــە زۆربــەیان مولحیدوستۆیلی بووینە، زیاتر لایەنگیری دەسەلات بووینــە، لەوانــە زینــۆن(300 پ.ز) بۆ پاپای ئەسینا، مارکۆس ئۆلیتۆس وئیکتیپۆس(60-120) بە نۆکــەری ئیمپراتۆر بە ناوبانگ بوو.. ئەوانە بە (ستۆیلی)ناوزەد دەکران واتە: بــەردەم پایــە، بە هەمان شیوە ئەرستۆ هۆبز و وماکیاڤیلی.. رۆفائیلی هونەرمەند وینەی ئەرستۆ

[1] موسوعة علم الإجتماع ص339

و ئەفلاتونی لەتەنیشت یـەك وا دروسـت كردبوو(لەسـەر دیـواری كنیسـە دروسـت كرابوو)ئەفلاتون ڕووی لە ئاسمان و ئەرستۆش رووی لە زەوی بەو مانایەی یەكەمیان لاهوتی و دوەمیـان ناسـوتی، یـان سـادەتر یەكـەمیان خواییانـەودوەمیان واقعـی ودنیاییانە، ئەفلاتون ئاینی ولەرێزی میلەت بـوە وەك جـون لـویس دەڵـێ دەنگـی میلەت وشاری بوە، ئەرستۆش لە خزمـەت داگیركـەرێكی وەك فیلیپـی مەقـدونی بوە[1]، دوایـش بـوە فەیلەسـفی رەسمـی ئیمپراتۆریـەت ومامۆسـتای ئەسـكەندەری مەقدۆنی مونەزیری دەولەتی بەندایـەتی بـوو، سـینكای دوەم مامۆسـتای نیرۆنـی زۆردار بوو كەدوای خۆی دەماری بڕی وسینكای كوشت[2]، میكاڤیلی بۆ بنەمالـەی حوكومـداری مدیتچـی وئـاواش لاپـلاس وهـۆبز و... زانـای هۆلەنـدی هۆگـۆ گرۆتیۆس(1583-1645)بە دامەزرینەری یاسای دەولی وسیسـتەمی عـەلمانی هەژمار دەكرێ كەچی لایـەنگری كۆیلـەداری بـوە، هەڵمەتـەكان بۆسـەر جیهـانی ئیسلامی بەهەمان شـێوە دەسـت پـێ دەكـا، یەكـەم جـار هـەولیان داوە ئاینیـان لاوازبكا، ( لورنس براون) دەڵێ گەورەترین دیوار لـە پـیش داگیركـار وئیسـتعمار ئاینە[3]، سەركردەی پورتوگالی لە1515ز لە ژێـر دروشمـی (طـرد المسـلمین وأخمـاد النار المحمدیة الی الأبـد) بـەرەو جیهـانی ئیسـلامی هـات[4]، كلادسـتونی سـەرۆك وەزیرانی بریتانیا دەڵێ: مادام هذا القـرأن فـی أیـدی المسـلمین یتدارسـونە ویقبلـون علی العنایة، لن تقوم لنا قائمة، فلا بد العمل علی انتزاع هذا الكتاب من عقولهم وقلوبهم)) دەڵێت ناتوانین جیهانی ئیسلامی داگیربكـەین تـا (قورئـان) یـان لـەنێو

---

[1] سبینوزا-رسالة فی اللاهوت و السیاسة ص211

[2] د.عدنان علی رضا النحوی- المسلمون بین العلمانیة وحقوق الأنییسان الوضعیة، ط 1 1997م، ص10

[3] التبشیر والاستعمار ص 104

[4] بنی مرجة- صحوة رجل المریض ص199

دورنەخەینەوە[1]،لە ناو پەرلەمانی فرنسا پەرلەمانتاریك هەستا ووتی(القرأن هوالژی يحرچ المسلمين اژايه الفرنسيين)[2] فەلسەفەی ئینتیداب و دابەش و دیـزاینی جیهـانی ئیسلامی بەگشتی و رۆژهەلاّتی ناوەڕاست بەپێی مقاسیدی سایکس بیکۆ دروسـت کرا، یەکەم پێگەی (بەمورتاحی) ئیستیعمار لەجیهانی عـەرەبی حیجـاز بـوە کـە یەکەم پرۆسەی لێك جیاکردنەوەی ئایین لە دەسەلاّتی ئەنجامدرا لەنێوان(محمد کـوڕی عەبدولوەهاب)و(محمد کوڕی سعود) لەسالی 1737ز ئاین بۆ یەکـەم ودەسـەلاتیش بۆ دوەم[3].

دەسەلاّتی عوسمانیش لەدوای ئەوەی ڕێڕەوی سیکۆلاری کەوتە نێـو ئـەوجا بـوە دەولّەتە نەخۆشەکە، رۆجی غارودی هەروەهاش مەکسیم رۆدنسن دەلّێن ئیسـتعمار بۆ جیگیر بوونی خۆی لە وولاتانی داگیرکـراو هـەولی یەکـەمی دەرکیشـانی ئـاین وکەلتوری ڕەسەنی ئـەو میلەتـە بـوە، بۆیـە تەبشـیری پیشـرەوی ئیسـتعمارە..[4]، مەبەستی بنچینە تەبشیری گۆڕینی ئاینی داگیرکراو بوە بۆیە پیشەنگی داگیرکـاری بوە [5]، تەنانەت داگیرکەر هەولی داوە ئاینیکی بەهیزو بەرگر بگۆڕێ بـە ئـاینیکی تری سادە، بۆیە هەولّی گۆڕینی دراوە، چونکە ئاینی ئیسلامی ڕاستەقینە هـەرگیز ناشیّت ونابیّتە کەرەستەی هیچ داگیرکـەرێك، جـورج کامبـل لـە کتیّبـی (الأفرقـا الإستوائية) لەگەلّ ڕای(جورج کارپنتر) هاوڕان ودەلّێن ئاینی ئیسـلام رۆلی سـەلبی نەبوە لەداگیرکاری، تەبشیری بە پیّچەوانەی ئیسـلام سـەربەخۆیی نیشـتمانی تیـك

[1] بنی مرجة- صحوة رجل المريض ص199
[2] ابن باديس وعروبة الجزائر ص40
[3] د.صالح العابد –حركة الأستقلال العربى ص12-13
[4] روجيه غارودی-ماركسية قرن عشرين ص149 وص195 هەروەها مكسيم رۆدنسن لە کتيبی (الإسلام والماركسيه) ئەو باسە دەكات.
[5] هاری ماجدۆف- الإمبريالية من عصرالإستعمار الى اليوم ص67

شکاندوە لە ئەفریقا[1]، سەرەڕای ئەوەش هیشتا ئاینێکی لاوازیش باشترە لە بێ ئاینی، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە مانەوەی گیانی بەرگری میلەتی کیبک لە کەنەدا دەبینین یەکێ لە هۆیە بنچینەییەکە ئەوەیە رۆحی ئاینیان هیشتۆتەوە وەك بەشیك لە سەربەخۆیی (وەك لە ئامارەکەی سالی 2010 دەرکەوت).

لە ئەزمونی ئەپارتایدی ئەفریقا ورۆدیسیای پیشوو سەرنج بدە ئەو تیمەی سپیەکان دژ بە رەشەکانیان دروست کردبوو بەناوی(عصابه التمساح) تا ژێرخانی میلەت داخوڕێنن بۆ ئەوەی بەرگریان نەمینی، هەول دەدرا بەهاو ئاینی ڕەسەنیان بتوینەوەو فەرهەنگی ئەوروپیان بەسەردا زال بکەن[2].

لەوە زیاتر (فرانتزفانون)دەڵێت ئیمپریالیزم وداگیرکاری کەسێتی وسروشتی مرۆڤ تێك دەشێوینێ و عەقڵیشی دوادەخا[3]، بۆیە لە بنەماکانی(تصفیه الإستعمار) واهاتوە:بۆ رزگاری یەکجاری پێویستە خۆت لە هەمو ئاسەوارەکانی ئیستعمار رزگار بکەیت[4]، ئەرستۆ لە چوارچێوەی تیڕوانینی بۆ میلەتان مرۆڤی بە (حیوان ناطق) وهۆبز ونیتچەو لەهەمان ڕوانگەی ڕەگەزپەرستی مرۆڤیان بە گورگ وەسف کردوە، کەچی زۆربەی فەیلەسوفانی رزگاری خواز مرۆڤیان بە (کائن متدین) وەسف کردوە، پێیان وابوە بەبێ ئاین کەسیتی مرۆڤ تەواو نابێ[5]، نمونەگەلی زۆرە بۆمانەوەی ئیستیعمار و داگیرکەر تەقەلای داوە ئەو هەنگاوانە بێنێتەدی:

1- میللەتی داگیرکراو گەشە نەکا بەرەو مەدەنیەت و ڕووناکی و شارەزایی.

---

[1] عباس محمود عقاد- مایقال عن الإسلام ص91 هتروةها: جورج کامبل-الأفرقا الإستوائية ج2ص276

[2] مایکل ریبون-النار السوداءحرب العصابات فی رودیسیا ص76-، ص117

[3] معذبو الأرض- ص6

[4] عبدالكريم العبيدی - تصفية المصالح الإمبريالية الأمريكية ص48

[5] المعتقدات الدينية لدى الشعوب ص7 بۆزیاترلەوبابەتەبروانە: إدوارد سعید (الاستشراق والثقافة والإمبريالية - Orientalism 1978، Culture & Imperialism ,new york 1993).

2- هەردەم دەیەوێ سیاسەتو ئاین ومەبادیئو گیانی نیشتمانی لیك جیا کاتەوە.

3- یەکپارچەیی و گیانی هاریکاری و زیندەکی و هەست بە ئازادی و دیموکراسی نەکا.

4- هەوڵدەدا پەیوەندی نێوان خاك و میللەت ومێژوو لاواز بکات.

5- هەوڵدەدەن بەرژەوەندی تایبەتی و خۆویستی زاڵ بکەن بەسەر هەست بەبەرپرسیاریەتی و بەرژەوەندی گشتی و خۆشەویستی خاك و نیشتیمان و دژ بە زوڵم و زۆرداری.

6- بۆهەموو ئەوانە هەوڵ لەسەر کۆی ئەو هەنگاوانە لەسەر چاوەیەك دەکا ئەویش تەقەلای لاوازکردنی ئایین و ئەخلاق و مەبدەئە لەناو ئەو میللەتە، لەبەرامبەردا فەلسەفەی مولحیدی بڵاودەکاتەوە.

هەموو وڵاتێك بەتایبەتی میللەتانی ژێر دەستە بۆ ئەوەی نەتوێتەوە، بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت، ئەوا پێویستی بەوە هەیە ژێرخان و ڕووحی کۆمەڵگەکەی بپارێزێت کە بریتیە لە ئایین وکەلتور وفەرهەنگی، بەپێچەوانەش دەبێ هەوڵبدا هەموو ئەو دەروازانەی دەچێتەوە سەر مولحیدی دەری کێشی، ئەوە مانای زاڵکردنی ئایینێك بەسەر ئایینێك نیە، مانای قەدەغەکردنی موزاییکی فرەئایینش نیە، ئێمە باسی ئایینێکی دیاریکراومان نەکردووە، بەڵکو وتومانە میللەت ئایینی هەبێ، ئازادە چ ئایینێك هەڵدەبژێرێ، ئەگەر بکرێ هەر وڵاتێك یەك ئاینی هەبێ، بەڵام ئەگەر فرەئایینیش بوو ئەوا لێبوردەیی یەکتر قبوڵکردن و تەبایی بکرێنە بنچینە لە چوارچێوەی هاوڵاتی هاوئادەمی بوون، خۆ ئەگەر لەناو ئەو میللەتە ئایینیش نەبوو ئەوە نەریتە ئیجابیەکان و مێژوو و فەرهەنگ بکرێتە بنچینە، خۆ ئەگەر هەر مولحیدیش بوون ئەوا ئەو جۆرە مولحیدە بن لەسەر بنچینەی فەلسەفە و زانست

بێت باشترە لە (نەفامی مولحیدی)، هەر وەك لە قورئانیش ئەو پۆلەی پـێ باشـترە ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾[1].

## لەکوردستان:

نمونەی شبلی شمیل(1850-1917) وهەلویستی خراپی بەرامبەر ئاین ولەهەمان کات خراپی بەرامبەر نیشتمان نمونەیەکە بۆ بەشیکی زۆری سیکولاری کورد،ئەو پێی وابوو ئاین هۆکاری پەرتەوازەی میلەتانە،بۆیە داوایان دەکرلە ژیان وسیاسەت جیا بکرێتەوە ،بۆیەش یەکەم زانا بوو (تیۆری پەرەسەندنی)هێنا ناو عرب بە کتیبیکی بەناوی (فلسفه النشوو والارتقاو)لەگەل (سلامه موسا)ش پرۆژەی هاوبەشی تریان هەبوو ،کەچی ئەوانە لەلای میژوونوسانی عرب بە نانیشتمانی وەسف کراون ،بەتایبەتی لە کیشەی قەناتی سویس و پرسە عربیەکانی تر .

ئەوەو ئەوەی سەرووتریش بۆ گشت وولاتە داگیرکراوەکانەو بە ئاشکرا لەکوردستان بەدی دەکرێ، ئەوەی زۆر ڕوونەو بینیومانە قولبوونەوەی فەلسەفی ناوێ کە داگیرکەران بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەنیازی چیە لە کوردستان، بۆئەوەی داگیرکاریەکەی ڕەسەن بکا هەلساوە:

1- فەرهەنگ و کەسایەتی کورد هەلتەکێنێ. ئامراز: بەهۆی بەتەماح کردنی و خۆویستی و مادی بوونی و...

---

[1] الحج : 8

2- هەوڵی داوە ئایین لە کوردستان لاواز بکا.ئامراز: چ بە سوتاندن و وێرانکردنی مزگەوتەکان چ بەناشرینکردنی لە رێ ی ناوی ئایینی لە پرۆسە عەسکەریەکانس دژ بە کورد.

3- هەوڵی داوە ئەو تەبایی و هاریکاری و ئەخلاقە کۆنەی کوردی لەناو ببا کە جاران ناوی قورەیشی عەجەم بوە. ئامراز: بەهۆی ناکۆکی خستنە ناویان و گواستنەوەیان لە شوێنی خۆیان و کۆکردنەوەیان لە کۆمەڵگە و دروستکردنی (فوج) بۆ هەر عەشیرەتێك بەناوی(افواج خفیفە) کە هەمان ناوە لەسەردەمی ئیتحادیەکانی عوسمانی لەدوای سالانی 1908 بۆ کورد کرایەوە.

4- لەکۆی ئەوانەش هەوڵی داوە پەیوەندی نێوان کوردستان و کورد لەیەکتر جیا بکاتەوە، پەیوەندی تاکی کوردیش بە (مێژوو و ئایین و فەرهەنگ و کورد و نیشتیمان) لێك بکاتەوە، تا ئینتیمای تاك بۆ میللەت و نیشتیمان لاواز بکا، کەسێکی یاخی و (لامنتمی) لێ دەرچێ.

ئامڕاز: _بەهۆی ژیاندنەوەی فاکتەرە ستونیەکانی عەشایری و دروستکردنی فەوج، تاکیش سەرقاڵ بکا بە ئارەزو بازی وباقی کارە لاوەکیەکانی تر.

ئەوانەی داگیرکەران کردوویانە:

1- یەکەم لێکجیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت ڕۆژنامەی (یەکێتی کورد) سەر بە بەریتانیا لە سلێمانی بانگیشەی بۆکرد.

2- داگیرکەران (کۆمەڵگە- مجمع-) یان دروست کرد.

3- ژمارەی خۆفرۆش و جاش لەسەردەمی سەرکردەی عەلمانی کورد دەیان جار زیاتربوە لەسەردەمی سەرکردەی ئایینی.

4- بوونی جاش لەنێو کۆمەڵگەی عەشایری بوە، زۆر بەدەگمەن لەنێو ئایین پەروەران و ڕۆشنبیران بووە.

نابێ ئەوەشمان لەبیربچێت کە لە بنەچەدا شۆڕشەکانی کوردچۆن دژ بە داگیرو دابەشی کوردستان بوە ئاواش دژ بە مولحیدی و عەلمانی بوە، چونکە زانیویانە مەینەتی کورد هەم لە ئەستۆی عەلمانی دایە هەم عەلمانیەت وپرۆسەی دژ بەئاینی ڕێزی میلەتەکەت تێك دەدا، مەلا سلیم وشیخ عبدالسلام وئەوەی شێخ سعیدی پیران بە ڕوونتر لە دادگاییەکەی دەردەکەوێ کەلە گۆڤاری (گێرشەم)ی ئەوسەردەم بڵاوکرایتەوەو دەڵێت: ئێمە دژی داگیرکەروعەلمانیەت شۆڕشمان کردوە، بەتایبەتی کەبینیم لە جەریدەی (سبیل الرشاد) عبدالله جودت واحمدناوێك نوسیبویان: موسا بە لەخۆبایی و عیسا بەناوبانگی و محمد بەئەمینی.. هەریەکە ئاینێکیان هێناوە، ئێمەش دەتوانین ئاینێك بهێنین، ئەو جۆرە بانگێشانە لەڕۆژنامەکان تەنیبۆوە ئێمەش شۆڕشمان دژ بەوانیش کرد[1].

بۆ هەموو ئەوانە و چارەسەری کارنامەی هەمەلایەنی پێویستە، هەر لە ڕاست کردنەوەی چەمکە زانستیەکان بەرەو پەروەردە و ئارامی سایکۆلۆژی و قەڵاچۆی (تقزم الثقافي) و دیاردەکانی خۆویستی و نەفامی و.....

تادەگاتە فەلسەفە و ئەخلاق کە لێرەوە مەبەستمانە بۆ ئەوەی میللەتەکەمان دووچاری پەرتەوازەیی و خۆویستی و بێ سەروبەی و بێ ئینتیمایی نەبێ، بۆ ئەوەی گیانی بەرگری نەمرێ، ئەوا دەبێ چەمکی فەلسەفەی باوەڕ لەبەرامبەر چەکی کوشندەی بێ باوەڕی (ئیلحاد)ی داگیرکەران دروست بکەین، داگیرکەر ئەو چەکەی (بێ باوەڕی) بۆخۆی و لەنێو میللەتی خۆی بڵاوناکاتەوە، دەهێنێ لەناو میللەتی کورد بڵاویدەکاتەوە.

---

[1] دەقی گفت وگۆی دادگاییەکە لە: دراسات فی الحركة الكوردية المعاصرة ص512- 523

# کۆتایی و ئەنجام:

لەو کورتە توێژینەوە کۆمەڵێك دەرەنجامی فەلسەفی وسیاسی وفکریمان بۆ ساغ کرایەوە :

1- فەلسەفە دایکی لقە زانستی وفکریەکانی ترە هەم پیشڕەویشە، لەهەمو سەردەمەکان دابەشی فەلسەفی هەبوە، لەو سەردەمەش دابەشی هەیە بەتایبەتی فیزیای کوانتەم، بەشیکیان بە ئاقاریکی تر ڕۆیشتون، بەڵام بەگشتی ڕێڕەوی مێژووی گەشەی فەلسەفەو زانست ئاسۆی کێشەی فەلسەفی کەم کردۆتەوەو لە ئاینیش نزیك بوویتەوە، کەم تریش باوی فەلسەفەی ووشك وکەلامی وسەفسەتایی ماوە بەڵکو فەلسەفەی تەتبیقی بەرهەمدارجێی گرتۆتەوە.

2- ڕەوشی فەلسەفی سەدەی 21 زیاتر بەرەو ئاشت بوونەوەی ئاین وفەلسەفەو زانستە، ئەوەی لەو کۆڕایە یاخیە بەشێك لە فیزیای کوانتەمە، پرسیاری فەلسەفی بنچینە لەو مەیدانە ساغ نەبوویتەوە بۆیان بریتیە لەوەی ئاخۆ سیستەمی بوونەوەر بە پێی یاساو ڕێساوهۆو ئەنجامە یان بەپێی ئەگەرو زارهەلدانە، لە یەکەما دیزاینی گەردوون دێزاینەری پێویستە لە دوەما دیزاینێکی گۆڕاوی بێ ئامانج وبێ سیستەم پێویستی بە دێزاینەر نیە.

3- فەلسەفە بەر لەهەموان عەولەمی بوەو تیایدا مرۆڤە جیاجیاکان دەتوانن لەو بوارە یەکتر بە ئەرینی بناسنەوەو ڕاستیەکانیان بۆ دەرکەوێ دوور لە کاردانەوەی نەریتی وکەلتوری ومیراتی، ئامانجی کۆتایی دروست کردنی

کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتیە یان بە گوزارشی (عبدالکریم فتاح) دەگەینە پلەی (هاوولاتی گەردوونی)[1].

4- لەوسەردەمە زیاتر لەهەمو سەردەمەکانی تر پێویست بە فەلسەفە هەیە بۆ ئەوەی مەرجەعیك دروست بکا لەسەر بنچینەی هەق تیایدا ئاین وزانست وئایدیۆلۆژیا ئاشت بکاتەوە لە خزمەتی کۆمەڵگە.

5- زیاد بوونی قەیرانەکانی ئابووری وسیاسی وکۆمەلایەتی و..پێویست بەوە دەکادادگەری گشتی بۆتەواوی سەرزەوی پەیڕەو بکرێ، هەمولایەك پاگندەی ئەوە دەکەن ئەو دادگەریە لای ئەوە، با فەلسەفە ببیتە ئەو نیوبژیە (دوور لە دەمارگیری) لە نێوان هەر چوار مەدرەسە(لیبرال دیموکراسی، سۆشیال دیموکراسی، شیوعیەت، ئاینی) هەق ودادگەری لای کام لابوو هەمولایەك ڕوولەو بکەین لە پیناو خۆشگوزەرانی کۆمەڵگەو زال بوون بەسەر کارەسات وقەیرانە سەختەکانی ڕووبەڕووی کۆمەڵگە دەبێتەوە.

6- لەو سەردەمە وەك پیشوو نیە تاك وهاوولاتی پێویستیان بە دەولەت نەبێ وهەر کۆمەلە بەشەریەك پێویستیەکانیان بەیەکتری تەواو بکەن، ئیستا ئەو ئەرکە ڕاستەوخۆ کەوتۆتە سەر دەولەت، دەولەتیش بۆ دەولەتەکانی تر لەسەر ئاستی جیهانی، بۆیە توێژینەوە لەبارەی دەولەت وئەرکەکانی تەنها لە ئەستۆی زانستی سیاسی ویاسایی نەماوە بەڵکو فەلسەفەش ئەو ئەرکە بە ئەستۆ دەگری ولەو توێژینەوە دەرکەوت کە چ جۆرە حوکمیك دەگونجێ لەگەڵ یاساکانی سروشت وسروشتەکانی مرۆڤ وڕاستیەکانی بوونەوەر.

7- دەرکەوت ئەو فەیلەسوفانەی مولحیدن دژ بە ئازادی ودیموکراسیشن، زۆربەشیان لایەنگری دیکتاتۆری بووینە، دەریش کەوت مادام خوای گەورە

[1] عبدالکریم فتاح-میزان(ئیسلام لە نیوان دەرکەوتەکانی ومیزانی قورئاندا) ل116

ڕاستەوخۆ حوکم لەسەر بوونەوەر ناکا بەڵکو خۆی ویستویەتی لەڕێی یاسای سروشتی بێت ئەوا ئاینی ڕاستەقینە حوکمی سیۆکراتی پەیڕەو ناکا، هەم حوکمی دیکتاتۆریش لە ژێر هیچ ناوێك، مادام ئاینیش تۆبزی نیە ئەواحوکمی ئاینیش تۆبزی نیە، هەر خودا خۆشی ویستویەتی فرە میلەت وفرە ئاین وبیروڕای جیا هەبێ ئەواڕاستی ودادگەری ئەو نیوبژیەیە کەهەمولایەك لەسەری کۆکن، لە قۆناغێکی گەشەی کۆمەڵگە بەرەو دادگەری دەکرێ دیموکراسی بکریتە ئەو نیوبژیە ئاخۆ میلەت بۆ هەلبژاردنی چارەنوسی کام مەدرەسە هەلبژێرن (لیبرال دیموکراسی، سۆشیال دیموکراسی، شیوعیەت، ئاینی).

8- لەسەر ئەو بنچینە فەلسەفیانە دەتوانین دیزاینی سیاسی کۆمەڵگەی ئیستا بە شیوازێکی نوێ وا پۆلین بکەین: ئەوانەی دەڵێن ئەمرو خلق بۆ خودا نیە بەڵکو بۆ سروشتە ئەوانە عەلمانی توند ڕەوە- مەدرەسەی سیاسی شیوعەت وبێ باوەڕی لەو زەمینەیە دێت، ئەوانەی دەڵێن خودا (خلقی) هەیەو (ئەمر)یش بۆ ئێمەیە ئەوا عەلمانیەتی میان ڕەوە مەدرەسەی لیبرالی وسۆشیال دیموکراسیە، ئەوانەی دەڵێن خودا خاوەنی ئەمرو خەلقە ئەوانەش دووبەشن، ئەوانەی پێیان وایە دنیاو قیامەت دژی یەکن ئەوانە پێگەیان لە دیزاینی سیاسی ئاینی نیە، ئەوانەی پێیان وایە ئاین بۆدنیا هاتوەو دادگەری لە دنیا هەم خۆشگوزەرانیەو هەم زامنی قیامەتیشە ئەوانە بریتین لە بزوتنەوە ئاینیەکان.

9- کۆمەڵگەی کوردستان زیاتر لەهەموان پێویستی بە فەلسەفە هەیە بۆ هەردوو قۆناغی رزگاری نیشتمانی ورزگاری کۆمەڵایەتی، سەرەڕای کاری بەرزکردنەوەی هۆشیاری گشتی.

# ناوەرۆك

# سوپاس وپێزانین

زۆر سوپاس بۆ:

1-بۆدەزگای تەفسیرو کارمەندانیان کە هەردەم ئامادەیە بۆ بەپیل وەچوونی ئەو جۆرە پرۆژانە.

2-بۆدەزگای(ڕوئیە- بۆ پێگەیاندنی ڕێکخراوەیی) کە یارمەتی دەری هەمەچەشنی ئەو پرۆژانەیە.

3-بۆ ئەو هەمو یارمەتی وهاندانە زۆرەی دۆست وزانست پەروەران بەگشتی و بۆ ئەو پرۆژەیەش زیاتر لەلایەن د.احمد میرزا، د.علی ، د.عوسمان گەرمیانی و مامۆستایانی ئاینی م.سوسەیی و م.کاریتانی و مامۆستایانی تر و هەریەکە لە کاك ئیسماعیل وکاکە دەهام و فەرمان و دیدار و..زۆری تر.

## له بڵاوكراوەكانی ستاندەر و نوسەر:

ئەوانەی ناوی بەرامبەر نیە ئەوە نوسینی دانەرە.

1- دۆزی كورد، فەشەلی عەلمانی و غیابی ئیسلامیەكان (سەلام ناوخۆش)

2- كێشەی جەزائیرو چەند پەندیك بۆ دۆزی كورد

3- هەڵبژاردن لەنێوان عەلمانی وئیسلامی.

4- قوتابخانە فكریەكان وحزبە كوردستانیەكان .

5- دەقەكانی سیڤەر وخویندنەوەیەكی تر (سەلام ناوخۆش) (مسعود عبدالخالق) بەهاوكاری (یەكێتی پەرلەمانتارانی كوردستان).

6- چارەنوسی فیدراڵی لە دوای دەرچوونی عێراق لە بەندی (7)

7- كێشەی ئافرەت لە ڕوانگەی ئاینی و عەلمانی بەهاریكاری یەكێتی خوشكانی یەكگرتووی كوردستان.

8- كێشەی كوردستان لە توركیا و عێراق، شێخ محمد باڵەك (وەرگێران)

9- تیشكێك بۆ هەڵەكانی جیهادكردن لەرێی خوا (وەرگێڕان)

10- دیواری دەسەڵات –شیعر- محسن شوانی

11- بەرهەمەكانی سامی یوسف – گورانی-

12- ڕۆڵی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەت كورد.

13- مەوسوعەی جودی.

14- ناسنامەی كەركوك وناوچە دابڕێنراوەكان بە پێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتیەكان.

15- بە عربی :

أ- الإسلام والعلمانية واثرهما على نشأة الدولة العراقية الحديثة -رسالة ماجستير.

ب-الإسلامية الكردية –بإشتراك مع مشروع المسبار الدولية.